


# دەرد و دەرمان

وەڵامی تەواو

بۆ چارەسەری نەخۆشیەکان

نووسینی

پێشەوا ابن القیم الجوزی

وەرگێرانی

هیلال علی سەنکاوی

٢٠٠٩




چاپخانەی رۆژهەلات

- ناوی کتێب : دەردو دەرمان
- ناوی نووسەر: الأمام العلامة أبن القيم الجوزية
- وەرگێران : م. هيلال علی سەنگاوی
- تایپ : شێرزاد محمود حسن
- بەرگ: کەیوان
- نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی (٧٤ ) ساڵی ٢٠٠٩ ی داوەتێ
- شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەلات – هەولێر



Email: h.daneshfar@yahoo.com
Mob: 0750 449 3561

هەولێر ـ شەقامی ئاراس ـ کۆڵانی سینەما سیروان

# پێرست



## بەشی یەکەم

### خستنەڕووی پلەوپایەی نزا (دوعاء) لەئیسلامدا

### دیاری کردنی مەرجەکانی قبوڵ بوونی نزا (دوعاء)

## بەشی دووەم:

## شوێنەواری تاوان.... سزای لە دونیا و قیامەتدا

## بەشی سێ یەم

## تاوانە بچوك وگەورەکان وەگەورەترین تاوانە گەورەکان

## بەشی چـــــوارەم
## حەرام کردنی خراپەکاری وپاراستنـــی داوێـن

## بەشی پێنجەم
## چارەسەرو وەڵامی پڕوپوخت

بەناوی خوای گەورە

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگار،سلاَوو درود لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) .

پێشەوا "ابن القیم" یەکێکە لە زاناو پسپۆڕە لێهاتووەکانی بواری فیقە و فکر و دەرونزانی. وەلەم بوارە جیاجیانەدا بەرهەمی نایاب و سەرچاوەی گرنگی پێشکەش بەمرۆڤایەتی کردووە. کە ئەمرۆ وەك سەرچاوە سودی لێ وەردەگرین. وەئەم زانا لێهاتووە خاوەن چەندین بۆچوون و تیۆری تایبەتی یە لەم بوارانەی کە باسمان کرد. کتێب و نوسراوەکانی بوونەتە سەرچاوەی زۆربەی توێژەران و جێی بایەخ و گرنگی پێدانە. ئەمرۆ کتێبخانەی کوردی لەبەرهەمی ئەم زانایە خالَی یەو بێ بەشە.

ئێمەش بە ئەرکی خۆمان زانی کە بەم ئەرکە پیرۆزە هەستین و یەکێك لەکتێبەکانی وەربگێڕین بۆسەر زمانی کوردی شیرین.تاخوێنەری کوردی لەبەرهەمەکانی بێ بەش نەبن.لەم کتێبەدا تەنها چەند برگەیەکی کەم نەبێت کە پێمان باش بوو وەری نەگێڕین لەبەر هۆکاری بەسەرچوونی بابەتەکە. ئیتر هەر هەموو بابەتەکانی وەك خۆی وەرگێڕاون.دواتر ئەم کتێبە شعرێکی زۆری عەرەبی تێدا بووە.کەئێمە بەپێویستمان نەزانیوە لەم وەرگێڕەدا باس بکرێت تەنها ئەو پۆپلە شیعرانە نەبێت کەپێویست بوو بۆ بابەتەکان.

بەهیوای ئەوەی سود مەند بێت بۆ هەموو لایەك وە خوای گەورە لە کەم و کورپیەکانمان ببورێت. دیارە تەنها کە خودا بێ کەم و کوری یە.

وەرگێڕ

هیلال علی سەنگاوی

## پێشەکی

سوپاس وستایش بۆ پەروەردگاری جیهان، کەقبوڵکەری تۆبەکارانە وبەخشندەیە،نەرم ونیان ولێ بوردەیە، داپۆشەری تاوانی تاوەنبارانەو لێ بوردەوقبوڵکەری تۆبەی تۆبە کارانە.وەسلاو ودرود لەسەر ئەو کەسەی کەڕەحمەتەو خۆری پرشنگدارە بۆ هەموو دنیا ومژدەبەخش وترسێنەر کە محمدﷺ وەلەسەر یارو دۆستانی.

پاشان... نووسەر لەکتێبی (طب النبوی) دا سەبارەت بە"عیشق" دەلێت:

(ئەم نەخۆشی یە لە نەخۆشیەکانی دڵە ، جیاوازە لەنەخۆشی یەکانی تر لە ڕووی خودو هۆکارو چارەسەریشەوە، جا ئەگەر ئەم نەخۆشی یە شوێنی خۆی بگرێت زۆر زەحمەت دەبێت چارەسەرکردنی لەلایەن پزیشکەکانەوە، وەنەخۆشەکەش تەواو گرفتار دەبێت پێیەوە) . وەخوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بە دوو پێڕ لەخەڵکی باسی کردووە.کە"عەشقی ئافرەتان وعشقی منداڵ ومێرد منداڵانە".یەکەمیان لە ڕووداوی هاوسەرەکەی عەزسزی میسرداله گەڵ پێغەمبەر یوسفدا باسی کردووە سلاوی خوای لەسەر بێت،وەدووەمشیان لەسەر نەتەوەو قەومی لوط باس کردووە.

وەئەم کتێبەمان لەسەر جۆری دووەم باس وخواس دەکات کەئەمڕۆ بەچەمکی"نامۆیی سێکسی– شذوذ الجنسي"ناسراوە. وەپێغەمبەری خوداﷺدەفەرموێت: (إن اخوف ما أخاف على أمتي عمل قوم لوط.... واتە: ئەو شتەی کەزۆر لێی دەترسم بۆ ئومەتەکەم، بریتی یە لەکردەوەی قەومی لوط) وەهەروەها ﷺ دەفەرموێت: (اقتلوا الفاعل والمفعول به في عمل قوم لوط) هەروەها دەفەرموێت (من عمل بعمل قوم لوط فأقتلوه.... واتە: بکەرو پێکراوی کرداری قەومی لوط بکوژن) .وەلە گێڕانەوەیەکی تر دەفەرموێت"هەر کەسێك کردەوەی قەومی لوط ی ئەنجامدا بیکوژن."

وەعبـــــداللە ی کــــوڕی عـــــەمرﷺ دەفـــــەرموێت کــــە پێغەمبـــەر فەرموویـــەتیﷺ: (لــەڕۆژی قیامەتــدا نێربازەکــان لەســـەر شــێوەی بــەراز وەیمون حەشر دەکرێن) .

جـا عیشــق زیـان وەترســی زۆری هەیـە بـۆ دیـن ودنیـا ، چـونکە دڵ سـەرقاڵ دەکـات لـە بیرکردنـەوەو تـرس ونزیـك بوونـەوەو ناسـینی خـودای گەورەهـەروەها سـەرئەنجامی سـنوور شـکاندنەکانی دەبێتـەهۆی لەدەسـت دانـی دوارۆژ و تـووش بـوون بەسـزای تونـدی خـوای گـەورە. هەرچـەندەمرۆڤ لــەئارەزووەکانی نزیــك بێتـــەوە ئــەوا ئەوەنـــدە لـــەخوای گـــەورە دوور دەکەوێتـەوە، هــەر شـتێکمان جگــە لـە خـودای گـەورە خۆشویسـت توشــی سـزای خـوا دەبـین. وەزۆر بەدەگمەنـە عیشـق لەسـنووری ڕێ پێـدراوی خۆیـدا نامێنێتـــەوە، وەهـــەر کـــاتێ ڕوویـــدا زووش لــەناو دەچـــێت ،هـــەروەکو دەوترێت:"هەموو یاساغ کراوێك پەسەندکراوە."

وەپێشــەوا "ابــن القــیم"شــێوازی نایـابی خــۆی هەیـە لـە توێژینــەوەی کێشـەکان وچارەسـەرکردنیان ، چـونکە شـێوازی ئـەو دوورە لـە ئامۆژگـاری و استقلا ء بـەڵکو وەکـو پزیشـکێکی پسـپۆڕ وهـەوڵێکی هۆشـدەر و شـارەزا بـە نەخۆشــی وچارەســـەرەکان ووتـــەکانی وەك مەڵهـــەمی ســـاڕێژ وایـــە بـــۆ برینـــەکانی دڵ و ڕوح. وە وەڵامـــەکانی لـــەم بـــوارەداو چارەســـەری تـــەواوی وەڵامی پڕوپوختە.

**لەم کتێبەدا ئەم کارانەمان ئەنجام داوە....**

١- ڕێکخسـتنی دەقــی کتێبەکــە، وەدانـانی هەنـدێ ناونیشـان بـۆ هەنـدێ لەبـەش وبڕگـەکان ،وەئـەو زیـاد کردنانـەی ئێمـە نوسـیومانە لـەنێوان ئـەم شـێوازانەدا دامـان نـاوە (..........) وەهـەر ووشـەو دێڕێـك لابرابێـت یـان جـودا بێـت بـەهۆی جیـاوازی چـاپ کردنەکانـەوە ڕاسـتەوخۆ تێبینیمـان داوەو نووسیومانە.

٢- کتێبەکـەمان دابـەش کـردووە بەسـەر پێـنج بەشدا بـۆ زیـاتر ئاسـانکاری بۆ توێژەر وخوێنەر.

٣- دەرهێنانی سەرچەم فەرموودەکان ووتەکان وگێڕانەوەیان بۆ سەرچاوە ڕەسەنەکان لە"قورئان وسونە" دا.
٤- قسە لەسەر کردن وشیکردنەوەی هەندێ لەبڕگەکانی ئەم کتێبەو وەزیاتر ڕوون کردنەوەیان بە نوسراوەکانی تری "ابن القیم" وکەسانی تر.
٥- ڕوون کردنەوەی واتای ووشە نامۆکان.
٦- پێناسەکردنی هەندێ لەوپێڕو کۆمەڵانەی کەلەم کتێبەدا ناویان براوە.
٧- دروست کردنی پێڕستێکی فراوان بۆ بڕگەکان وبابەتەکانی ،تابە ئاسانی خوێنەر بڕگەکانی لەبەر چاوبێت.
٨- هەروەها دانانی چەندین نیشانەی پێویست وەکو ئەستێرەو ژمارە بۆ جیاکاری لەنێوان بڕگەکاندا ، وەهەموو ئەمانە بەرچاوت دەکەوێت خوێنەری بەڕێز لەم چاپەدا.

وە دوا ووتەمان سوپاس کردنی خوای گەورەیە

رضوان جامع رضوان

قاهیرە لە شەوی هەینی ٢٢ ڕەمەزان ١٤٢٢ك. بەرواری ٢٠٠١/١٢/٧

## دەسپێك

### بەناوی خوای گەورە وبەخشندەو میهرەبان
### وەهەر بەئەویش پشت دەبەستین

پرسیان لە پێشەواو زانا وخواناس ورەخنەگر شمس الدین أبو عبدالله محمد کوری صالح أبی بکر، کەناسراوە بە ابن القیم الجوزی) رەزای خوای لەسەر بێت: (زانایان وپێشەوایانی ئاین رەزای خوایان لەسەر بێت چی دەڵێن سەبارەت بەپیاوێك گرفتاری دەردێك هاتبێت ، کەگەر بەردەوام بێت لەسەری دەبێتە مایەی شێواندنی دین ودونیایی؟ هەرچەندە هەوڵ وکۆششی کردووە و چەندین شێوازی بەکارهێناوە بۆ دەربازبوونی بەلأم بێسوود بووەو تابێت زیاتر گەشەی سەندووە. جا چی بکرێت بۆ دەرباز بوون لێی؟

وەچی رێگەیەك بگرێتە بەر بۆ ئاشکراکردنی؟

خوای گەورە رەحم بەکەسێك بکات کەهاوکاری دەردەداران بکات ووەخوای گەورە کۆمەك وهاوکاری کەسێکە تا ئەوکەسە هاوکاری براکەی بکات.

فتوامان بۆ بدەن خوا رحمتان لێ بکات وپاداشتان بداتەوە.

جا پێشەواو زاناو شێخ شمس الدین أبو عبدالله محمد کوری صالح أبی بکر ایوب پێشەوای قوتابخانەی "الجوزیە"وەلأمی دایەوەو فەرمووی:

## پێشەکی دانەر

لە صحیح البخاری دا لەفەرموودەدا أبی هریرە دەگێڕێتەوە ﷺ کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ما أنزل الله داءَ إلا أنزل الله لهُ شیفاءً.[1].. واتە خوای گەورە هەر دەردو نەخۆشیەکی ناردبێت ، چارەسەرەکەشی ناردووە) .

وەلە (صحیح مسلم) دا "جابر بن عبدالله"ﷺ دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (لکل داء دواءٌ، فإذا أصیب دواء الداء برأ بأذن الله) [2]واتە:"بۆ هەموو دەردێك چارەسەر هەیە ، جا هەرکاتێ

---

[1] – ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە ، بخاری گێڕایەتی یەوە لەبابەتی(الطب ) لە بەشی"باب ما أنزل الله داءً إلا أنزل الله شیفاءً "

[2] – ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە، مسلم گێڕاویەتی یەوە لە بابەتی"السلام"لەبەشی"باب لکل داء دواء واستحباب التداوي"بەژمارەی(٦٩/٢٢٠٤).

– پێشەوا نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمێت: "ئەمە ڕوون کردنەوەیەکی ئاشکرایە ، چونکە پێشتر زانراوەکە پزیشکەکان ووتویانە : نەخۆشی واتە دەرچوونی جەستە لەبارودۆخی ئاسایی خۆی وسروشتی خۆی.وەچارەسەرکردنیشی ربریتی یە لەگێڕانەوەی بۆ ئەوبارە سروشتی یە.وەپاراستنی تەندروستی : بریتی یە لەپاراستنی ئەو بارودۆخە وەپاراستنی بەندە بەپوختی وچاکی خۆراکەوە، وەگێڕانەوەی ئەو بارە بەندە بەدۆزینەوەی ئەو دەرمان وچارەسەری کە دژ بە نەخۆشی یەکەیە."

– وە بقراط دەلێت : شتەکان بەدژەکانی چارەسەر دەکرێت.

نەوەوی دەلێت: هەندێ جار پاراستنی نەخۆشی یەکە وجۆری دەرمانەکە نادیار دەبێت ،هەربۆیە متمانە بەدژەکان کەم دەبێتەوە. جالێرەدا بەتەنها پزیشکەکان دەکەونە هەڵەوە.چونکە واگومان دەبەن کە جۆری دەردەکە لەماددەیەکی گەرمە، کەچی بەپێچەوانەوە وادەرناچێت.یان ساردە، یان شێوەیەکی تری جیاوازە یاخود گەرمە. بەلام ئەو ئەندازە گەرمی یە نی یە کەپزیشکەکان گومانیان بۆی چووە، هەربۆیە لەم حالەتەدا چارەسەرو شیفا ڕوونادات. هەروەکو پێغەمبەری خودا بە ﷺ ووتەکەی ئاگەدارمان دەکاتەوە کە دەفەرمێت:"فإذا اصیب دواء الداء بدا بأذن الله"واتە ئەگەر دەرمانەکە ئاوێتەی دەردەکە بوو ئەوا بەیشتی (بەسشیوا(ن)) خودا چاك دەبێتەوە.

دوور نیە لێرەدا بلێین: تۆ فەرمووتە بۆ هەموو دەردێك ونەخۆشی یەك چارەسەر هەیە"لکل داء دواء"کە چی ئێمە زۆرێك لەودەردەدار ونەخۆشەکان دەبینین کە چارەسەریش دەکرێن بەلام چاك نابنەوە؟

فەرمووی: لێرەدا بەهۆی پەی نەبردنە بەڕاستی ودروستی شێوازی چارەسەرکردنەکەیە نەك دەرمان وچارەسەرکە. وەئەمەش ڕوونە والله أعلم.

چارەسەرکە ئاوێتە بوو بە دەردەکە ئەوا بەپشتیوانی خوای گەورە نەخۆشەکە چاك دەبێتەوە".وەلە "مسند" الامام احمد"دا هاتووە کە"أسامه بن شريك"دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا فەرموویەتیﷺ: (إن الله لم ينزل داء الا أنزل له شيفاء ، علمه من علمه، وجهله من جهله) [1] واتە:"خوای گەورە هەر دەردو نەخۆشی یەکی ناردبێت چارەسەر

---

١ه. بەدەست کاری کردنەوە لە "شرح مسلم للنووی :٢٠٣/١٤ چاپی موسسه المختار- قاهیرە."

1 – ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە ، ئیمامی احمد گێڕاویەتی یەوە لە مسند ، وا( ٤٤٣/١ ،٢٧٨/٤) وە" الهیثمي"لە (المجمع)دا هێناویێتی لەفەرموودەی ابن مسعودﷺ (٨٤/٥) دەیداتە پاڵ ئیمام ( احمد وطبراني) وەدەڵێت: پیاوەکانی طبراني متمانە دارن و.اه، وەهەروەها "الحافظ"لە "فتح"دا هێناویێتی (١٤١/١٠) وە دەڵێت: ئەم فەرموودەیە ( ابن حبان وحاكم) بەڕاستیان ناسیوە. وەدەڵێت :ئەوەی لەم وتەیەی تێی بگەین "جهله من جهله.... ئەوەی نەیزانی نایزانێت"ئەوەیە کەلە هەندێ نەخۆشیدا ڕوودەدەن، کاتێك توشی دەردێك دەبێت بەدەرمانێك چاك دەبێتەوە.

وەدانەر لەکتێبی"طب النبوي"دەڵێت: لەم فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە پێویستە بۆ هەرزانست وپیشەیەك پشت بەکەسانی پسپۆڕی ئەو بوارە ببەستین ، چونکە ئەوانە شارەزاترن ونزیکترن لەڕاستی یەکان، هەروەها بۆ کەسانێك کەپیشەی "فتوادانیان هەیە" زیاتر پشت بەکەسانی زاناتر ولێهاتوو تر لەخۆیان ببەستن.

وەدەڵێت : پێڕێك وتیان: سەرجەم لەم هەموو دەردو دەرمانە بەهۆی باریێی بارانەوەیە لەئاسماندا پەیدا دەبێت، چونکە هەربەهۆی بارانەوەیە خواردن ورۆزی یەکان ودەردو دەرمانەکان پەیدا دەبن وەهۆکارەکانی دروست دەبێت.وەهەرچی تۆخم وکانزاکان هەیە هەمووی بەوهۆیەوە لەچیاکاندا ڕووەودۆڵەکان دادەبەزێت وشیو ودۆڵ وبەروبوومەکان دەتەنێت.

وەدەڵێت ئەمە لەتەواوی دانایی وپەروەردگاری گەورەدایە، هەرچۆن بەندەکان گرفتار دەکات بەدەردو نەخۆشی بەوەبەهەمان شێوە ئاسانکارییان بۆ دەکات لە دۆزینەوەی چارەسەرەکەیدا. هەروەکو چۆن گرفتاریان دەکات بەتاوانکاری و ئاسانکارییان بۆدەکات بەتەوبە کردن وئەنجام دانی کرداری چاکە کەدەبێتە مایەی سڕینەوەی تاوانەکان. هەروەها چۆن گرفتاری کردوون بەڕوحە شەڕانی وخراپەکان کە شەیتانەکانە ، بەهەمان شێوە پشتیوانیان دەکات بەسەربازە ڕوحانی یەپاکەکان کە فریشتەکانە. هەروەکو چۆن گرفتاری کردوون بە ئارەزووی سێکسی یەوە، بەهەمان شێوە ئاسانکاری بۆ کردوون لەچۆنییەتی ئەنجامدانیدا.

جا خوای گەورە هەرجۆرە گرفتارێکی ناردبێت ، لەگەڵیشیدا هاوکاری کردوون کەچۆن بەرەنگاری ببنەوە ودەربازیان ببێت،بەڵام لێرەدا تەنها جیاوازی یەکان لەئەندازەی ئەو

وشیفاکەشـــی نـــاردووە، ئـــەوەی زانـــی دەیزانێـــت، وەئـــەوەی نـــەیزانی نایزانێت".

وەلـــە ووتەیـــەکی تـــردا: (إن الله لم يـضع داء الا وضـع لـهُ شـيفاء، أو دواء ،الأداءَ واحـد. قـالوا: يـا رسـول الله مـا هـو؟ قـالﷺ: الهـرم. قـال الترمـذي:هـذا حديث صحيح) ١.

واتــە: (خــوای گــەورە هــەر دەردێکــی دانــابێ، شــیفاو چارەســەرەکەی بــۆ دانــاوە، تــەنها یــەك دەرد نــەبێت. ووتیــان ئــەی پێغەمبــەری خــوداﷺ ئــەوە چی یە؟فەرمووی: پیری یە) .

## دەردو نەخۆشی تووشی دڵ وجەستەو ڕوحیش دەبێت

وەئــەم حاڵەتــە هەریەکــە لــەدڵ وڕوح وجەســتەش دەگرێتــەوە، وەدەبێــت چارەســەریش بکرێــت. وەپێغەمبــەری خــوداﷺ نــەزانینی"الجهـل" بــەدەردو نەخۆشــی پێنــاس کــردووە، وەپرســیارکردنیش لــەزانایان و پــسپۆڕان بــە چارەسەری نەزانین باس کردووە.

أبــو داود دەگێڕێتــەوە لــە (ســننه) کەلــە فــەرمودەی جــابری کــوڕی عبـداللهﷺ دەفــەرمێت: (خرجنـا في سفر ، فأصاب رجـلاً منـا حجـر، فـشجه

---

زانــست وپــەی پــێ بردنەدایــە، کەچــۆن پــەی بــەرن وزانــسق چــۆنیەتی بــەکاهێنانی بەدەســت بخەن وەبەتەنها بەخودا پشت دەبەستین.١-هو "الطب النبوي: ص/٨٨".

1- ئــەم فەرموودەیــە ترمــذی گێڕاوییــەتی یــەوە لــە کتــێبی" الطب "لەبەشــی (بــاب مــا جــاء في الــدواء الحــث عليــه) بــەژمارەی( ٢٠٣٨ ) وە ووتــی: لــەم فەرموودەیــە(حــسن صــحيح)ە،وەهــەروەها (أبـــو داود) لەبەشـــی یەکـــەمی کتـــابي(الطـــب) بــەژمارەی٣٨٥٥هێناویەتی. وە(الألباني)بە ڕاستی داناوە.

وەلە ووتەیەکی تردا ووشەی "الموت" لە بری "الهرم"بەکارهێناوە.

"حــافظ" دەڵێــت: جیاکردنــەوەی مــردن بەتایبــەتی ڕوون ودیــارە، وەدەســت نیــشانکردنی دەردی مەرگ ومـردن، واتـە ئـەودەردو نەخۆشی یـەی کەبـە نەخۆشـی مـەرگ ناودەبرێـت ئـەو کەسـە تیایــدا دەمرێــت. وەدەســت نیــشان کردنــی پــیری- الهــرم کــە لــە گێڕانەوەیــەکی تــری فەرموودەکــەدا هاتووەلــەوە دەچــێت لەبــەر لەیــەك چــوونیان بێــت لەگــەڵ مــردن، چــونکە لەهــەردوو حاڵەتەکــەدا مــرۆڤ تەندروســتی دەشــێوێت، یــاخود لــەنزیك بوونــەوەی مــەرگ لەپیریدا، هەروەها پیری هیچ چارەسەرێکی نی یە.١-هـ ( فتح الباري: ١٤٢/١٠).

في رأسه، ثم أحتلم، فسأل أصحابه فقال: هل تجدون لي رخصته في التيم؟ قالوا: ما نجد لك رخصته،وأنت تقدر على الماء، فأغتسل فمات، فلما قدمنا على النبي ﷺ. أخبر بذالك، فقال: قتلوهُ ، قتلهم الله ألا سألوا أذ لم يعلموا؟ فأنما شيفاء العي السؤال. إنما كان يكفيه ان يتمم ويعصر او يعصب ، على جرحة خرقة ثم يمسح عليها ،ويغسل سائر جسده) [1].

واته: ئێمه بۆ گەشت وسەفەرێك دەرچووین، یەكێكمان سەری كێشای بەبەردێكدا وسەری برینداروو لەت كرد. پاشان ئەوكەسە توشی "أحتلام- لەش پیسی" هات. پرسی لەهاوەڵەكانی ئایا مۆڵەتم بۆ دەبینن كە تەیەمیم بكەم؟ ووتیان: نەخێر تۆ دەتوانیت خۆت بشۆیت، ئەویش خۆی شۆردو پاشان مرد بەهۆی ئاو چوونە نێو سەری یەوە. كاتێك كەچوونە لای پێغەمبەرو باسەكەمان بۆ گێڕایەوە.فەرمووی: كوشتان ،خوا بتان كوژێت.ئایە نەیتوانی پرسیار بكەن كاتێ كەنازانن ، بێ گومان شیفاو چارەسەری دەردی نەزانین پرسیار كردنە.بەڵكو ئەو كەسەیە دەیتوانی تەیەمیم بكات و سەری بپێچێت وسەرجەم جەستەی بشوات.

## قورئان هەمووی چارەسەرو شیفایە بۆ ڕوح وجەستە

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا ڕایگەیاندووە كە قورئان شیفاو چارەسەر. كەدەفەرموێت: (وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا أَعْجَمِيًّا لَقَالُوا لَوْلَا فُصِّلَتْ آيَاتُهُ أَأَعْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاء....فصلت:٤٤) واته:"ئەگەر ئەم قورئانەمان بەزمانی گەلانی تر بناردایە، ئەوا بێ باوەڕان

[1] - ئەم فەرمودەیە"حسن"ە. ابوداود گێڕاویەتی یەوە لە كتێبی(طهارة)لە بەشی (باب المجروح يتمسيم) بەژمارەی( ٣٣٦ ) (ابن الملقن)دەڵێت:پیاوەكانی متمانەن، وە(ابن ابی داود) دەڵێت: ئەمە سونەتێكە تەنها ئەهلی مەكە دەیان كرد.
وەئەم فەرموودەیە (عطاء)لە جابرەوە نەیگێڕاوەتەوە، تەنها "زبرین خریق" كە ئەویش بەهێز نی یە. اه. بەهەمان شێوە "حافظ"یش هەروا دەڵێت لە"التلخيص"ەوە ئەم ووتەیەی داوەتە پاڵ وەچەندین شاهیدی بۆ ئەم فەرموودەیە هێناوەتەوەكە بەهێزی دەكات.
وە"اللبانی"ئەم فەرموودەیە بە "حسن"دادەنێت بەلام بەبێ برگەی (إنما يكفيه...الخ)"صحيح سنين ابی داود"وەبڕوانە ووتەكەی لەسەر"صحيح الأدب"(ص/١٢٣).

دەیان ووت: ئایا نەدەبوو ئایەتەکانی ڕوون وئاشکرابوایە بەزمانی خۆمان بوایە، چۆن دەبێت قورئان بەزمانی بێ گانەبێت؟لە کاتێکدا محمدﷺ بەعەرەبی دەدوێت؟! ئەی پێغەمبەرﷺ پێیان بڵێ ئەم قورئانە بۆئەوانەی باوەڕیان هێناوە هیدایەت وڕنوینی وشیفایە وچارەسەری هەموو دەرد ونەخۆشی یەکان دەکات، جائەوانەی کەباوەڕ ناهێنن گوێچکەیان کەڕەو بەشتی تر ئاخنراوە، هەروەها کوێرن لەئاستیدا، ئەوان هەروەکو لەدوورەوە بانگیان لێ بکرێت وایە 'نەدەنگەکە بەچاکی دەبیستن ونەڕەنگەکە بەڕوونی دەبینن'."

هەروەها دەفەرموێت: (وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ.....الاسراء: ٨٢) واتە:" ئێمە لەقورئان سورەت وئایەتانێك دادەبەزێنین ، کەببێتە هۆی چارەسەرو شیفا بۆ نەخۆشی یە جەستەیی ودەروونی یەکان هەروەها ڕەحمەت ومیهرەبانیشە بۆ ئیمانداران ، بۆ ستەمکاران وخوانەناسانیش تەنها زیادکردنی زەرەوزیان نەبێت هیچی تر نی یە، هیچ بەهرەو سودێکی لێ نابینن."

وەلێرەدا بۆ دەرخستنی ڕەگەزەکەیە "جنس" نەك بۆ چەنداندن "التبعیض" چونکە قورئان هەر هەمووی چارەسەرە هەروەکو لە ئایەتی پێشەکی یەکەدا ڕونی کردۆتەوە. قورئان چارەسەرو شیفایە بۆ دڵەکان لە دەردی نەزانین وگومان، هیچ کاتێك خوای گەورە چارەسەروشیفای بەسوودو پوخت وگونجاوی وەکو قورئان نەناردۆتە خوارەوە.

وەلە "صحیحین"دا هاتووە لە فەرموودەی "ابی سعید"ﷺ ووتی: (انطلق نفر من اصحاب النبي ﷺ في سفرة سافرها ، حتى نزلوا على حي من أحياء العرب فأستضافوهم، فأبوا أن يضيوفوهم فلدغ سيد ذلك الحي، فسعوا لو بكل شيء لاينفعه شيء، فقال بعضهم: لو أتيتم هولاء الرهط الذين نزلوا لعله أن يكون عند بعضهم شيء، فأتوهم، فقالوا: ياأيها الرهط،أن سيدنا لدغ، وسيعنا له بكل شيء لاينفعه شيء، فهل عند أحدكم من شيء؟ فقال بعضهم:نعم والله إني لأرقي، ولكن والله لقد أستضفانكم فلم تضيفونا، فما انا براق لكم، حتى تجعلوا لي

جُعلا،فصالحوهم على قطيع من الغنم،فانطلق يتفل عليه ويقرأ:"الحمد لله رب العالمين"فكأنما نشط من عقال،فانطلق يمشي،ومابه قلبة فأوفوهم جعلهم الذي صالحوهم عليه، فقال بعضهم:اقتسموا. فقال الذي رقى: لانفعل حتى ناتي النبيﷺ فنذكر له الذي كان، فنظر ما يأمرنا.فقدموا على رسول اللهﷺ فذكروا له ذلك فقالﷺ:وما يدريك أنها رقيه؟ثم قال: قد أصبتم أقتسموا واضربوا لي معكم سهما) ١.

واته: پیرێك لەیاوەرانی پێغەمبەری خوادﷺ بەگەشتێك دەرچوون، تالەلای ئاوایەكی عەرەب لایان دا، ویستیان ببنە میوانیان،بەلأم ئاوای یەكە ڕەزامەندییان نەنواند،پاشان سەرۆكی ئەوئاواییە مار پێوەی دا ،زۆر هەولّیان دا بۆیان چارەسەر نەكرا. یەكێكیان ووتی: بابچینە لای ئەو پێرەی كەلەتەنیشت ئاوایەكەمان لایانداوە، بەلّكو شتێكیان پێبێت،پاشان هاتن بۆ لایان،ووتیان:ئەی خەلّكینە سەرگەورەكەمان مار پێوەی داوەو بۆمان چارەسەر ناكرێت،ئایا كەستان چارەسەرێكی لایە، یەكێك لەو پێرە ووتی:بەلّێ بەخودا من روقیە دەكەم،بەلأم والله ی چونكه ئێوەڕازی نەبوون میوانداریمان بكەن منیش بەبێ بەرامبەر كارتان بۆناكەم،پاشان ڕێكەوتن لەسەر برێك لە مەریان بدەنێ وەك بەرامبەر بەوكارە.پاشاەن هەستاو ڕۆیشت لەگەلّیاندا. لەسەر برینەكە تفی كردو"الحمد لله رب العالمین"واتە سورەتی فاتحەی دەخوێند ،ڕاستەوخۆ سەرگەورەكەیان چاك بۆوەودەستی كرد بەڕۆیشتن وەك بلّێ ی زۆر گورج وگۆلأنە كەهیچی نەبووبێ. دواتر ئەوانیش ئەو بڕە مەڕەی لەسەری ڕێكەوتبوون پێیاندا، كەگەڕایەوە ناوبرادەرەكانی،یەكێك ووت: بادابەشی بكەین،بەلأم ئەوكەسەی كەڕوقیەكەی خوێند.ووتی:نەخێر،ئەم ڕووداوە بۆ پێغەمبەر دەگێڕینەوە،تا بزانین فەرمانێك دەدات. كەهاتنە لای پێغەمبەر باسەكەیان بۆگێڕایەوە،پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:چۆن دەزانیت ئەوە ڕوقیەیە؟ پاشان

---

1 – ئەم فەرموودەیە "بخاری "گێراویەتی یەوە لە كتێبی(الاجارة)لەبەشی"باب ما یعطي في الرقیة"بەژمارەی(٢٢٧٦)وەلەچەند شوێنێكی تریش هێناوێتی ، تەماشای شەرحی ئەم فەرموودەیە بكە لە(فتح الباري ٤/٥٣٢-٥٣٥)

ووتـی:"بەڕاستی پێکـات دابەشـی بکـەن،وە وەك خۆتـان بەشـێکش بـۆ مـن دابنێن".

بـەم شـێوەیە ئـەم دەرمانـە کـاری کـردە سـەر ئـەو دەردەو چارەسـەری کـرد هـەروەکو بلـێ ی توشـی هـیچ نـەبووبێ. وەئەمـە ئاسـانترین چارەسـەر ،جائەگـەر خـەڵکی بـزان چارەسـەرکردن بـە"فاتحـە"بکـەن ئەوکاتـە هەسـت بەهێزوکاریگەری یەکەی دەکەن.

وەمـن خـۆم بۆماوەیـەکی زۆر لەشـاری مەککـە بـووم،هەرچـی یـەکم تـووش بهاتایـە بـە سـورەتی"فاتحـە" خـۆم چارەسـەردەکرد.چـونکە هـیچ پزیـشکێکم نـەدەبینی لـەو شـارەدا،تەنانـەت هەرکەسـێکیش توشـی ئـازارێکیش بهاتایـە ڕێنمـایم دەکـرد کـە بـە"فاتحـە" چارەسـەری خـۆی بکـات،کەزۆربـەیان زۆر بەخێرایی چاك دەبوونەوە.[1]

## چەك بەندە لەسەر چەك بەدەستەکە

لێـرەدا کارێـك هەیـە پێویـستە وریـا بـین لێـی، ئـەویش ئەوەیـە کـە ئـەو هـەموو ئایـەت وزیکـرو نزایانـە کـە ڕوقیـەو چارەسـەری پـێ دەکرێـت، خـۆی لـەخودی خۆیـدا چارەسەروشـیفایە.بـەڵام لەهـەمان کاتـدا پێویـستی بـە ورەبـەرزی ومتمانـەی ئـەو کەسـە هەیـە کـە ڕوقیەکـە دەخوێنێـت. هـەروەها پێویـستی بەمتمانـەو ڕەزامەنـدی ودڵنیـابوونی ئـەو کەسـە هەیـە کەنەخۆشـەو ڕوقیەکـەی بـۆ بـەکاردەهێن. جاهـەرکاتێ ئـەم ڕوقیانـە بـەکارهات وچارەسـەرو شـیفایان نـەدا، ئـەوە پێویـستە بگەڕێنـەوە بـۆ خـودی ئەوکەسـانەی کـە بـەم

1- نوسـەر لەسـەرەتای "المدارج"دا دەڵێـت:سـورەتی "فاتحـە"گرنگـی یـەکی تایبـەتی هەیـە کەباشـتر لـە"فاتحـە" خـوای گـەورە نەیهێناوەتـە خـوارەوە لەکتێبەکانیـدا، چـونکە سـەرجەم واتاکـانی قورئـانی تێـدا کۆبووەتـەوە کـە بـەوردی بنـەماکانی نـاو وسـیفاتەکانی خـودای تێـدا باس کراوە. هـەروەها بـاس لـەیەکتاپەرستی وسـەلماندنی قیامـەت وزەلیلـی بەنـدەکان بـۆ خـوای گـەورە. داواکـردن وپاڕانـەوە لـەخودا بەگـەورەترین جـۆری پاڕانـەوە کەبەخـشینی ڕێگـای ڕاسـتە"صـراط المـستقیم"وەبـەردەوام بـوون لەسـەری ، هـەروەها بـاس لـەجۆرەکانی خـەڵك دەکاتلەوانـەی کـە نیعمەتـەکانی بەسـەردا ڕژانـدوون"المنعم علیـە"وەئەوانـەی نـەفرەتیان لـێ کراوەوگومڕابوونە. بۆزانیاری زیاتر بڕوانە(المدارج:١/٢٢ )وە (فتح الباری:١/٢٠٩).

کاره هەستاون، یان ڕێگروبەربەستێکی بەهێز هەیەکە بووەتە مایەی شیفا نەدانیان. هەروەکو ئەم حاڵەتە لەگەڵ دەرمان وچارەسەرەکانیشدا هەیە،کەهەندێ جار سروشتی ئەوکەسە ئەو دەرمانە وەرناگرێتیان لەبەر هەربەربەستێکی تریبێت، بەلاّم ئەگەر ئەو سروشتە ئەودەرمانەی پەسەندوقبوڵ کردئەوا شیفای تەواو وەردەگرێت.

بەهەمان شێوەش بۆ دڵ،ئەگەر ئەوئایەت وڕوقیانەی بەدڵنیایی تەواو قبوڵ کرد، وەلە هەمان کاتدا ئەو کەسەی کەدەیخوێنێت خاوەن دەروونێکی هیمەت بەرز وکاریگەر بێت ئەوا دەبێتە مایەی لەناودانی ئەو دەردو نەخۆشی یە.

## پاڕانەوە و نزا "الدعاء" لەگرنگترین هۆکارەکانی نەهێشتنی مەینەتی یە"المكروه"

بەهەمان شێوە پاڕانەوەو نزا باشترین وگرنگترین هۆکاری نەهێشتنی بەلاّو مەینەتی یە، وەبەدەست خستنی خواستەکانە، بەلاّم لەهەمان کاتدا کاریگەری پاڕانەوە بەندە بەخودی کەسەکەوە،هەندێ پاڕانەوە هەیە جێی خۆی ناگرێت هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك لەوانە: لاوازی دەروونی ئەوکەسە یاخود پەسەند نەبوونی ئەو نزایە لەلای خوای گەورە بەهۆی ئەوەی نزای شەڕ لەخەڵکی دەکات.یان لاوازی دڵ وباوەڕی ئەو کەسەیە، کەبەدڵ ودەرونی تەواو ئەو نزایە ناکات. کە هاوشێوەی تیروکەوانێکی شل وشاو وایە کەلە کاتی تیر هاویشتندا مەبەستی خۆی ناپێکێت. یاخود بەهۆی هەندێ بەربەستی تایبەتی ترەوە کەڕێگرە لە قبوڵ بوون وپەسەند بوونی ئەو نزایە ،لەوانە:خواردنی حەرام، کەڵەکە بوونی تاوان لەسەر دڵ ودەرون، زاڵ بوونی بێ ئاگایی ئارەزوو بازی بەسەریدا ،هەروەکو لە"مستدرك"ی حاکم دا هاتووە لەفەرموودەی"أبی هریرە"ﷺکە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (ادعوا الله وأنتم موقنون بالاجابة واعلموا أن الله لايقبل دعاء من قلب غافل لاه) .

واتـه: بپاڕێنـەوەو داوا لـەخوا بکـەن بەشـێوەیەك کەتـەواو دڵنیـابن لـە وەڵامدانـەوە پەسـەندبوونی، وەبـاش بزانن کـە خـوای گـەورە پاڕانـەوە ونـزای کەسـێك پەسـەند ووەڵام ناداتـەوە کـەدڵ ودەروونـی بـێ ئاگابێـت لـەخوای گەورە.

جـا ئـەم دەرمانـە چارەسـەر لەناوبـەری دەردو نەخۆشـی یـە،بـەڵام بـێ ئاگـایی دڵ ودەرون لـەخوای گـەورە هێـزو کاریگـەری کـەم دەکەنـەوە. هـەروەها خـواردنی حەرامیـشبەهەمان شـێوە لەکاریگـەری نـزا کـەم دەکاتـەوە. هـەروەکو لـە"صـحیح مـسلم"دا هـاتووە لەفـەرموودەی أبـی هـوریرە‌رضي الله عنه ووتـی: پێغەمبـەر دەفـەرمێتﷺ: (ایهـا النـاس ،ان الله طیـب، لایقبـل الا طیبـاً وان الله امـر المـؤمنین بمـا أمـر بـه المرسلین فقـال:یـا أیهـا الرسـل كلـوا مـن الطیبـات واعملـوا صـالحا انـي بمـا تعملـون علـیم: المؤمنـون:٥١. وقـال:"یـا أیهـا الـذین امنـوا كلـوا مـن طیبـات مـا رزقنـاكم:بقـرة:١٧٢" ،ثـم ذكـر الرجـل یطیـل الـسفر اشعث اغـبر، یمـد یدیـه الی الـسماء: یـارب یـارب، مطعمـه حـرام،ومـشربه حـرام وملبـسه حـرام وغذي بالحرام،فانی یستجاب لذلك)[1].

واتـە: ئـەی خەڵکینـە خـوای گـەورە پاکـە ، وەشـتی پـاك وجـوان نـەبێت پەسـەندو قبـوڵی ناکـات، وەخـوای گـەورە فـەرمانی بـەباوەڕداران کـردووە بەهـەمان فـەرمانی پێغەمبـەران کەدەفـەرموێت:ئـەی پێغەمبـەران بخـۆن وبخۆنـەوە لـە نیعمەتـە پـاك وحەڵاڵـەکانی خـوای گـەورە ، وەکـرداری چاکەوچـاکەخوازی ئـەنجام بـدەن،وەمـن ئاگـەدارم بـەوەی کەئـەنجامی دەدەن. هـەروەها دەفـەرموێت: ئـەی بـاوەڕداران بخـۆن لەونیعمەتـە پـاك وحەڵاڵانەی ئێمە پێمان بەخشیون.

---

1 - ئـەم فەرموودەیـە"صـحیح"ە مـسلم گێڕاویەتەوەلـە کتـێبی زەکـات"بـاب قبـول الـصدقة مـن الكـسب الطیـب وترتیبهـا"بـەژمارەی ١٠١٥/٦٥.وەپێـشەوا نـەوەوی دەفـەرموێت:بڕگـەی "چـۆن وەڵام دەدرێتـەوە"واتـە چـۆن وەڵامـی کەسـێك دەدرێتـەوە کـە ئەمـە ئاکـاری بێـت. وەهـەروەها دەڵێـت: ئـەو دەیـەوێت نـزاو پاڕانـەوەکانی قبـوڵ بێـت لـەلای خـوای گـەورە، پێویـستە گرنگـی بـدات بەحـەڵاڵی خـواردن وخواردنـەوەو پۆشـاك وجـل وبـەرگی.(شـرح مسلم: ١٠٤/٧)چاپی دەزگای "المختار– قاهیره".

پاشان هاته سەرباسی پیاوێك كە ڕێگەیەكی دووری بڕیوەو جل وبەگی وقژ وڕوخساری شێواوەو دەستەكانی بۆ ئاسمان بەرز دەكاتەوە ودەڵێت: ئەی پەروەردگار ئەی پەروەردگار ، لەكاتێكدا خواردن وخواردنەوەو جل وبەرگ وپۆشاكی هەرهەمووی حەرامە، وەبەحەرامیش پەروەردەكراوە جا چۆن وەڵامی كەسێكی وادەدرێتەوە.

وە"عبدالله كوڕی پێشەوا أحمد"لە كیتابی (الزهد) دا لەباوكی یەوە دەگێڕێتەوە، كەبەنی ئیسرائیل توشی بەلایەك هاتن، ئەوانیش لەشاردەرچوونە دەروە بۆ پاڕانەوەو نزاكردن ، خوای گەورەش وەحی بۆناردن وپێی ڕاگەیاندن كە:ئێوە دەرچوونە بەرەو "الصعید" بەجەستەی پیسەوە وەدەستانێك بەرزدەكەنەوە بۆ پاڕانەوە كەسوورن لەخوێن ڕێژیدا، وەماڵەكانتان پڕكردووە لەشت ومەكی حەرام،لێرەدا من تووڕەیی خۆم بەسەرتاندا توند دەكەم، وەجگە لەدووری لەمنەوە هیچی تر وەدەست ناخەن.[1]

وە"أبو ذر"ﷺ دەڵێت: خواردن چەند پێویستی بەخوێ هەیە ، ئەوەندەش نزا پێویستی بە چاكە هەیە.

---

[1] – الزهد للأمام احمد ـل٦٩

## پاڕانەوەونزا لە چاکترین دەرمان وچارەسەرەکانە

نــزاو پاڕانــەوە لەباشــترین دەرمانەکانــە کــە دژی بەلاَیــە،ڕووبــەڕووی دەبێتــەوە وچارەسـەری دەکـات وڕێگـری دەکـات لەدابـەزینی و وەسـوکی دەکاتـەوە کەدابـەزێت، وەهـەروەها چـەکی بڕواداڕانـە. هـەروەکو "حـاکم "لـە صـحیحەکەیدا لــە فــەرموودەی علــی کــوڕی ئــەبی طالــب رضي الله عنه دەفــەرمێت: (الـدعاء سـلاح المـؤمن، وعمـاد الـدين ،ونورالـسموات والارض) . واتــە: نـزاو پاڕانەوە چەکی بڕوادارانە وکۆڵەکەی ئاینەو ڕووناکی زەوی وئاسمانەکانە.[1]

## حاڵی نزاو پاڕانەوە لەگەڵ بلاَدا

نزاو پاڕانەوە لەبەرامبەر بەلاَدا لە سێ حاڵەتدایە:

یەکەم: لەبەلاَکە بەهێز ترەو دووری دەخاتەوە.

دووەم: بەلاَکــە بــەهێزترەو زاڵ دەبێــت بەســەریدا وبەلاَکــە توشــی کەســەکە دەبێــت، هەرچــەندە نزاوپاڕانەوەکــە لاواز بێــت ،بــەلاَم بەلاَکــە ســوک دەکاتەوە.

سـێ یـەم: یـاخود ڕووبـەڕووی یـەکتر دەوەسـتنەوە وهەریەکـەیان ڕێگـری ئەویتریان دەکات لەگەیشتنی بەشوێنی مەبەست.[2]

---

1 – ئـەم فەرموودەیـە لاوازە"ضـعیف الأسـناد"حـاکم گێراویـەتی یـەوە(١/٤٩٢). تەماشـای (السلسلة الـضعیفة)ی "الألبـاني"بکـە١٧٩. هـەروەها(الكامـل في الـضعفاء)ی"ابـن عـدی ٦/٢١٨١"بکە. هەروەها بڕوانە(مجمع الزوائد: ١٠/١٤٧).

2 – ئەمـە سـەبارەت بـە نـزاو پاڕانـەوە لـە نەهێشتنی بـەلاَدا،بـەلاَم سـەبارەت بەنزاوپاڕانـەوەی خـودی موسـوڵمانان ، سـێ حاڵـەتی هەیـە: "حـافظ" پـاش هێنانـەوەی چـەندین فـەرموودە لەسەرئەوەی کەنزاوپاڕانەوەی بڕوادار ڕەت ناکرێتەوە ،بەم شێوازە:

١. یان وەلاَم دانەوەی بۆ کاتێکی تر دوادەخرێت.

٢. یاخود بەلاَیەکی پێ لەناو دەبرێت.

٣. یاخود وەلاَمدانەوەکەی بۆ قیامەت هەڵدەگیرێت وەك پاداشت کەئەمە باشترینیانە.

هەروەها "حافظ"دەڵێـت: ئەمـە بۆچـوونی (داودی ابـن جـوزی ) دەڵێـت:جگـە لـەمانـەش پێویـستە بـاوەڕدار دەسـت بـەرداری پاڕانـەوە نـەبێت چـونکە بەشـێکە لـە پەرسـتن. اه.(فـتح البـاری ١١/١٤٥)بەدەستکاری یەوە.

هـەروەها "حـاکم"لـە صـەحیحەکەیدا دەگێڕێتـەوە لـە فـەرموودەی خـاتو عائیـشەﷺ کـە پێغەمبـەری خـودا دەفـەرمێت: (لایغـني حـذر مـن قـدر، والـدعاء ینفـع ممـا نـزل وممـا لم ینـزل، وان الـبلاء لینـزل فیلقـاه الـدعاء فیعتلجان الی یوم القیامة) ١.

واتـــە: وریـــایی و خۆپاراســـتن هـــیچ بایـــەخی نـــی یـــە لەقـــەدەردا،وەنزاوپاڕانـــەوە کاریگـــەری وســـوودی هەیـــە بـــۆ ئـــەو شـتانەی"قەدەرانـەی" کـە دابـەزیون یـاخود دانەبـەزیون، وەبـەلاَ دادەبـەزێت بەلاَم نزاوپاڕانەوە پێشی دەگرێت تا ڕۆژی قیامەت کێبڕکێ دەکەن.

هـەروەها فـەرموودەی"ابـن عمـر"ﷺ کـە پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (الـدعاء ینمـع ممـا نـزل وممـا لم ینـزل ، فعلـیکم عبـادالله بالـدعاء) .واتـە: نزاوپاڕانـەوە کاریگـەرو بەسـوودە بـۆ ئەوشـتانەی هاتبێتـە خـوارەوە ، یـان ئەوانەشی نەهاتبێتە خوارەوە، جا بەندەکانی خوا نزاوپاڕانەوەبکەن.

هـەروەها فـەرموودەی "ثوبـان"ﷺ کـە پێغەمبـەرﷺفەرموویـەتی: (لا یـرد القـدر الا الـدعاء، ولایزیـد في العمـر الا الـبر، وان الرجـل لیحـرم الـرزق بالـسنین یـصیبه) .[2]واتـە: هـیچ شـتێك قـەدەر ناگێڕێتـەوە تـەنها نزاوپاڕانـەوە نـەبێت، وەهـیچ شـتێکیش تەمـەن درێـژ ناکـات تـەنها چـاکەکردن نـەبێت، وەمرۆڤ بەهۆی تاوانەوە لەڕزق وڕۆزی بێ بەش دەبێت.

## سـووربوون وتکـاکردن لـە نـزاو پاڕانـەوە یەکێکـە لەمەرجـەکانی نزاوپاڕانەوە

سـووربوون لەنزاوپاڕانـەوەدا باشـترین جـۆری دەرمانـە. و"ابـن ماجـە"لـە (سـننه) کەیـدا دەگێڕێتـەوە لـە (أبـی هریـره) ﷺ کەپێغەمبـەرﷺ

1 – ئـەم فەرموودەیـە "ضـعیف"ە لـەڕووی سـەنەدەوە، حـاکم گێڕایـەتی یـەوە(٤٩٢/١) وەدەڵێت سەنەدی صحیحە بڕوانە "الجمع ١٤٦/١٠"

2– ئـەم فەرموودەیـە"حـسن"ە بـەم شـێوەیە گێڕراوەتـەوە(حـاکم –٤٩٣/١)وە(امـام احمـد ٢٨٢،٢٨٠،٢٧٧/٥ ) وەابن ماجە والبانی دەڵێن:حسنه (السلسله الصحیحه/١٥٤)

دەفەرمێت: (من لم یسأل الله یغضب علیه) .[1] واتە: هەرکەسێك لەخوای گەورە نەپاڕێتەوە خودا لێی تورە دەبێت.

وەلە "صحیح الحاکم"دا هاتووە لەفەرموودەی "أنس"ﷺ کە پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرمێت: (لاتعجزوا في الدعاء، فإنه لایهلك مع الدعاء أحد) .[2] واتە:دەسەوەسان نەبن لەنزاکردندا، چونکە هیچ کەسێك لەگەڵ نزاکردندا تیاناچێت.

وەلە (الاوزاعی) لە (الزهری) لە (عروة) لە (عائیشە) دەگێڕێتەوە، کەپێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ان الله یحب الملحین في الدعاء) واتە: خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کەزۆر تکا دەکەن وسوورن لەسەری.

وەپێشەوا (امام احمد) لە کتێبی"الزهد"دا لە سەرزاری (قتادە) دەگێڕێتەوە کە (مورق) وتوویەتی: من پێم وایە تاکە نمونەیەك بشێت بۆدەرخستنی حاڵ بڕواداران ئەو نمونەیە کە مرۆڤی باوەڕدار لەناودەریایەك دایە لەسەر پارچەتەختەیەك،هەر هاواردەکات ودەپاڕێتەوە –خودا، خوایە.بەڵکو ڕزگاری بکات.[3]

## خێراو پەلەنەکردن لەوەڵامدانەوەی نزاوپاڕانەوە

یەکێك لە بەڵاکانی نەمانی کاریگەری پاڕانەوە لەسەر بەندەکان، بریتی یە لەوەی کە دەیەوێت زۆر بەخێرایی وەڵامی بدرێتەوە. کە وەڵامدانەوەکە دوا دەکەوێت ، چیتر دەست بەرداری پاڕانەوە دەبێت. نمونەی ئەمە وەك کەسێك وایە کە نەمامێك یان درختێك دەڕوێنێت بەردەوام ئاوی دەدات، کەکاتێك دەبینێت گەشەکردنی تۆزێك سستە ،وازی لێ دێنێت. وەلە صحیح البخاری ئەم فەرموودەیەی هێناوەتەوە کە پێغەمبەر

---

1 – ئەم فەرموودەیە حسنە ابن ماجە بەژمارەی(٣٨٢٨) وە(امام احمد ٢/٤٤٣– ٤٧٧) وە (حاکم ١/٤٩١ ) و (ترمذي) بەصحیح ناوی بردووە وە(ألبانی)بە حسن ناوی بردووە. بڕوانە (الصحیحە /٢٦٥٤).

2 – ئەم فەرموودەیە "ضعیف الاسنادە"ئەمانە گێڕایانەتوە:( حاکم ١/٤٩٤ ) وە ( ابن حبان ٢٣٩٨) وە ( ابن عدی ) لە کامل في الضعفاء ١٣/٥ هێناویتی.

3 –(الزهد لأمام احمد ص٣٠٥)

ﷺدەفەرمێت: (یستجاب لأحدکم ما لم یعجل ،یقول دعوت فلم یستجیب لي)[1]

واتە: خوای گەورە وەلامی نزاوپاڕانەوەکانتان دەداتەوەوقبوڵی دەکات.تەنها لەوکاتانەدا نەبێت کە پەلە بکات لەوەلامدانەوەی وبلێیت پاڕامەوە لەخوای گەورە بەلام وەلامی نەدامەوە.

وەلە (صحیح مسلم) دا ئەم فەرموودەیەی هێناوەتەوە کە پێغەمبەرﷺدەفەرمێت: (لایزال یستجاب للعبد مالم یدع بإثم أو قطیعة رحم، مالم یستعجل ، قیل یا رسول الله ما الاستعجال؟قال: یقول: قد دعوت وقد دعوت ،فلم أر یستجب لي، فیستحسر عند ذلك ویدع الدعاء)[2]. واتە: بەردەوام خوای گەورە وەلامی پاڕانەوکانی بەندەکەی دەداتەوەو قبوڵی دەکات، بەمەرجێك دوعای شەڕو خراپەو پەیوەندی پچڕین نەکات وەهەروەها پەلە نەکات. ووتیان ئەی پێغەمبەری خودا:پەلەکردن چی یە؟ فەرمووی: بلێت ئەوەندە پاڕامەوە ،بەلام نەمبینی وەلامم بدرێتەوە، ئیتر دەست بەرداری پاڕانەوە دەبێت و وازی لێ دێنێت.

وە لە"مسند"ی پێشەوا"احمد"دا هاتووە لەفەرموودەی "أنس"ﷺ کە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (لایزال العبد بخیر مالم یستعجل ، قالوا یارسول الله کیف یستعجل؟ قالﷺ:یقول: قد دعوت ربي فلم یستجیب لي)[3]. واتە: بەردەوام بەندە چاکەو لەخێردایە تا پەلە نەکات. ووتیان ئەی پێغەمبەری خودا ،پەلە کردن چی یە؟ پێغەمبەریش فەرمووی: بلێت: لە خوای گەورە پاڕامەوە کەچی وەلامی نەدامەوەو قبوڵی نەکرد.

---

1 -(بخاری)لە کتابی"الدعوات"بەژمارەی(٦٣٤٠) وە (مسلم) لە کتێبی (الذکر والدعاء) بەژمارەی (٢٧٣٥/٩٠)گێڕایانەتەوە.

2 - (مسلم) بەژمارەی(١٧/٥٥-نووی)گێڕایەتی یەوە: وەواتای یستحسر واتە دەست لەپاڕانەوە هەڵدەگرێت،بڕوانە سورەتی(الانبیاء:١٩)وە ئەوەوی دەڵێت پێویستە دەست لەدوعا هەڵنەگرین وقەلەی قبول بوونمان نەبێت(شرح مسلم:١٧/٥٥).

3 - ئەم فەرموودەیە(ضعیف الأسناد وهو صحیح لغیره)،(احمد: ٣/١٩٣،٢١٠) (الهیثمي، المجمع: ١٠/١٤٧).

## بەدڵ پاڕانەوەو مەرجەکانی تری پاڕانەوە

جا ئەگەر لەگەڵ پاڕانەوەدا ئەم شتانە یەك بگرێت:

١. "بەدڵ پاڕانەوە"واتە ئامادە بوونی دڵ بەشێوەیەکی دروست لەپاڕانەوەدا.

٢. لە کاتە شیاوەکاندا بێت کەتیایدا پاڕانەوە قبوڵ دەکرێت کە شەش کاتە کەبریتین لە (سێ یەکی شەو ، پێش نوێژی بەیانی، لەکاتی بانگ وقامەت کردندا، وەپێش نوێژە فەرزەکان، لەکاتی سەرکەوتنی ووتاربێژ بۆ میمبەر لەڕۆژی هەینیدا تاکاتی تەواو بوونی نوێژ لەو ڕۆژەدا، وەدواکات لە پاش عەسردا) .

٣. بوونی خشوع و زەلیلی لەدڵ و خۆ بەبچوك زانین و ملکەچانە لەبەردەست خوای مەزندا.

٤. ڕوو کردنە ڕوگە"قیبلە".

٥. پاك وخاوێن بێت"دەست بەدەست نوێژ بێت".

٦. وەبەرزکردنەوەی دەستەکان.

٧. وەسەرەتای دەست پێکی بەسوپاس کردنی خوابێت.

٨. پاشان سلاوات دان لەسەرگیانی پاکی پێغەمبەرﷺ.

٩. پاشان داواکردنی لێ خۆشبوون وگەڕانەوە بۆ لای.

١٠. پاشان بێتە سەرداواکردنی مەبەستەکەی.

١١. پاڕانەوە بە تەوەسل کردن بەناووسیفاتە جوانەکان و تاك وتەنهایی خوای گەورە.

١٢. پاشتر بڕیاری صدقە وخێرێك بدە، ئەنجامی بدە.

جا ئەم پاڕانەوەیە لەوەناچێت ڕەد بکرێتەوە، بەتایبەتی گەر بێتوو لەو پاڕانەوانە بێت کە پێغەمبەری خوداﷺ هەواڵی داوە کەقبوڵ دەبێت، کەناوی مەزنی خودای گەورەی لەخۆگرتووە.

## ئەو نزاوپاڕانەوانەی کەناوی مەزنی خودای تێدایە

لەوانە ئەوەی کەلە (سنن وصحیح) ی "ابن حبان"هاتووە لەفەرموودەی "عبدالله بن بریدە"کە لەباوکی یەوە دەیگێڕێتەوە کە

پێغەمبەری خودا گوێی لەپیاوێك بوو دەیووت: (اللهم أني أسألك باني أشهد أنك أنت الله لا اله الا انت ، الاحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفواً أحد، فقال ﷺ: "لقد سأل الله بأسم الذي اذا سئل به اعطى واذا دعي به أجاب"، وفي لفظ:لقد سألت الله بأسمه الأعظم) .[1]

واتە: (ئەی خودایە من لێت دەپاڕێمەوە وشایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نی یە بەحەق وشایەنی پەرستن بێت تەنها تۆ جێی نەبێت، تەنها تۆ ڕازو نیازی ، کەنە لەدایك بوویتەو نەکەسیشت لێ لەدایك ئەبێت، وەبەتاك وتەنهاو بێ هاوەڵیت. پێغەمبەرﷺ فەرمووی:بەڕاستی بەناوی مەزنی گەورەی خودا پاڕایەوە کەئەگەر پێی بپاڕێتەوە ، وەڵامت دەداتەوەو داوای هەرشتێکی لێ بکەیت بۆت جێ بەجێ دەکات) .

وەلە"سنن"و"صحيح ابن حبان"دا هاتووە لەفەرموودەی "أنس بن مالك" ﷺکە پێغەمبەری خوداﷺ دانیشتبوو وەپیاوێك نوێژی دەکردو ووتی: (اللهم اني اسألك بان لك الحمد، لا إله إلا أنت المنان وبديع السموات والارض، ياذا الجلال والاكرام، ياحي ويا قيوم، فقال النبيﷺ:"لقد دعاء الله باسمه العظيم، الذي اذا دعي به أجاب، واذا سئل به اعطى") .[2]

واتە: خودایە لێت دەپاڕێمەوەدەشزانم کەبە تەنها شایەنی سوپاس وستایشیت وەهیچ خودایەك نی یە بەحەق شایەنی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت، کەبەدیهێنەری ئاسمانەکان وزەویت، ئەی خاوەن شکۆو ڕێز ، ئەی هەمیشە زیندووڕاوەستاو.پێغەمبەرﷺفەرمووی: "بەڕاستی بەناوی مەزنی خودا پاڕایتەوە، کەئەگەر پێی بپاڕێیتەوە وەڵامت دەداتەوە، چی لێ داوا بکەیت جێ بەجێی دەکات".

---

[1] – ئەم فەرموودەیە "حسن"ە ابن حبان لە "صحيحه/٢٣٨٣"وە"الامام احمد"لە "مسند، ٣٠٦٠/٥" وە "الترمذي ٣٤٧٥"و(ابو داود ١٤٩٣)وصحيحه الالباني.

[2] – ئەم فەرموودەیە"حسن"ە (الامام احمد ١٥٨/٣)و (ابن حبان ٢٣٨٢)و(حاكم ٥٠٣/١-٥٠٤ وصحيحه)گێڕاویانەتەوە وە(البانی)بە صحيحی لەقەڵەم دەدا(التوسل ص/٣٤).

هەروەها فەرموودەکە پێشەوا"امام احمد"دەریهێناوە وەلە "جامع الترمذي"لە فەرموودەی"اسماء بن يزيد"ﷺ کەپێغەمبەر فەرموویەتیﷺ: (اسم الله الأعظم في هاتين الآتين "وإلهكم إله واحد لا إله إلا هو الرحمن الرحيم...بقرة:١٦٣" وفاتحة أل عمران"ألم ٭ الله لا إله إلا هو الحي القيوم".)[1] وە ترمذي دەڵێت ئەم فەرموودەیە صحیح) ە.
واتە: ناوی مەزنی خودای گەورە لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدایە: سورەتی بقرە:١٦٣..واتە"پەروەردگاری ئێوە خودایەکی تاك وتەنهایە، هیچ خودایەك نی یە تەنها ئەو نەبێت کەبەخشندەو میهرەبانە". وەسەرەتای سورەتی أل عمران کە واتاکەی:"الم * الله خودایەو هیچ خودایەك نی یە تەنها ئەو نەبێت کەهەمیشە زیندو وراوەستاوە".
هەروەها لە (مسند) ی امام احمد و لە (صحیح حاك) مدا هاتووە لە فەرموودەی "ابو هوریرە"و"انس بن مالك"و"ربیعە بن عامر"ﷺ کە پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: (الظوا بيا ذا الجلال والأكرام)[2]واتە: دەستی پێوە بگرن بەردەوام بن لەسەری وخۆتانی پێوە هەڵواسن بەخاوەنی ڕێز وشکۆمەندی یەوە. واتە خۆتان هەڵبواسن ودەست بگرن بەخاوەنی ڕێز وشکۆمەندەوە.
وەلە "جامع الترمذي"دا هاتووە لەفەرموودەی (ابی هريرة) ﷺدەفەرمێت: (ان النبيﷺ اذا اهمه امر رفع راسه الى السماء ، واذا أجتهد في الدعاء قال:ياحي يا قيوم) .[3] واتە: ئەگەر هەرکارێك بەلایپێغەمبەرەوە گرنگ بوایەسەری بەرز دەکردەوەبۆ ئاسمان ، وەئەگەر قوڵ ببوایەتەوە لە پاڕانەوەدا دەیفەرموو: یاحی یاقیوم.

---

[1] – ئەم فەرموودەیە"حسنە" (ترمذي ٣٤٧٨)و (ابو داود ١٤٩٦) و(امام احمد ٤١٦/٦)گێڕاویانەتەوە.
[2] – ئەم فەرموودەیە"حسن لغيره"(امام احمد ١٧٧/٤)و(حاكم٤٩٨/١)و(الترمذي ٥٣٩/٥:
[3] – ئەم فەرمودەیە"حسن"ە (ترمذي)گێڕاویەتی یەوە بەژمارەی(٣٤٣٦).

هـەروەها لەهـەمان سەرچـاوەی پێـشوودا هـاتووە لەفـەرموودەی"انـس بـن مالـك"ﷺ دەڵێـت: (اذا كـان الـنبيﷺ اذا حزبـه امـر، قـال:يـا حـي يـاقيوم برحمتـك اسـتغيث)[1] واتــە: ئەگــەر كارێــك پێغەمبــەری ســەرقاڵ بكردايــە "حزبـە"دەيفـەرموو: (يـا حـي يـاقيوم برحمتـك اسـتغيث) واتـە: ئـەی خـودای هەميشە زيندوو ڕاوەستاو من پەنا بۆ ڕەحمەتت دەبەم.

وەدەڵێــت:لــە"صــحيح الحــاكم"دا هــاتووە لــە فــەرموودەی "أبــى أمامــە"ﷺ كــە پێغەمبــەر فەرموويــەتیﷺ: (اســم الله الأعظــم في ثــلاث ســورة القــران: البقــرة، وآل عمــران، وطــه)[2]. واتــە: نــاوی مــەزنی خــودای گەورە لە سێ سورەتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە: بقرە،آل عمران، طە.

قاسم دەڵێت:پشكنيم بۆم ڕوون بووەوە كە ئايەتی (الحی القيوم) ە.

وەلــە (جــامع الترمــذي) و (صــحيح الحــاكم) دا هــاتووە لەفــەرموودەی (ســعد بــن أبــى وقــاص) ﷺ كــە پێغەمبــەر ﷺفەرموويــەتی: (دعــوة ذي النـون، اذا دعـا وهـو في بطـن الحـوت: ان لاإلـه الا أنـت سبحانك انـي كنـت مـن الظـالمين: الأنبيـاء:٨٧. إنـه لم يـدع بهـا مـسلم في شـيء قـط الا اسـتجاب الله لـه)[3]. واتـە: نـزاو پاڕانەوەكـەی"ذی النـون–واتـە يونـسی پێغەمبـەر"كەلـەناو ســكی نەهەنگەكــەدا پاڕايــەوە فــەرمووی: ان لا الــه الا انــت ســبحانك انــي كنـت مـن الظـالمين... واتـە: هـيچ خـوداو پەرسـتراوێك نـی يـە بەڕاسـت ،تـەنها تـۆ نـەبێت، پـاك وبـێ گـەردی بـۆ تـۆ، مـن يـەكێك بـووم لەستەمكاران. جـا هـەر موســوڵمانێك بــەم نزايــە بپاڕێتــەوەخوای گــەورە قبــوڵی دەكــات و وەڵامــی دەداتەوە.

---

[1] – ئــەم فەرموودەيــە"حــسن"ە ،(ترمــذي:٣٥٢٤)وە(حــاكم–١/٥٠٩) گێڕاويانەتــەوە وە(الالـبانى)بە حسن ی داناوە (التوسل:ص٣٤).

[2] – ئــەم فەرموودەيــە"حــسن"ە، (حــاكم –١/٥٠٥)گێڕاويــەتی يــەوە(السلــسله الصحيحه/٧٤٦).

[3] – ئــەم فەرموودەيــە صحــسحه، (ترمــذي /٣٥٠٥)و(الحــاكم:٣٨٢/٢)و( امــام احمــد ١/١٧٠)و(البهيقى ١/٣٥٥)ڕيوايەتيان كردووە.

وەلـە"مـستدرك الحـاكم"دا هـاتووە لـە فـەرموودەی (سـعد) ﷺ كـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێت: (الا اخـبركم بـشيء اذا نـزل برجـل مـنكم أمـر مهـم فـدعا بـه يفـرج الله عنـه؟ دعـاء ذي النـون)[1]. واتـە: ئايـا شـتێكتان پـێ بڵـێم ئەگـەر پياوێك لـەئێوە توشـی شـتێك هـات بـەوە نـزا بكـات خـوای گـەورە دەرگای لێ دەكاتەوە ورزگاری دەكات؟ ئەويش نزای يونسی پێغەمبەرە.

هــەروەها لــە"صـحيح حــاكم"دا هــاتووە كــە هــەر"سـعد"گـوێی لــە پێغەمبـەری خـودا بـووە فەرموويـەتی: (هـل أدلكـم علـى أسـم الله الأعظـم؟ دعــاء ليــونس. قــال رجــل: يارســول الله ، هــل كانــت يــونس خاصـة؟فقال ﷺ:الم تـسمع قولـه تعـالى: فأسـتجبنا لـه...الأنبيـاء:٨٨.. فأيهـا مـسلم دعـا بهـا في مرضـه اربعـين مـرة فمـات في مرضـة ذلـك اعطـي أجـر شـهيد، وان بـرىء بـريء معفـورا لـه)[2] واتــە: ئايــا نــاوی مــەزنی خـوای گــەورەتان پــێ بڵـێم؟ كــەبريتی يــە لــە نـزای يـونس. پياوێـك ووتــی: ئــەی پێغەمبــەری خــودا ئــەم نزايــە تايبــەت نــەبووە بەحــەزرەتی يونــسەوە؟ پێغەمبــەری خــودا ﷺ دەفــەرمێت:ئايــا ئــەم ئايەتــەی خــوای گــەورەت نەبيـستووە كەدەفــەرمووێت: ئێمــە وەلأمــی ئــەومان دايــەوە...... هــەر موسـوڵمانێك لـەكاتی نەخۆشـيدا چـل جـار بيخوێنێـت جائەگـەر بمرێـت ئـەوە پلـەی شـەهيدی هەيـە، وەئەگـەر چـاك بـۆوە ئـەوا خـوای گـەورە لێـی خـۆش دەبێت.

وەلــە"صـحيحين"دا هــاتووە لەفـەرموودەی "ابـن عبـاس"ﷺكەلـەكاتی ناخۆشـی وقەيرانــدا پێغەمبــەری خــودا دەيفــەرموو: (لا الــه الا الله العظـيم الحلـيم، لاالــه الا الله رب العـرش العظـيم، لا الـه الا الله رب الـسموات الـسبع ورب الارض ورب العـرش الكـريم)[3]. واتــە: هــيچ پەرسـتراوێك نييــە بەحــەق

---

[1] – ئەم فەرموودەيە صەحيح(حاكم )گێراويەتی يەوە(١/٥٠٥)
[2] – ئــەم فەرموودەيــە"حــسن"ە ، (حــاكم ١/٥٠١)بەســەنەدێكی لاواز گێــڕاو يــەتی يــەوە، هەروەها (حافظ)لە(فتح ١١/١٥١)وە بێ دەنگ بووە لەسەری.
[3] –ئــەم فەرموودەيــە صــەحيحە،(بخـاری ٦٣٤٥)و(مـسلم ٨٣/٢٧٣٠). نــەوەوی دەڵێــت: پێويستە ئەم فەرموودە نايابە لەكاتی قەيرانەكاندا بوترێت.

تـەنها الله نـەبێت کەمـەزن وبەسۆزە، هـیچ پەرسـتراوێك نیـە بەحـەق تـەنها الله نـەبێت، کـەخاوەنی عـەرش- کۆشـکی مەزنـە، هـیچ پەرسـتراوێك نـی یـە بەحـەق تـەنها الله نـەبێت کەپـەروەردگاری هـەر حـەوت ئاسمانـەکان وەزەوی یە وخاوەنی عەرشی بەرزو مەزنە.

وەلـە "مـسند"ی امـام أحمـد دا هـاتووە لـە فـەرموودەی (علـي بـن ابـي طالـب) ﷺ کەفەرموویـەتی: (پێغەمبـەری خـودا فێـری کـردووم ئەگـەر کێـشەوقەیرانێك رووی تێکـردم بلـێم: لا الـه إلا الله الحلـيم الكـريم، سـبحان الله تبـارك الله رب العـرش العظـيم، والحمـد لله رب العـالمين)[1]. واتـە: هـیچ پەرسـتراوێك نییـە بەحـەق تـەنها الله نـەبێت کەهەمیشە بەسـۆزو بـەڕێزە، پـاك وبێگـەردی بـۆ خـوای گـەورەوتبارك خـاوەنی عەرشـی-کۆشـکی مـەزن، سوپاس وستایش بۆ پەروەردگاری جیهان.

وەهـەروەها لـە"مـسند" دا هاتووەلەفـەرموودەی (عبـدالله بـن مـسعود) ﷺ کەپێغەمبـەری خـوداﷺ فەرموویـەتی: (مـا اصـاب احـداً قـط هـم ولاحـزن فقـال: "اللـهم أنـي عبـدك وابـن عبـدك ابـن أمتـك ،ناصـيتي بيـدك،مـاض في حكمـك، عـدل في قـضاؤك،اسـألك اللـهم بكـل أسـم هـو لـك، سميـت بـه نفـسك ، او علمتـه أحـد مـن خلقـك،أو أنزلتـه في كتابـك، او اسـتأثرت بـه في علـم الغيـب عنـدك، ان تجعـل القـرآن العظـيم ربيـع قلبي، ونـور صـدري، وجـلاء حزنـي،وذهـاب همـي الا ذهـب الله عزوجـل همـه وحزنـه،وابدلـه مكانـه فرحـا"،فقيـل يـا رسـول الله ،الا نتعلمهـا ؟

---

وە(طـبری) دەڵێـت: سـەلەفی سـاڵح هەمیـشە دەیـان خوێنـد ، بـەدوعای کـرب- ناسـراوە، جائەگەر کەسێك بڵێت : ئەمە یادو زیکرە نەك نزا. ئەوا وەڵامەکەی بەم شێوەیەیە:

یەکـەم: بـەم یـادو زیکـرە سـەرەتای نزاکـەت دەسـت پـێ بکـە، پاشـان باسـی خواسـتەکەی خۆت بکە.

دووەم: وەڵامـی (سـفیان بـن عیینـە) کـە ووتـی ئایـا نـەتان بیـستووە کـە خـوای گـەورە لەفەرموودەی قودسیدا فەرموویـەتی: (مـن شـغع ذكـرى، مـن مـسألتي أعطيتـه افـضل مـا أعطـى الـسائلين.)واتـە: هەرکەسـێ یـادی مـن سـەرقاڵی بکـات وەنەپەرژێتـە سـەر نزاوپاڕانـەوە لـێم، ئەوا من بەشی دەدەم لەو بەشەی کە بەباشترین نزاکەرانی دەبەخشم.

[1] – ئـەم فەرموودەیـە"حـسن"ە ،(امـام احمـد ١/٩١-٩٤)و (حـاکم ١/٥٠٨)گێڕاویانەتـەوە ، ووتی ڕاستە لەسەر مەرجی"مسلم".

قال ﷺ:بلى ينبغي لمن سمعها ان يتعلمها) [1]. واته: هەرکەسێك توشی ناخۆشی وخەفەتێك هات بڵێت: خوایە گیان ،من بەندەی تۆم، کوڕی بەندەی تۆ وکوڕی دایکێکم کەبەندەی تۆیە، چارەنوسی من بەدەستی میهرەبانی تۆیە، بڕیاری تۆ بەسەرمندا بەجێ یە، دادپەروەری تۆ لەبڕیارەکانتدا کەبەسەرمندا جێ بەجێ وڕەوایە، خوایە گیان لێت دەپاڕێمەوە وبنزادەکەم بەهەرهەموو ناوەجوانەکانت کەلەخۆت ناوە، یاخود فێری یەکێك لەدروست کراوەکانت کردووە، یان لەقورئانی پیرۆزدا ناوت بردووە،یاخود لەلای میهرەبانی خۆت پەنهانت کردووە. کەقورئانی مەزن وپیرۆز بکەیتە بەهاری دڵم وڕووناکی سنگم ودەروونم، وەڕەوێنەرەوەی خەمەکانم. ئەوا خوای گەورە لەناخۆشی وخەمەکەی ڕزگاری دەکات ولەبریا خۆشی وشادی پێ دەبەخشێت. ووتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئایا فێری نەبین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ پێویستە هەرکەسێك بیستی فێری ببێت ولەبەری بکات.

وە"ابن مسعود"دەڵێت: هەر پێغەمبەرێك توشی قەیرانێك هاتبێت ڕاستەوخۆ پەنایان بردۆتە بەر "سبحان الله"کردن.

(ابن ابی الدنیا) لە کتێبی (المجابین) دا لەپلەوپایەی"الدعاو"دا ئەم ڕووداوە دەگێڕێتەوەکە "حسن"ە ڕەحمەتی خوای لێبێت.دەڵێت: پیاوێك لەهاوەڵانی پێغەمبەری خودا ﷺ کەلە ئەنصاریەکان بوو بە"ابا معلق"ناسرابوو، ئەم پیاوە بەپارەی خۆی وکەسانی تریش بازرگانی دەکرد وشوێنان دەگەڕا، وەکەسێکی خاوەن وەرع وخواناس بوو،جارێکیان چەتە ودزێك بەچەکەوە ڕێگەی لێ دەگرێت وپێی دەڵێت: چیت پێیە دایبنێ، چونکە دەت کوژم. ئەویش دەڵێت چیت دەوێت لەپارە بیبەو چیت داوە لەکوشتنم؟ دزەکەش ووتی پارەم ناوێت، مەبەستم کوشتنەتە. بازرگانەکەش ووتی: ئەگەر هەر سوورێت ئەوا مۆڵەتم بدە تا چوار ڕکات نوێژ بکەم. دزەکەش ووتی چەندت دەوێت نوێژ بکە.

---

[1] - ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە، (احمد ١/٣٩١-٤٥٢)وە (حاکم ١/٥٠٩)بڕوانە "السلسله الصحیحه الالبانی -١٩٩".

بازرگانەکەش دەست نوێژی گرت وچوار ڕکات نوێژی کرد، لەدوا سوجدەیدا ووتی: (یاودود یاودود، یا ذي العرش المجيد، يا فعال لما تريد،أسألك بعزك الذي لا يرام،وبملك الذي لايضام، وبنورك الذي ملأ أركان عرشك. ان تكفي شر هذا اللص، يا مغيث أغثني ، يامغيث أغثني... ثلاث مرات) . واتە:ئەی بەڕەحم و بەسۆز ئەی خاوەن کۆشکی مەزن

ئەی ئەو خوایەی کە چیت بوێت دەیکەیت ،لێت دەپاڕێمەوەبەگەورەیت کە کەس پێت ناگات.

وە بەو موڵکەت کەهیچ کاتێك کەم ناکات و بەراورد ناکرێت، وەبە نوورو ڕوناکیت کە هەموو گۆشەکانی کۆشکی مەزنی گرتۆتەوە کەلەشەڕی ئەم چەتەیە (دزە) بمپارێزیت ،ئەی فریاد ڕەس فریام کەوە. ئەی فریاد ڕەس فریام کەوە (سێ جار ) .لەم کاتەدا سوارچاکێك بەچەکێکەوە دەرکەوت و ڕوەو چەتەکە هات ولەپڕدا لێی داو کوشتی.بازرگانەکەش ووتی باوك ودایکم بەقوربانت بێت تۆ کێیت ئەویش ووتی:خوای گەورە منی نارد بۆ فریاکەوتنی تۆ.

من فریشتەیەکم لەفریشتەکانی ئاسمانی چوارەم.لەیەکەم نزاو پاڕانەوەت دەرگاکانی ئاسمان دەنگەدەنگیان تێ کەوت لە پاڕانەوەی دووەمت پشێویەکی لە نێو فریشتەکاندا نایەوە.وەلەپاڕانەوەی سێ یەمدا بەمنیان ووت: نزای بەڵادارە لێ قەوماوە منیش لەخوا پاڕامەوە کە ئەرکی کوشتنی ئەو (دزە) بە من بسپێرن.[1]

وە (حسن) دەڵێت:هەرکەسێ دەست نوێژ بگرێت وچوار رکات نوێژ بکات و ئەم نزاو پاڕانەوەیە بکات ئەوا خوای گەورە وەڵامی دەداتەوە جا چ بەڵادار بێت یان بێ بەڵابێت

---

[1] -ئەم ڕووداوە"ضعيف"ە لەسەنەدا.(مجابی الدعوە. ص٦٣٦٤)بڕوانە(الاصابە٤-١٨٢) و (اسدالغابە ٦/٢٩٥).

## نهێنیەکانی نزاوپاڕانەوە

زۆر جار هەندێ نزاو پاڕانەوە دەبینیت کەکەسانێك پێی پاڕانەتەوە.جا خوای گەورە یان بەهۆی جۆری کێشەو کەسەکە قبوڵی کردوە.یاخود ڕێکەوتی یەکێك لەوکاتە کەنزای تێدا قبولْ دەبێت.یان خوای گەورە لەبری چاکەیەك کەئەو کەسە ئەنجامی داوە.ئەو نزایەی قبولْ کردوە.ئیتر خەڵکی وادەزانێت نهێنی قبولْ بونی ئەو نزایە لە ووتەو وشەکانیدایە کەپێی پاڕانەتەوە.ئیتر ئەو ووتانە بەکاردەهێنن لەنزاکانیاندا.

هەروەکو کەسێك لەکاتێکی شیاودا جۆرە دەرمانێك بەکاردەهێنێت بۆ نەخۆشیەك چارەسەری دەکات دواتر کەسانی تر هەمان جۆری دەرمان بەکاردەهێنن بۆ نەخۆشیەکانیان وادەزانن چارەسەری هەموو نەخۆشیەك دەکات.کەئەمەش خۆی لەخۆی دا هەڵەیەو زۆر کەس تیایدا بەهەڵەدا چوونە دوور نییە ئەو نزایە لە تەنیشت یان لەسەر گۆڕی کەسێك دا گیرا بووبێت ئیتر کەسانی نەفام وادەزانێت نهێنیەکە دەگەڕێتەوە بۆ جۆری نزاو دڵپاکی ودەروونی کەسەکەو شێوازی نزاکردنەکە، جائەگەر لەیەکێك لەماڵەکانی خودا بێت باشترە لای خوای گەورە.

## چەك بەخاوەنەکەی کەوتووە

نزاوپاڕانەوەکان نمونەی چەکن، وەچەکیش بەخاوەنەکەی کەوتووە، نەك تەنها بەچەکەکە. جا هەرکاتێك چەکەکە باش بێت ، وەهەڵگرەکەی "خاوەنەکەی"بازو دەست ومشتی چاك بێت وبەربەستی نەبێت، باشتر دوژمن دەپێکێت.

جا کام لەم سێ هۆکارە بوونی نەما ، ئەوکاریگەریە کەمتر دەبێتەوە. واتە ئەگەر ووشەکانی نزاکە باش نەبێت وئەوکەسەی کەدەپاڕێتەوە دڵ ودەروون وهۆشی یەك نەخات، وەڕێگری یەك هەبێت لەقبولْ بوونی نزاکە ،ئەوا کاریگەری نابێت.

## لەنێوان نزاو قەدەردا

لێرەدا پرسیارێکی باو هەیە لە نێوان خەڵکیدا ئەویش ئەوەیە کەئەگەر لەقەدەردا لەسەر کەسێك شتێك نوسرابێت، ئیتر ڕوودەدات جا ئیتر نزابکات یان نەیکات.هیچ کاریگەری نی یە. وەهەروەها بەپێچەوانەوە ، ئەگەر لەسەری نەنوسرابێت ئەوا ڕوونادات ،جا نزا بکات یان نا.

پێڕێك پێیان وایە کەناوەڕۆکی ئەم پرسیارە ڕاستە و وەدەست بەرداری نزاوپاڕانەوە بوونە، جا ئەم پێڕە لەگەڵ نەفامی وگومڕایاندا پێچەوانەن،چونکە ئەوان دەست گرتن بەهۆکارەکان "الاسباب"ڕەد دەکەنەوە.

جا ئەگەر بەیەکێکیان بوترێت:ئەگەر تێری نوسرابێت لەسەرت کە قەدەرە، ئەوا ڕوودەدات ئیتر نان بخۆیت یان نەیخۆیت، وەبەپێچەوانەشەوە ئەگەر منداڵ بوون قەدەربێت ،ئەوا ڕوودەدات ئەگەر بچینەلای خێزانەکانمان یان نا، وەبەپێچەوانەوە. جائیتر پێویستمان بە پرۆسەی هاوسەرگیری وژن هێنان نی یە؟!

ئایا هیچ مرۆڤێکی خاوەن ژیر ئەمەدەڵێت؟!

تەنانەت ئاژەڵەکان وگیانلەبەرەکانیش ئەمانە ناڵێن. کەدەزانن بەردەوام بوونی ژیان بەندە بەدەست گرتن بەهۆکارەکانەوە، بگرە ئەو پێڕە لەئاژەڵ کەمترن.

وەهەندێکی تر ژیری خۆیان بەوەدەرخەن کەدەڵێین: نزاوپاڕنەوەو سەرقاڵ بوون پێوەی لەڕووی پەرستنەوە خوای گەورە پاداشتی لەسەردەداتەوە. بەڵام هیچ کاریگەری یەکی نی یە لەسەر ڕووداوەکان وداواکان جێ بەجێ نابن.

لێرەدا هیچ جیاوازیەك نی یە لەنێوان ئەم پێڕەو ئەوانەی پێشوودا ، هەروەکو بڵێت کاریگەری نزاوپاڕانەوە وەك بوونی نەبێت وایە.

پێڕێکی لەمانە ژیرتر دەڵێن: نزاوپاڕانەوە نیشانەوبەڵگەیەکن کەخوای گەورە تەرخانی کردووە بۆ جێ بەجێ بوونی پێویستیەکان. واتە هەرکاتێك خوای گەورە کەسانێکی سەرکەوتوو کرد کەنزاوپاڕانەوە بکەن،

ئـەوا بەڵگـەی ئەوەیـە ئـەوکارە جـێ بـەجێ بـووە. هـەروەکو کاتێـك کـە هەورێکی ڕەشی سارد لەزستاندا دەبینیت ،بەڵگەی باران بارینە.

وە ووتیـان: وەهــەروەها بەهــەمان شـێوە بـۆ پەرسـتن وپاداشـت، بـێ باوەڕی ویاخی بوون لەگـەڵ سزا، ئەمانـە نیشانەی ڕوودانـی پاداشـت وسـزان بـەبێ ئـەوەی هۆکـارین. بەهــەمان شـێوە شـکان لەگـەڵ شـکاندن، سـوتان لەگـەڵ سـوتاندن، خـوێن ڕشـتن لەگـەڵ کوشـتندا، واتـە هـیچ کـام لەمانـە هۆکـاری تـەواو نـین، وەبـوونی پەیوەنـدی نێوانیـان تـەنها لەیەکـچوونێکی ئاسـاییە نـەك هۆکـارێکی کاریگـەر. بەمــەش پێـچەوانەی شـەرع وعـەقڵ و فیترەت ئەوەستنەوە ،بگرە پێڕی عاقڵ وداناکان بەم پێڕە پێدەکەنن.

ڕاسـتی یەکـەی: (کـەپێڕی سـێ یـەم هەیـە کـە پرسـیارکەر باسـی نـەکردووە) کـە پێیـان وایـە هەرشـتێك کەلـە قـەدەردا نوسـرابێت ، بەنـدە بـــەهۆکارەکانی یـــەوە، وەنزاوپاڕانــــەوەش یەکێکـــە لـــەهۆکارەکان. جاهــــەرکاتێك بەنــــدە دەســـــتی گـــرت بەهۆکارەکانـــەوە ئـــەوا ئەوقــەدەرەڕوودەدات، وەبەپێــچەوانەوەبەنەبوونی هۆکارەکـان قەدەرەکـە ڕوونادات.

وەهــەر ئـەم واتایـە دەگەیـەنێت کـەهۆکاری تێـری نـان خواردنـە وهۆکـاری منـداڵ بـوون ژن هێنانــەو چـوونە لای خێزانەکەتـە. وەهۆکـاری دوورینــەوە چـاندنە، وەهۆکـاری چـوونە بەهەشـت کـرداری چـاکەیە، وەهۆکـاری چـوونە دۆزەخ کاری خراپەیە. وەئەم پێڕە ڕاسترین پێڕن.

## نزاوپاڕانەوە لەبەهێزترین هۆکارەکانی قەزاوقەدەرە

بـەم شـێوە نـزاو پاڕانـەوە لـە بـەهێزترین هۆکارەکـانن ، جائەگـەر قـەدەری کەسـێك بەنـدبێت بەنزاوپاڕانـەوە ، کەواتـە نـابێ بوترێـت نزاوپاڕانـەوە بـێ سـوودە. هـەروەکو چـۆن نەشـیاوە بوترێـت خـواردن وخواردنـەوەو سـەرجەم کاروکردارەکـان بـێ سوودن. وەهـیچ هۆکارێـك بەئەنـدازەی نزاوپاڕانـەوە سـود بـەخش وکاریگـەر نـین بـۆ بەدەسـت هێنـانی خواسـت ومەبەسـتەکان ، هەربۆیـە دەبینیـەن پێـڕی هـاوەڵانی پێغەمبـەرﷺ کەلـە هـەموو کەسێك زیـاتر

شارەزاترو خواناس تر بوون، کەبەردەوام دەستیان بەنزاوپاڕانەوە دەگرت مەرجەکانیان بەجێ دەهێنا.

وە خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب ﷺ بە نزاوپاڕانەوە زاڵ دەبوو بەسەر دوژمنەکانیدا. کەهەمیشە بەهاوەڵانی دەووت:"ئێوە بەزۆریتان سەرناکەون، بەڵکو ئێوە لەئاسمانەوە سەردەکەون". وەهەروەها دەیفەرموو:"من خەمی قبوڵ بوون و وەڵامدانەوەی نزاکانم نی یە، بەڵکو خەمی نزاکردنمە، چونکە گەر بەکوڵ نزا بکرێت ،ئەوا وەڵامدانەوەکەی لەگەڵ خۆیدایە".

جا ئەو خودایەی کەنزای بەخشیوە ، مەبەستی وەڵامدانەوە بووە هەربۆیە دەفەرمێت: (وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ.... بقرة: ١٨٦) واتە: "ئەی پێغەمبەر ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێ بکەن دەربارەم، ئەوا من نزیکم لێیانەوە، بەهاناو هاوارو نزایانەوە دێم، هەرکاتێ لێم بپاڕێنەوەو نزابکەن".

وە لە سنن ابن ماجە دا هاتووە لە فەرموودەی (ابی هریرە) ﷺ کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (من لو یسأل الله یغضب الله علیە) [1] واتە: هەرکەسێك نزانەکات ولەخوا نەپاڕێتەوە خوای گەورە لێی توڕەدەبێت.

ئەمە ئەوەدەگەیەنێت کەڕەزامەندی خوای گەورە کەهەمووی خۆشی وبەختەوەری یە ، لەنزاکردن وپاڕانەوە لێی، وەهەروەها توڕە بوونی خوای گەورە لێمان کەهەمووی بەڵاو نەهامەتی یە لەدەست بەرداربوونە لەنزاوپاڕانەوە.

امام أحمد لە کتێبی (الزهد) دا ئەم"اثرة"دەگێڕێتەوەکە: (أنا الله، لا الە انا ، اذا رضیت بارکت، ولیس لبرکتي منتهی. واذا غضب لعنت، ولعنتي تبلغ السابع من الولد) واتە: من (الله) م، هیچ پەرستراوێك بەڕاست نی یەتەنها من نەبێت، جا ئەگەر لەهەرکەسێك ڕازی ببم ئەوا پیت وبەرەکەت بەسەریدا دەڕژێنم، وەپیت وبەرەکەتی من کۆتایی

[1] -ئەم فەرموودەیە"حسن"ە ، پێشتر ئاماژەمانم پێ کردووە.

نایەت،وەئەگەر توورە بم نەفرەت دەکەم ، وەنەفرەتی من تا حەوت نەوە وەچەدەگات.

وەهەروەها سەرجەم عەقلّ ونەقلّ وفیترەت و ئەزموونەکانی نەتەوەو میللەتان بەجیاوازی زمان ورەنگ وشوێنیش ئەوە دەسەلمێنن کە نزیک بوونەوە لەخوای گەورە مایەی خێرو چاکەوچاکە خوازی یە وەباشترین هۆکارە لەم بوارەدا. وەبەپێچەوانەشەوە دوورکەوتنەوە لەخوای گەورە مایەی سەرجەم نەهامەتی وشەڕخوازی یە.

وەهیچ هۆکارێك نەبووتە مایەی خۆش گوزەرانی بۆکەسەکان بەئەندازەی ملکەچ کردن وبەندایەتی کردن ونزیك بوونەوە لەخوای گەورە ، وەچاکەکردن لەگەلّ دروست کراوەکانیدا. جا خوای گەورە بەدەست هێنانی سەرجەم خێری دونیاو قیامەت و شەڕی دونیاو قیامەتی بەستۆتەوە بەکارەکانمانەوە. وەکاری بەستۆتەوە بەهۆکارەکانەوە. وەلە قورئاندا لەهەزارەها شوێندا ئەم ڕاستیە دووپات دەکاتەوە کەسزاوپاداشت بەندە بەجۆری کارەکانەوە. هەروەکو دەفەرموێت: (فَلَمَّا عَتَوْاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَاسِئِينَ.. الاعراف: ١٦٦) واتە: جا کاتێك کە هەر سەرکێشی یەکیان کرد لەوەی کە قەدەغەکراوبوو لێیان ، ئێمەش پێمان ووتن: ببنە کۆمەلّە مەیمونێکی سوك وریسوا ودوور لەڕەحمی خوا.

وەدەفەرموێت: (فلما اسفونا انتقمنا منهم... زخرف: ٥٥) واتە: جا کاتێك ئێمەیان توورەکرد ورقی ئێمەیان هەستاند، ئێمەش تۆلّەمان لێ سەندن.

وەدەفەرموێت: (وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا....مائدة:٣٨) واتە: دزی "نێر" و دزی "مێ" واتە لەپیاوژندا، دەستەکانیان ببڕنەوە وەك سزایەك بەوەی ئەنجامیان داوە. وەهەروەها دەفەرموێت: (إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا.... احزاب:٣٥) واتە: بەڕاستی ئافرەتان وپیاوان لە موسولّمانان وباوەڕداران و ملکەچەکان وڕاستگۆیان وئارامگرەکان ولەخوا

ترساوەکان وە بەخشندەکان وڕۆژوو گران وداوێن پاکان، وەئەوانەی کەیادی خوادەکەن، ئەوا بەخشین ولێبوردەی وپاداشتی زۆرمەزن وبێ سنووریان لەلایەن خوای گەورەوە بۆ ئامادەکراوە.

وەلەم جۆرە زۆرەیە و ئەوەندە بەسە.

وەهەندێ جاریش لەسەرشێوازی مەرج وپاداشت بەندە ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (إِن تَتَّقُواْ اللّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَاناً وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ....الأنفال:٢٩) واتە: ئەی باوەڕداران. ئەگەر لەخوا بترسن وپارێزگاری بکەن ئەوا خوا بەرچاو ڕۆشنی یەکی تەواتان بۆ فەراهەم دەهێنێت.وەهەڵەو گوناهەکانتانیش دادەپۆشێت ولێتان خۆش دەبێت.

هەروەها دەفەرموێت: (فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ.... توبة:١١) واتە: جا ئەگەر تەوبە بکەن وپەشیمانی دەربڕن و نوێژەکانتان ئەنجام بدەن وزەکات لەماڵ وسامانتان دەربکەن ، ئەوا برای ئایینی ئێوەن. وەهەروەها دەفەرموێت: (وَأَلَّوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَاهُم مَّاء غَدَقًا.... الجن:١٦) واتە: ئەگەر ئەو خەڵکە ڕێگەی ڕاست وئیسلامەتی بگرنە بەر ،ئێمە بارانی بەپیت وبەرەکەتیان بەسەرتاندا دەبارێنین. وەدەبینین هەندێك جاریش بە پیتی (لامی تعلیل) دێت.

هەروەکو دەفەرموێت: (لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ....ص:٢٩) واتە: بۆ ئەوەی ئایەتەکانی لێك بدەنەوە وبیری لێ بکەنەوە و بۆئەوەی خاوەن بیروهۆشەکان پەندوئامۆژگاری وەربگرن وتێبفکرن. وەهەروەها دەفەرموێت: (لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا..البقرة:١٤٣) واتە: تاوەکو ئێوە ببنە شاهێد بەسەر خەڵکی یەوە وەپێغەمبەریش شاهێدە بەسەر ئێوەوە.

وەهەندێ جاریش ئامرازی (کی) دێت کەئەویشت بۆ (تعلیل) ە، هەروەکو دەفەرموێت: (کي لايكون دولة بين الأغنياء منكم... الحشر:٧٠) واتە: بۆئەوەی ئەو سامانە تەنها لەنێوان دەوڵەمەندەکانی ئێوەدا نەبێت.

وەهەندێ جاریش بەئامرازی (باء سببي) واتە هۆکاری دێت کەدەفەرموێت: (ذلك بما قدمت أيديكم...أل عمران:١٨٢) واتە ئەو سزایە

لەئـەنجامی دەسـت پێشخەری خۆتادایـە.وەهـەروەها دەفـەرموێت: (بمـا كـنـتم تعلمون...مائدة:١٠٥) واتە: بەوەی کە ئێوە دەتان کرد.
هەروەها دەفەرموێت: (بما کنـتم تکـسبون: یـونس:١٥٢) واتـە: بـەوەی کـە ئێوەدەستتان دەکەوت.
(ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُواْ يَكْفُرُونَ بِآيَـاتِ اللّـهِ:آل عمـران:١١٢) واتـە لەبەرئـەوەی ئەمانـە هەمیـشە ئایەتـەکانی خوایـان بـەدرۆ دەخـستەوە. وەهەنـدێ جـاریش تەواوکەری بەیاریدە دەهێنێت کەدەفەرمێت: (فَرَجُـلٌ وَامْرَأَتَـانِ مِمَّـن تَرْضَـوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْـدَاهُمَا الأُخْـرَى... البقـرة:٢٨٢) واتـە: پیاوێـك دوو ئـافرەت لەوکەسـانەی کەشـایەتی دانیـان پەسـەندە لـەلاتان، کـە یـەکێك لـەو دووئافرەتـە لـەبیری کـرد ئـەوەی تریـان لـەیادی دەمێنێـت. وەدەفـەرمێت: (أَن تَقُولُـواْ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ إِنَّـا كُنَّـا عَـنْ هَـذَا غَـافِلِينَ... اعـراف:١٧٢) واتـە: نـەك لـەڕۆژی قیامەتـدا بڵێن ئێمـە بـێ ئاگـا بووین لـەم ڕاستیانە. وەدەفـەرموێت: (أَن تَقُولُواْ إِنَّمَا أُنـزِلَ الْكِتَـابُ عَلَـى طَـآئِفَتَيْنِ مِـن قَبْلِنَـا... الأنعـام:١٥٦) واتـە: نـەك بڵێن:بەڕاسـتی کتێبی ئاسمـانی بـۆ دوو دەستەی"گاوروجولەکە" پێش ئێمە دابەزێنراوە.
وەهەنـدێ جـاری تـریش بـە (ف) ی هۆکـاری (سـببیە) دەهێنێـت کەدەفـەرموێت: (فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْـدَمَ عَلَـيْهِمْ رَبُّهُـم بِـذَنبِهِمْ فَـسَوَّاهَا.... الـشمس:١٤) واتـە: باوەڕیـان پـێ نـەکردو بـەدرۆیان خـستەوە وحوشـترەکەیان سـەربڕی ،خـوای گـەورە لەتۆڵەیـدا وڵاتیـانی کـاول کـرد ولەگەڵ زەویدا تـەختی کرد، کەدەفـەرمێت: (فَعَـصَوْا رَسُـولَ رَبِّهِـمْ فَأَخَـذَهُمْ أَخْـذَةً رَّابِيَـةً.... حاقـة:١٠) واتـە: سەرپێچی وسەرکەشییان نوانـد بەرامبەر پێغەمبەرەکـەیان ئـەوا خـوای گـەورە تۆڵـەی لـێ سـەندنەوە بـەگرتنێکی سەخت. وەدەفـەرموێت: (فَكَذَّبُوهُمَا فَكَـانُوا مِـنَ الْمُهْلَكِـينَ.... المؤمنـون:٤٨) واتـە: هـەردووکیانیان بـەدرۆ دەخـستەوە بـەم شـێوەیە بوونـە کەسـانێك لەتیاچووەکان.
وەهەنـدێ جـاریش ئـامرازی (لمـا) دەهێنێـت کەدەسـت نیـشانە بـۆ سـزایەك. وەك دەفـەرموێت: (فَلَمَّـا آسَـفُونَا انتَقَمْنَـا مِـنْهُمْ... زخـرف:٥٥)

واتــه: جــا كاتێــك ئێمــه‌یان تــوڕه‌كردو ڕقــی ئێمــه‌یان هه‌ســتاند تۆڵــه‌مان لــێ سه‌ندنه‌وه‌.

وه‌هه‌نــدێ جــاریش (بــإن) ده‌هێنێــت كه‌ده‌فــه‌رموێت: (إنهــم كـــانوا يــسارعون في الخــيرات....أنبيــاء:٩٠) واتــه: ئــه‌وان به‌ڕاسـتی لـه‌كاری خێـردا پێش بڕكێیان ده‌كرد. وه‌ده‌فه‌رموێت دژی ئه‌م پێڕه: (إنهــم كـــانوا قــوم ســوء فأغرقنا هم أجمعــين.....انبيــاء:٧٧) واتــه: ئــه‌وان پێـڕو نه‌ته‌وه‌یـه‌كی خراپـه‌كار بوون بۆیه ئێمه‌ش هه‌رهه‌موویانمان نوقمی ئاو كرد وخنكان.

وه‌هه‌نــدێ جــاریش ئــامرازی (لــولا) بــه‌كارده‌هێنێت كــه‌كاری پێكــه‌وه‌گرێ دانی داهـاتووه كه‌ده‌فـه‌رموێت: (فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنْ الْمُسَبِّحِينَ * لَلَبِــثَ فِــي بَطْنِــهِ إِلَــى يَــوْمِ يُبْعَثُــونَ....صــافات:١٤٣-١٤٤) واتـه:ئه‌گـه‌ر پێغه‌مبـه‌ر یـونس له‌وكه‌ســانه نه‌بوایــه كه‌هه‌میــشه یــادی خــواو ســبحان الله ی ده‌كــرد. ئــه‌وا تاڕۆژی زیندووبوونه‌وه ده‌بوایه له‌ناو سكی نه‌هه‌نگه‌كه بوایه.

وه‌هه‌نــدێ جــاریش ئــامرازی (لــو) بــه‌كارده‌هێنێت كه‌نیــشانه‌ی مه‌رجــه، كه‌ده‌فـه‌رمێت: (وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُواْ مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَــانَ خَيْــرًا لَّهُــمْ... نــساء:٦٦) واتــه: جــا ئه‌گــه‌ر ئــه‌وان به‌ڕاســتی بــه‌گوێره‌ی ئامۆژگــاری وفــه‌رمانی ئێمــه ڕفتاریان بكردایه، ئه‌وا چاكتر بوو بۆیان.

وه‌تێكـڕا قورئـانی پـیرۆز زۆر ڕاشـكاوانه هــه‌ر له‌سـه‌رتاوه‌ی تاكۆتـایی كـاری چـاكه‌و خێـر وشــه‌ڕ وحــوكم بوونه‌وه‌ریــه‌كان ده‌به‌ســتێته‌وه بــه‌هۆكا ره‌كانیــه‌وه "الأســـباب"، بــه‌ڵكو ڕێكخــستنی ئــه‌حكامی دونیــاو قیامــه‌ت وبه‌رژه‌وه‌نــدی وگه‌نده‌ڵی یه‌كان ده‌به‌ستێته‌وه به‌هۆكارو كاره‌كانه‌وه.

جـا هه‌ركه‌سـێك بـه‌فراوانی لـه‌م بابه‌تـه تـێ بگـات ئـه‌وا سـوودمه‌ندیه‌كی زۆر ده‌بێــت. وه‌هــیچ كاتێــك به‌نــه‌فامی ونــه‌زانی و بــێ ده‌ســه‌ڵاتی یــه‌وه پــشت ناكاتــه‌وه له‌قــه‌ده‌ر،پــشت به‌ســتنی به‌قــه‌ده‌ر بــێ ده‌ســه‌ڵاتی بێــت، وه‌بــێ ده‌ســه‌ڵاتیش پــشت به‌ســتن بێــت به‌قــه‌رده‌ر. بــه‌ڵكو تێگه‌یـشتووی ژێـر ئــه‌و كه‌ســه‌یه كــه قــه‌ده‌ر به‌قــه‌ده‌ر وه‌ڵام ده‌داتــه‌وه.وه‌بــه قــه‌ده‌ر پــاڵ به‌قــه‌ده‌ره‌وه ده‌نێــت وه‌بــه قــه‌ده‌ر بــه‌ره‌نگاری قــه‌ده‌ر ده‌بێتــه‌وه، چــونكه مــرۆڤ ناتوانێــت بــێ ئه‌مانــه بــژێت، چــونكه برســێتی وتــونێتی ســه‌رماو جۆره‌كــانی مه‌ترســی و وریایی هه‌مووی له قه‌ده‌ره‌وه‌ن.

وەهەمیـــشە بوونـــەوەرەکان لەهـــەوڵی ئـــەوەدان کەقـــەدەر بەقـــەدەر پـــاڵ پـــشتەوە بنـــێن. بـــەم شـــێوەیە ئەگـــەر کەســـێك خـــوای گـــەورە ســـەرکەوتووی بکـــات، ئـــەوا قـــەدەری ســـزاو تۆڵـــەی قیامـــەت بەقـــەدەری تۆبـــەو بـــاوەڕ وکـــرداری بـــاش پـــاڵ پێـــوە دەنێـــت. جـــا هـــیچ کاتێـــك خـــوای تـــاك وتـــەنها کـــە خـــاوەنی هـــەردوو دنیایـــە کـــارو حیکمەتـــەکانی پێـــچەوانەو پوچـــەڵ کـــەرەوەی یـــەکتری ناوەستێتەوە.

جـــا ئـــەم بابەتـــە لـــە شـــکۆمەندترین بابەتەکانـــە بەمـــەرجێ کەســـێك نرخـــی بزانێت وڕەچاوی بکات. وەتەنها خودا پشت وپەنایە.

## بەختەوەری مرۆڤ لەناسینی هۆکارەکانی چاکەو خراپەدایە

بـــەڵام لەهـــەمان کاتـــدا پێویـــستمان بـــە دوو کـــاری تـــر هەیـــە کەبەختـــەوەری فەراهەم دەهێنێت. ئەوێش:

یەکـــەم: بـــە وردەکـــاری هۆکارەکـــانی چـــاکەوخراپە بزانیـــت، وەبەرچـــاو ڕوونـــی هـــەبێت لـــەوەی کەلـــە پـــێش چـــاویدا ڕوو دەدات و لـــەخۆی وکەســـانی تریش وەئەوانەی کەدەیان بیستێت لەکۆن ونوێدا.

وەباشـــترین پێناســـەیش بـــۆ ئـــەم مەبەســـتە توێژینـــەوەو وردبوونەوەیـــە لـــەقورئانی پـــیرۆز کەبـــە فراوانـــی بـــاس لـــەهۆکارەکانی چـــاکەوخراپە دەکـــات. پاشـــان (ســـونەت) ە کـــەهاوەڵی قورئـــانی پـــیرۆزە، وەبەبەشـــی دووەمـــی وەحـــی"نیگـــا"ناودەبرێـــت. جـــا هەرکەســـێك لـــەم دووسەرچـــاوەیە بگـــات ســـەرکەوتوو دەبێـــت ، چـــونکە هـــەردووکیان "قورئـــان وســـونەت"ســـەرجەم ڕێگاکـــان وهۆکارەکـــانی چـــاکەوخراپەی خـــستۆتە ڕوو.چ لەباســـی مێـــژوو پێـــشینەکانمان لەنەتـــەوەکانی تـــر، وەئەوەنـــدەی باســـیش کـــە داهاتووەکـــان وئایـــەتی زانـــستی دەخاتـــە ڕوو کـــەزیاتر باوەڕمـــان پتـــەودەبێت، کـــەقورئان وسونەت وپێغەمبەریشﷺ ڕاست ودروستن دوور لەگومانن.

وەخـــوای گـــەورەش بەڵێنـــەکانی خـــۆی بـــەجێ دەهێنێـــت، جـــا مێـــژوو شـــیکردنەوەی ڕووداوەکانـــە کـــەخواو پێغەمبەرەکـــەی چـــەندە بـــەڕوونی ئاماژەیان بۆ هۆکارەکان وچاکەوخراپە کردووە.

## بەختەوەری لەوەدایە کەخۆت بەهەڵەدا نەبەیت

دووەم: پێویستە مرۆڤ زۆر وریا بێت لەوەی کەخۆی هەڵ نەخەڵەتێنێت و خۆی بەمل هەڵەدا نەبات ، کەئەمە لەگرنگترین هۆکارەکانە. مرۆڤ خۆی باش دەزانێت کە تاوانکاری ویاخی بوون وخۆلە گێلی دان یەکێکە لەهۆکارە زیان بەخشەکان ومەترسی دەخاتە سەردونیاو قیامەتی، ئەمە لەلای هەموو کەسێك ڕوون وئاشکرایە. بەلأم خۆ خەڵەتاندن وخۆگێل کردن هەرجارەی بەشتێك، وەك پشت بەستن بەلێ بوردەیی ولێ خۆش بوونی خوای گەورە جارێك ، وەجارێکی تر بەوەی ماوەیەکی تر ساڵێکی تر تۆبە دەکەم ودەگەڕێمەوە، یاخود بیانوو گرتن کەهەرچی بەسەردێت لەسەری نوسراوە لەقەدەردا. ئیتر ئەم دەسەلأتی نی یە وەیان بەئەنجامدانی هەندێ کاری خێر لەچەشنی"مندوب"سونەتدایە. یان بەبیانووی خۆ سەرقاڵ کردن بەزانستەوە یان چاولێکردنی لەهەندێ پێشەنگی لەخۆگەورەتر و...هتد.

ئەمانە هەرهەموویان بریتین لەخۆ هەڵخەڵەتاندن.

## جیاوازی لەنێوان تەوبەی ڕاستەقینەو"النصوح" تەوبەی زارەکی

زۆرێك لەخەڵکی وا گومان دەبەن کەهەرچی بکەیت لەتاوان وتاوانکاری بەتەنها ووتنی ووشەی"أستغفرالله" هەر هەمووی دەسڕێتەوە وخودا لێی خۆش دەبێت.یەکێك لەوکەسانەی کەخۆی بەشارەزا دەزانێت لە"فقە" پێی ووتم: من هەرچی بکەم لەتاوان دەیکەم، دواتر سەد جا "سبحان الله وبحمدە"دەڵێم، ئیتر هەرهەمووی دەسڕێتەوە. هەروەکو پێغەمبەری ئازیزﷺ مژدەی داوە کەدەفەرمێت: (من قال في يوم"سبحان الله وبحمده "مائة مرة" حطت عنه خطاياه ولو كانت مثل زبد البحر)[1] واتە: هەرکەسێك ڕۆژی سەد جار بلێت"سبحان الله وبحمدە" ئەوا تاوانەکانی لەسەر دەسڕێتەوە ئەگەر چی بەقەد کەف سەر دەریا تاوانی هەبێت.

---

[1] – ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە،(بخاری٦٤٠٥)و(مسلم٢١٩٦) گێڕایانەتەوە.

وەیەکێکی تر لەخەڵکی شاری مەککە پێی ووتم: هەرکەسێك لەئێمە گەر هەرتاوانێك بکات ، دواتر خۆی بشۆرێت وبۆ ماوەی هەفتەیەك "طواف" بکات بەدەوری کەعبەدا ئیتر تاوانەکەی دەسرِێتەوە.

وەکەسێکی تر پێی ووتم: ئەوەتا فەرموودەیەکی راست ودروست لەپێغەمبەری خوداﷺ دەگێڕنەوە کەفەرمویەتی: (أذنب عبد ذنبا فقال: أي ربي أصبت ذنبا فأغفرلي فغفرله، ثم مكث ماشاء الله ،ثم أذنب ذنبا آخر ، فقال: أي ربي أصبت ذنبا فأغفرلي، فقال الله عز وجل: علم عبدي أن له ربا يغفر الذنب وياخذ به، قد غفرت لعبدي، فليصنع ماشاء) [1] واتە: بەندەیەکم تاوانێکی ئەنجام دا ، دواتر ووتی: ئەی خوایە گیان توشی تاوانێك بووم لێم خۆشبە. لێی خۆش بووم.پاشان بۆماوەیەکی تر مایەوە، دواتر جارێکی تر تاوانێکی ئەنجامدا. ووتی: ئەی خوایە گیان توشی تاوانێك بووم ، لێم خۆش بە. خوای گەورە فەرمووی: بەندەکەم دەزانێت کەخوایەکی هەیە خاوەنی لێبوردەیەو لێی خۆش دەبێت. بۆیە لەبەندەکەم خۆش بووم چی دەکات بابیکات.

هەربۆیە منیش بەوپەڕی دڵنیایی یەوە دەزانم کەخودایەکم هەیە لەتاوانەکان خۆش دەبێت لێمان دەبورێت.

جا لەڕاستیدا ئەم پێرە لەخەڵکی خۆیان هەڵواسیوە بەم دەق وتێکستانەوە و وەپشت ئەستوور بوونە پێوەی. وەهەر کاتێك گلەیی وڕەخنەیان ئاراستەکەیت سەبارەت بەتاوانێك کەئەنجامیان دابێت، ڕاستەوخۆ ئەم فەرموودانەت بۆدەهێننەوە دەربارەی لێ بووردەیی وبەخشندەیی خوای گەورە، بەپشت بەستن بەم دەقە تکاکاریانە"الرجاء".

## جۆرەکانی تێگەیشتنی هەڵە بۆ ئەم دەقانە لەلایەن خراپەکارانەوە

تێگەیشتنی خەڵکە نەفام لەم بارەیەوە شتی سەیروسەمەرەیان هەیە: وەك ووتەی هەر یەکەیان کەدەڵێت:

كثر ما أستطعت من الخطايا     اذا كان القدوم علي كريم

---

[1] – ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە، (مسلم ٢٧٥٨)و(بخاری ٧٥٠٧) گێڕایانەتەوە.

واتە: چیت پێ دەکرێت لەتاوانکاری ئەنجامی بدە مادام ئەو کەسەی کەبۆ لای دەچیت بەخشندەیە وەیەکێکی تر دەڵێت:پاك بوون لەتاوان نەفامی یە سەبارەت بەفراوانی بەخشندەیی ولێ بوردەیی خوای گەورە.

وەکەسێکی تر دەڵێت: دەست هەڵگرتن لە تاوان وتاوان نەکردن بێ شەرمی وبێ ئەدەبی یە سەبارەت بەلێ بوردەیی خوای گەورە وبچوك تەماشاکردنێتی.

وە"محمد بن حزم"دەڵێت: هەندێکم لەوکەسانەم بینیوە لەکاتی نزاو پاڕانەوەدا ووتوویەتی: خودایە من پشتت پێ دەبەستم لە"عصمە"واتە بێ تاوانی وپاکی وبێ گوناهی.

وەهەندێکی تر لەوپێڕە لەخۆبایی بووە خۆیان هەڵدەواسن بەبابەتی "جبر"وەدەڵێن: هەرچی مرۆڤ هەیە هیچی بەدەست نی یە وژێردەست وناچارکراوە کەهەموو شتێك بکات لەتاوانکاری ویاخی بوون ،چونکە شتەکان هەرهەمووی بەدەستی خوای گەورە.

وەهەندێکی تر لەو پێڕە بەبابەتی"ارجاء" سەرلەخۆیان دەشێوێنن ودەڵێن: باوەڕ"ایمان" تەنها پەیوەستە بەدڵەوە کەلە دڵەوە خودا بەڕاست بزانیت، ئیتر کردەوەکانی مرۆڤ پەیوەندی بەباوەڕەوە نی یە. وەباوەڕی خراپترین مرۆڤیش وەك باوەڕی فریشتەکان"جبریل ومیکائیل"وایە.

وەکەسانێکی تر لەم پێڕە خۆیان بەوە دڵ خۆش دەکەن کە (هەژاران وپیاوچاکەکان وخواناسانیان) خۆش دەوێت وەهەمیشە سەردانی گۆڕەکانیان دەکەن ولێیان دەپاڕێنەوەو تەوەسولیان پێ دەکەن داوادەکەن لەوان کەهاوکاریان بکەن تا خوا لێیان خۆش بێت وداوای شیفای لێ دەکەن...

وەهەندێکی تریان پشت بەباوباپیریان دەبەستن کەئەوان لەلای خوای گەورە پێگەو پلەوپایەیەکی گەورەیان هەیەو فریای وەچەکانیان دەکەون، نمونەی ئەمانەش زۆرن، لەوانە پادشاکان کاتێك یەکێك لەوەچەکانیان دەکەوێتە کارێکی ناڕەواوە، ئەوان بەسوود وەرگرتن لەپلەوپایەیان فریایی دەکەون لەدونیادا.

وەهەنـدێکی تـر پـشت بـەوە دەبەسـتن کـەخوای گـەورە لـێ بوردەیـە ، وەسـزادانی بەنـدەکانی هـیچ لـەموڵك ودەوڵەمەنـدی زیـاد ناکـات ، وەلێبـوردەیی ولـێ خـۆش بـوونیش هـیچ لـە دەوڵەمەنـدی ومـوڵکی ئـەو کـەم ناکـات. جانەگـەر یـەکێك لـەنێو ماڵەکەیدا دەریایـەك ئـاوی سـازگار پێ بکـات، وەکەسـێکی هـەژارو تینـوو بـۆ چـۆڕێ ئـاو بێتـە بـەردەرگای ئایـا ڕێگـری دەکـات کـە چـۆڕێ ئـاو لەودەریایـەی بـداتێ؟! بـێ گومـان خـوای گـەورە زۆر لـەوە دەوڵەمەنـد تـر وفـراوانترو بەخـشندە تـرە. هـەر بۆیـە ئێمـەی هـەژار پێویـستمان بەچـۆڕێ لـێ بـوردەیی بەخـشندەیی خـوا هەیـە. وەخـوای گـەورە لەهەموو کەسێك بەخشندە ترە.

وەهەیانـە پـشت دەبەسـتێت بـەخراپ تێگەیـشتن لەدەقـەکانی قورئـان وسونە. وەکـو پـشت بەسـتنی هەنـدێك بەئایـەتی: (وَلَـسَوْفَ يُعْطِيـكَ رَبُّـكَ فَتَرْضَـى...الـضحى:٥) واتـە: خـوای گـەورە ئەوەنـدەت پـێ دەبەخـشێت کـەڕازیت دەکـات....."جـا مـن ڕازی نـابم بـەوەی کـە بم خاتـە دۆزەخـەوە"ئـەم لێکدانەوەیـە لـە لوتکـەی نەفامیدایـە بەرامبـەر بـەم ئایەتـە. بـێ ئـەدەبی بـێ ئـەنجام دانـە، چـونکە بـێ گومـان خـوای گـەورە پێـی خۆشـەو ڕازی یـە بەسـزادانی تاوانکـاران وسـتەمکاران کەسـوورن لەسـەر تاوانکـاری. بـێ گومـان پێغەمبەریشﷺ بەم کارەی خودا ڕازیە.

وەهـەروەها وەکـو پـشت بەسـتنی کەسـانێك بەئایـەتی: (إن الله يغفـر الـذنوب جميعـاً.... زمـر:٥٣) واتـە: خـوای گـەورە لەهـەموو تاوانـەکان دەبورێـت وخـۆش دەبێـت..... کەئـەم تێگەیـشتنەش لـە نـاڕەواترین جـۆری تـێ گەیـشتنە بـۆ ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە، چـونکە هاوبەشـی پەیـداکردنیش واتـە"شـیرك"یـش دەگرێتـەوە ئـەم ئایەتـە؟ کەچـڵەوپۆپەی سـەرجەم تاوانەکانـە؟ وەهـیچ کەسـێکیش گومـانی نـی یـە کەئـەم ئایەتـە دەرحـەق بەتۆبـەکاران دابـەزیووە.کەلەهـەموو تاوانـەکانی پێـشووتریان خـۆش دەبێـت جانەگـەر ئـەم ئایەتـە دەرحـەقی تۆبـەکاران نەبوایـە، بۆهـەموو پێرێـك بێـت، ئەوکاتـە هـیچ واتایـەك بـۆ بەڵێنـەکانی خـوای گـەورە نەدەمایـەوە کـە بـاس لەسـزای دۆزەخ دەکـات بـۆ بـێ بـاوەڕ وموشـریك وتاوانکـاران ، وەهـەروەها

فـــەرموودەی دەرهێنـــانی پێرێـــك لـــەدۆزەخی یـــەکان کەیەکتاپەرســـتن بەشەفاعەتی پێغەمبەرﷺ بۆ بەهەشت.

کـــە ئەمـــە کـــاڵ فـــام وبیرتەســـکی ئەوکەســـانە دەســـەلمێنێت ، چـــونکە ئـــەوەتا خـــوای گـــەورە لـــەو ئایەتـــەدا بـــە گـــشتی بـــاس دەکـــات ، بـــەلاّم لەسـورەتی"النساء" ئـەم بابەتـە تایبـەت دەکاتـەوە دەفـەرمێت: (إِنَّ اللَّـــهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِـكَ لِمَــن يَـشَاء... النساء:٤٨) واتـە:خـودا لەکەسـانێك خـۆش نابێـت کـە هاوبەشـی بـۆ بڕیـار دەدەن، جگـە لەمـە لەهەموو شتێکی تر خۆش دەبێت.

ئـەگر خـوای گـەورە مەبەسـتی تۆبـەکاران نەبوایـە، جیـاوازی نـەدەکرد لـەنێوان تاوانـەکانی "شـیرك وشـتی تـریش" مـادام لـەڕابردوودا کردوویـەتی و ئێـستا تەوبـەی کـردووەو نایـان کاتـەوە. وەهـەروەکو گومڕاکـان وهەنـدێ لەنـەفامان بەئایـەتی: (يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَـرَّكَ بِرَبِّـكَ الْكَـرِيمِ.... الانفطـار:٦) واتـە: ئـەی مـرۆڤ تـۆ چـی وای لـێ کردوویـت کەسـەرکەش بیـت بەرامبـەر پەروەردگاری میهرەبان وبەڕێزت.

وەهـەروەها ووتـەی هەنـدێ لـەگومڕایان سـەبارەت بەئایـەتی: (لَـا يَـصْلَاهَا إِلَّـا الْأَشْـقَى * الَّـذِي كَـذَّبَ وَتَـوَلَّى... الليـل:١٥-١٦) واتـە:ناچێتە نـاو ئـاگرەوە ، مەگـەر کەسـانی دڕنـدەو ناپوخـت وخوانـەناس نـەبێت. ئـەوەی بەرنامـەی خـودای بەناڕاسـت دەزانـی وپشتی تـێ دەکـرد. وە ئایـەتی: (اعـدت للكـافرين...البقـرة:٢٤) واتـە: بـۆ کافرەکـان ئامـادەکراوە.بـەلاّم ئایـەتی: (اعــدت للكــافرين...البقــرة:٢٤) کـەباس لـە دۆزەخ دەکـات، بەهـەمان شـێوەش فەرموویـەتی بۆ بەهەشـتیش: (اعـدت للمـتقين... أل عمـران:١٣٣) واتە: ئامادەکراوە بۆ لەخواترسان.

جـا کـە دەفـەرمێت بـۆ کـافران ئامـادەکراوەخۆ ڕێگـری لـەوەش ناکـات کەسـتەمکارو فاسـقەکان بـچنە دۆزەخـەوە. هـەروەکو چـۆن ئامـادەکردنی بەهەشـت بـۆ لەخواترسـان مانـای ئـەوە نـی یـە چـیتر ئەوانـەی تۆزقاڵێـك باوەڕیان هەبووە نەچنە بەهەشتەوە.

هەروەها هەندێکی تر بەڕۆژووگرتنی ڕۆژانی "عاشوراو عەرەفە" تەنانەت هەیانە دەڵێت ڕۆژوو گرتنی عاشورا تاوانی ساڵێك دەسڕێتەوە[1]، وەڕۆژووی عەرەفە تەنها بۆ زیاد کردنی پاداشتە ، کەچی ئەم بێ ئاگایە نازانێت کەڕۆژووی مانگی ڕەمەزان ونوێژە فەرزەکان خێریان لە ڕۆژوی عەرەفەو ڕۆژی عاشوراش زیاترە وبایەخدار ترە.کە بێ گومان نوێژەکان ونوێژی هەینی بۆ هەینی یەکی تر ڕەمەزان بۆ ڕەمەزانێکی تر دەبنە مایەی لێ خۆش بوون وسڕینەوەی تاوانە بچووکەکان، بەمەرجێ خۆی لەتاوانە گەورەکان بپارێزێت.[2]

جا ئایا چۆن ڕۆژوویەکی سونەت دەتوانێت ئەو هەموو تاوانە گەورانە بسڕێتەوە ، لەکاتێکدا خاوەنەکەی هێشتا بەردەوامە لەسەر ئەنجامدانیان؟! ئەمە مەحاڵە.

جائەگەر بێتو مرۆڤ دەست لەتاوانە گەورەکان هەڵبگرێت وڕۆژووی سونەتەکان"عاشوراو عەرەفە" ئەنجام بدات وتەوبە بکات وئەوساتە هەردوو هۆکارەکە یەکدەگرن وپاڵ پشتن بۆ یەکتری کە کارلەسڕینەوەی تاوانە گەورەکانیش بکات ،هەروەکو چۆن"ڕەمەزان بۆڕەمەزان ونوێژەفەرزەکان" هاوکارن بۆ سڕینەوەی تاوانە بچوکەکان بەمەرجێك دەست لەگەورەکانیش هەڵ بگرێت. ئەوەتا خوای گەورەش دەفەرموێت: (إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ.....النساء:٣١) واتە: ئەگەر بێتو خۆتان بپارێزن لەتاوانە گەورەکان ،ئەوا لەتاوانەکانتان خۆش دەبین.

---

[1] –فەرموودەیەکی "صحیح" لەم بارەیەوە هاتووە کە پێغەمبەر پرسیاری لێ کرا سەبارەت بەڕۆژوو گرتنی "عاشورا"فەرموویەتی:(یکفر السنة الماضیة). (بخاری-باب صوم یوم عاشورا)و(مسلم- الصیام: ١٩٦-١٩٧/١١٦٢). وەبەهەمان شێوە بۆ ڕۆژی "عەرفە"لە هەردوو"صحیحین"دا هاتووە.

[2] – فەرموودەیەکی"صحیح"لەم بارەیەوە هاتووە کە پێغەمبەر فەرموویەتی:(الصلوات الخمس، والجمعة، ورمضان الى رمضان، كفارات لما بينهن مالم تغش الكبائر). (مسلم-الطهارة-١٤-١٦/٢٣٣)گێڕایەتی یەوە. وەلەسەرووی ئەمانەشەوە خوی گەورە دەفەرموێت: (إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ.....النساء:٣١) واتە: ئەگەر بێتو خۆتان بپارێزن لەتاوانە گەورەکان ،ئەوا لەتاوانەکانتان خۆش دەبین.

جاهـــەرکاتێ هۆکارەکـــانی ســـڕینەوەی تاوانـــەکان زۆربـــن وبـــەهێزبن ئەوســـاتە زۆرتـــر ئەگـــەری لـــێ خۆشـــبوون وســـڕینەوەی تاوانـــە گـــەورەکانیش دەبێت.

## گومانی باش بردن بەخوای گەورەو... تێگەیشتنی هەڵە

وەکـــو پـــشت بەســـتن بـــەو فـــەرموودە قودســـیەی کەپێغەمبـــەری خـــوداﷺبۆمـــان بـــاس دەکـــات کـــەخوای گـــەورە فەرموویـــەتی: (وانـــا عنـــد حـــسن ظـــن عبـــدي بـــي ، فلـــيظن بـــي ماشـــاء)[1] واتـــە: مـــن بـــەپێی گومـــانی باشـــی بەندەکەم، کاری لەگەڵ دەکەم جا چۆن گومانم پێ دەبات بابیبات.

واتـــا چـــۆن گومـــانم پـــێ دەبـــات چـــی بەســـەردا بهێـــنم هـــەروای لەگـــەڵ دەکـــەم. بـــێ گومـــان کەســـێك گومـــانی چـــاکە بـــەخوای گـــەورە دەبـــات چـــاوەڕوانی

---

[1] - ئـــەم فەرموودەیـــە"صـــحیح"ە، (بخـــاری ٧٤٠٥)وە(مـــسلم٥/١٧)گێڕایانەتـــەوە. لـــەدەقی فەرموودەیەکی درێـــژ کـــە "ابـــی هریـــره"ﷺ کەپێغەمبـــەر فەرموویـــەتی:(أنـــا عنـــد ظـــن عبـــدي بـــي، وانـــا معـــه اذا ذكرنـــي فـــإن ذكرنـــي في نفـــسه ذكرتـــه في نفـــسي، وان ذكرنـــي في مـــلأ ذكرتـــه في مـــلأ خـــير مـــنهم، وان تقـــرب الى بـــشبر تقربـــت إليـــه ذراعـــاً، وان تقـــرب الـــيَّ ذراعـــاً تقربـــت اليـــه باعـــاً وان اتـــاني يمـــشي أتيتـــه هرولـــة).واتـــە:مـــن بـــەپێی گومـــان بردنـــی بەندەکـــەم پـــێم، وەمـــن ولەگەڵێدام هەرکاتێ لـــە دەروونـــی خۆیـــدا یـــادم بکاتـــەوە، منـــیش لـــەلای خـــۆم یـــادی دەکەمـــەوە ، ئەگەر ئـــەو لـــەلای کەســـانێکی تـــر یـــادمی کـــردەوە ، منـــیش لـــەلای کەســـانێکی لـــەوان چـــاکتر یـــادی دەکەمـــەوە، وەئەگـــەر ئـــەو بـــستێك لـــەمن نزیـــك بێتـــەوە ، ئـــەوا مـــن باڵێـــك لێـــی نزیـــك دەبمـــەوە. وەئەگـــەر باڵێـــك لـــەمن نزیـــك بـــووەوە ، ئـــەوا مـــن هـــەنگاوێکی گـــەوەر لێـــی نزیـــك دەبمەوە. وەئەگەر بەڕۆیشتن بێت بۆ لام ،ئەوا من بەخێرایی دێم بۆ لای.

وەهـــەروەها لـــەلای مـــسلم بـــەم شـــێوەیە هـــاتووە. ئـــەم فەرموودەیـــە کـــە "جـــابر بـــن عبـــدالله"دەڵێـــت گـــوێم لەپێغەمبـــەر بـــوو لـــەپێش مردنـــی بەســـێ ڕۆژ دەیفـــەرموو:( لا یموتـــت احـــدكم الا وهـــو یحسن الظن بالله ) واتە:کەسێك لەئێوە نەمرێت تا گومانی باش بەخوای خۆی نەبات.

"نووی" دەڵێت: مەبەستم لێرەدا گومـــانی بـــاش واتـــە بـــاوەڕی وابێـــت کـــەخوای گـــەورە ڕەحمـــی لـــێ دەکـــات وســـزای نـــادات. وەزانایـــان دەڵـــێن: لـــەکاتی لـــەش ســـاغیدا زۆر لـــەخوا بترســـێت وکاری چـــاکە ئـــەنجام بـــدات، وەلـــە کـــاتی سەرەمەرگیـــشدا تکاکاربێـــت و گومـــانی بـــاش بـــەخودا بەرێت کەسەر فرازی دەکات.

وە فەرموودەی"مـــسلم" پـــشت ڕاســـتی ئـــەم حاڵەتـــە دەکاتـــەوە کەپێغەمبـــەر دەفـــەرمێت:(یبعـــث لـــل عبـــد علـــی مامـــات علیـــه)واتـــە: خـــوای گـــەورە مردووەکـــان لەســـەر هـــەمان حاڵـــەتی مردنـــی زیندویان دەکاتەوە.

مامەڵـەی چـاکە لێـی دەکـات، کـە خـۆی چـاکە خوازبێـت وەچـاوەڕوانی پاداشـتی چـاکەخوازی یەکـە دەکاتـەوە. چـونکە خـوای گـەورە لەسـەر بـەڵێنی خۆیەتی و تەوبەی لێ قبوڵ کردووە.

وەهەرکەسـێ بکـەری تاوانـە گـەورەکان وخراپـەکاری وبەدڕەوشـتی ویـاخی بـوون بێـت لـەدونیا، هەمیـشە بـیر لەوەدەکاتـەوە کـەخوای گـەورە چـۆن تۆڵـەی لـێ دەسـێنێتەوە ، وەهـەر ئـەم تاوانکاریانـە دەبنـە ڕێگـر کەبەگەشـبینانەوە گومـانی بـاش بـەرێت بـەخوای گـەورە، ئەمـە لەدونیاشـدا هەروایـە. تۆسەرپێـچی لـەخۆت گـەورەتر بکـەیت چاوەڕوانیت سـزات بـدات نـەك پاداشـت بداتـەوە. جـا هەرکەسـێك باشـەی ئـەنجام دابێـت چـاوەڕوانی باشە دەکات لەخواوە وەبەپێچەوانەشەوە.

هـەروەکو"حـسن البـصری"دەڵێـت: ئـەو باوەڕدارانـەی کـەکاری چاکەدەکەن وەهەربۆیـە گومـانی چـاك وبـاش بـەخوای گـەورە دەبـەن ، بـەڵام تاوانکـار چـونکە گومـانی خـراپ بـەخوای گـەورە دەبـات هەمیـشە خـەریکی کاری خراپەیە.

چـۆن گومـانی بـاش بـەخودا بـەریت لەکاتێکـدا هەمیـشە سەرپێـچی فەرمانـەکانی دەکـات ومـافی پێـشێل دەکـات،وەدژایـەتی پەیامبـەرانی"بـانگخوازانی"ڕێگـەی خوادەکـات ، وەبـێ بـاوەڕی دەنوێنێـت بەرامبـەر بـە بـوون وسـیفات وناوەجوانـەکانی خـوا. وەبـاوەڕدار بەنـەفام ونـەزان وکۆنەپەرسـت لەقەڵـەم دەدات؟ چـۆن گومـانی بـاش دەبـات کـەخۆی گومـانی وایـە کـە ئەوخودایـە نەفـەرمان دەکـات ونەقسەدەکات نـەتوڕەدەبێت ونەڕێگری دەکات؟!

هەربۆیـە خـودای گـەورە دەربارەیـان دەفـەرمێت: (وَذَلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَاكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ الْخَاسِرِينَ....فصلت:٢٣) واتـە: ئـەوە بەرئـەنجامی ئەوگومانـە ناپەسـەندانەتان بـوو بەرامبـەر پـەروەردگارتان، ئێستا بووە هۆی داخزان وتیاچونتان وچوونە ڕیزی زەرەرمەندانەوە.

جاهەرکەسـێك ئەمـە بیروبـاوەڕی بێـت ، جاچـۆن گومـان دەبـات کـە خـوای گـەورە لێـی خـۆش بێـت وبـە بەهەشـتی بـەرینی شـادبکات؟ ئەمـە خـۆ

خەڵەتاندنــــە وســــەرلێ شــــێواوی یەکــــە شــــەیتان دواکــــەوتووەکانی پــــێ گومڕادەکات، نەك گومان باش بردن.

## تاوانکــــار ویــــاخی بــــوو ،بــــێ ئاگایــــە لەســــیفاتە جوانــــەکانی خــــودا کەدەیبینێت ودەیبیستێت

گــەر بــەجوانی لــەم حاڵەتــە ورد بینــەوە کــە چــۆن لــەدڵی مرۆڤیکــدا ئــەم دووشــتە کۆدەبێتــەوە. کــاتێ کەدڵنیایــە کــە خــوای گــەورە بــەوردی دەیبــینێ و ووتــەکانی دەبیــستێت وبەئاگایــە لــەنهێنی وئاشــکراکانی ووەلەبەردەمیــدا ڕاوەســتاوە کــە تاوانکــاری دەکــات و مــاف ویاســای خــودا پێــشێل دەکــات.هەرخۆشــی بەرپرســە لەســەرکار ووتــەکانی کــە ئــەنجامی داون. لەگــەڵ هــەموو ئەمانەشــدا هێــشتا پێــی وایــە گومــانی بــاش بــەخودای گــەورە بــەرێت، ئەمــە جگــە لــەفێڵی شــەیتان وسەرکەشــی دەروون نــەبێت هیــچی تــر نی یە.

(أبـو امامـه سـهل بـن حنيـف) دەڵێـت: مـن و (عـروه بـن الـزبير) چـووین بـۆ لای خــاتوو عائیــشەﷺ فــەرمووی: (لــو رأيتمــا رســول اللهﷺ في مــرض لــه، وكانــت عنــده ســتة دنــانير اوســبعة دنــانير، فــأمروني رســول اللهﷺ ان أفرقهــا ،فــشغلني وجــع رســول اللهﷺ حتــى عافــاه الله ، ثــم ســألني عنهــا فقــال:مــا فعلــت؟ أكنــت فرقــت الــستة الــدنانير ؟ فقلــت:لا والله، لقــد كــان شغلني وجعـك، قالـت: فـدعا بهـا فوضـعها في كفـه، فقـال: مـا ظـن نـبي الله لـو لقـي الله وهـذه عنـده؟) [1]. واتــە: ئەگــەر ئێــوە پێغەمبــەری خوداتــان ببینایــە لــە یــەکێك لەنەخۆشــیەکاند، پێــنج یــان شــەش دینــاری لابــوو، پێــی دام وفــەرمووی: پــەرش وبــەلاوی بکــەرەوە بەســەر هەژارانــدا. دواتــر منــیش بــەهۆی ســەرقاڵ بــوونم بــەئازارو ئێــشی پێیغەمبــەری خــواوە ڕاســپاردەکەم لــەیاد چوو. پاشــان پێغەمبــەری خــودا چــاك بــۆوە،لێــی پرســیم چــیت کــرد، پارەکــەت بلاوکــردەوە؟منیش پــێم ووت بــەهۆی ســەرقاڵ بــوونم بــەئازاری تــۆوە لــەیادم

---

[1] - ئــەم فەرموودەیــە"صــحیح"ە،(امــام احمــد ٦/٨٦-١٨٢,١٠٤)گێڕایــەتی یــەوە ســەنەدەکەی صحیحە.

چــوو.پێغەمبــەریش لێــی وەرگــرتم وفــەرمووی: ئایــا دەبێــت گومــانی پێغەمبـەری خـودا چـی بێـت کاتێـك بەدیداری خـودا بگـەم وئـەم بـڕە پارەیـەم لابــێ ؟... وەلــە فەرموودەیــەکی تــردا لــەبری بڕگــەی"نــبی الله" بڕگــەی "محمد" هاتووە.

جانەگـەر ئەمـە دیـدو بۆچـوون وگومـانی پێغەمبـەری خـودا بێـت، ئـەبێت گومــانی ئەنجامــدەرانی تاوانــە گــەورەکان ســتەمکاران چــۆن بێــت...ئایــا بەتــەنها ووتنــی ئێمــە گومانمــان بــاش بووەبــەتۆ خودایــە کەســزامان نادەیــت، ئــیتر ئێمــەش بۆیــە هــەموو جــۆرە کارێکمــان دەکــرد.ڕزگاریــان دەبێــت وســزای دۆزەخ ناچێژن؟

پــاك وبــێ گــەردی بۆخــوای گــەورە..گــومڕایی مــرۆڤ بەچــی پلەیــەك دەگەیــەنێت.ئــەوەتا حــەزرەتی ابــراهیم (ســەلامی خــوای لێبێــت) ڕوودەکاتــە نەتەوەکەی ودەڵێت: (أَئِفْكًـــا آلِهَـــةً دُونَ اللَّـــهِ تُرِيـــدُونَ * فَمَـــا ظَـــنُّكُم بِـــرَبِّ الْعَـــالَمِينَ... صـــافات:٨٦-٨٧) واتــە: ئێــوە شــتی دەســت هەڵبەســت دەکەنــە خــواو لــەجیاتی پــەروەردگار دەتانــەوێت بیپەرســتن؟ باشــە ئــاخر ئێــوە چ گومانێکتان لەپەروەردگاری جیهانەکان؟

## تێگەیشتنی دروست لەمەڕ گومانی باش بردن بەخودا

ئــەوەی لــەم بابەتــە وردبێتــەوە بــۆی دەردەکــەوێت کــەگومانی بــاش بــردن بــەخودا مایــەی کــرداری باشەوچــاکەیە. چــونکە مــرۆڤ دەزانێــت کــەخودای گـەورە پاداشـتی چـاکەی کـارە باشـەکانی دەداتـەوە هـەر بۆیـە کـرداری باشـە وچاکە ئەنجام دەدات.

جــا هەرچــەندە گومــانی بــاش بێــت ئــەوا زیــاتر کــاری بــاش ئــەنجام دەدات،بــەلاّم گومــانی بــاش بــردن بــەخودا لەگــەڵ شــوێن کــەوتنی ئــارەزوو یــەك ناگرێتــەوە. هەربۆیــە لەفــەرموودەی (شــداد بــن أوس) دا هــاتووە کــە (ترمــذي) لــە (مــسند) دا هــاتووە کەپێغەمبــەری خــوداﷺ دەفــەرمێت: (الكـيس مـن دان نفـسه وعمـل لمابعـد المـوت والعـاجز مـن أتبـع نفـسه هواهـا وتمنـى علـى الله)

واتــە: کەســی ژیــرو وریــا ئــەو کەســەیە کەلێپرســینەوە ولێپێــچینەوەی (محاسـبەی) خــۆی دەکــات وکــار بـۆدوای مــردن دەکــات، وەکەســی بــێ دەســـەلآت وبـــێ ئـــیرادە ئەوکەســـەیە کەبەشـــوێنی ئارەزوبـــازی وهــــەوا دەکەوێت، تەنها ئاوات دەخوازێت بەخوای گەورە.[1]

بەپوختی:

گومـــانی بـــاش بـــردن بـــەخودا ،هاورێکـــە لەگـــەڵ دەســـت گـــرتن بـــەهۆکارەکانی ڕزگـــاری لـــە قیامەتـــدا. بـــەلآم لەگـــەڵ دەســـت گـــرتن بـــەهۆکارەکانی تیاچـــوون بەروەهەڵدێرچـــوون شـــتێك نـــی یـــە نـــاوی گومـــانی باش بێت.

جائەگـەر ووتـرا: بـەڵێ دەکرێـت، چـونکە ڕەحمـەت وبـەزەیی ولـێ بـوردەیی خــوای گــەورە بــێ ســنوورەو پــێش تووڕەبــوونی کــەوتووە وەهــەموو شــتێکی داپۆشیوە.

## جیاوازی لەنێوان گومانی باش بردن بەخودا و بوغرابوون بەخودا

وەئەگــەر ووتــرا:خــوای گــەورە زۆر لەمانــەی کــە ئێــوە باســی دەکــەن دەوڵەمەنــدتر وبەخــشندەتر ولێبــوردەترو بەبــەزەیی یــە، ئێمــە هەرچــی بکــەین ڕەحمـــەت وبـــەزەیی یەکـــەی دەمانگرێتـــەوە. ڕاســـتە خـــوای گـــەورە خـــاوەنی چـــەندین ســـیفاتی جـــوانی هاوشـــێوەی ئەمانەیـــە، بـــەلآم لەســـیفاتە نایابـــەکانی خــوای گــەورە بــریتی یــە لــە "دانــایی- الحکمــە"وەهەریەکــە لــەم ســیفاتانەی ســـەرەوە کـــەباس کـــران لەشـــوێنی شـــیاو وگونجـــاوی خۆیـــدا بـــەکاردەهێنێت وە بـــۆ کەســـانێکیش شـــایەنی ئـــەوەبن کـــە بـــەزەیی وڕەحمـــەتی بیانگرێتـــەوە لەتەویـــەکاران وچـــاکە خـــوازان نـــەك کەســـانی خوانـــەناس وتاوەنکـــارو ســـتەمکار وپێشێل کاری یاساو شەرعی خودا بن.

بـــەڵکو بـــۆ کەســـانێکە لـــەبری کـــاری خراپـــە چـــاکەدەکەن وســـەرجەم ئەوتەمەنـــەی کەماویانـــە لـــەکاری خێـــردا بـــەختی دەکـــەن. جابەئەمـــەیان

---

[1] – ئـەم فەرموودەیـە"حـسن لغـیره"ە ، (ترمـذي-٢٤٥٩)وە بـە"حـسن"ی دادەنێـت وە( امـام احمد ٤/١٢٤)وە(ابن ماجە-٤٢٦٠).

دەوترێت گومانی باش بردن بەخوای گەورە. وەبەوی تریان دەوترێت "غرور" بوون بەخوای گەورە... پەنا بەخودای گەورە دەگرین.

ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێت: (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أُوْلَـئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ اللّهِ.... البقرة:٢١٨) واتە: ئەوکەسانەی کەباوەڕیان هێناوە وکۆچ دەکەن وتێ دەکۆشن لەپێناوی خودای گەورە، ئەوانە مەبەستیان ڕەحمەت وبەزەیی ومیهرەبانی خوایە.

خوای گەورە ئەمانی بەپێڕی تکاکار ناودەبات نەك فاسقەکان.

هەروەها دەفەرموێت: (ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُواْ السُّوءَ بِجَهَالَةٍ ثُمَّ تَابُواْ مِن بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُواْ إِنَّ رَبَّكَ مِن بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ... النحل:١١٩) واتە: ئەو کەسانەی بەنەزانین کاری خراپەیان ئەنجام داوە بەلاّم پاشان تەوبەیان کردووەو گەڕاونەتەوە بۆ لای خوای گەورە وکاری چاکەخوازیان ئەنجام داوە، ئەوا خوای گەورە بۆ کارەکانی پێشوو تریان لێبوردە وبەبەزەیی ومیهرەبانە.

خوای گەورە پێمان ڕادەگەیەنێت کە لێبوردەیە بۆ ئەوکەسانەی بەم شێوەیە گەڕابێتنەوە بۆ لای خودا. جا کەسانی ژیر وزانا بابەتی"رجاء-تکا"لە شوێنی شیاوی خۆیدا بەکاردەهێنن ، بەلاّم نەزان ونەفامەکان لەشوێنی شیاوی خۆیدا بەکاری ناهێنێت.

## ئەو کەسانە زۆر نەفام ونەزانن کەپشت بەڕەحمەت ولێ بوردەیی خودا دەبەستن لەهەمان کاتدا فەرمایشتەکانی پشت گوێ دەخەن

زۆرێك لەخەڵکی بەنەفامانە پشت ئەستوری ڕەحمەت ولێ بوردەیی خوای گەورە بوونە فەرمایشتەکانیشی پشت گوێ دەخەن وداواکاریەکانی جێ بەجێ ناکەن، وەك بڵێی لەیادیان چووە کە خوای گەورە خاوەنی توندترین سزایە وەهیچ بەربەستێك نییە ڕێگری لەخشم وتوڕەیی خودا بگرێت بەرامبەر بەتاوەنباران. جا هەرکەسێ پشت بەلێبوردەیی خوا ببەستێت وسوور بێت لەسەر تاوانکاری ، ئەوا وەك مل هوڕ ویاخی وکەلەڕەق وایە.

"معـروف"دەڵێـت: تـۆ تکـا لەکەسـێك دەکـەیت کـەڕەحمت لـێ بکـات ویتبورێت، کەچـی بەبـەردەوامی تـۆش بـێ فـەرمانی دەکـەیت ویـاخی دەبیـت لێی، ئەمە ئەوپەڕی بێ عەقڵی وسەرشۆڕی یە.

وەبە"حسن"یان ووت: دەبینین زۆر دەگیریت؟

ئەویش ووتی: ئەترسم..فرێم بداتە دۆزەخەوە باکی نی یە.

وەهـەروەها دەیـووت: "هەنـدێ لەخـەڵکی ئەوەنـدە پـشتیان بـە لێخـۆش بـوونی خـودا بەسـتووە کـەکاتێ مـردن ولـەدنیا دەرچـوون تەنانـەت فریـایی تەوبـەکردنیش نەکـەوتن"هـەردەبینی دەڵێـت: ئێمـە گومـانی بـاش دەبـەین بـەخودا ، بەڕاسـتی درۆیـان کـرد ، ئەگـەر گومـانی باشـیان ببردایـە کـاری باشیان ئەنجام بدایە.

پیاوێـــك لـــە"حـــسن"ی پرســـی: تـــۆ ڕات چـــۆنە بـــەپێرێك کەلـــە دانیـــشتنەکانیاندا زۆر دەترســـێنن بەئەندازەیـــەك دەڵێـــت ئێـــستا دەفـــرم لەترسانە؟

حـسن ووتـی: بـەڕای مـن هـاوڕێتی کردنـی ئـەم پێـرە گـەلێ باشـترە لـەپێرێك کەهەردڵنیات کەنەوە کەترس وبیرت لەقیامەت کەم بێتەوە.

وەلـە هـەردوو"صـحیحین"دا هـاتووە لەفـەرمودەی"اسـامە بـن زیـد"کـە دەڵێـت گـوێم لـێ بـووە کەپێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (یُجـاء بالرجـل یـوم القیامـة فیلقـی في النـار، فتنـدلق أقتـاب بطنـه فیـدور في النـار کمـا یـدور الحمـار برحـاه، فیطـوف بـه أهـل النـار. فیقولـون:یـا فـلان، مـا أصـابك، ألم تکـن تأمرنـا بـالمعروف وتنهانـا عـن المنکـر، فیقـول::کنـت أمـرکم بـالمعروف ولآتیـه، وأنهـاکم عـن المنکـر وآتیـه )[1] واتـە: پیاوێـك دەهێـنن لـەڕۆژی قیامەتـدا دەیخەنـە نـاو دۆزەخـەوە، هەرچـی ڕیخۆڵـەکانی ناوسـکی هەیـە هەرهـەمووی دەکەوێتـە سـەرزەوی، وەبـەدەوری ڕیخۆڵـەکانی دەسـوڕێتەوە وەکـو سـوڕانەوەی گوێدرێـژ بـەدەوری مێخـسکەکەیدا. خـەڵکی پێـی دەڵـێن: ئـەی فـلان کـەس چـیت بەسـەردا هـاتووە ، ئـەی تۆلـەدونیادا فـەرمانت پـێ

[1] - ئـــەم فەرموودەیـــە"صـــحیح"ە،(بخـــاری: ٣٢٦٧- ٧٠٩٨)وە(مـــسلم١٨/١١٠- نووی)گێڕایانەتەوە.

نەدەکردین بەچاکەو ڕێگریت دەکردین لەخراپە؟ ئەویش دەڵێت: من فەرمانم پێ دەکردن بەچاکە کەچی خۆم نەدەکرد،وەڕێگریم دەکردن لەخراپە ،کەچی خۆم دەمکرد.

وە امام أحمد دەگێڕێتەوە لەفەرموودەی"ابی رافع"کەدەڵێت پێغەمبەر بەلای گۆڕستانی (بقیع) دا تێ پەڕی وفەرمووی: (أف لك، فظننت أنه يريدني ، فقال: لا ،ولكن هذا قبر فلان، بعثته ساعياً الى آل فلان، فغل نمرة فدُرع الآن مثلها من النار) [1]واتە: فەرمووی: ئۆف لەتۆ، منیش وام زانی کەمەبەستی من، پێغەمبەر فەرمووی: نەخێر مەبەستم تۆ نییە مەبەستم ئەوگۆڕەیە، کەگۆڕی فلان کەسە، جارێك ناردم لەلای فلانە تیرە غەنیمە تیرە کۆبکاتەوە بەلام لەوێ پارچەقوماشێکی لە غەنیمەکە هەلگرت بۆ خۆی بەبێ پرس ، ئێستا ئەو قوماشە وەك خۆی لەئاگر دروست کراوە.

وەلە "مسند"ی امام احمد دا هاتووە لە فەرموودەی"انس بن مالك"ﷺ فەرمووی کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (مررت ليلة أسري الي على قوم تقرض شفاههم بمقارض من نار، فقلت: من هؤلاء قالوا خطباء من أمتك من اهل الدنيا، كانوا يأمرون الناس بالبر وينسون انفسهم) . [2]واتە: لە شەوی ئیسرادا کەبەرزکرامەوە بۆ ئاسمان، پێڕێکم بینی کە لێوەکانیان دەبڕدران بە مەقەسی ئاگرین، پرسیم ئەمانە کێن؟ ووتیان:ئەمانە ووتار بێژن لەخەڵکی دونیا لەنەتەوەکەت، کەهەمیشە فەرمانیان دەکرد بەچاکەو خۆیان لەبیردەکرد.

وەهەروەها لەفەرموودەی"أنس بن مالك"ﷺ دەڵێت کەپێغەمبەر فەرموویەتیﷺ: (لما عرج بي، مررت بقوم لها أظافر من نحاس يخمشون بها وجوهم وصدروهم، فقلت:من هولاء يا جبريل؟ فقال: هولاء الذين

---

[1] – ئەم فەرموودەیە(ضعیف الاسناد)ە، (امام احمد:٦/٧، ٣٩٢)(الطبراني ٣٠٢/١)و(النسائي ١١٥/٢)بڕوانە (مجمع الزوائد ٥٣/٣).

[2] – ئەم فەرموودەیە"صحيح"ە،(امام احمد :٢٣١/٣,١٢٠، ٢٣٩ ) گێڕایەتیەوە.

كانوا يأكلون لحوم الناس ، ويقعون في أعراضهم) [1]. واته: له كاتی بلّند کردنەوەم لەشەوی ئیسراو میعراجدا بەسەر نەتەوەو پێرێکدا تێپەڕیم کە نینۆکی دریژیان هەبوو لە مس دروست کرابوو بەو نینۆکانی چنگیان دەدا لەدەم وچاو سنگیان ودایان دەڕنی. بەجبریلم ووت: ئەم پێرە کێ یە؟ ئەویش ووتی: ئەمانە ئەو پێرەن کەهەمیشە گۆشتی مرۆڤەکانیان دەخوارد وبە خراپە باسی ناموسی خەڵکیان دەکرد.. مەبەستی لەگۆشتی خەڵکی واتە غەیبەت کردنە.

وەهەروەها لە "أنس"ەوە کەپێغەمبەرﷺ بە زۆری ئەم ووتەیەی دووپات دەکردەوەکە دەیفەرموو: (یا مقلب القلوب والابصار، ثبت قلبي على دينك ، فقلنا يا رسول الله ، أمنا بك وبما جئت به، فهل تخاف علينا؟ قالﷺ: نعم ،ان القلوب بين أصبعين من أصابع الله يقلبها كيف شاء) [2]. واتە: ئەی ئاوەژووکەرەوەی دڵ وچاوەکان، دڵ ودەرونمان جێگر کە لەسەر ئاینەکەت. ئێمەش ووتمان ئەی پێغەمبەر ئێمە باوەڕمان بەتۆ هێناوە و وەبەوەشی کەتۆ هێناوتەو ئایا هێشتا لێمان دەترسیت کەبگۆڕێین؟ فەرمووی:بەڵێ... دڵەکان لەنێوان دوو پەنجەن لەپەنجەکانی خوای گەورە، دەیان گۆڕیت چۆنی بوێت.

وەهەروەها هاتووە کەپێغەمبەری خوداﷺ بەجبریلی ووت: (مالي لاأرى مكائيل ضاحكاً قط؟ قال: ما ضحك منذ ان خلقت النار.) [3] واتە: بۆچی هیچ کاتێک میکائیل نابینم کە پێ بکەنێت؟ ئەویش فەرمووی: لەوڕۆژەوەی کە دۆزەخ وئاگر دروست کراوە ئەو ئیتر پێ نەکەنیوە.

وە لەصحیح مسلم دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (يؤتى بأنعم أهل النار، فيصبغ في النار صبغة. ثم يقال له: يا ابن أدم، هل

---

1 – ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
2 – ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە، هەمان سەرچاوەی پێشوو، (٢/٣،٤/١١٣، ١٨٣/٤)وە(حاكم ٥٢٥/١) بە صحیحی داناوە لەسەر مەرجی"مسلم".
3 – ئەم فەرموودەیە(ضعیف الاسناد)ە، (امام احمد ٢٢٤/٣)گێراویەتەوە (حافض الهیثمي لە المجمع: ٣٨٥/١٠)دا هێناوێتی.

رأيت خيراً قط؟هل مر بك نعيم قط؟ فيقول: لا والله يارب ، ويؤتي بأشد الناس بؤساً في الدنيا من أهل الجنة، فيصبغ في الجنة صبغة، فيقال له: يا أبن أدم ، هل رأيت بؤساً قط؟هل مربك شدة قط؟ فيقول: لا والله يا رب، ما مر بي بؤسٌ قط، ولا رأيت شدة قط.)[1] واته: كەسێك دەهێنن لەوانەی کەخۆشترین ژیان ژیابێت لە دونیادا"کەئێستا لە دۆزەخیەکانە". هەڵی دەکێشن لەدۆزەخ پاشان پێی دەڵێن: ئەی کوڕی ئادەم ئایا لەژیانتدا خۆشی وشادیت بینیوە؟ ئەویش دەڵێت: نەخێر سوێند بێت بەتۆ نەم بینیووە. وەکەسێك دەهێنن لەوانەی کەلەناخۆشترین ودژوارترین جۆری ژیاندا ژیابێت لەدونیادا"کە ئێستا لەبەهەشتەیەکانە" بە بەهەشتدا هەڵی دەکێشن، دواتر لێی دەپرسن ودەڵێن: ئایا لە ژیاندا ناخۆشی وخەمناکییەکت بینیوە؟ ئەویش دەڵێت: نەخێر پەروەردگار هیچ ناخۆشی وخەمناکییەکم نەبیوە.

وەلە "مسند" دا هاتووەلەفەرموودەی"براء بن عازب"ﷺ دەڵێت: لەگەڵ تەرمی پیاوێکی ئەنساری بەرێ کەوتین بۆ گۆڕستان وپێغەمبەریشمان لەگەڵدا بوو. کاتێك کەبەخاکمان سپارد پێغەمبەر ﷺدانیشت وئێمەش بەچواردەوریدا دانیشتین. زۆر لەکەشێکی ناخۆشدا بووین ، وە پێغەمبەرﷺ چیلکەیەکی"پارچەدارێکی بچوك"بەدەستی یەوە بوو زەوی یەکەی پێ هەڵدەکەن، پاشان سەری بەرزکردەوەو دوو تاسێ جار فەرمووی"استعيذوا بالله من عذاب القبر... واتە پشت بەخوا ببەستن لەسزای گۆڕ"، پاشان فەرمووی: ان العبد المؤمن اذا كان في أنقطاع من الدنيا وإقبال من الآخرة نزل اليه ملائكة من السماء بيض الوجوه، كأنهم وجوههم الشمس ، معهم كفن من اكفان أهل الجنة،وحنوط من حنوط الجنة،حتى يجلسوا منه مد البصر، ثم يجيء ملك الموت حتي يجلس عند رأسه، فيقول: أخرجي أيتها النفس المطمئنة أخرجي الى مغفرة من الله ورضوان، فتخرج تسيل كما تسيل القطرة من في السقاء

[1] – ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە،(مسلم ١٤٦/١٧– نووی)وە(احمد ٢٠٣/٣)وە(نسائی ٣٦/٦) گێڕایانەتەوە.

فيأخذها لم يدعوها في يده طرفة عين حتى يأخذها فيجعلوها في ذلك الكفن وفي ذلك الحنوط، فأذا أخذها لم الكفن وفي ذلك الحنوط، ويخرج منها كأطيب نفحة مسك وجدت على وجه الارض، فيصعدون بها، فلا يمرون بها على ملأ من الملائكة الا قالوا: ما هذه الروح الطيبة؟ فيقولون: روح فلان ابن فلان. بأحسن أسمائه التي كانواا يسمونه بها في الدنيا، فيستفتحون له،فيفتح له، فيشيعهُ من كل سماء مقربوها الى السماءالتي تليها، حتى ينتهي به السماء السابعة، فيقول الله عز وجل: أكتبوا كتاب عبدي في عليين، واعيدوه الى الارض فأني منها خلقتهم وفيها اعيدهم ، ومنها أخرجهم تارة أخرى، قال: فتعاد روحه الى الارض فيأتيه ملكان، فيجلسانه فيقولان له: من ربك ؟ فيقول ربي عزوجل. فيقولان له: ما دينك؟ فيقول: ديني الاسلام. فيقولان له: ماهذا الرجل الذي بعث فيكم؟ فيقول: هو (محمد) رسول الله. فيقولان له: وما علمك؟ فيقول: قرات كتاب الله عزوجل فآمنت به وصدقت، فينادي مناد من السماء: ان صدق عبدي ، فأفرشوا له من الجنة، وألبسوه من الجنة، وأفتحوا له بابا الى الجنة. قال: فيأتيه من روحها وطيبها ، ويفسح له في قبره مُد بصره. قال: ويأتيه رجل الحسن الوجه، حسن الثياب، طيب الريح. فيقول: ابشر بالذي يسرك هذا يومك الذي كنت توعد من انت فوجهك الوجه الذي يجيء بالخير. فيقول: انا عملك الصالح، فيقول: رب اقم الساعة... رب أقم الساعة، حتى أرجع الى أهلي ومالي، قال وأن العبد الكافر، اذا كان في أنقطاع من الدنيا واقبال من الآخرة نزل إليه ملائكة من السماء، سود الوجوه، معهم المسوح، فيجلسون منه مد البصر، ثم يجيء ملك الموت حتى يجلس عند رأسه ، فيقول: أيتها النفس الخبيثة:أخرجي الى سخط من الله وغضب، قال: فتغرق في جسده فينزعها كما ينزع السفود من الصوف المبتل، فيأخذها فإذا أخذاها لم يدعوها في طرفة عين ، حتى يجعلوها في تلك المسوح، ويخرج منها كأنتن ريح جيفة وجدت على وجه الارض ، فيصعدون بها ،فلا يمرون بها على ملأ من الملائكة الا قالوا: ماهذه الروح الخبيثة؟ فيقولون: روح فلان بن فلان، بأقبح أسمائه التي يسمى بها في الدنيا ،

**فيستفتح فلا يفتح له ثم قرأ رسول الله ﷺ:"لا تفتح لهم ابواب السماء ولا يدخلون الجنة حتى يلج الجمل في سم الخياط...:أعراف:٤٠" فيقول الله عزوجل: أكتبوا كتابه في سجين، في الارض السفلى، فتطرح روحه طرحا ثم قرأ"** وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاء فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ...الحج: ٣١ ) . **فتعاد روحه في جسده ويأتيه ملكان فيجلسانه فيقولان له: من ربك؟ فيقول: هاه...هاه، لا أدرى. فيقولان له ما دينك؟ فيقول: ها...ها لاأدري. فيقولان له ماهذا الرجل الذي بعث منكم ،فيقول: ها...ها لاأدري.. فينادي مناد من السماء: أن كذب عبدي، فأفرشوا له من النار وافتحوا له بابا الى النار. فيأتيه من حرها وسمومها، ويضيق عليه قبره ،حتى تختلف فيه اضلاعه، وياتيه رجل قبيح الوجه قبيح الثياب، منتن الريح. فيقول: أبشر بالذي يسوءك ، هذا يومك الذي كنت توعد،فيقول: من أنت؟ فوجهك الوجه الذي يجيء بالشر ، فيقول: انا عملك الخبيث، فيقول: رب لاتقم الساعة)** [1].

**واته: پاش ئەوەی فەرمووی پەنا بگرن بەخوا لەسزای گۆڕ ، فەرمووی: کاتێک مرۆڤی باوەڕدار کۆتایی بەژیانی دونیایی دێت وبەرەو ژیانی قیامەت نزیک دەبێتەوە، پێڕێک لەفریشتەی ئاسمان دادەبەزن بۆ لای کە ڕوخساری لەشێوەی خۆردایە لەپرشنگداریدا. کفنی بەهەشت وبۆنی بەهەشتیان پێ یە، لەتەنیشتەوە دادەنیشن تا چاوبڕکات.پاشان فریشتەی گیان کێشان دێت ولەژوور سەریەوە دادەنیشێت، پێی دەڵێت: ئەی دەروونی پاك وئارام ودڵنیا ، دەرچۆ بۆ دیداری بەخشندەیی ولێبوردەیی ڕەزامەندی خوای گەورە ، پاشان گیانەکەی دەردەچێت لەشێوەی دڵۆپێك ئاو لەدەمی گۆزەوە ، پاشان وەری دەگرن، لێرەدا ڕاستەوخۆ لەدەستی وەردەگرن لەچاوپروکانێکا. وەدایدەپۆشن بەوکفنە بەهەشتیە. وەبۆن خۆشی دەکەن**

[1] – ئەم فەرمودەیە"صحیح"ە، (امام احمد :٤/٢٨٧–٢٩٥)وە ابوداود وکەسانی تریش گێڕایانەتەوە لە"صحیحین"دا هەیە کەبە"المشهور"بەناوبانگە. بڕوانە دەرهێنانی ئەم فەرمودەیە لە کتابی"اهوال القبور/ برقم: ٤ "نوسینی(ابن رجب الحنبلی).

بـەبۆنی بەهەشـت ، کـەدەری دەهێـنن بـۆن خـۆش بـووە بەخۆشـترین بـۆنی میـسك لەسـەر زەویـدا، پاشـان بـەرەو ئاسمـان بڵنـدی دەکەنـەوە، وەبـەلای هـەر پێڕێکـی فریـشتەدا تـێ دەپـەڕن پرسـیار دەکـەن: ئـەم ڕوحـە پـاك وبـۆن خۆشـە کـێ یـە؟ پێیـان دەڵـێن: ئەمـە ڕوحـی فلأنـە کەسـی کـوڕی فلأنەکەسـە. بەخۆشـترین نـاو نـاوی دەبـەن کەلـەدونیادا نـاوبراوە. پاشـان فریـشتەکان داوای کردنـەوەی دەرگـای ئاسمـان دەکـەن بـۆی ، ئـەوانیش دەرگاکـە دەکەنـەوە ولەهـەر ئاسمانێکـەوە لەلایـەن فریـشتە زۆر بەڕێزەکانـەوە کەلـەخوداوە نـزیکن بەمەراسـیمێکی شـکۆدار بـەڕێی دەخـەن، تادەگاتـە ئاسمـانی حەوتـەم. خـودای گـەورە دەفـەرمێت:"کتـابی بەندەکـەم لـە تۆمـاری (علـیین) تۆمـار بکـە (کـە تایبەتـە بەبەهەشـتیەکان) پاشـان دەفـەرمێت بیگەڕێننـەوە بـۆ زەوی ، چـونکە مـن لـەزەوی دروسـتم کـردووە، وەهـەر بـۆ ئـەویش دەیـان گەڕێنمـەوەو وەهەرلـە ئەویـشدا جـارێکی تـر زینـدویان دەکەینـەوە".پاشـان ڕوحـی دەگێڕنـەوە بـۆ سـەرزەوی بـۆ ناوجەسـتەی ، پاشـان دوو فریـشتە دێنـە دیـاری ولێـی دەپرسـن کـێ خوداتە؟ئـەویش دەڵێـت: الله خـودای گەورەمـە. وەلێـی دەپرسـنەوە: ئـاینی تـۆ چـی یـە؟ ئـەویش دەڵێـت: ئـاینی من ئیـسلامە. دیسانەوە لێـی دەپرسـنەوە: ئـەو پیـاوە کـێ یـە کەلـەنێو ئێـوەی مرۆڤـدا ڕەوانـە کـراوە: ئـەویش دەڵێـت: ئـەوە "محمـد"ە ، کەپێغەمبـەرونێردراوی خـودای گەورەیـە. وەلێـی دەپرسـن چـۆن زانیـت؟ ئـەویش دەڵێـت: کیتـابی خـودام خوێنـدەوە وبـاوەڕم پێـی هێنـا وبەڕاسـتم زانیـوە. دەنگێـك لەئاسمانـەوە دێـت ودەڵێـت: بەندەکـەم ڕاسـتی کـردووە لەڕاخـەری بەهەشـتی بـۆ ڕابخـەن، وپۆشـاکی بەهەشـتی لەبـەر بکـەن ، وەدەرگایـەکی بـۆ والأ بکـەن بـۆ بەهەشـت ، لـەوێوە بـۆن وبـەرامی خۆشـی بۆدێـت، گۆڕەکـەی بـۆ فـراوان دەکرێـت بەئەنـدازەی چـاوبڕکات.. پێغەمبـەر فـەرمووی: پیـاوێکی ڕوخـۆش وجـل وبـەرگ جـوان دێـت بـۆ لای پێـی دەڵێـت: مـژدەبێت بـەوەی کەئاسـانکاری بۆکردیـت، ئەمـە ئەوڕۆژەیـە کەپـەیمانت پـێ درا. پێـی دەڵێـت:تـۆ کێیـت؟ کەڕوخـسارت لەمژدەبـەخش دەچـێت؟ ئـەویش پێـی دەڵێـت: کردەوچـاکەکانتم. لێـرەدا مردووەکـە دەڵێـت: خودایـە قیامـەت هەسـتێنە... بابگەڕێمـەوە بۆنـاو کـەس وکـارو مـاڵم....... بـەلأم مرۆڤـی بـێ

باوەڕ کاتێ کۆتایی بە ژیانی دێت ولەقیامەت نزیک دەبێتەوە ، پێڕێک لەفریشتەی ئاسمان دادەبەزن بۆلای ڕوخساریان ڕەش وناشرینە، تورەکەیەکی لەموو دروست کراویان پێ یە، لەتەنیشتی دادەنیشن تا چاوبڕکات، پاشان فریشتەی گیان کێشان دێت لەژوور سەریەوە دادەنیشێت وپێی دەڵێت: ئەی دەروونی پیس وەرە دەرەوە بۆ سزاوخەشم وتوڕەیی خوا.. پێغەمبەر دەفەرموێت:"دەست دەباتە ڕوحی لەڕەگ وڕیشە بەتوندی دەری دەهێنێت هەروەکو دەرهێنانی تەلەزی یەك لەناو پەمووی تەڕدا" هەر کەدەریان هێنا لەچاوپروکانێکا دایدەپۆشن بەوتورەکەیە ، وەکاتێك دەری دەهێنن بەناخۆشترین وبۆگەنترین بۆن کەهەبێت لەسەرزەویدا بۆنی لێ دەدەن، پاشان بەرەوئاسمانەکان بەکێشی دەکەن، وەبەلای هەرپێڕێکی فریشتەدا تێ پەڕن، یەکسەر دەپرسن: ئەم بۆنەناخۆش وبۆگەنە کێ یە؟ ئەوانیش دەڵێن: فڵانەکەسی کوڕی فلان کەسە. بەناشیاوترین ناوی دەبەن کەبانگیان پێ کردووە لەدونیادا. داوا دەکەن کەدەرگای ئاسمانەکانی بۆ بکەنەوە. پاشان پێغەمبەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (لاَ تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاء وَلاَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ... الأعراف:٤٠) واتە: دەرگاکانی ئاسمانیان لێ ناکرێتەوە وبەهەشت نابینن تا هوشتر نەچێتە کونەدەرزی یەوە. پاشان خوای گەورە دەفەرمێت: ناوی لە کیتابی "سجين"دا تۆماربکەن "کەتۆماری دۆزەخی یەکانە"، لەزەوی ژێرەوەدا ، پاشان ڕوحی فڕێدەدەنە"هەڵی دەدەن"خوارەوە، پاشان پێغەمبەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاء فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ...الحج: ٣١ ) واتە: هەرکەسێك هاوەڵ بۆ خودا بڕیار بدات، وەك ئەوە وایە لەئاسمان بەربێتەوە و باڵندە پەلاماری بدات و"پارچەپارچەی کات"یاخود ڕەشەبایەکی بەهێز بیفڕێنێت وبیبات بۆشوێنێکی دوور وقوڵ...... پاشان ڕوحی دەگێڕنەوە بۆ ناوجەستەکەی. دوو فریشتە دێنە لای ولێی دەپرسن: کێ خوداتە؟ ئەویش دەڵێت:هاه..هاه..نازانم. وەلێی دەپرسن: ئاینی تۆ چی یە؟ دەڵێت: هاه...هاه، نازانم. وەدەپرسنەوە: ئەو پیاوە کێ یە کەلەنێو ئێوە نێردرا؟

دەڵێت: هاه...هاه، نازانم. دەنگێك لەئاسمانەوە دێت دەڵێت:بەندەكەم درۆی كرد لەڕایەخی دۆزەخی بۆ ڕاخەن ودەرگایەكی دۆزەخی لێ والآ كەن. بۆن وبەرامێكی ناخۆش وگەرمایەكی بەتینی لێوە دێت، وەگۆڕەكەی لەبەرتەسك دەكەنەوە، تاوەكو هەموو ئێسكەكانی تێكەڵ بەیەك دەبن ، پاشان پیاوێكی ڕوخسار ناشرین وجل وبەرگ شێواو وپیس وبۆن ناخۆش دەڵێت: مژدەبێت ئەم ناخۆشی یەت، ئەمە ئەوڕۆژەیە كەپەیمانت پێ درابوو. ووتی: تۆ كێیت؟ كەڕوخسارت لەمژدەبەخش نایێت، ئەویش دەڵێت: من كردەوە خراپەكانتم.دەڵێت: خودایە قیامەت دوابخە..

وە لەوتەیەكی تردا كە ئیمامی احمد دەیگێڕێتەوە: (ثم يقض له اعمى واصم وابكم، في يده مرزبة ، لو ضرب بها جبلاً كان ترابا، ثم يعيده الله عزوجل كما كان، فيضر به ضربة اخرى، فيصيح صحية يسمعها كل شيء الا الثقيلين. وقال البراءﷺ :ثم تفتح له باب الى النار ويمهد له من فراش النار) [1]. واتە: كەسێكی بۆ دەنێرن كە كوێر وكەڕ ولاڵە ، چەكوشێكی گەورەی ئاسنی بەدەستەوەیە ، ئەگەر بیدات لەچیایەك دەیكات بەخۆڵ ، پاشان خودا وەك جارانی لێ دەكاتەوە، وەجارێكی تر لێی دەداتەوە. هاوارو فیزاحێك دەكات هەموو شتێك گوێی لێ دەبێت تەنها مرۆڤ وجن نەبێت.

لە (”مسند”) ەوە هاتووە لە "براء"ەوە كەدەفەرمێت: (بينما نحن مع رسول اللهﷺ، اذا بصر بجماعة فقال: علامة اجتمع هؤلاء؟ قيل على قبر يحفرونه، ففزع رسول اللهﷺ ، فبدر بين يدي اصحابه مسرعاً، حتى انتهى الى القبرفجثا على ركبتيه، فأستقبلته بين يديه لأنظر مايصنع ،فبكى حتى بل الثرى من دموعه. ثم اقبل علينا فقال: أي اخواني لمثل هذا اليوم فأعدوا.) [2] واتە: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر بووین ،

---

[1] – ئەم بەشەیان(ضعیف الاسناد)ە ، (امام احمد ٤/٢٩٦)بڕوانە"احوال القبور:ص٢٧ وەفتح الباری ٣-٢٠٧٧".

[2] – ئەم فەرموودەیە(ضعیف الاسناد)ە، (احمد ٤/٢٩٤)و(ابن ماجه ٤١٩٥) بڕوانە "احوال القبور-٢٦٣".

کۆمـەڵێکی بـینی پرسـی کەئەمانـە چـی دەکـەن؟ پێـی وتـرا: ئەوانـە گۆڕێـك هەڵدەکـەنن ، پێغەمبـەر سـامناکی دایگـرت ، بـەخێرایی ڕۆیـشت بـۆ لایـان تـا گەیـشتە گۆڕەکـە ، لەسـەر چۆکەکانی دانیـشت ومنـیش ڕووبـەڕووی وەسـتام تـا بـزانم چـی دەکـات، پێغەمبـەری خـودا دەسـتی بـەگریان کـرد،تـا خـاکی بـەردەمی تـەڕ کـرد بەفرمێـسکەکانی. پاشـان ڕووی وەرگێـڕا بۆلامـان وپێـی فەرمووین: براکانم بۆ ڕۆژوشوێنێکی ئاوها خۆتان ئامادەکەن.

وەلـە "مـسند" دا هـاتووە لـە فـەرموودەی (بریـد) ﷺ دەڵێـت: (خـرج إلينـا رسـول اللهﷺ يومـاً، فنـادى ثـلاث مـرات: "يـا ايهـا النـاس ، أتـدرون مـا مثلـي ومـثلكم؟ قـالوا: الله ورسـول أعلـم. فقـالﷺ:إنمـا مثلـي ومـثلكم مثـل قـوم خـافوا عـدواً يـأتيهم ، فبعثـوا رجلاً يـتراءي لهـم، فأبـصر العـدو، فأقبـل لينـذرهم، وخـشى أن يدركهُ العـدو قبـل أن ينـذر قومـه، فـأهوى بثوبـه: ايها النـاس أوتيـتم ، ايهـا النـاس أوتيـتم... ثـلاث مـرات".)[1] واتـە: ڕۆژێـك پێغەمبـەر هـات بـۆ لامـان وسـێ جـار هـاواری کـرد: ئـەی خەڵکینـە ئایـا دەزانـن نمونـەی مـن وئێـوە وەکـو کـێ وایـە؟ ووتیـان: خـوداو پێغەمبـەر دەزانـن ، پێغەمبـەر فـەرمووی: نمونـەی مـن وئێـوە وەکـو قـەومێك وایـە کـە مەترسـی ئـەوەیان هـەبوو کـە دوژمنەکـەیان بـدا بەسـەریاندا، بـۆ ئـەم مەبەسـتە پیاوێکیـان نـارد کەچـاودێری دوژمنـەکانیان بکـات، کاتێـك پیاوەکـە بـینی وا دوژمنەکانـەیان بـەرەو ڕوویـان دێـت، ئـەمیش ویـستی قەومەکـەی ئاگەداربکاتـەوە، بـەڵام ترسـا دوژمنـەکانی پێـی بـزانن وڕێـی لـێ بگـرن پـێش ئـەوەی هەواڵەکـە بەقەومەکـەی بگەیـەنێت.لەناچـاریدا جـل وبەرگەکـەی داکەنـدو بەدەسـتی یـەوە ڕای دەوەشـاند وهـاواری دەکـرد ئـەی خەڵکینـە هاتن بۆگیانتان...سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە.

وەلـە صـحیحی موسـلیمدا هـاتووە لـە فـەرموودەی (جـابر) ﷺ کـە پێغەمبـەر دەفـەرمێت: (کـل مـسکر حـرام، وإن علـى الله عزوجـل عهـداً لمـن شـرب المـسکر ان یـسقیه مـن طینـة الخبـال ، قیـل ماطینـة الخبـال؟ قـالﷺ:

---

[1] – ئەم فەرموودەیە"حسن"ە ،(احمد٥/٢٤٨)(المجمع ٢/١٨٨).

عرق أهل النار ، او عصارة أهل النار.)[1] واته: هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە.، خوای گەورە بەڵێنی داوە هەرکەسێك ماددەی سەرخۆشکەر بخواتەوە ،ئەوا"طينة الخبال"ی دەرخوارد بدات. پرسیان: "طينة الخبال"چی یە؟ پێغەمبەریش فەرمووی: "طينة الخبال"مەی'عارەقی'خەڵکی دۆزەخە ،یان پاشەڕۆی خەڵکی دۆزەخ وئاگرە.

وەهەروەها لە "مسند" دا هاتووە لە فەرموودەی"ابي ذر"ﷺ کە پێغەمبەر فەرموویەتیﷺ: (انـي ارى مالا ترون ، واسمع مالاتسمعون، اطت السماء وحق لها ان تئط، ما فيها موضوع اربع أصبع الا وعليه ملك ساجد، لوتعلمون ما اعلم لضحكتم قليلاً ولبكيتم كثيراً وما تلذ ذتم بالنساء على الفرش ، ولخرحبتم الى الصعدات تجأرون الى الله عزوجل. قال ابو ذر: والله لوددت اني شجرة تعضد.)[2] واتە: ئەوەی من دەیبینم و دەیبستم ، ئێوە نایبینن ونابیستن، ئاسمان ناحەق نی یە، چونکە شوێنی لەپێکی دەست نی یە فریشتەیەکی تێدانەبێت کڕنوش دەبات ، والله ی ئەوەی من دەیزانم ئێوە بیزانن ئەوا کەم پێ دەکەنن وزۆر دەگریان وچێژتان لەهاوسەرەکانتان وەرنەدەگرت لەسەر جێگا. یەکسەر ڕادەپەڕین ورووەو دەشتەکان دەڕۆیشتن لە خودا دەپاڕانەوە. ئەبو ذر ووتی:خۆزگەم دەخواست کە من دارێك بوومایە گازو قەپم لێ بگیرایە.

وەلە "مسند" دا هاتووە لە فەرموودەی"حذيفة"ﷺ ووتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خودادا بووین لەبەخاك سپاردنی تەرمێکدا. کاتێ گەیشتینە گۆڕەکە، پێغەمبەر هاتە خوارەوە لەقاچی تەرمەکە وردبووەوەو فەرمووی: (يضغط المؤمن فيه ضغطة تزول منها حمائله

---

[1] – ئەم فەرموودەیە"صحيح"ە،(مسلم١٣/١٧٦–نووی)گێراویەتی یەوە.
[2] – ئەم فەرموودەیە"حسن"ە ،(ترمذي ٢٣١٢)وە(ابن ماجه ٤١٩٠)و(امام احمد ١٧٣/٥) وە(حاكم ٥١٠/٢ – ١٠٦٠–١٧٧٢).

ويملأ على الكافر ناراً.)[1] واتە: باوەڕدار لەم گۆڕەدا فشارێكی توندی توش دەبێت كەسەرجەم پەل وپۆ وسنگی وردو خاش دەبێت ، بۆ بێ باوەڕیش پڕی دەبێت لەئاگر.

هەروەها لە (مسند) دا هاتووە لە فەرموودەی"جابر"ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خودا دا بووین ڕۆیشتین بۆ بەخاك سپاردنی (سعد بن معاذﷺ) كاتێك پێغەمبەر نوێژی لەسەر كردو بەدەستی خۆی لەگۆڕی ناو پێغەمبەر"سبحان الله"ی كرد، ئێمەیش "سبحان الله"ی زۆرمان كرد. دواتر پێغەمبەر "الله أكبر"ی كرد. پرسیان: ئەی پێغەمبەری خودا بۆچی"سبحان الله و الله أكبر"ت كرد؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (لقد تضايق على هذا العبد الصالح قبره حتى فرج الله عنه.)[2] واتە: گۆڕەكە زۆر بەرتەسك بووە لەسەر ئەم پیاو چاكە، تاخوای گەورە فریای كەوت دەربازی كرد، وە لە (صحيح) ی (بخاری) دا هاتووە لە فەرموودەی"ابی سعيد"ﷺ كە پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (اذا وضعت الجنازة، واحتملها الرجال على أعناقهم ، فإن كانت صالحة قالت:قدموني قدموني، وإن كانت غير صالحة قالت: يا ويلها ، أين تذهبون بها؟ يسمع صوتها كل شيء الا الانسان، ولو سمعها الانسان لصعق.)[3] واتە: كاتێك تەرمی مردوویەك دادەنرێت و دەخرێتە سەرشان ودەبرێت بۆ گۆڕستان. جا ئەگەر ئەوتەرمە خاوەنەكەی پیاوچاك وصالح بێت دەڵێت: پێشمخەن... پێشمخەن، واتە زوو بم گەیەنن، بەڵام ئەگەر خراپ بێت دەڵێت: ئەی قوڕم بەسەر بۆ كوێم دەبەن. بەدەنگێكی بەرز ئەم فیزاح وهاوارە دەكات، كەهەموو شت گوێی لێ یەتی تەنها مرۆڤ نەبێت، كەئەگەر گوێی لێبێت ئەوا لەهۆشی خۆی دەچێت.

---

1 - ئەم فەرموودەیە(ضعيف الاسناد)ە، (امام احمد ٥/٤٠٧)(المجمع ٣/٤٦، ١٠/٢٦٤) وە(بن رجب- اهوال القبور ١٠٨)گێڕایانەتەوە.

2 - ئەم فەرموودەیە(ضعيف الاسناد)ە،(احمد ٣/٣٦٠، ٣٧٧) وە (المجمع ٣/٤٦)وەبڕوانە(اهوال القبور ٨٧-٩١).

3 - ئەم فەرموودەیە"صحيح"ە،(بخا رى :١٣١٤-١٣١٦ - ١٣٨٠)گێڕاویەتیە وە.

وه لـه "مـسند" دا هـاتووه لەفـەرموودەی"ابـی أُمامـه"رضي الله عنه کـه پێغەمبـەر فەرمووی‌ـەتی: (تـدنوا الـشمس یـوم القیامـة علـى قـدر میـل ، ویـزدا حرهـا كـذا وكـذا، تغلـي منهـا الـرؤوس كمـا تغلـي القـدور، یعرقـون فیهـا علـى قـدر خطـا یـاهم، مـنهم مـن یبلـغ الى كعبـه، ومـنهم یبلـغ الى سـاقه ، ومـنهم مـن یبلـغ الى وسـطه، ومـنهم یلجـم العـرق.) [1] واتــه: لـه ڕۆژی قیامەتـدا خـۆر یـەك میـل لـه مرۆڤەكانـەوه دووره وپلـەی گـەرمی خـۆر چـەندین وچـەندین جـار زیـاد دەكـات. هــەموو ســەرەكان تێیــدا وەك مەنجــەڵ دەكوڵێــت وه عــارەقێكی زۆر دەكـەن هـەر كەسـەو بـەپێی تاوانـەكانی. هەیاەنـه عـارەق دەگاتـه قولـه قـاپی، هەیانــه عــارەق دەگاتــه قاچــەكانی، هەیانــه عــارەق دەگاتــه كەمــەرەی، وهەەیانه عارەق دادەپۆشێت.

وهەـەروەها لـه "مـسند" دا هـاتووه لـه فـەرموودەی"ابـن عبـاس"رضي الله عنه کـه پێغەمبــەر فەرموویــەتی: (كیـف أنعمـم وصـاحب القـرن قـد الـتقم القـرن: وحنـى جبهتـه یـستمع متـى یـؤمر فیـنفخ ، فقـال أصـحابه: كیـف نقـول؟ قـال ﷺ: قولـوا: حـسبنا الله ونعـم الوكیـل، علـى الله توكلنــا.) [2] واتــه: مــن چــۆن هەســـت بەخۆشــــی بكــــەم، كــــەخاوەن قۆچــــەكەواته فریــــشته "ئیـسرافیل"قۆچـەكەی هـەڵگرتووه ، گـوێی ڕاگرتـووه تاكـەی فـەرمانی پـێ بكرێـت فـوو بەقۆچـەكەدا (بـووق) كـەدا بكـات. ووتیـان: ئەگـەر كەوتینـه ئەوكاتــەوه چــی بڵــێین؟ پێغەمبــەریش فــەرمووی بڵــێن: "تــەنها خودامــان بەسەو ئەو باشترین كەسه بۆمان وپشت بەخودا ببەستن".

وه لــه"مــسند" دا هــاتووه لەفــەرموودەی"ابــن عمــر"رضي الله عنه یرفعــه: (مــن تعظـم في نفـسه، او اختـال في مـشیته، لقـى الله تبـارك وتعـالى وهـو علیـه غـضبان.) [3] واتــه: هەركەسێك لەناخـەوه خـۆی بـەفیز زل وگـەوره زانـی، یـان

---

[1] –ئەم فەرموودەیه"حسن"ه ،(احمد ٥/٢٥٤)وه(حاكم ٤/٥٧١)گێڕایانەتەوه.

[2] – ئـــەم فەرموودەیـــه(ضـــعیف الاســـناد وهـــو حـــسن لغـــیره)ه؛(احمـــد ١/٣٢٦، ٣/٧، ٤/٣٧٤)وه(ترمذي :٢٤٣١، ٣٢٤٣) بڕوانه(السلسله الصحیحه: ١٠٧١).

[3] – ئەم فەرموودەیه"صحیح"ه،(احمد ٢/١١٨)بڕوانه(الصحیحه– ژمارەی ٥٤٣).

لەڕێ وڕۆیشتندا بە فیزو لوت بەرزی یەوە دەڕۆیشت ، کاتێك بەدیداری خودا دەگات خوای گەورە لێی توڕەیە.

وەلە (صحیحین) دا هاتووە لە "ابن عمر"ەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (إن المصورين يعذبون يوم القيامة ، ويقال لهم:أحيواما خلقتم.)[1] واتە: پەیکەر تاشەکان سزادەدرێن لە قیامەتدا وپێیان دەوترێت:ئەو پەیکەری دروستتان کردووە زیندووی بکەنەوە وڕوح بخەنە بەریان.

وەهەروەها تێیدا هاتووە لە"ابن عمر"ەوە کەپێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ان احدكم اذا مات عرض عليه مقعده بالغداة والعشي، ان كان من أهل الجنة فمن أهل الجنة، وان كان من اهل النار فمن أهل النار. فيقال: هذا مقعدك حتى يبعثك الله عزوجل يوم القيامة.)[2] واتە: هەر کەسێك کەلە ئێوە دەمرێتهەموو ئێوارەو بەیانی یەك شوێن وجێگای خۆت پێ نیشان دەدەن ،ئەگەر بەهەشتی بێت یان دۆزەخی. وەپێی دەڵێن: ئەمە شوێن وجێگەتە تا ڕۆژی قیامەت وزیندوو دەکرێیتەوە.

وەهەروەها لە (صحیحین) دا هاتووە لە "ابن عمر"ەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (اذا صار أهل الجنة في الجنة، وأهل النار في النار. جيء بالموت حتى يوقف بين الجنة والنار ثم يذبح، ثم ينادي مناد: يا اهل الجنة خلود فلا موت. ويا اهل النار خلود فلا موت. فيزداد أهل الجنة فرحاً الى فردهم ويزداد اهل النار حزنا الى حزنهم.)[3] واتە: کاتێك بەهەشتیەکان بەرەو بەهەشت یەکلاکرانەوەو دۆزەخیەکانیش بەرەو دۆزەخ یەکلا کرانەوە. "مردن ومەرگ" دەهێنرێت لەنێوان بەهەشت ودۆزەخدا سەردەبڕێت ،پاشان کەسێك جاڕ دەدات ودەڵێت: ئەی بەهەشتیەکان ئیتر مردن نی یەو زیندوون بەهەمیشەیی، ئیتر بەهەشتیەکانیش لەسەروو دڵ خۆشیەکەیانەوە هێندەی تر دڵ خۆش تر

---

1 – ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە،(بخاری ٦١٠٩)و(مسلم ١٤/٩٠ نووی).
2 – ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە، (بخاری ١٣٧٩)و(مسلم ١٧/١٩٥– نووی).
3 – ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە،(بخاری ٦٥٤٨)وە(مسلم ١٧/١٧٩– نووی).

دەبــن، وەدۆزەخییــەكان لەســەروو ناخۆشــیەكانیانەوە هێنــدەی تــر نــاخۆش وخەفەتبار تردەبن.

هــەروەها لــە "مــسند" دا هــاتووە لــە فــەرموودەی "ابــن عمــر" كەپێغەمبــەر فەرموویــەتی: (مــن اشــترى ثوبــاً بعــشرة دراهــم فيهــا درهــم حــرام لم يقبــل الله لــه صــلاة مــادام عليــه، ثــم ادخــل اصــبعية في أذنبيــه ثــم قــال: صــمتاً إن لم أكــن سمعــت الــنبيﷺ يقولــه.)[1] واتــە: هەركەســێك جــل وبــەرگێك بــە دە درهەم بكڕێـت بـەلاَم یـەك درهـەمی حـەرام بێـت، ئـەوا خـوای گـەورە نوێـژی قبـــولْ ناكـــات تـــا لەبـــەری دا بێـــت وەپاشـــان هـــەردوو دەســـتی خزانـــە گوێچكەكانی یەوەو ووتی: ئای خۆزگایە گوێم لێ نەبووایە.

هــەروەها لــە "مــسند" دا هــاتووە لــە فــەرموودەی "عبــدالله بــن عمــر"رضي الله عنه كــە پێغەمبــەرﷺ فەرموویــەتی: (مــن تــرك الــصلاة ســكراً مــرة واحــدة فكأنمــا كانــت لــه الــدنيا ومــا عليهــا فــسلبها ، ومــن تــرك الــصلات ســكراً اربــع مــرات كــان حقــاً علــى الله ان يــسقيه مــن طينــه الخبــال. قيــل "ومــا طينــة الخبــال"يــا رســول الله، قــال رســول اللهﷺ:"عــصارة أهــل جهــنم".)[2] واتــە: هەركەســێك یــەك جــار واز لەنوێــژكردن بهێنێــت بــەهۆی سەرخۆشــی یــەوە ، ئــەوە وەك ئــەوە وایــە كــە هــەموو دونیــا مــولْكی ئــەو بووبێــت دوای بەتالأنیــدات. وەهــەر كەســێك چــوا جــار واز لەنوێــژكردن بهێنێــت بــەهۆی سەرخۆشــی یــەوە، ئــەوا مــافی خودایــە كــە"طينــة الخبــال"دەرخــوارد بــدات. پرســیان: "طينــة الخبــال" چــی یــە؟ پێغەمبــەر فــەرمووی:پاشــەڕۆی ئــەهلی دۆزەخ.

هــەروەها لــە هــەمان سەرچــاوەی پێــشوو وەهــەر لــە"عبــدالله بــن عمــر"رضي الله عنه مرفوعــاً: (مــن شــرب الخمــر مــرة لم تقبــل لــه صــلاة اربعــين صــباحا، فــإن تــاب، تــاب الله عليــه، فــإن عــاد لم يقبــل الله عليــه فــلا أدري في الثلاثــة او الرابعــة قــال: فــإن عــاد كــان حقــاً علــى الله ان يــسقيه مــن ردغــة الخبــال يــوم

---

[1] – ئەم فەرموودەیە(ضعيف الاسناد)ە، (احمد ٢ /٩٨)بڕوانە(المجمع: ١٠ /٢٩٢).

[2] –ئــەم فەرموودەیــە"حــسن لغــيره"ە ، (احمــد ٢ /١٧٨)وە (حــاكم ٤ /١٤٦) (البهيقــى ١ /٣٩٨، ٨ /٢٨٧) (صحيحه حاكم).

القيامـة.) [1] واتـه: ئەگـەر هەركەسـێك يـەك جـار مـەی بخواتـەوە ، ئـەوا تـا مـاوەی چـل بـەيانی"ڕۆژ" نوێـژی لـێ قبـولْ ناكرێـت، وەئەگـەر تەوبـەی كـردو گەڕايـەوە ، ئـەوا خـودا لێـی خـۆش دەبێـت.بـەلاّم ئەگـەر جـارێكی تـر مـەی خـواردەوە، ئــەوا ديـسانەوە چـل بـەيانی نوێـژی دروسـت وقبـولْ نابێـت، جائەگەر تەوبەی كردو گەڕايەوە ئەوا خودا لێی خۆش دەبێت.

بـەلاّم نـازانم لەسـێ يەميانـدا يـان چـوارەمياندا فـەرمووی:ئەگـەر جـارێكی تـر گەڕايـەوە سـەر مـەی خواردنـەوە،ئـەوا مـاف خـودا خۆيـەتی لـە پاشـەڕۆی ئەهلی دۆزەخی دەرخوارد بدات لەڕۆژی قيامەتدا.

وەهــەروەها لــە "مــسند" دا هــاتووە لەفــەرموودەی "ابــی موســی"ﷺ كــە پێغەمبــەرﷺ فەرموويــەتی: (مــن مــات مــدمنا للخمــر سـقاه الله مــن نهــر الغوطـة. قيـل مـا نهـر غوطـة؟ قـالﷺ: نهـر يجـری مـن فـروج الموسـات يـؤذي اهـل النـار ريـح فـروجهن.) [2]واتــە: هەركەسـێك ئـالْوودە بوبێـت بـە مەيـەوە وبمرێـت، ئـەوا خـوای گـەورە لـە ڕووبـاری"غوطـة"ی دەرخـوارد دەدات. ووتيـان: ڕووبـاری"غوطـة"چـی يـە؟ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ڕووبارێكـە لـە دامێنـی ئافرەتـە داوێـن پيسەكانی دۆزەخـی يـەكان دەردەچێت بۆن وبەرامە ناخۆشەكەی دۆزەخی يەكان سزاوئازار دەدات.

وەهــەروەها لەهــەمان سەرچــاوەدا لــە فــەرموودەی"ابــی موســی"ﷺ كەپێغەمبــەرﷺ دەفــەرمێت: (يعـرض النـاس يـوم القيامـة ثـلاث عرضـات ، فأمـا عرضـتان فجـدال ومعـاذير، وامـا الثالثـة فعنـد ذلـك تطـير الـصحف في الايـدي، فأخـذ بيمينيـه او اخـذ بـشماله.) [3] واتــە: لـە ڕۆژی قيامەتـدا خـەلْكی سـێ جـار توشـی"عـرض"كـردن دەبێتكـە يـان يەكـەم ودووەميانـە كـە: مـشت ومـڕو گفتوگـۆو بيـانو هێنانەوەيـە ، وەيـا سـێ يەميانـە كـە تێيدا نامـەی

---

[1] -ئــەم فەرموودەيــە"حــسن"ە ،(احمــد ٢٥/٢ ، ١٧١/٥ ، ٤٦٠/٦) و(حــاكم ٣٠/١ – صحيحه)و(ترمذي ١٨٦٢–و حسنه)و(الهيثمي– المجمع ٦٩/٥)گێڕاويانەتەوە.

[2] -ئـەم فەرموودەيـە"حـسن"ە ،(احمـد ٣٩٩/٤) وە (حـاكم ١٤٦/٤)وە(ابـن حبـان في صـحيحه ١٣٨٠–موارد)و( الهيثمي– المجمع ٧٤/٥)گێڕايانەتەوە.

[3] – ئەم فەرموودەيە(ضعيف الاسناد)ە،(احمد ٤١٤/٤)وە(ابن ماجه ٤٢٧٧)وضعفه الالباني.

کردەوەکـان دەدرێـت بەدەسـتەکان ، یـان دەدرێـت بەدەسـتی ڕاسـت یـان دەدرێت بەدەستی چەپ.

وەهـەروەها لـە (مـسند) دا هـاتووە لەفـەرموودەی "ابـن مـسعود"رضي الله عنه کەپێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (إيـاكم ومحقـرات الـذنوب، فـإنهن يجـتمعن علـى الرجـل حتـى يهلكنـه ، وضـرب لهـن رسـول اللهﷺ ، مـثلاً كمثـل قـوم نزلـوا أرض فـلاة ، فحـضر صـنيع القـوم، فجعـل الرجـل ينطلـق فيجـي بـالعود،والرجـل يجـي بـالعود حتـى جمعـوا سـواداًوأججوا نـاراً فأنـضجوا مـا قـذفوا فيهـا.) [1] واتـە: وریـایی تاوانـە بچوکەکان بـن ، چـونکە کەڵەکـە دەبـن لەسـەرتان تـا بەهیلاکتانـدا دەبـەن. پێغەمبـەر نمونەیـەکی هێنایـەوە فـەرمووی: وەك نمونـەی پێرێـك لـەزەوی وشـك وچـۆڵدا لایانـداوە گەورەکـەیان پیـاوان تـەرخان دەکـات بـۆ هێنـانی پارچـەدار، تـا دارێکـی زۆر کۆدەکەنـەوەو ئـاگری تـێ بـەردەدەن.، وەئـەوەی خـستیانەسەر ئاگرەکـە کولاّنـدیان. "واتـە هەرچـەندە پارچـەدارەکان بچوك بـوون بـەلاّم کـەزۆربوون ئـاگری گـەورە بـەرپا دەکەن".

وە لــە (صــحيح) دا هــاتووە لەفــەرموودەی"ابــی هريــرة"رضي الله عنه کــە پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (يـضرب الجـسر علـى جهـنم ، فـأكون اول مـن يجـوز، ودعـوى الرسـول يومئـذ: اللـهم سـلم سـلم، وعلـى حافيتـه كـلا بيـب مثـل شـوك الـسعدان تخطـف النـاس بأعمـالهم فمـنهم الموثـق بعملـه، ومـنهم المخـردل ثـم ينجـو، حتـى اذا فـرغ الله مـن القـضاء بـين العبـاد، واراد ان يخـرج مـن النـار مـن أراد وان يـرحم ممـن كـان يـشهد ان لاالـه الا الله، امـر الملائكـة أن يخـرجهم ، فيعرفـونهم بعلامـة أثـار الـسجود، وحـرم الله علـى النـار أن تاكـل مـن ابـن ادم أثـر الـسجود، فيخرجـونهم قـد امتحـشوا فيـصب علـيهم مـن مـاء يقـال لـه مـاء الحيـاة، فينبتـون نبـات الحبـة في حميـل الـسيل.) [2] واتـە: پردێـك لەسـەر دۆزەخ دروسـت دەکرێـت "کـە بـەپردی سـراط

---

[1] – ئـەم فەرموودەیـە"صـحیح"ە،(احمـد ٤٠٢/١ ، ٣٣/٥) و(طبرانـي ٢٦١/١٠)بڕوانـە (الصحيحه:٣٨٩).

[2] – ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە،(بخاری ٦٥٧٣)گێڕاویەتی یەوە.

ناســراوه"وەیەکـــەم کەســـێك لـــەوپردە دەپەڕێتـــەوە مـــن دەبم، وەنـــزاو
پاڕانـــەوەی ســـەرجەم پێغەمبـــەران لـــەوڕۆژەدا بـــریتی یـــە لـــە:خودایـــە
بەسـەلامەتی.. خودایـە بەسـەلامەتی.. وەکـەنارو قـەراغی ئـەو پـردە قـولاب
ڕێـژکراوە لـە شـێوەی دڕکـی "الـسعدان"کەدەبنـە هـۆی سـەغلەت کـردن
وڕێگرتنـــی خـــەڵکی هەرکەســـێك بـــەپێی کردەوەکـــانی ، هەیانـــە پـــشت
ئەسستوورە بـەکردەوەکانی بەئاسـانی دەپەڕێتـەوە، وەهەیانـە دەڕوات وگـیر
دەبێـت لـە قولابـەکان وهەڵدەسێت وڕزگـاری دەبێـت هـەتا خـوای گـەورە لـە
دادوەری دادگـاکردنی نێـوان بەنـدەکانی تـەواو دەبێـت پاشـتر خـوای گـەورە
دەیـەوێت ئەوانـەی کـە شـایەنی بـەزەیین لـەدۆزەخ دەریـان بهێنێـت لەوانـەی
کـە شـایەتی گـەواهیان داوە کـە"لا الـە الا الله" یـان بەڕاسـت زانیـوەو
ووتویانـە. بـۆ ئـەم مەبەسـتە فـەرمان دەکـات بەفریـشتەکان کـە دەریـان
بهێـنن، فریـشتەکانیش ئەوکەسـانە بـە نیـشانەی سـوژدەی نێوچـاوانیاندا
دەناسـنەوە، چـونکە خـوای گـەورە حـەرامی کـردووە کـە ئـاگر شـوێنەواری
سـوژدەی وەچـەی ئـادەم بـسوتێنێت. پاشـان کـەدەریان دەهێنێـت
هەرهـەموویان بـرژاون. دواتـر ئـاوی "حـەیاتیان"بەسـەردا دەکـەن وەکـو
گەنمە ناو ئاوڕێژ سەوز دەبنەوە.
هـەروەها لـە (صـحیحین) دا هـاتووە لـە فـەرموودەی "ابـی هریـره"ﷺ کـە
پێغەمبـەرﷺ دەفـەرمێت: (ان ا ول النـاس یقـضي فیـه یـوم القیامةثلاثـة:
رجـل استـشهد، فـأتي بـه فعرفـه نعمـه فعرفهـا. فقـال: مـا عملـت فیهـا؟ قـال:
قاتلـت فیـك حتـی قتلـت ، قـال كـذبت، ولكـن قاتلـت لیقـال: هـو جـريء ،
فقـد قیـل ثـم امـر بـه فحسب علـی وجهـه حتـی ألقـي في النـار، ورجـل تعلـم
العلـم وعلمـه وقـرا القـرآن، فـأتي بـه فعرفـه نعمـه فعرفها فقـال: مـا عملـت
فیهـا؟ قـال: تعلمـت فیـك العلـم وعلمتـه وقـرأت فیـك القـرآن، فقـال:
كـذبت،ولكنـك تعلمت لیقـال: هـو عـالم، فقـد قیـل، وقـرأت القـرآن لیقـال، هـو
قـاريء ، فقـد قیـل ، ثـم أمـر بـه فحسب علـی وجهـه حتـی ألقـي في النـار،
ورجـل وسـع الله علیـه واعطـاه مـن اضـاف المـال كلـه، فـأتي بـه فعرفـه نعمـه
فعرفهـا فقـال: مـا عملـت فیهـا؟ فقـال: مـا تركـت مـن سـبیل تحـب ان ینفـق
فیهـا الا أنفقـت فیهـا لـك. قـال:كـذبت ، ولكـن فعلـت لیقـال: هـو جـواد، فقـد

قيل، ثم أمر به فحسب على وجهه حتى ألقي في النار."وفي لفظ"فهو أول خلق الله تسعر بهم النار يوم القيامة. )[1] واته: يەكەم پێر كە لەرۆژی دوايدا دادگاييان لەگەڵدا دەكرێت بريتين لەسێ كەس: پياوێك شەهيد بووە خودا نيعمەتەكانی خۆی بير دەهێنێتەوە ئەويش هەمووی دەناسێتەوە، پێی دەڵێن: چيت كردووە؟ ئەويش دەڵێت: كوشتارم كردووە تا كوژرام. دەڵێت درۆت كرد، كوشتارت كردووە تاكو پێت بڵێن جوامێر وكەڵەمێرد. جا ئەوەت پێوترا ، فەرمان دەكات بەكێشی كەن بەسەردەم چاويدا بۆ ناوئاگر. وەپياوێك فێری زانست بووەو خەڵكيشی فێركردووە، قورئانی خوێندووەو خودا نيعمەتەكانی خۆی بير دەهێنێتەوە ئەويش هەمووی دەناسێتەوە ،وتی: چيت كردووە؟ ئەويش دەڵێت: فێری زانست وزانياری بوومە وخەڵكيشم فێركردووە ، وەقورئانيشم خوێندووە، دەڵێت: درۆت كرد، تەنها لەبەر ئەوە وات كرد كە پێت بڵێن زانايە، وە پێيان ووت: فەرمان دەكان بەسەردەم وچاوی دا بەكێشی بكەن بۆ ناوئاگر. وە پياوێك خوای گەورە دەرگای پيت وبەرەكەتی لێ والآ كردبوو لەهەموو جۆرەكانی ماڵی پێدابوو، خودا نيعمەتەكانی خۆی بير دەهێنێتەوە ئەويش هەمووی دەناسێتەوە. ووتی: چيت كردووە؟ ئەويش دەڵێت: هەرچی يەكم بەباش زانيبێت لە پێناوی خودادا بەخشيمە. دەڵێت: درۆت كرد. تەنها لەبەرئەوەی پێت بڵێن سەغی ومالّ بەخشە، وەپێيان وتيت. پاشان فەرمان دەكات بەسەر دەم وچاويدا بەكێشی بكەن بۆ نێو ئاگر، وە لە وتەيەكی تردا بەم شێوەيە هاتووە: ئەمانە يەكەم پێرێكن كە خوای گەورە ئاگری دۆزەخيان پێ گەرم دەكات.

وە (شيخ الاسلام ابن تيميە ) دەڵێت: (باشترين وچاكترين پێر ، بريتی يە لەپێری پێغەمبەران ، وە خراپترين پێر ئەوانەن كە وادەدەنێت لە پێری پێغەمبەرانن بەلآم لەئەوان نين. وە باشترين پێر لەدوای پێغەمبەران پێری زانايان وشەهيدەكان وڕاستگۆكان ودڵسۆزەكانن،

---

[1] – ئەم فەرموودەيە"صحيح"ە، (مسلم: ١٣/٥٥ – نووی)گێڕاويەتی يەوە.

وەخراپترین پێڕیش ئەوانەن کە وادادەنێن لە پێڕی ئەمان بن ،بەڵام لەئەمان نین) .

وە لەصحیح بخاری دا هاتووە لە فەرموودەی "ابی هریرە"ﷺ کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (من کان عنده لأخیه مظلمة في مال أو عرض فلیأته، فلیستحلها منه قبل أن یؤخذ ولیس عنده دینار ولادرهم ، فأن کانت له حسنات أخذ من حسناته فأعطیها هذا، والا اخذ من سیئات هذا فطرحت علیه ثم طرح في النار.) [1] واتە: هەرکەسێك ئەگەر ستەمی لەبرایەکی کرد ،یان مافێکی لەلایە لەماڵ وسامان و وەستەم وناڕەوایەکی کردووە لێی ، باپێش ئەوەی بمرێت بیداتەوە، چونکە گەر دوابکەوێت ، ئەوا دەکەوێتە ڕۆژێکەوە نەدیناری پێ یەو نەدرهەم، ئەوکاتە گەر چاکەی هەبێت لەچاکەکانی دەردەهێنرێت و دەدرێت بەخاوەن مافەکە. وەئەگەر چاکەشی نەبوو ئەوا لەخراپەکانی خاوەن مافەکە دەردەهێنرێت ودەخرێتە سەر تاوانەکانی، ئەوساتە فڕێ دەدرێتە دۆزەخەوە.

وە لەصحیح دا هاتووە لەفەرموودەی"ابی هریرە"ﷺ کە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (من اخذ شبراً من الارض بغیر حقه خسف به یوم القیامة الی سبع أرضین.) [2] واتە: هەرکەسێك بستێك زەوی بەناحەق داگیر بکات ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە بە ناخی حەوت زەویدا دەیباتە خوارەوەو ڕۆی دەکات.

وە لە"صحیحین"دا هاتووە لفەرموودەی"ابی هریرە"ﷺ کە پێغەمبەرﷺدەفەرمێت: (نارکم هذه التي یوقد بنو أدم جزء من سبعین جزءاً من نار جهنم، قالوا: والله إن کانت لکافیه، قالﷺ: فإنها قد فضلت علیها بتسعته وستین جزءاً کلهن مثل حرها.) [3] واتە: ئەم ئاگرەی ئادەمیزاد بۆ سوتاندن بەکاری دەهێنێت، بەشێکە لە حەفتا بەشی گەرمی دۆزەخ، ووتیان: ئەگەر هەرئەمەش بوایە بەس بوو ئەی پێغەمبەری خودا.

---

1 – ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە، (مسلم ١٣/٥٥ – نووی)گێڕاویەتی یەوە.
2 – ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە،(بخاری ٦٥٣٤)گێڕاویەتیەوە.
3 – ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە،(بخاری ٣٢٦٥)وە(مسلم ١٧/١٧٥ –نووی) گێڕایانەتەوە.

ئـەویش فـەرمووی: لەڕاسـتیدا دۆزەخ شەسـت ونـۆ پلـە زیـاترە لـەم. هـەر بەشێکی بەوێنەی ئەم گەرمە.

وەلـە مـسند دا هـاتووە کـە"معـاذ"ﷺدەفـەرمێت پێغەمبـەر ﷺوەسـیەتی بـۆکردم و فـەرمووی: (لا تـشرك بـالله شـيئا، وإن قتلـت او حرقـت، ولا تعقـن والـديك، وإن أمـراك أن تخـرج مـن أهلـك ومالـك، ولا تتركـن صـلاة مكتوبـة متعمـداً، فـإن مـن تـرك صـلاة مكتوبـة متعمـداً فقـد برئـت منـه ذمـةالله، وتـشربن خمـراً، فإنـه راس كـل فاحـشة ، وإيـاك او المعـصية ، فـإن المعـصية تحـل سـخط الله.) [1] واتـە: هاوبەشـی بـۆ خـودا بڕیـار مـەدە ،ئەگـەر لـەم پێناوەیـشدا بکوژرێیـت یـان بـسوتێنرێیت، وەئـازاری دایـك وباوکـت مـەدە ،ئەگـەر چـی دەریـان کـردی لـەماڵ ونێـو خزمانیـشدا، وە بـە ئەنقەسـت نوێـژی فـەرز لەدەستی خۆت مـەدە، چـونکە هەرکەسـێ بـە بـێ بیانووی دروست نوێـژ لەدەسـت بـدات ئـەوا لەپـەنای خـودا دەردەچـێت. وە مـەی"عـارەق"مەخۆنـەوە ، چـونکە سەرچـاوەی هـەموو خراپـەو بـەد ڕەوشـتی یەکـە، وەوریـا بـە یـاخی نـەبی لـەخودا، چـونکە یـاخی بـوون دەبێتـە مایـەی تورەبوونی خودا.

فـەرمودە لـەم بـوارەدا زۆر زۆرە جاتامۆژگـاری کەسـێك دەکـەین کەسـێ دەیـەوێت گـوێی خـۆی دابخـات وچـاوەکانی دابخـات وخـۆی فـڕێ بداتـە نـاو دەریـایی یـاخی بـوون وتاوەنکـاری، بەئومێـدی ئـەوەی گومـانی باشـی بـەخودا هەیە. ئەوا ئەوکەسە سەرگەردانی تەواوە.

"ابـو الوفـاء بـن العقيـل""ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت "دەڵێـت: " (پێویـستە زۆر وریـا بـین بـە ئومێـد وگومـانی بـاش بـردن بـەخودا نەخەڵـەتێین، بەتایبـەتی کاتێـك بـۆ سـێ دەرهـەم دزیـن دەسـت ببڕێتـەوە و بـۆ خواردنـەوەی چـۆڕێ مـەی داری حـەدی لـێ بـدرێت، وەئافرەتێـك بـچێتە دۆزەخـەوە بـەهۆی ئـازاردانی پـشیلەیەك، وەشـەهیدێك بـچێتە دۆزەخـەوە کاتێـك نیـەتی پـاك نـەبوو، ئـیتر چـۆن بەئومێـدی گومـانی بـاش بـردن خۆمـان دەس خـەڕۆ بکـەین)

[1] – ئەم فەرموودەیە(ضعيف الاسناد)ە، (احمد ٥/٢٣٨)وە (حاكم ١٤/١٤)گێڕایانەتەوە.

وه امـام احمـد "ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت"دەڵێـت:لـە"ابـو معاويـە"كـە "أعمش"بۆی گێڕاینـەوە لـە"سـلمان بن مـسيرە"وە لـە"طـارق بن شـهاب"رضي الله عنه يرفعـه ، ووتـی: (دخـل رجـل الجنـة في ذبـاب، ودخـل رجـل النـار في ذبـاب، قـالوا: وكيـف ذلـك يـا رسـول الله؟ قـال: مـر رجـلان علـى قـوم لهـم ضـم لايجـوزه أحـد حتـى يقـرب لـه شـيئا. قـالوا لأحـدهما:قـرب، قـال لـيس عنـدي شـيء، قـالوا لـه: قـرب ولـو ذبابـا، فقـرب ذبابـا فخلـوا سـبيله، فـدخل النـار، وقـالوا للآخـر: قـرب، فقـال: ماكنـت لأقـرب لأحـد شـيئا مـن دون الله عزوجـل، فـضربوا عنقـه فـدخل الجنـة.)[1] واتـە: پیاوێـك بـەهۆی مێـشێكەوە دەچـێتە بەهەشـتەوە ، وەیـەكێكی تـر بـەهۆی مێـشێكەوە دەچـێتە دۆزەخـەوە. ووتیـان چـۆن ئـەی پێغەمبـەری خـودا؟ فـەرمووی: دوو پیـاو بـەڕێبواری ڕێیـان دەكەوێتـە قـەومێك، ئـەم قەومـە پێـستێكیان هەیـە ، هەركەسـێك تێپـەڕێت دەبێـت قوربـانی یـەكی بـۆ بـدات، ئەگـەرنا مۆڵـەتی نـادەن تێپـەڕێت. بەیەكـەمیان دەڵـێن: قوربـانی بـدە. ئـەویش دەڵێـت:هیـچم پـێ نـی یـە بیكەمـە قوربـانی. ووتیـان تـەنها مێـشێكیش بێـت ئـەبێت. ئـەویش مێـشێكی گـرت وكردیـە قوربـانی ، ئـەوا بـەم كـارە چـووە دۆزەخـەوە. دووەمیـان ووتـی: مـن قوربـانی نـادەم. ووتیـان تـۆش مێـشێك بكـە قوربـانی. ووتـی: مـن جگـە بـۆ خـودا قوربـانی بـۆ كـەس نـادەم. كوشـتیان بـەڵام چـووە بەهەشـتەوە. جـاری وا هەیـە بـە تـەنها ووشـەیەك دەبێتـە مایـەی ئـەوەی بەدۆزەخ شاد بێت.

## گومڕابوونی نەفامان بەوەی خودا لەدونیادا نیعمەتی پێ بەخشیوە

زۆر ئـادەمیزاد بـەوە سـەرگەردان دەبێـت كاتێـك دەبینێـت خـوای گـەورە لـە دونیـادا نیعمـەت وپیـت وبەرەكـەتی زۆری ڕشـتووە بەسـەریدا، وادەزانێـت خـودا خۆشـی دەوێـت، وەلـە قیامەتیـشدا زۆرتـری پـێ دەبەخـشێت. بـەم شێوەیە توشی گومڕایی دەبێت.

---

[1] - لە كتێبی"الزهد"ی(امام احمد: ل١٥)دا هاتووە.

امـــام احمـــد دەگێڕێتـــەوە لەفـــەرموودەی"عقبـــە بـــن عـــامر"رضي الله عنه کەپێغەمبـــەرﷺفەرموویـــەتی: (اذا رأیــت الله عزوجــل یُعطــي العبــد مــن الدنیا علی معاصیة ما یحب ، فإنما هو استدراج، ثم تلا قوله عز وجل: (فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُـواْ بِمَـا أُوتُـواْ أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ.. الأنعـام: ٤٤) [1] واتـە: ئەگـەر کەسێکتان بینـی سـوور بـوو لەسـەر تاوانکـاری ویـاخی بـوون، لەهەمانکاتـدا خـوای گـەورە نیعمـەتی دەڕژانـد بەسـەریدا ، واتـایی ئـەوە نـی یـە کـەخودای گـەورە خۆشـی دەوێـت بـەڵکو ئەمـە کەمەنـدکێش کردنێتـی. پاشـان ئـەم ئایـەتی خوێنـدەوە ( (فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُـواْ بِمَـا أُوتُـواْ أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَـإِذَا هُـم مُّبْلِسُونَ.. الأنعـام: ٤٤..... واتـە: پاشـان کاتێـك ئـەو بەرنامـــەو ڕێبـــازەی کـــە یادیـــان خرابـــوەوە فەرامۆشـــیان کـــرد، ئێمـــەش دەروازەکـــانی هـــەموو شـــتێکمان بـــۆ واڵا کردنـــەوە 'نـــازو نیعمـــەتمان ڕژانـــد بەسـەریاندا' هــەتا کاتێــك دڵخــۆش وشــادومان بــوون بــەوەی کــەپێیان دراوە ئـیتر لەناکاوێکـدا گرتمـانن وهـەموویانمان سـەرگەردان وڕیـسوا کـرد پاشـان بەوپەڕی نائومێدی بوونەوە بەغەم وپەژارەوە تیاچوون) ) .

هەنـدێك لـە پێـشینەکان"سـلف" دەڵـێن: (هـەرکاتێك هەسـتت کـر کـە خـوای گـەورە نیعمـەتی زۆری بەسـردا ڕشـت و تـۆش سەرپێـچی فەرمانـەکانی دەکـەیت، ئـەو کاتـە وریابـە ئـەوە کەمەنـد کـێش کردنـە.ئـەوەتا خـوای گـەورە دەفەرمووێت: (وَلَوْلَا أَن يَكُونَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِـدَةً لَجَعَلْنَـا لِمَـن يَكْفُـرُ بِـالرَّحْمَنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فَضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ * وَلِبُيُـوتِهِمْ أَبْوَابًـا وَسُـرُرًا عَلَيْهَـا يَتَّكِؤُونَ * وَزُخْرُفًا وَإِن كُلُّ ذَلِكَ لَمَّا مَتَـاعُ الْحَيَـاةِ الـدُّنْيَا وَالْـآخِرَةُ عِنـدَ رَبِّـكَ لِلْمُـتَّقِينَ.... زخـرف:٣٣-٣٥) واتـە: ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبوایـە کـە خـەڵکی هـەموو دەبوونـە یـەك پێـر"لـەبێ بـاوەڕ وتاوانکاریـدا"ئـەوا هەرکـەس بـاوەڕی بـەخوای گـەورەو میهرەبـان نەبوایـە سـەقفی خانووەکـەیمان لـە زیـو بـۆ دروسـت دەکـرد، هـەروەها قادرمـــەو پێپیلکانـەکان و ئاسنـسوارمان بـۆ

[1] - ئـەم فەرموودەیـە(ضـعیف الاسـناد وهـو صـحیح لغـیره)ە،(احمـد ١٤٥/٤)و(طبرانـي ٣٣٠/١٧)گێڕایانەتەوە، بڕوانە(الصحیحیە- ٤١٣).

دەکـردن بەسـەریاندا سـەربکەون، وەبـۆ ماڵـەکانیان قـاپی ودەروازەی زیـو وکورسـی و قەنەفـەی ڕازاوەشمـان پـێ دەبەخـشین تـا پـاڵ بدەنـەوەو شـانی لەسـەر دابـدەن، بەهـەموو جـۆرە نـەخش ونیگـارێکی جـوان وڕازاوە "دارو دیـوار وسـەقف وکـەل وپـەلی ناوماڵـەکانیانمان دەڕازانـدەوە"جـا ئـەوە هەرهـەمووی خـۆش گـوزەرانی ژیـانی دونیـا نـەبێت هیـچی تـر نـی یـە. لەکاتێکدا کـە ژیـانی پـڕ خۆشـی وبەختـەوەری ونـەبڕاوە لای پـەروەردگارت بـۆ خواناسان ودوورە پەرێزانە لە گوناه).

هـەروەها خـوای گـەورە وەلامـی دروسـتی ئـەو کەسـانە دەداتـەوە کەبـەوە دڵی خۆیان خـۆش دەکـەن. کەدەفـەرمێت: (فَأَمَّـا الْإِنسَـانُ إِذَا مَـا ابْتَلَـاهُ رَبُّـهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ * وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَـاهُ فَقَـدَرَ عَلَيْـهِ رِزْقَـهُ فَيَقُـولُ رَبِّـي أَهَـانَنِ.... الفجـر: ١٥-١٧) واتـە: کاتێـك ئـادەمیزاد لەلایـەن پـەروەردگاری یـەوە تـاقی دەکرێتـەوە ڕێـزی لـێ دەنێـت وناز ونیعمـەتی بەسـەردا دەڕژێنێـت، دەڵێـت: وادیـارە پـەروەردگارم خۆشـی دەوێـم وڕێـزم هەیـە لـەلای،بـەلام کاتێـك تـاقی دەکاتـەوە بەکـەم کردنـەوەی ڕزق، وەلێـی دەگرێتـەوەو دەڵێـت پـەروەردگارم خۆشـی نـاوێم وڕقـی لێمـەو ڕیـسوای کردووم، نەخێر...

کەواتـە هـەموو نیعمـەت وبەخشـشێك لەلایـەن خـوداوە واتـی خـەلات کـردن نـی یە، وە هـەموو نەهامـەتی یـەك کەلەلایـەن خـوداوە دێتَ واتـای ڕیـسواکردن نـی یـە. بـەڵکو هەنـدێ جـار بەنەهامـەتی بەنـدەی خـۆی تـاقی دەکاتـەوە و بەنیعمەتی زۆریش کەسی تر ڕیسوا دەکات.

وەلـە"جـامع" ترمـذي دا هـاتووە کەپێغەمبـەرﷺدەفـەرمێت: (ان الله یعطـي الـدنیا مـن یحـب ومـن لایحـب ، ولا یعطـي الایمـان الا مـن یحـب.)[1] واتـە: خـوای گـەورە دونیـاو خۆشـی یـەکان بەوکەسـانە دەدات کـە خۆشـیانی دەوێـت وبەوانەشـی کەخۆشـیانی ناوێـت، بـەلام بـاوەڕ تـەنها بـەو کەسـانە دەدات کە خۆشی دەوێن.

---

[1] —ئەم فەرموودەیە"حسن"ە ، (احمد ١/٣٨٧) وە(حاكم ٤/١٦٥ وصحیحه اسنادە).

وە پێرێک لەسەلەف دەڵێن: دوور نی یە کەسێك بەنیعمەتەکانی خودای گەورە کەمەندکێش بێت وخۆی نەزانێت ، وەدوور نی یە کەسێك بەپەردەپۆشی کردنی خودا بۆ تاوانەکانی گومڕا ببێت بەخۆی نەزانێت ، وەهەروەها کەسێك بە پێدا هەڵدانی خەڵکی بۆی توشی فیتنە بووبێت ، بەڵام بەخۆی نەزانێت.

## گەورەترین گومڕایی بوون ئەوکەسەیە کەبەدونیا گومڕادەبێت

گەورەترین گومڕایی ئەوجۆرەیە کە مرۆڤ سەرگەردانی دونیانو خۆشی یەکانی بێت و قیامەتی بیربەرێتەوە. تەنانەت هەندێك لەگومڕایان دەڵێن: دونیا وەك پارەیەکی نەقد وایە ،بەڵام قیامەت وەك قەرز وایە.

یاخود هەندێکی تر دەڵێن: دونیا پارەیەکی لەدەستە ، قیامەت پارەیەکی دوورە دەستە.

یاخود دەڵێن: خۆشی یەکانی دونیا لەبەر چاوە ، بەڵام خۆشی یەکانی قیامەت گوماناوی وخەیاڵە.

ئەمانە لە ترسناکترین جۆرەکانی لەخشتە بردنی شەیتانە بۆ نێچیرەکانی ، بگرە ئاژەڵ وگیان لەبەرەکان گەلێك لەم پێرە هۆشیارترن، چونکە ئاژەڵ وگیانلەبەرەکان کاتێك هەستیان بەمەترسی کرد بەزۆریش لێیان بدەیت بەرەورووی نا ڕۆن. بەڵام ئەمانە ڕووبەڕووی هەڵدێرو تیاچوون هەنگاو دەنێن بەشێوەیەکی مل هوڕانە.

وەئەوانەی کەزانیاریان هەیەو ئاگادارن بەڕاستی خوداو پێغەمبەرەکانی ومل هوڕانە بەدونیا سەرگەردان بوونە، لەڕۆژی قیامەتدا شەرمەزارترین پێڕن کە ئەم هەموو ڕاستی یەیان زانیوەو کاریان بۆ نەکردووە.

## وەڵام دانەوەی ئەم گومانانە:-

ئەو ووتەیەی کەدەڵێت: (پارەیەکی بەدەست نەك پارەیەکی دوورە دەست) .

وەڵامەکەی: ئەگەر بڕوبەهاو نرخ وسەنگی پارەی دوورە دەستەکەو پارەی دەستەکە هاوسەنگ بوون و وەك یەك بوون ، ئەوا بێ گومان

پارەی بەدەستەکە"دونیاکە"باشترەو چاکترە، بەڵام ئەگەر پارەی دوورە دەستە نرخ وبەهاو سەنگی وزۆرتر وباشتر بوو ئەوساتە بێ گومان پارەی دوورە دەستەکە باشترە. جا دونیا لەچاو قیامەتدا چ نرخ وبەهایەکی هەیە؟

وەژیانی دونیا بەهەموو خۆشی یەکانی یەوە وەك هەناسەیەکی قیامەت وایە. هەروەکو لە مسند ی أمام أحمد دا هاتووە لەفەرموودەی"المستورد بن شداد"کە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (ما الدنيا في الاخرة الا كما يدخل احدكم اصبعه في اليم، فلينظر بم يرجع؟)[1].واتە: نمونەی کەم بایەخی و بچوکی دونیا لە چاو قیامەتدا وەك نمونەی کەسێکە کە پەنجەی دەستی بکاتە ناو ئاوێکەوە پاشان دەری بهێنێت. ئایا چەندی پێ یە لەو ئاوە چی هێناوە لەگەڵ خۆیدا؟.

جا بەقوربان کردنی پارەی دوورە دەستە باشەکەبۆ پارەکەم بەدەستەکە چ گەوجی ونەفامی یەکە. بەواتایەکی تر لەدەست دانی قیامەتێکی هەتاهەتایی وپڕ لەخۆشی وبەختەوەری وهەمیشەیی بۆ تەمەنێکی کەم وپڕ لەناسۆر ودەدەسەری وخۆشی یەکی کاتی.... کامیان جێگەی هەڵسەنگاندنی ژیرو عەقڵە؟!

بەڵام ووتەکەی تر کە پوختەکەی دەڵێت: (شتێکی دڵنیایی ،بەشتێکی گوماناوی ناگۆڕمەوە)

واتە دونیا دڵنیایی یەو قیامەت خۆشی یەکانی جێگای گومانە...

ئەوە پێی دەوترێت: تۆ لەم دوو حاڵەتە بەدوور نیت ، یان گومانت لە بەڵێن وپەیمانەکانی خودای گەورەو پێغەمبەرەکانی هەیە سەبارەت بەقیامەت، یاخود دڵنیایی یەکی تەواوت پێی هەیە. جا ئەگەر دڵنیایەکی تواوت پێی هەیە، بە چ ژیری وهۆشیاری یەکەوەدەست بەرداری قیامەتێك وخۆشی یەکی نەبڕاوە دەبیت بۆ چەند ڕۆژێکی کورت وکاڵی دونیا؟!

---

[1] – ئەم فەرموودەیە"صحيح"ە، (احمد ٤/٢٢٩)وە (ترمذي ٢٣٢٣)وە بە (حسن صحيح)ی دادەنێن.

وەئەگــەر گومــان و دوو دڵیــت هەیــە ئــەوا دەســت بــەجێ بکــەوەرە پیاچــوونەوە وردبوونــەوەو لێکدانــەوەی ئایەتــەکانی خــوای گــەورە کــەباس لــەبوون تــاکێکتی وهێــز وتوانــا دەکــات، کــەباس لەڕاســتی ودروســتی پەیامبەرەکان دەکات ، تا بە تەواوی ڕاستی ودڵنیایت بۆ دروست بێتەوە.

جـا لـە ژێـرو ھـزری ھـیچ کەسـێك جێگـەی نابێتـەوە وەبڵێـت خوایـەکی بـەتواناو بڵنـد وبەدەسـەڵات دانـاو زانـاو بیـسەرو بینـەر... دەسـت بـەرداری ئـەم ھـەموو ژیـان ودونیایـە دەبێـت. لـێ پرسـینەوەو پاداشـت وسـزا ئـەنجام نـەدات. ئـەم حاڵەتـە مەحاڵـە بـۆ پادشـایەکی ئـادەمیزادی بـۆ وڵاتەکـەی، جـا چـۆن شـیاوی گـەورەیی خـودای مەزنـەو بەدانایـە. جـا ئەگـەر مـرۆڤ بـەوردی لەدروسـت بـوونی خـۆی وردبێتـەوە کـە لـەدڵۆپێك ئـاوەوە بـۆ ئـەم ڕێـك وپێکـی یـەی کـە ئێـستا ھەیـەتی. کـێ ئـەم ھـەموو گرنگـی یـەو چاودێری یـەی کـردووە، قۆنـاغ بـەقۆناغ گەشـەی پـێ کـردووە تابووەتـە ئـەم مرۆڤـە. جـا چـۆن خـودا دروسـت کراوێکـی وا مـەزنی پـشت گـوێ دەخـات ومـاف وسـنوور وئـەرکی بـۆ دیـاری ناکـات؟ جـا ئەگـەر بەچـاوی تـێ ڕامانـەوە تەماشـای چـوار دەوری خۆمـان بکـەین لەوانـەی کـەدەیانبینین و لەوانـەی کـە نایـانبینین ھـەر ھـەموو ئەمانــە بەڵگــەی تــاك وتــەنهایی و ڕاســتی خــودا ناســەلمێنن کــە"قورئــان" ووتەی خودایە؟! کە خـوای گـەورە بـۆ ئـەم حاڵەتـە دەفـەرمێت: (فـلا أقـسم بما تبصرون * وما لاتبصرون * انــه لقــول رســول كــريم... الحاقــة:٣٨-٤٠ ) واتـە: سـوێند بێـت ئـەوەی کـە دەبیینـن و وەئـەوەی کـە نـایبینن ئەمـە ووتـەی خوای گەورەیە.

ھـەروەھا بەڵگـەی زۆرمـان ھێنایـەوە لەسـەر ئـەم بابەتـە، تەنانـەت خـودای گـەورە دەفـەرمێت: (وفي أنفــسكم افــلا تبــصرون... الــذاريات: ٢١) واتـە: بەڵگــەکانمان لــەدەروونی خۆتانیــشدا ھەیــە، ئایــا نــابینی بەتــەنها مــرۆڤ بەڵگەی لەسەر تاکی ودانایی خوای گەورەیە.

گومڕابــوونی مرۆڤــەکان بــۆ دوو ھۆکــار دەگەڕێتــەوە کــە ئــەویش ھۆکــاری بەڕاست زانین ودڵنیابوونە بە بوون، یاخود درۆکردن وگومان بردنە.

## باوەڕ بوون بەقیامەت بەڵام تەمەڵی لەخواپەرستیدا

ئەگەر ووترا: ئەگەر دڵێك باوەڕی تەواوی بەقیامەت و پاداشت وسزا هەبێت، کەچی لەهەمان کاتدا زۆر سست وتەمەڵە لەئەنجام گەیاندنی ئەرکی خودا پەرستیدا؟

ئایا ئەگەر کەسێك دڵنیا بێت کە سبەینێ لەلایەن پادشایەکەوە خەڵات دەکرێت، یاخود سزا دەدرێت، ئایا ئەو شەوە وەك شەوانی تر بەبێ دوودڵی وراپایی بەسەر دەبات؟! ئایا بیر لەسبەینێ ناکاتەوە؟ وەخەمی بۆ ناخوات وخۆی بۆ ئامادە ناکات؟

ووترا: بەڵێ زۆر ڕاستە ئەمە پرسیارێکی زۆر دروستە زۆربەی خەڵکی دەگرێتەوە. کە جێی سەرسوڕمانە ئەم تەمەڵی وبێ باکی یە! وەئەمەش بێ هۆکار نی یە ، وەهۆکارەکانی بریتین لە:

یەکەم: نزمی ئاستی زانستی وکەمی وکوڕی لە دڵنیایی بوونیدا. هەرکەسێك پێی وابێت کەئاستی زانست چەسپاوەو زیادو کەم ناکات، ئەوە بەهەڵەدا چووە. ئەوە "ایبراهیم"ی پێغەمبەر"س.خ" پرسیار لەخودای گەورە دەکات ودەیەوێت شێوازی چۆنی یەتی زیندوو کردنەوەی مردووەکانی پێ نیشان بدات، کەلەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی تەواوی هەبوو بەڕاستی ئەم کارە، بەڵام ویستی دڵنیایی تەواوی بێ کەم وکوڕی بۆ دروست ببێت، واتە سەرچاوەی ئەم پرسیارە لە گومان ودوو دڵی یەوە نەهاتووە، بەڵکو ویستی دڵنیایی بوونی یەکجاری بۆ دروست بێت.[1]

وەلە مسند ی امام احمد دا هاتووە کە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (لیس المخبر کالمعاین)[2] واتە: هیچ کاتێك هەواڵ دەر وەك بینەری ڕووداوەکە نی یە.

هەرکاتێك نزمی لەئاستی زانستدا بوو کاریگەری لەسەر دڵ کەم دەبێت ولێشاوی حەزو ئارەزوو وسەرقاڵی بەدونیاوە هێرشی بۆ دەهێنێت و شەیتان کاریگەری خۆی بۆ دروست دەکات لەسەر دەروونی ودنیایی لا

---

[1] – بڕوانە (شرح مسلم للنووی ٢/١٨٣ – ١٨٤) وە(فتح الباری) کەلەم بارەیەوە زۆر وتراوە.

[2] – ئەم فەرموودەیە"صحیح"ە،(احمد ١/٢١١٥ – ٢٧١) وە (حاکم ٢/٣٢١) گێڕایانەتەوە.

شـرين دەكـات و بـێ ئاگـايى بـيرو هۆشـى دەگرێـت وبـەم چەشـنە بـاوەڕ ودڵنيايى بەر تەسك دەبنەوەو هەرەس دەهێنێت.

لەبـەر ئـەم هۆيەيـە مرۆڤـەكان لەئاسـتى بـاوەڕو كـاردا جياوازيمـان هەيـە، تەنانـەت جـارى وا هەيـە لاوازى بـاوەڕ دەگاتـە ئاسـتى تـەنها گـەردێك"مثقـل ذرە" لەدڵدا.

وەسـەرجەم ئـەم هۆكارانـە دەگەڕێتـەوە بـۆ لاوازى لـەبينايى"البـصيرە"و ئـارامگرتن"الـصبر" هەربۆيـە خـواى گـەورە مـەدح و وەسـفى كەسـانى ئـارام گر و دڵنيابوو دەكـات ودەفـەرمووێت: (وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّـةً يَهْـدُونَ بِأَمْرِنَـا لَمَّـا صَـبَرُوا وَكَـانُوا بِآيَاتِنَـا يُوقِنُـونَ.... الـسجدة:٢٤) واتـە: ئێمـە نەتـەوەى ئيـسرائيلمان كـردە پێـشەوا، وەدەسـەلاتمان پـێ بەخـشين، فـەرمانيان دەكرد، چونكە ئارامگربوون وباوەڕى تەواويان هەبوو بە ئايەتەكانمان.

## گومـانى بـاش بـردن بـەخودا بزوێنـەرى كـارى چـاكەيە نـەك كـەم تەرخەمى

پێـشتر ڕوونمـان كـردەوە جيـاوازى زۆر هەيـە لـەنێوان گومـانى بـاش بـردن بـەخواى گـەورە، وەگومڕابـوون. وە ڕونمـان كـردەوە گومـانى بـاش بـردن هەميـشە بزوێنـەرى كـارى چـاكەو چاكەخوازى بـووەو هانـدەرى ڕێگـەى ڕاسـت ودروسـتى خـودا پەرسـتى يـە ، چـونكە گومـانى بـاش بـردن واتـاى تكاكـارى بەندەيـە بـۆ خـواى گـەورە و ملكەچـى كـردنێتى، ئـەوا ئـەو تكاكـارى يـە ڕاسـت ودروسـتە ، بـەلأم هەركەسـێك تكاكـارى يەكـەى هانـدەرى كـەم تەرخـەمى و بێ پەڕوايى بێت ئەوا گرتنەبەرى ڕێگاى گومڕاييە.

نمونـەى ئەمانـە وەكـو جوتيارێـك وايـە ، كەئەگـەر زەوى يەكـەى بـە چـاكى وباشـى بكێڵێـت وچـاودێرى بكـات، ئـەوا چـاوەڕوانى بەرهـەمى چـاك وبـاش وپـاك دەكـات، بەلأم ئەگـەر كـەم تەرخـەم وبـێ پـەڕوا بێـت و وردەكـارى نـەكات لـەكێلان وبـژارو چـاودێرى كردنيـدا ، ئـەوا چـاوەڕوانى بەرهـەمى بـاش نابێـت، بـەلأم هەميـشە گومـانى بـاش بـەزەوى يەكـە دەبـات، ئايـا هـيچ سـوودێكى هەيە؟

یاخودا کەسێك بەبێ ئەوەی بچێتە لای خێزانەکەی تەنها بەئومێد وگومانی باش بردن منداڵی دەبێت؟ یاخود بەبێ کۆشش وخوێندن وهەوڵدان دەبێتە باشترین وچاکترین زانای سەردەمی خۆی؟

بەهەمان شێوە ئەگەر هەرچەندە ئومێدی باش وگومانی چاك بە خودای گەورە بەرێت بەڵام کۆشش وخودا پەرستی نەکات ئایە پلە بەرزەکانی بەهەشت بەدەست دەهێنێت.؟

وە خوای گەورە دەفەرمێت: (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أُوْلَـئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ اللّهِ...... البقرة:١١٨) واتە: "ئەو کەسانەی کەباوەڕدارن وکۆچیان کردوەو تێکۆشاون لەپێناو خوای گەورەدا ئەوانە بەڕاستی تکاکاری ڕەحمەت و بەزەیی خوا دەکەن "

تەماشای ئەوە بکە کە تکاکاری ئەم پێرە چۆن بزوێنەری کاری چاکەو هەوڵدانیان بوە.

دەنهێنی ئەم بابەتە ئەوەیە کە:ئومێدو تکاکاری وگومانی باش بردن بەخوای گەورە پێویستی بەگرتنە بەری هۆکارەکانێتی.کەپێویست دەکات بۆ بە ئەنجام گەیاندنی کە خوای گەورە لەشەرع و بەرنامەو سزاو پاداشتی دا دیاری کردوە. کەپێویستە دەستی پێوە بگرین.پاشان ئومێدو تکاوگومانی باش بەخودا بەرین کەلەسەر کاری چاکە بەردەوامان بکات لە سستی وکەم تەرخەمی بمان پارێزێت.

## جیاوازی لە نێوان تکاکاری و هیوا خوازی دا

پێویستە کە هەرکەسێ کەتکاکاری دەکات (الرجا ) کەپەیوەست بێت بەسێکاری سەرەکیەوە:

یەکەم:خۆش وویستنی ئەوەی کەتکاکاری بۆ دەکات

دووەم:ترس لەدەست چوونی

سێ یەم:هەوڵدان وکۆشش کردن بەگوێرەی توانا بۆ بەدەست خستنی

جاهەر (تکاکاریەك) ئەم سێ شتەی تێدا نەبوو.ئەواتەنها (هیواخوان) یەکی بێناوەڕۆکە.

(تکاکــــاری ) جیـــاوازه لـــه (هیواخـــوازی) .تکاکـــار هەمیـــشه دەترســـێت_وەئـــەوی بترســـێت _خێـــرا دەکـــات تائـــەوەی ئەنجامەکـــەی لەدەســـت نەچـێت.لــە (الجـامع الترمـذی ) دا هــاتوه لەفــەرموودەی (أبـی مریـرة) ﷺ کەپێغەمبــەر ﷺدەفــەرمێت : (مــن خــاف أدلج ومــن أدلج بلـغ المنــزل، الا ان ســلعة الله غاليـــة، الا ان ســلعة الله الجنـــة.)[1] واتـــە:ئـــەوی بترسـێت هەڵـدەدات وشـەو دەگـەڕێت هـەنگاو دەنێـت وەئـەوەی هـەنگاو بنێـت وەهەوڵـدات.دەگاتــە شـوێنی مەبەسـت.بەڕاسـتی کاڵاوخـەڵاتی خـوای گـەورە بەنرخ وبەبەهایە.کاڵای خوداش بەهەشتی بەرینە.

هــەروەها خـودای گـەورە بەهــەمان شـێوە ی تکاکـاری (الرجـا ) تـرس (الخـوف) یـشی کـردوە بەبزوێنـەری کـاری چـاکە وچـاکە خـوازی پێکـەوە دوو فاکتـەری هەمیـشەی کـردەوەی چاکەن.هـەروەکو دەفـەرمێت: (إِنَّ الَّـذِينَ هُـم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ * وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ * وَالَّـذِينَ هُـم بِـرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ * وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُـمْ إِلَـى رَبِّهِـمْ رَاجِعُـونَ * أُوْلَئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَـا سَـابِقُونَ..... المؤمنـون: ٥٧-٦١) واتـە: ئـــەو کەســـانەی کەترســـی پـــەروەردگاریان لەدڵدایـــەو دەترســـێت لێیـــان بڕەنجێـــت ئەوانـــەش بـــڕوا بەئایـــەت وفەرمانـــەکانی پـــەروەردگاریان دەهێـنن.ئەوانەشـی هـاوەڵ وهاوبەشـی بۆپـەروەردگار بڕیـار نـادەن.ئەوانـەش کـــە دەبەخـــشن لـــەزەکات و خێـــر دڵیـــان دەترســـێتنەوەکو لێیـــان وەرنـەگرێت.چـونکە ئـەوان بێگومـانن کـەبۆ لای پـەروەردگاریان دەگەڕێنـەوە. ئا ئەوانە پەلەدەکەن پێشبڕکێ دەکەن لە ئەنجام دانی هەموو چاکەیەك"

وەلـــە (جـــامع) ی (ترمـــذی) دا هـــاتوە.لەفـــەرمودەی عائیـــشە‌ﷺ کـــە دەڵێـت: (سـألت رسـول الله ﷺ عـن هـذه الايـة، فقلـت: اهـم الـذين يـشربون الخمــر ويزنــون ويــسرقون؟ فقــال‌ﷺ: لا يــا ابنــة الــصديق، ولكــن الــذين يــصمون ويـصلون ويتــصدقون ، ويخـافون ان لاتقبـل مـنهم اولئـك يـسارعون

---

[1] -ئـەم فەرموودەیـە"حـسن"ە ،( ترمـذي ٢٤٥٠) وە (حـاكم ٤- ٣٧٠٧) وە صـحیحە بڕوانـە (الصحيحه : ٩٥٤).

في الخيرات.)[1] واتـه: خـاتوو عائيـشه فـهرمووى: پرسـيم لهپێغهمبـهرى خـوداﷺ سـهبارهت بـهم ئايهتـه، ئايا باسـى ئـهو كهسانه دهكات كـه مـهى دهخۆنـهوهو زينـا دهكـهن دزى لـهماڵى خـهڵكى دهكـهن؟ پێغهمبـهرﷺ فـهرمووى: نـهخێر ئـهى كـچهكهى صـديق. بـهڵكو ئهوانـهى ڕۆژوو دهگـرن ونوێژدهكـهن خێروچاكه دهكـهن لهههمان كاتـدا دهترسـن كـه خـودا لێيـان قبوڵ نهكات، ئهمانه بهڕاستى پێش بڕكێ دهكهن لهكارى چاكهدا.

## ترس وتكا لهژيانى هاوهڵاندا[2]

خـواى گـهوره وهسـف وپێناسـهى خـۆش بـهختان دهكـات بـه پڕوپـوختى لهگـهڵ ترسـدا، وه وهسـفى بهدبهختـهكان دهكـات بهخراپـهو هێمنـى وئاسايـشى. هـهر بۆيـه گـهر لـهم سـۆنگهيهوه تهماشـاى ژيـانى هـاوهڵانى پێغهمبـهرﷺ بكـهيت دهبينيـت كـه لهگـهڵ پڕوپوختيـان لهگـهڵ كـارو تـێ كۆشاندا هێشتا دهت رسان لهخوداى گهوره.

## حاڵى ابو بكرى صديق رضي الله عنه

ئـهوه "ابـو بكـر"ه دهڵێـت: هيـوا خـواز بـوو كـه مـن تـهنها تاڵـه موويـهك بوومايـه لـه سـنگى باوهڕدارێـك. وه"احمـد" دهگێڕێتـهوه وههـهروهها دهڵێـت: زمانى خۆى دهگرت ودهيووت:" ئهمه سهرچاوهى تاوانهكانمه".

وهزۆر جـار لهترسـى خـودا دهگريـاو دهيـووت: بگـرێن، ئهگـهر نـهگريان خۆتان بگرێنن.

وههـهر كاتێـك كهههڵدهسا بـۆ نوێـژ كـردن وهك دارێك لهترسـا ڕادهوهسـتا. جارێكيـان باڵندهيـهكى ڕزگـار كـردو ووتـى: هـهر نێـچيرێك ڕاوبكـهيت ويـان دارێك ببڕيت، ئهوا لهيادى خوات خستووه.

كاتێـك لهسـهرهمهرگدا بـوو ، بـهخاتوو عائيـشهى ووت: (ئـهى كـچهكهم مـن لـهماڵ وسـامانى مهسـوڵمانان ئـهم عابايـهو شيردۆشـێك ئـهم خزمـهت كارهم ههيه، خێرا بيان گهڕێنهوه دهستى عومهرى كوڕى خهتاب رضي الله عنه ) .

---

[1] – ئهم فهرموودهيه"صحيح"ه، (ترمذي ٣١٧٥)وه (ابن ماجه ٤١٩٨).

[2] – بڕوانه (موسوعه الصحابه)و پێشهكى كتێبى(الاوائل من الصحابه)

وەدەڵێت: (والله ی ئاواتە خواز بووم دارێك بوومایەو بخورامایەو گازم لێ بگیرایە ) .

وە"قتادە"دەڵێت: (بیستوومە کە ابو بکر فەرموویەتی: ئاواتە خواز بووم کە لاسکە سەوزەیەك بوومایە کرم بیخواردمایە ) .

## حاڵی عمری کوڕی خەتابؓ

ئەوەتا عمری کوڕی خەتابؓ سورەتی "الطور"ی دەخوێندەوە تا گەیشتە ئایەتی (ان عذب ربك لواقع...الطور:٧) دەستی کرد بەگریانێکی زۆر لەتاوندا نەخۆش کەوت وخەڵکی سەریان لێ دەدا.

لەکاتی سەرەمەرگیدا بەکوڕەکەی ووت: (ئەمە چی دەکەیت، ڕوومەت وگۆنام بخەرەسەر زەوی تا خوای گەورە بەم دیمەنە ڕەحمم پێ بکات)

هەروەها ووتی: (قوڕبەسەرم دایکە...ئەگەر خودا لێم خۆش نەبێت..."سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە"پاشان یەکسەر گیانی سپارد)

.

شەوانە قورئانی دەخوێندەوە کە دەگەیشتە هەر ئایەتێك بیهەژاندایە وبترسایە، لەتاواندا چەند ڕۆژێك نەدەهاتە دەرەوە وخەڵی وایان دەزانی نەخۆشە. تەنانەت ئەوەندە گریا بوو دوو خەتی ڕەش لەسەر دەم وچاوی دەردەکەوت.

"عبدالله کوڕی عباس"ؓ پێی دەڵێت: خوای گەورە لەسەر دەستی تۆ میسری ئازاد کردو چەندین فەتحی گەورە لەسەر دەستی تۆ هاتە دی، ئەویش فەرمووی: ئاواتە خوازم بەس تەنها لەقیامەتدا دەربازبم ، نەپاداشتم هەبێت نەتاوان.

## حاڵی عثمانی کوڕی عەفانؓ

عثمانی کوڕی عەفانؓ کاتێك لەسەر گۆڕێك ڕابوەستایە ئەوەندە دەگریا تاڕیشی تەڕ دەبوو. وەدەڵێت: (ئەگەر من لەنێوان بەهەشت ودۆزەخدا بم ،وەنەزانم بۆ کامیان ڕەوانەم دەکەم، لەوێدا ئاواتە خوازم ببمە خۆڵەمێش پێش ئەوەی بزانم بۆ کام لایان دەمنێرن ) .

## حاڵی علی کوڕی ئەبی تالبرضي الله عنه

ئـەوە علـی کـوڕی ئـەبی تاڵیبـە کـە زۆر دەترسـا لەدووشـتی سـەرەکی هیـوا درێژی وشوێن کەوتنی حەزو ئارەزووەکان.

یەکـەمیان "هیـوا درێـژی یـە" قیامـەت بیردەباتـەوە، بـەلآم شـوێن کـەوتنی ئارەزووەکـان ڕێگـری دەکـات لـە حـەق و ویـستی. جـا وادونیـا بـەرەو ئـاوابوون دەچـێت وقیامــەت سـەرهەڵدەدات ، جـا هەریەکـەیان کـەس وڕۆڵـەی خـۆی هەیـە. وریـا بـن و ببنـە ڕۆڵـەی قیامـەت و دونیـا وەلانـێن. ئـەمڕۆ تـەنها کـارەو سبەینێ تەنها لێ پرسینەوەیە.

## حاڵی ئەبو درداءرضي الله عنه

دەڵێـت (ئـەو شـتەی کـەمن زۆر لێـی دەترسـم ، ئەوەیـە کەلـەڕۆژی قیامەتـدا لـێم بپرسـن وبڵـێن: ئـەبو دردا ئـتۆ فێـری زانـست بـووی، ئایـا کـارت پێ کردووە ؟ )

وەهەمیـشە دەیـووت: (ئەگـەر ئـەتان زانـی دوای مـردن چیتان بۆ ئامـادە کـراوە، ئـەوا نـان وئاوتـان پـێ نـەدەخورا بەئاسـانی. وەلەماڵـەکانتان خۆتـان نـەدەگرت ، بـەڵکو بەرەودەشـت ودەرەکـان هـەڵ دەهـاتن وسـنگتان دەکوتـا وبۆخۆتـان دەگریـان. وەمـن ئاواتـە خـواز بـووم دارێـك بوومایـەو بخورامایـە ) ..

## حاڵی عبدالله ی کوڕی عباسرضي الله عنه

ئەوەندە دەگریا چاوەکانی شۆڕ ببونەوە ئەوەندە دەگریا.

## حاڵی ئەبو ذررضي الله عنه

دەیـووت: (ئاواتــە خوازبـووم دارێـك بوومایــە ، یـاخود هــەر دروسـت نەکرامایە. وەکاتێـك ویـستیان هاوکـاری بکـەن لەلایـەن دەوڵەتـەوە ووتـی: مـن پێویـستم پێـی نـی یـە، چـونکە بزنێکمـان هەیـە دەیفرۆشـین و وەگـوێ درێـژێکمان هەیـە بـۆ بارهـەڵگرتن، خزمـەتکارێکمان هەیـە هاوکاریمـان دەکـات ، وەعابایـەکم هەیـە. وەمـن دەترسـم لەسـەر ئەمانـە توشـی لـێ پرسـینەوە بم لە قیامەتدا ) .

### حاڵی تەمیمی داریﷺ

شەوێکیا تەمیم ی داری سورەتی جاثیە ی دەخوێندەوەتا گەیشتە ئایەتی: (أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُم وَمَمَاتُهُمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ... الجاثية:٢١) واتە: ئایا ئەوانەی کەتاوانکاریان ئەنجام داوە وای دادەنێت کەلەگەڵ ئەوکەسانەدا وەك یەکن کە باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکەیان ئەنجام داوە، لەژیان ومردنیاندا زۆر بەهەڵەدا چوون.

ئیتر لەترساندا دەگریاو هەردووبارەی دەکردەوە تاوەکو ڕۆژ دەبووەوە.

### حاڵی ئەبو عوبیدەی کوڕی جەراحﷺ

ئەبو عوبیدە دەڵێت: زۆر ئاواتە خوازم کەمن مەڕێك بوومایەو بکرامایە قوربانی وسەر ببڕامایە و گۆشتم بخورایە.

لەم بوارەدا ڕووداو و ووتەی زۆر هەن کە درێژە دەکێشێت، تەنانەت "بخاری "لە (صحیح ) ەکەیدا بابەتێکی لەم بوارەی لەژێر ناونیشانی"باب خوف المؤمن ان یحبط عمله، وهو لایشعر"دا داناوە.

"**ابراهیم التیمی**"دەڵێت: (هەرکاتێك بەراوردی نێوان ووتەو کردەوەی خۆمم کردبێت ، مەترسیم بۆ دروست بووە لەوەی کردەوەکانم ووتەکانم بەدرۆ بخاتەوە. )[1]

"**ابن ابی ملیکە**"دەڵێت: (سیٚ لەهاوەڵانی پێغەمبەرم بینوە هەر هەموویان لەوە ترساون توشی دوو ڕووی هاتبێتن، وەکەسیان نەی دەووت باوەڕی من وەك باوەڕی جبریل ومیکائیل وایە. )[2]

وە"**حسن**" ڕەحمەتی خوای لێبێت دەڵێت: (تەنها باوەڕدار دەترسێت ، وەتەنها دووڕوو بیٚ ترسە. )[1]

---

1 –بوخاری ئەم ووتەیەی لە (صحیح)ەکەیدا هێناوە ، (باب خوف المؤمن ان یحبط عمله ، وهؤلاء یشعر /کتاب الایمان ، باب٣٧).

2 –هەمان سەرچاوەی پێشوو.

وه"بخـاری"دەڵێـت: کاتێـك پێغەمبـەرﷺ نـاوی دووڕووەکـانی لای (حذیفـه) بردبـوو، "حذیفـه"دەڵێـت: "عمـری کـوڕی خـەتابرضي الله عنه دەهـات ودەیفـەرموو: سـوێندت دەدەم بـەخودا نـاوی بـەدووڕوو بـردم یانـا؟ وه خذیفەش دەیفەرموو: نەخێر بەڵام لەدوای عمر بەکەسی تر ناڵێم.

هـەروەها بخـاری دەڵێـت: بیـستم یـەکێك لـەزانایان ووتـی: مەبەسـتی لـەحذیفـه لـەوەی کـه بـەدوای عمـر بەکەسـی تـر نـاڵێم ، واتـه ئـەم دەرگایـه لـەخۆم ناکەمـەوه خـەڵکی بێـت پرسـیارم لـێ بکـەن لـەم بـوارەدا. وەبوخـاری دەڵێـت: منـیش ووتم: ئەمـەی حذیفـه وەك هـەمان فـەرموودەی پێغەمبـەرﷺ وایـه کـه یـەکێك لـەهاوەڵانی داوای لـێ کـرد کـه یـەکێك لـەو حـەفتا هـەزارە بێت کـه بەشـەفاعەتی پێغەمبـەرەوە دەچـنه بەهەشـتەوە، پێغەمبـەر پێـی فەرموو: سبقك عكاشة.[2] واته عکاشه پێش تۆ کەوت لەم داوا کردنەدا.

پێغەمبـەر مەبەسـتی ئـەوه نـەبووه کـه جگـه لـه"عکاشـه"ئـیتر کەسـی تـر نـەماوه، بـەڵکو مەبەسـتی ئـەوەبووه کـه ئـەم دەرگایـه لـەخۆی نەکاتـەوه وهەرکەسـێك بێـت وداوا بکـات و تائـەویش بکەوێتـه بـەر ئـەو تکاکـاری وشەفاعەته....والله أعلم.

---

1 -هەمان سەرچاوەی پێشوو.

2 - ئەم فەرموودەیه"صحیح"ه، (بخاری ٦٥٤٢)وه(مسلم ٣/٨٩- نووی) گێڕاویانەتەوە.

## تاوان هۆكاری هەموو تاوان ودەردێكە

دێینــەوە ســەر باســی دەردو نەخۆشــی یــەكان ، كــە هۆكــاری تێكــدەری دونیــاو قیامەتــە. دەبێــت بــزانین كــەتاوان زیــانی خــۆی دەدات بەتایبــەتی لەدڵــدا. نمونــەی وەك ژەهــر وایــە لــە جەســتەی مرۆڤــدا. بــە پێــی جۆرو پلــەی تاوانەكان كاریگەریشی دەگۆرێت.

ئایــا جگــە لــەتاوان ، هــیچ كــارێكی تــر هەیــە دونیــاو قیامەتیــشی شێواندبێت؟

هــەر تــاوان نــەبووە هــۆی هۆكــاری بــەدەركردنی" أدم وحــوی"ی بــاوك ودایكمان لە بەهەشتی خۆش وبەختەوەری؟

هــەر تــاوان نــەبووە هۆكــاری بــەدەرهێنان و ریــسوا كردنــی (ئیبلــیس) لــە مەلــەكوتی خــوای گــەورە، وەبــەر نــەفرەت وخەشــم وقــینی كــەوت و دیمــەن و ڕوخــساری بــووە ناشــرینترین ســامناكترین ڕوخــسار، وەبــۆ هەتامــەتایی بــێ بــەش كــرا لەبــەزەیی و ڕەحمــەتی خــوای گــەورە، وەدۆزەخ بــووە جێگــەی هەمیــشەیی. كەهــەموو ژیــانی ســەروبن كــردەوە لەڕەحمــەتی خــودا بــەتوڕەیی وغــەزەبی. لەبەهــشتی خــۆش بــۆ دۆزەخــی ئــاگرین، لــەباوەڕ بــۆ بــێ بــاوەڕ، لــەپیرۆزی یــەوە بــۆ درنــدەیی وریــسوایی....لــەبری تەســبیحات ،كفروشــیرك و دووڕووی... وەلــە بــری ئــەو هــەموو پــیرۆزی وخــودا پەرســتی یــە، بووبەڕابــەر وهاندەری پێڕی تاوانبار وستەمكار وخراپەكاران.

هــەر تــاوان نــەبوو ، بووەهــۆی هــەڵكردنی زریــانی نغرۆبــوون ونقــوم بــوونی هەموو سەر زەوی بەهەموو پێكهاتەكانی یەوە ئاو دایپۆشین؟

هــەر تــاوان نــەبوو بــووە هــۆی هــەڵكردنی زریــانی ڕەشــەبا بــۆ ســەر قــــەومی"عــــــاد" و وەبووەمایــــــەی ســــــەرگەردان وتــــــەفروتوناكردنیان ولەناودانیان، وەبوونە نمونەو پەند بۆ هەموو مێژوو وجیهان؟

وەهــەر تــاوان نــەبوو بــووە هۆكــاری نــاردنی"هــاوارو قیــژەی ســامناك" بــۆ سەر قەومی (ثمود) كە جەرگ ودڵ وهەناویانی بڕی ولەناوی بردن؟

هــەر تــاوان نــەبوو بــووە هــۆی هۆكــاری لــەڕەگ وڕیــشە دەركردنــی گونــدەكانی قــەومی"لــوط" و بەرزكردنــەوەیان بــۆ بەرزاییــەكانی ئاســمــان وبەشــێوەیەك كــە فریــشتەكانی ئاســمــان گوێیــان لــەوەڕینی ســەگەكانیان بــوو.

پاشان لەبەرزاییەوە بەناخی زەویدا ڕۆیان کردن سەربەرەوخوار پاشان بەردی باران بەسەریانداکە هەموو چەشنەکانی غەزەبیان بەسەردا باران ولەناو بران. وەئەم قارو سزایە دوور نی یە دووبارە بێتەوە بۆ ستەمکاران.

هەر تاوان نەبوو...بووە هۆکاری ناردنی هەوری ڕەشی سامناك بۆ سەر قەومی (شعیب) و دواتر کەگەیشتە بان سەریان ئاگری بەتینی سوتێنەری بەسەردا باران؟

هەر تاوان نەبوو... بووە هۆکاری خنکاندنی (فیرعەون) و دارودەستەکەی، دواتر ڕوحەکانیان ڕەوانەی دۆزەخ کردن ولاشەوجەستەکانیشایان وەك عیبرەت هێشتنەوە؟

هەر تاوان نەبوو... قارون ومال وسامان وکۆشکەکەی بەناخی زەویدا برد؟

هەر تاوان نەبوو... بووە مایەی لەناوبردنی قەومی "یس" بەهاواری گەورە؟

هەر تاوان نەبوو. پێڕێکی بەتواناو جەربەزەی زاڵ کرد بەسەر (بنی إسرائیل) دا پیاو وکوڕیانی کوشتن وکچ وئافرەتیان بەکەنیزە بردو ولاتیان کاولکرد؟

هەر تاوان نەبووە... هەموو جۆرە کارەساتێکی گەورەی بەسەریاندا هێنا"بنی إسرائیل" لەکوشتارو کاولکاری ووێرانی وکچ وئافرەت بەکەنیزەکردن ووەزاڵ کردنی پاشاو ستەمکارەکان و وەبوون بەمەیمون وبەرازە ڕیسوا... وەدوایەمینیان پەیامی خوای گەورەیە کەدەفەرمێت: (لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ.... اعراف:١٦٧) واتە: کەسانێك دەنێرمە سەریان کەتا ڕۆژی قیامەت ئازارو ئەشکەنجەیان بدات.

"امام احمد" دەڵێت: (ولید بن مسلم) بۆی گێڕامەوە کە ئەویش لە (صفوان بن عمرو) ئەویش لە (عبدالرحمن بن جیبر بن تفیر) ئەویش لەباوکی یەوە، دەڵێت ووتی: کاتێ ولاتی "قبرص" ئازادکراو دەسەلاتدارەکانی سەرگەردان وپەرش وبلاوبوونەوەو وەبەسەریەکدا دەگریان. لەوکاتەدا "ابو درداء"م ﷺ بینی لەگۆشەیەکدا دەگریا. منیش لێم پرسی: بۆچی لەم ڕۆژەدا دەگریت کەخوا ئیسلامی سەربەرزکرد تێیدا

ئـەویش ووتـی: ئـەوە ئـەڵێی چـی "جیـبر" خـەڵکی چـەند بـێ دەسـەڵاتن بەرامبـەر بەگـەورەیی خـودا. ئـەم قەومـە خـاوەن دەسـەڵات وپاشـای بەهێزبوون کەپشتیان لەفەرمانی خودا کرد، چییان بەسەردا هات.

"علی بن الجعد" دەڵێت: (شعبه بن عمرو بن مره) ووتی: گوێم لە "أبا البحتری" بوو ووتـی: ئەوانـەی کـە گوێیـان لـێ بـوو هـەواڵیان پێـدام کـە پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (لـن یهلـك النـاس حتـی یعـذروا مـن انفسهم.)[1] واتـە: خـوای گـەورە خـەڵکی بـەهیلاك نابـات ، تاخـەڵکی خۆیـان بیسانوو بەدەستەوە نەدەن.

وەلــە مـسند دا هــاتووە لــە فــەرموودەی (ام سـلمة) رضي الله عنها کەپێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (إذا ظهـرت المعاصـي في أمـتي عمهـم الله بعـذاب مـن عنـده، فقلـت یـا رسـول الله: امـا فـیهم یومئـذ انـاس صـالحون؟ قـالﷺ : "بلـی"، فقلـت: کیـف یـصنع بأولئـك؟ قـال: یـصیبهم مـا أصـاب النـاس ،ثـم یـصیرون الی مغفـرة مـن الله ورضـوان.)[2] واتـە: ئەگـەر سەرپێـچی وتاوەنکـاری ویـاخی بـوون سـەری هەڵـدا لـەناو ئومەتەکـەمـدا، ئـەوا خـوای گـەورە هـەموویان توشـی سـزا دەکـات. منـیش پرسـیم: ئایـا کەسـانی چـاکەخوازیان تێـدا نـی یـە؟ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: "بـەڵێ تێیدایـە". منـیش ووتم: ئـەی چـی لـەوان دەکـات؟ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ئـەوانیش توشـی دەبـن بـەڵام دواتـر دەگەڕێنـەوە بـۆ لای ڕەحمـەت وڕەزامەنـدی خـوای گەورە.

وەلـە "مراسـیل الحـسن" لـە پێغەمبـەرەوە کەدەفـەرمێتﷺ : (لا تـزال هـذه الأمـة تحـت یـدالله وفي کنفـه مـالم یمـالئ قراؤهـا ، ومـا لم یـذل صـلحاؤها فجارهـا، ومـالم یهـن خیارهـا اشـرارها، فـأذاهم فعلـو ذلـك رفـع الله یـده عـنهم، ثـم سلط علـیهم جبـابرتهم فـساموهم سوء العـذاب، ثـم ضـربهم

---

[1] – ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(احمد : ٤/ ٢٦٠، ٥/٢٩٣)و (أبو داود:٤٣٤٧).

[2] – ئـەم فەرموودەیـە (صـحیح)ە،(احمـد: ١/ ٢، ٦/ ٣٠٤)وە لـە(صـحیحین)دا بـەم چەشـنەیە:(یهلکـون مهلکـا واحـداً ولکـن یبعثـون علـی نیـاتهم) لەگێڕانەوەیـەکی تـردا (علـی أعمالهم).

الله بالفاقة والفقر.)[1] واتە: بەردەوام ئەم ئومەتە لەژێر دەستی ڕەحم ومیهرەبانی وچاودێری خودادایە، کاتێک کە قورئان خوێنەکانیان چاولەخوارو مەیلداری کاربەدەستان نەبن، وەپیاوچاکانیان ژێردەستەی خراپەکاران نەبن، وەپیاوە باشەکانیان بەچاوی سوکەوە تەماشا نەکرێن، بەلاَم کاتێک ئەمانە ڕوویاندا، ئەوا دەستی چاودێری ومیهرەبانیان لەسەر هەلَدەگرێ وپاشان زۆرداران زالّ دەکات بەسەریاندا و تووشی خراپترین ئازاریان دەکات ودواتر بەلاَی هەژاری نەبوونیان تووش دەکات.

وەلە مسند دا هاتووە لە فەرموودەی (ثوبان) ﷺ کەپێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ان الرجل ليحرم الرزق بالذنب يصيبه.)[2] واتە: مرۆڤی وا هەیە بێ بەش دەبێت ورزقی لێ قەدەغەدەکرێت بەهۆی تاوانێکەوە کەتوشی دەبێت.

هەروەها لەهەمان سەرچاوەو هەمان کەسدا هاتووە کەپێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (يوشك ان تتداعى عليكم الأمم من كل افق، كما تداعى الأكلة على قصعتها، قلنا: يا رسول الله امن قلة منا يومئذ؟ قالﷺ: انتم يومئذ كثير، ولكنكم غثاء كغثاء السيل، تنزع المهابة من قلوب عدوكم، ويجعل في قلوبكم الوهن، قالوا وما والوهن؟ قال: حب الحياة وكراهة الموت.)[3] واتە: نزسکە میلەتانی تر لەهەموو لایەکەوە بێن وبدەن بەسەرتاندا، وەکو چۆن کەسانێك بانگی یەکتری دەکەن بۆ سەر نان خواردن، هاوەلاَن وتیان: ئایا ئێمە ئەو ڕۆژە ژمارەمان کەمە؟ پێغەمبەر فەرمووی: ئێوە ئەو ڕۆژە ژمارەتان زۆرە، بەلاَم وەکو کەفی سەر دەریان، ترسی ئێوە لەدلّی ئەوان دەردەهێنرێت ولێتان ناترسن"وهن"دەخرێتە ناودلّەکانتان،

---

[1] – ئەم فەرموودەیە(ضعيف)ە، (حافظي عيراقي)لە (المغنى)دا هێناویەتی وەدەلێت(أسنادها ضعيف).
[2] – ئەم فەرموودەیە(حسن لغيره)ە،(احمد:٢٧٧/٥)و (الحاكم:٤٩٣/١)و (ابن ماجه:٤٠٢٢) بڕوانە (كنز الفوائد).
[3] – ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە،(احمد: ٢٧٨/٥)و(ابو داود ٤٨٧٨)بڕوانە(السلسله الصحيحه:٩٥٨).

پرسیان:ئەی پێغەمبەر"وهن" چی یە؟ پێغەمبەر فەرمووی: "وهن" واتە: خۆشویستنی دونیاو ڕق لێ بوونەوەی مردن.

وەلە (مسند) دا هاتووە لە فەرموودەی"أنس"ﷺ کە پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرمێت: (لماعرج بي مررت بقوم لهم أظفار من نحاس يخمشون بها وجوههم وصدورهم، فقلت: من هولاء ياجبريل ؟ قال: هؤلاء الذين ياكلون لحوم الناس، ويقعون في أعراضهم.)[1] واتە: لەشەوی "إسراء"دا قەومێكم بینی نینۆكی درێژیان هەبوو لە مس دروست کرابوو سنگ ودەم وچاوی خۆیانی دەڕنی ، بەحەزرەتی جبریلم ووت: ئەمانە کێن؟ ئەویش ووتی: ئەوانە ئەو پێرەن کە بەهەمیشەیی گۆشتی مرۆڤیان دەخواردو بەخراپە باسی ناموسی خەڵكیان دەکرد.

وەلە "جامع" ترمذی دا هاتووە لە فەرموودەی (ابي مريرة) ﷺ کە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (يخرج في اخر الزمان قوم يختلون الدنيا بالدين ، ويلبسون للناس مسوك الضأن من اللين، ألسنتهم أحلى من السكر، وقلوبهم قلوب الذئاب، ويقول الله عزوجل: ابي يغترون؟ وعلى يجترئون؟ فبي حلفت، لأبعثن على اولئك فتنة تدع الحليم فيها حيران.) واتە: لە کۆتایی زەماندا کەسانێك دەردەچن لە ڕێگەی ئایینەوە دونیا بەدەست دەهێنن، هێندەش خۆیان نەرم ونیان دەکەن بەوێنەی مەڕ، زمانیان شیرینترە لە شەکر،بەڵام دڵیان دڵی گورگە. خوای گەورە دەفەرمێت: (ئایا دەیانەوێت من بخەڵەتێنن؟ جورئەت وبوێری بەسەر منەوە دەکەن؟ سوێند بێت بەخودی خۆم..بەڵاو فیتنەیەکی ئەوتۆیان بەسەر دێنم کە عاقڵەکانیان تێدا سەرگەردان بن) .

وە (ابن أبی الدنيا) لەفەرموودەی (جعفر بن محمد) . (عن ابيه عن جده) ووتی کە (علی بن ابی طالب) ووتی: (يأتي على الناس زمان لايبقى من الاسلام إلا إسمه، ولامن القرآن الا رسمه، مساجدهم يومئذ عامرة، وهي خراب من الهدى، علماؤهم شر من تحت اديهم السماء،

---

[1] – ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە،(احمد: ٣/٢٢٤)و (أبو داود: ٤٢٩٧) بڕوانە (سلسله الصحيحه: ٩٥٨).

منهم خرجت الفتنة، وفيهم تعود.) واتە: ڕۆژانیك دێت بەسەر خەڵكیدا، ئیسلام تەنها هەر ناوەكەی دەمێنێت ، وە قورئانیش تەنها وێنەكەی و مزگەوتەكان ڕازاوەن،بەڵام وێرانە لەڕووی خودا پەرستی یەوە، زاناكانیان خراپترین پێڕن ، لەوانەوە فیتنەو ئاشوب سەرهەڵدەدات، وەهەر بۆ ئەوانیش دەگەڕێتەوە.

وە لە"سماك بن حرب" وەلە " عبدالرحمن بن عبدالله بن مسعود"ەوەﷺ لەباوكی یەوە ووتی: (اذا ظهر الزنا والربا في قرية أذن الله عزوجل بهلاكها) واتە: هەركاتێك زیناو سوخواردن"ڕیبا"لەهەر شارێكدا سەری هەڵدا ، ئەوا خوای گەورە مۆڵەتی بەهیلاك بردنیان دەدات.

وەلە (مراسيل الحسن) دەڵێت: (اذا أظهر الناس العلم وضيعوا العمل، وتحابوا بالألسن ، وتباغضوا بالقلوب ، وتقاطعوا الارحام، لعنهم الله عزوجل عند ذلك، فاصمهم واعمى ابصارهم) واتە: هەركاتێك خەڵكی خۆیان بەزانا دەرخست وكاریان پێ نەكرد، بەزمان یەكیان خۆش دەویست ولەدڵەوە ڕقیان لەیەك بوو ، وە پەیوەندیان دەپچڕاند، ئەوا خوای گەورە نەفرەتیان لێ دەكات وكوێرولاڵیان دەكات.

وە لە"سنن"ی "ابن ماجە" دا هاتووە لەفەرموودەی (عبدالله بن عمر الخطاب) ﷺ فەرمووی: (كنت عاشر عشرة رهط من المهاجرين عند رسول اللهﷺ ، فأقبل علينا رسول اللهﷺ بوجهه فقال: يا معشر المهاجرين، خمس خصال اعوذ بالله ان تدركوهن: ما ظهرت الفاحشة[1] في قوم حتى اعلنوا بها إلا ابتلوا بالطواعين والأوجاع التي لم تكن في اسلافهم الذين مضوا ، ولا نقص القوم المكيال والميزان الا ابتلوا بالسنين وشدة المؤنة وجور السلطان، وما منع قوم زكاة اموالهم إلا منعوا القطر

---

[1] - فاحشە: هەموو شتێكی نارەواو ناشرین لە ووتەو كرداردا وەخوای گەورە باسی دەكات كە فاحیشە قەدەغەیە بەنهێنی وئاشكرایەوە:(قل انما حرم ربي الفواحش ماظهر منها وما بطن) وەدەفەرموێت:(الشيطان يعدكم الفقر ويأمركم بالفحشاء) وەزۆر ئەم ووشەیە ۆ "زینا" بەكاردەهێنرێت.

من السماء فلولا البهائم لم يمطروا،ولاخضر قوم العهد الا سلط الله عليهم عدواً من غيرهم، فأخذوا بعض ما في ايديهم ، وما لم تعمل أئمتهم بما انزل الله عزوجل في كتابه الاجعل الله باسمهم بينهم.)[1] واته: ئەی پێڕی کۆچەرییەکان"المهاجرین" پەنا ئەگرم بەخوادا کە توشی ئەم پێنج خەسڵەتە نەبن: لە قومێکدا زینا سەرهەڵبدات و بە ئاشکرا ئەنجامی بدەن ئەوا توشی چەندین پەتای جۆراوجۆر دەبن کەلە پێشینەو باوباپیریاندا نەبووە. وەهەر قەومێك دیاردەی دزی وفێل کردن لەتەرازودا ئەنجام بدەن، ئەوا توشی گرانی وستەمی دەسەلأت دەبنەوە. وەهەر قەومێك ڕێگری بکەن لەزەکات دەرکردن، ئەوا توشی وشکە ساڵی دەبن ، ئەگەر لەبەر گیانلەبەران نەبێت هەر بەیەکجاری باران نابارێت. وەهەر قەومێك دیاردەی پەیمان شکاندن تێیاندا سەرهەڵبدات، ئەوا خوای گەورە دوژمنانیان بەسەردا زاڵ دەکات و بەشێکی زۆری سامان ودەسەلأتیان لەدەست دەدەن. وەهەر قەومێك سەرکردەکانیان بەفەرمایشتەکان وکتێبەکەی خوای گەورە فەرمان ڕەوایی نەکەن ، ئەوا خوای گەورە توشی دوبەرەکی ودوژمنایەتیان دەکات لەنێو خۆیاندا.

وەلە (مسند وسنن) دا هاتووە لە فەرموودەی (عمرو بن مروە) لە (سالم بن ابی الجعد) ﷺ لە باوکی یەوە دەڵێت پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن من كان قبلكم كان اذا عمل العامل فيهم بالخطيئة جاءه الناهي تعذيراً، فأذا كان الغد جالسه و اكله وشاربه، كانت لم يره على خطيئة بالأمس، فلما رأي الله عزوجل ذلك منهم ضرب بقلوب بعضهم على بعض ، ثم لعنهم على لسان نبيهم داود وعيسى بن مريم، ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون. والذي نفس محمد بيده لتأمرن بالمعروف، ولتنهون عن المنكر ولتاخذن على يد السفية، ولتأطرنه على الحق أطراً او ليضربن الله بقلوب بعضكم على بعض، ثم ليلعنكم كما

---

[1] -ئەم فەرموودەیە(حسن)ە، (ابن ماجە: ٤٠١٩) و(بوبصر البانی)بە حسن یان داوەتە قەڵەم.

لعنهم) [1] واتە:لەو خەڵكانەی پێش ئێوەدا گەر كەسێك هەڵەی بكردایە ، ئەوا یەكێك لەوكەسانەی ئامۆژگاری خەڵكیان دەكرد دەهات وسزای دەداو ئامۆژگاری دەكرد، پێی دەووت: لەخوا بترسە، بەڵام بەیانی كەڕۆژ دەبووەوە ئامۆژگاری كەرەكە لەگەڵ تاوانبارەكەدا پێكەوە دەبوون نان وئاویان دەخوارد هەروەكو بڵێی ئەو كەسە دوێنێ هەڵەی هەرنەكردبێ. كاتێك خوای گەورە ئەمەی لێ بینین دڵەكانی وەك یەك لێ كردن وەبەیەكیانیدا. ئەوجا نەفرەتی لێ كردن لەسەر زاری "داود وعیسای كوری مریم (س.خ) ". ئەمەش بەهۆی ئەوەی سەرپێچی خودایان دەكرد ،پاشان پێغەمبەر فەرمووی: سوێند بەوكەسەی كەگیانی منی بەدەستە ،ئەگەر فەرمان بەچاكەو رێگری لەخراپە نەكەن ، وەدەستی نەفامان نەگرن وپشتیوانی لەحەق نەكەن، ئەوا خودا دڵەكانتان دەدات بەیەكداو نەفرەتان لێ دەكات، وەكو لەوانەی پێشوو تری كرد.

وە (ابن ابی الدنیا) لە "ابراهیم بن عمرو الصعانی"دەڵێت: (اوحی الله الی یوشع بن نون علیه السلام، انـي مهلك من قومك اربعین الفاً من خیارهم، وستین الفاً من اشرارهم، قال:یارب ،هؤلاء الاشرار ، فما بال الاخیار؟ قال: إنهم لم یغضبوا لغضبي، وكانوا یواكلونهم، ویشاركونهم.) واتە: خوای گەورە وەحی بۆ"یوشع بن نون"نارد كەمن وچل هەزار لەپیاو خراپ وچل لەپیاوچاكانی قەومەكەت بەهیلاك دەبەم. ئەویش ووتی: خوایە پێری خراپەكارەكان حەقی خۆیانە، ئەی پێری چاكەكاران بۆ؟ فەرمووی: چونكە بەئەركی خۆیان هەڵنەساون بەوەی رێگری خراپەكاران نەبوون ، توورەنەبوونە بەرامبەر ئەو كارانەی كە من پێم ناخۆشە، وەئەوان ئەنجامیان داوە.

هەروەها (أبو عمر بن عبدالبر) لە"أبی عمران" دەڵێت: (خوای گەورە دوو فریشتە رەوانە دەكات بۆ كاولكردنی گوندێك ،بەهەرچی تێدایە. كاتێك كەچوونە سەر گوندەكە بینیان كە پیاوێك لەمزگەوتەكەودا

---

[1] – ئەم فەرموودەیە(ضعیف الاسناد)ە، (احمد: ١/٢١٩)وە (ابو داود: ٤٣٣٦) وە(الترمذي: ٣٠٤٧) وە (ابن ماجه: ٤٠٠٦)بڕوانە: (ضعیف ابن ماجه ی الیانی: ٨٦٧).

خواپەرستی دەکات وکڕنوش دەبات، فریشتەکان ووتیان: خوایە گیان فلأن بەندەت لەگوندەکەتدا نوێژ دەکات، خوایگەورە فەرمووی ئەویشی لەگەڵدا وێران بکەن، چونکە هیچ کاتێك ناڕەحەت ودلگران نەبووە لەپێناو مندا).

وە"الحمیدی" لە (سفیان بن عُیینە) دەڵێت: (سفیان بن سعد) لە "مسعر" دەگێڕێتەوە: (کە فریشتەیەك فەرمانی پێ کرابوو کە گوندێك بەناخی زەویدا بەرێت ، دواتر ووتی ئەی پەروەردگار فلأنە کەسی خواپەرستی تێدایە. خوای گەورە وەحی نارد کەلەو کەسەوە دەست پێ بکە، چونکە هیچ کاتێك دلگران نەبووە بەرامبەر بەوکارە خراپانەی کەلەو گوندەدا کراوە.)

وەهەروەها (ابن أبی الدنیا ) لە "وهب بن منبە"دەڵێت: (کاتێك داودی پێغەمبەر هەڵەی کرد، داوای لێ خۆشبوونی کرد ، خوای گەورە لێی خۆش بوو. دواتر خوای گەورە باجی ئەو هەڵەیەی دابەسەر نەتەوەی بنی ئیسرائیلدا. حەزرەتی داود فەرمووی: ئەی خودایە تۆ فەرمانڕەوایی دادپەروەری ڕەهای چۆن باجەکەیت دابەسەر کەسانی تر کەچی من هەڵەم کردووە. خوای گەورە وەحی نارد وفەرمووی:چونکە کاتێك تۆ هەڵەت کرد، ئەوان ڕێگریان نەکردیت.)

وەهەروەها (ابن ابی الدنیا) لە (أنس بن مالك) دەڵێت: (أنه دخل علی عائیشةرضي الله عنها هو ورجل آخر، فقال لها الرجل: یا ام المؤمنین حدثینا عن الزلزلة. فقالت: اذا استباحوا الزنا،وشربوا الخمور ، وضربوا بالمعازف غار الله عز وجل في سمائه، فقال للأرض: تزلزلي بهم ، فإن تابوا ونزعوا، وإلا هدماها علیهم، قال: یا ام المؤمنین أعذاباً لهم؟ قالت: بل موعظة ورحمة للمؤمنین، ونكالا وعذاباً وسخطا علی الكافرین. فقال أنسرضي الله عنه:ما سمعت حدیثاً بعد رسول الله ﷺ أنا أشد فرحاً به مني بهذا الحدیث.) [1] واتە:من وپیاوێکی تر چووین بۆ لای خاتوو

[1] – ئەم فەرموودەیە (ضعیف الاسناد) ە،(حاکم: ٥١٦/٤) گێڕاویتیەوە لەسەر مەرجی مسلم بە"صحیح"ی داوە لەقەڵەم، وە(ذهبي) دلێت:پێم وایە هەڵبەستراوبێت ، وەئەم

عائیشه‌ﷺ،پیاوه‌كه لێی پرسی: ئه‌ی دایكی بڕواداران باسی بوومه‌له‌رزه‌مان بۆبكه‌"زلزله‌"؟خاتوو عائیشه‌ش فه‌رمووی: ئه‌گه‌ر زیناوداوێن پیسی به‌ئاشكراكرا و مه‌ی خورایه‌وه‌و ئامێری مۆسیقایان ژه‌نی. خوای گه‌وره له‌سه‌رووی ئاسمانه‌وه توڕه ده‌بێت، وه‌به‌زه‌وی ده‌ڵێت ده‌ست بكه به‌له‌رینه‌وه واته بوومه‌له‌رزه. جا ئه‌گه‌ر ته‌وبه‌یان كردو گه‌ڕانه‌وه باشه..ئه‌گه‌رنا ئه‌وا به بوومه‌له‌رزه كاولیان ده‌كات و خانوو كۆشكه‌كانیان به‌سه‌ردا ده‌ڕوخێنێت. پیاوه‌كه ووتی: ئه‌ی دایكی بڕواداران ئه‌مه‌ته‌نها سزایه‌كه بۆ ئه‌وان؟ خاتوو عائیشه فه‌رمووی: په‌ندو ئامۆژگاری یه‌كه بۆ بڕواداران وه سزاو توڕه‌یی خودایه بۆ بێ باوڕه‌كان. "أنس" ده‌ڵێت: له‌دوای پێغه‌مبه‌ری خودا فه‌رمووده‌ی وادڵ خۆشم نه‌بیستووه.

وه (ابن أبی الدنیا) له فه‌رمووده‌یه‌كی (مرسل) ده‌گێڕێته‌وه: **(إن الأرض تزلزت علی عهد رسول الله ﷺ ، فوضع یده علیها ثم قال: أسكني ، فإنه لم یأن لك بعد، ثم التفت الی اصحابه. فقال: (ان ربكم لیستعتبكم فاتبعوه) ، ثم تزلزت بالناس علی عهد عمر بن الخطابﷺ فقال: أیها الناس ما كانت هذه الزلزلة الا علی شيء أحد ثتموه، والذي نفسي بیده لئن عادت لا أساكنكم فیها أبداً.)**[1] واته: له‌سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌رداﷺ بومه‌له‌رزه‌یه‌ك ڕوویدا وزه‌وی ده‌ستی كرد به له‌رینه‌وه، پێغه‌مبه‌ریش ده‌ستی خسته سه‌ر زه‌وی و پێی فه‌رموو: هێمن وئارام به هێشتا كاتی ئه‌وه‌ت نه‌هاتووه ، پاشان ڕووی كرده هاوه‌ڵه‌كانی وفه‌رمووی: خوای گه‌وره لۆمه‌تان ده‌كات ، ده‌ی ئێوه‌ش لۆمه‌ی خۆتان بكه‌ن له‌سه‌ر خراپه‌كاریه‌كانتان

پاشان له‌سه‌رده‌می (عمر بن الخطاب) دا بومه‌له‌رزه‌یه‌ك ڕوویدا. (عمر) فه‌رمووی: (ئه‌ی خه‌ڵكینه ئه‌م بومه‌له‌رزه‌یه به‌هۆی كارێكه بووه ئێوه

---

فه‌رموودەیه‌(سیوطي )له كتێی(كتاب الزلازل)دا هێناویێتی و وه‌ده‌یداته پاڵ (ابن ابی الدنیاو حاكم) ه‌وه ده‌ڵێت: وه‌به‌ڕاستی زانیوه (صحیح) بڕوانه ئه‌و كتێبه لا٩٧-١٠، به‌ده‌رهێنانی ئێمه‌وه.

1 - ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌(ضعیف الاسناد ) ه،وه‌(ابن أبی حاتم)له‌(المراسیل، ل-١٩٠ گێڕاویێتیه‌وه، بڕوانه هه‌مان سه‌رچاوه‌ی پێشوو، لا٢٥.

بەخراپــە ئــەنجامتان داوە، ســوێند بێــت بەوکەســەی گیــانی منــی بەدەســتە، ئەم جارەیان ڕوویداتەوە من پارێزگاریتان لیٚ ناکەم) .

وەلـە پلەوپایـەی (عمـر بـن الخطـاب) دا هـاتووە لـە (ابـن ابـی الـدنیا) ەوە دەگێڕێتـــەوە کـــە: (ان الارض تزلزلـت علـی عهـد عمـرﷺ فـضرب یـده علیهـا ،وقـال: مالـك؟ ومالـك؟ أمـا إنهـا لـو كانـت القیامـة حـدثت اخبارهـا ، سمعـت رسـول اللهﷺ یقـول: إذا كـان یـوم القیامـة فلـیس فیهـا ذراع ولاشـبر إلا وهـو ینطـق.) واتـە: لەسـەردەمی (عمـر بـن الخطـاب) ﷺ زەوی لـەرزی یـەوە، عمـریش دەسـتی خـستەسەری و ووتـی: ئەوەچـیتە؟ ئـەوە چـیتە؟ خۆئەگـەر قیامـەت بێـت، ئـەوا دەبێـت بێتـە وەلام، چـونکە مـن گـوێم لەپێغەمبـەر بـوو ﷺ فـەرمووی: ئەگـەر ڕۆژی قیامـەت ڕوویـدا ئـەوا هـەموو بـالٚ وبستێك لەزەوی دەست دەكات بەقسەكردن.

وە (إمـام احمـد) لـە (صـفیه) دەگێڕێتـەوە کـە: ووتویـەتی: (قالـت: زلزلـت المدینـة علـی عهـد عمـرﷺ، فقـال: یـا أیهـا النـاس ماهـذا؟ مـا اسـرع احـدثتم. لـئن عـادت لأسـاكنكم فیهـا.) [1] واتـە: لەسـەردەمی "عمـر"ﷺ زەوی لەریـەوە، ئـەویش ووتـی: ئـەی خەڵكینـە ئەمـە چـی یـە؟ چۆن بـەخێرایی شـتێكتان كـردووە، جانەگـەر ئـەم جـارە ڕوویداتـەوە مـن ئێـوەی تێـدا ناپێرێزم.

وە (كعـب) دەڵێـت: هـەركاتێك خـەڵكی تـاوانی زۆریـان لەسـەر زەوی ئـەنجام بدایەئـەو زەوییـەی لەترسـی ئـەوەی كـە خـودای گـەورە ئاگـادارێتی دەلەرزی یەوە.

(عمـر بـن عبـدالعزیز) ﷺ نامـەی نووسـراوی ئاراسـتەی گشت شـارەكان كـرد: (امـا بعـد فـإن هـذا الرجـف شـيء یعاتـب الله عزوجـل بـه العبـاد ، وقـد كتـب الی الامـصار أن یخرجـوا في یـوم كـذا وكـذا شـهر كـذا وكـذا، فمـن كـان عنـده شـيء فلیتـصدق بـه، فـإن الله عزوجـل یقـول: قَـدْ أَفْلَـحَ مَـن تَزَكَّـى * وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى..أعلى:١٤-١٥. وقولوا كمـا قـال ادم: رَبَّنَـا ظَلَمْنَـا أَنفُـسَنَا

---

[1] – ئـەم فەرموودەیـە (صـحیح)ە،(ابـن ابـی شـیبه)لـە (مـصنفه:٢/٤٧٤)وە(بیهقـی)لـە (سـنة الطبی: ٣/٣٤٢)گێڕایانەتەوە.

وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ.... الأعراف:٢٣. وقول كما قال نوح: وَإِلاَّ تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِي أَكُن مِّنَ الْخَاسِرِينَ...هود:٤٧. وقولوا كما قال يونس: لَّا إِلَهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ.... الأنبياء:٨٧)[1].

واته: ئەم داچەڵەکینەی زەوی گلەیی خودایە لەبەندەکانی دەکات. وەلەنامەیەکدا کەئاراستەی سەرجەم شارەکانی کردو نووسی بووی: ئەم زەمین لەرزەیە گلەیی خودایە لە بەندەکانی،جا پێویستە لە فلاَن ڕۆژو لەفلاَن ڕۆژدا ، وەلە فلاَن مانگ ولەفلاَن مانگدادەربچنە دەرەوەی شار ، هەر کەسێك دەستی دەردەچێت وهەیەتی باخێر بکات، چونکە خوای گەورە دەفەرمێت: (قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّى * وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى..أعلى:١٤-١٥). واتە: ئەو کەسە سەرفرازە کەدەرونی خۆی پاك ڕاگرتووە، وەناوی پەروەردگار دەبات ونوێژ دەکات. ئێوەش هەروەکو"أدم"ووتی بلێن: (رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ.... الأعراف:٢٣) .واتە: ئەی پەروەردگار ئێمە ستەممان لەخۆمان کرد، ئەگەر تۆی بەخشندە لێمان خۆش نەبیت وەڕەحمان پێ نەکەیت ئەوا دەبینە یەکێك لەدۆڕاوەکان. وەهەروەکو "نوح"ووتی ئێوەش بلێن: (وَإِلاَّ تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِي أَكُن مِّنَ الْخَاسِرِينَ...هود: ) ٤٧.واتە: ئەی پەروەردگار ئەگەر تۆ ڕەحممان پێ نەکەیت ولێمان خۆش نەبیت ،ئەوا دەبینە یەکێك لەدۆڕاوەکان. وەهەروەکو "یونس"ووتی ئێوەش بلێن: (لَّا إِلَهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ.... الأنبياء: ) ٨٧. واتە: هیچ خودایەك نی یە بەحەق تەنها تۆ نەبێت، پاکی وبێ گەردی بۆتۆ ، من یەکێك بووم لەستەمکاران.

وەهەروەها (أمام أحمد) دەڵێت: (أسود بن عامر) لە (أبو بكر ) لە (الاعمش) لە (عطاء بن أبي رباح) لە (ابن عمر) ەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (سمعت رسول الله ﷺ يقول: اذا ضن الناس بالدنيا والدرهم وتبايعوا

---

[1] – ئەم فەرموودەیە(حسن)ە،(أبو نعيم)لە "حليه الاولياء ٣٠٥/٥"گێڕاویتیەوە، وەدەڵێت هەندێك کەسی تێدایە نایناسم، وە"ابن أبي شيبه"لە "مصنف: ٤٧٣٢"گێڕاویتیەوە بە "مسند"پیاوەکانی هەموو متمانەدارن.

بالعينــة، وتبعــوا أذنــاب البقــر، وتركــوا الجهــاد في ســبيل الله، أنــزل الله بهــم بــلاء لا يرفعــه حتــى يراجعــوا ديــنهم.) [1] واتــه گــويّم لەپێغەمبــەرﷺ بــوو دەفــەرمێت: ئەگــەر خــەڵکی دینــارو درهــەم وپــارە بــووە مەبەســتیان ، وەکــاری کــڕێن وفرۆشــتنیان بــە شــێوەی"عینــة" ئەنجامــدا، وەشــوێن دەســەڵاتدارانی قامــچی بەدەســت کــەوتن کــە قامــچیەکانیان لەشــێوەی کلکــی مانگادایــە. وەپــشتیان کــرد لەتێکۆشــان لــەپێناوی خــودادا. ئــەوا خــوای گــەورە بەڵایــەکیان بەســەردا دادەبــەزێنێت لــەکۆڵیان نابێتــەوە تــا نەگەڕێنــەوە ســەر ئاینەکەیان.

(وتبــايعوا بالعينــة) لــەلای "فقهــاء"وزانایــانی بــواری فیقــه دوو ڕاڤــەو لێکدانەوەیان هەیە:

یەکــەم: فرۆشــتنی کاڵایــەك بەقــەرز بەکەســێك، بــەنرخی زیــاتر لــەنرخی ئاسایی خۆی.

دووەم: فرۆشــتنی کاڵایــەك بەکەســێك ، پاشــتر کڕینــەوەی هــەمان کــاڵا لەوکەسە، بەڵام بەنرخێکی زۆر کەمتر لەوەی کە پێی فرۆشتووە. [2]

وە"حــسن"دەڵێــت: فیتنــە تــەنها ســزایەکەو تۆڵەســەندنەوەیەکە خــوای گەورە لەخەڵکی دەسێنێتەوە.

وەهەنــدێ لەپێغەمبــەرانی "بــنی ئیــسرائیل" کاتێــك وردبوونــەوە لــەو کارەســاتەی (بنختنــصر) [3] بەســەریاندا هێنــای ووتیــان: (ئــەی خــودای گــەورە بــەهۆی بەرئــەنجامی ناپــاکی وتاوانکــاری خۆمــان کەســێکت زاڵ کــرد بەسەرماندا ، نەتۆ دەناسێت ونەبەزەیی بەئێمەدا دێتەوە.)

وە (بختنــصر) بــە" دانیــال"ی پێغەمبــەر"ی ووت: چــی مــنی بەســەر قەومەکەتدا زاڵ کرد؟

---

[1] - ئەم فەرموودەیە(حسن)ە،(احمد: ٢/٢٨) وە (ابو داود: ٣٤٦٢)گێڕایانەتەوە.

[2] -بڕوانە: (معجم لغه الفقهاء: ل١١٤).

[3] - یــان نــەبو خودنوسر، پاشــای بابلیــەکان بــوو کــە هێرشــی کــردە ســەر شــاری "ئورشــەلیم- قــدس" وشارســتانیەتی جولەکــەی کــاول کــرد زۆری لــێ کوشــتن وزۆریــشی لــێ بــەدیل گــرتن ولەبابل بەندی کردن."وەرگێڕ"

(دانیــالّ) یــش ووتــی: گــەورەیی تاوانکــاری تــۆو ســتەمکاری قەومەکــەم بەرامبەر بەخودی خۆیان.

وە"ابــن ابــی الــدنیا" لــە فــەرموودەی (عمــار بــن یاســر) و (حذیفــة) ەوە دەگێڕێتــەوە کەپێغەمبــەرﷺ فەرموویــەتی: (إن الله عزوجــل إذا أراد بالعبــاد نقمــة أمــات الاطفــال وأعقــم ارحــام النســاء، فتنــزل النقمــة ، ولــيس فيــه مرحــوم.) [1] واتــە: هــەر کاتێــك خــوای گــەورە بیــەوێت بەلآیــەك توشــی بەنــدەکانی بکــات، ئــەوا پێشــتر منــدالآن دەمرێنێــت وئافرەتــان نــەزۆك دەکــات. ئەوسا بەلآکــە دادەگرێتــە خــوارەوە بــۆ ســەریان، کــە کەســێکیان تێــدا نــی یــە شایەنی بەزەیی خودای گەورە بێت.

وە (ملــك بــن دینــار) دەلّێــت لــە "حکمــە"دا خوێندمەتــەوە کــە خــودای گــەورە فەرموویــەتی: (مــن الله م پادشــاو خــاوەنی پادشــاکانم، دلّــی پادشــاکان لەدەســتی مندایــە. هەرکەســێ ملکەچــی وخواپەرســتی مــن بکــات، ئــەوا پادشــاکەیان دلّ نــەرم ونیــان دەکــەم. وەهــەر کەســێك سەرپیچیم بکــات ، ئــەوا پادشــاکەیان دەکــەم بــە بــەلآ بەســەریانەوە. جــا خۆتــان بــەکاروباری پادشــاکانەوە ســەرقالّ مەکــەن، بــەلّکو ســەرقالّی گەڕانــەوەو تەوبــە بــن بــۆمن، ئەوا ئەوان دلّ نەرم دەکەم.)

وەلــە (مراســل الحســن) دا هــاتووە: (ئەگــەر خــوای گــەورە ویســتی خێــر بڕژێنێــت بەســەر هــەر قەومێکــدا ، ئــەوا کاروباریــان دەداتــە دەســت کەســە نــەرم ونیــان ودلّســۆزەکانیانەوە، بــەلآم ئەگــەر ویســتی شــەڕیان بەســەردا بڕژێنێــت ، ئــەوا کاروباریــان دەداتــە دەســت کاربەدەســتانی ســتەمکار وبــێ عەقلّ ودلّ ڕەقەکانیان.)

وە (امــام أحمــد) و کەســی تــریش دەگێڕنــەوە لــە"قتــادە" دەلّێــت: (حــەزرەتی "موســی" (س.خ) فــەرمووی: ئــەی خــوای گــەورە تــۆ لەســەرووی ئاسمانــەکانیت و ئێمــەیش لــەزەوی. جــا نیشــانەی تورەبــوون وڕازی بوونــت

---

[1] – ئــەم فەرموودەیــە(ضــعيف الاســناد) ە،(سـيوطي)لــە (جامـع الكـبير)دا هێنــاویتی، وە(البــانی) لــە( ضــعيف الجــامع بــەژمارەی ١٥٤٤ )هێنــاویتی لــە( الالقــابی شــیراری) وەبــە(ضــعيف)ی داناوە.

لەئێمە چی یە؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەگەر کاروبارتانم دایە دەستی کاربەدەستانی نەرم ونیان وژیرو لێهاتوو، ئەوا نیشانەی ئەوەیە لێتان ڕازیم. وەهەر کاتێك کاروبارتانم دا بەدەستی ستەمکارو بێ بەزەیی ئەوا نیشانەی ئەوەیە لێتان توڕەم.)

وە (ابن ابي الدنيا) دەگێڕێتەوە کە "فضيل بن عباض"ووتی: "خوای گەورە وەحی نارد بۆ هەندێ لە پێغەمبەران کە: ئەو کەسەی کەمن بناسێت وسەرپێچیم بکات، ئەوا کەسێك بەسەریاندا زاڵ دەکەم کە من نەناسێت."

وەهەروەها (ابن ابی الدنيا) دەگێڕێتەوە لەفەرموودەی"ابن عمر"رضي الله عنه يرفعه: (والذي نفسي بيده ، لاتقوم الساعة حتى يبعث الله امراء كذبة، و وزراء فجرة، واعوانا خونة، وعرفاء ظلمة ، وقراء فسقة، سيماهم سيماء الرهبان، وقلوبهم أنتن من الجيف، اهواؤهم مختلفة، فيفتح الله لهم فتنة غبراء مظلمة فيتهاوكون فيها، والذي نفس محمد بيده لينقضن الاسلام عروة عروة، حتى لا يقال الله الله، لتأمرن بالمعروف ، ولتنهون عن المنكر، او ليسلطن الله عليكم شراركم فيسومونكم سوء العذاب، ثم يدعو خياركم فلا يستجاب لهم ، لتأمرن بالمعروف ولتنهون عن المنكر او ليبعثن الله عليكم من لايرحم صغيركم، ولايؤقر كبيركم.) واتە: سوێند بێت بەو کەسەی گیانی محمدی بەدەستە ، قیامەت ڕوونادات تاوەکو خوای گەورە ئەم کەسانە ڕەوانە نەکات: سەرکردەی درۆزن، وەزری تاوەنکارو ناپاك، خواناسی ستەمکار، قورئان خوێنی خراپە کار کەسیماو ڕوخساریان لەسیماو ڕوخساری ڕاهیبەکان دەچێت ، وە دڵەکانیان بۆگەنە ئارەزووەکانیان جیاوازە، خوای گەورە دەرگای ئاشوب وفیتنەی لێ دەکاتەوە. وەسوێند بێت بەوکەسەی گیانی محمدی بەدەستە ئیسلام پارچەپارچە دەبێت ولەناو دەچێت، تەنانەت ووتنی الله الله یش نابیستیت ، یان فەرمان بەچاکە دەکەن وڕێگری لەخراپە دەکەن ، یا خودای گەورە ستەمکاران وخراپەکارانتان دەکاتە ڕابەرو سەرکردە تاوەکو توشی توندترین ئازارتان دەکەن. لەم کاتەدا پیاو چاکەکانیشتان نزایان قبوڵ نابێت. یان دەبێت فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە بکەن، یاخود خوای

گــــەورە كەســــانێك بەســــەرتاندا زاڵ دەكــــات كــــەڕێز لەگــــەورەتان نــــەگرێت وبەزەیی بە بچوكیشتان نەیەتەوە.

وەلــە (معجــم الطبرانــي) و سەرچــاوەی تــریش هــاتووە لــە فــەرموودەی "ســعید بــن جــبیر" لــە "ابــن عبــاس"رضي الله عنه دەڵێــت:پێغەمبــەری خــوداﷺ دەفــەرمێت: (مــا طفــف قــوم كــيلاً، ولا بخســوا ميزانــاً ، الا مــنعهم الله عزوجــل القطــر، ومــا ظهــر في قــوم الزنــا إلا ظهــر فــيهم المــوت. ومــا ظهــر في قــوم الربــا الاســلط الله علــيهم الجنــون، ولا ظهــر في قــوم القتــل يقتــل بعضــهم بعضــاً، الا ســلط الله علــيهم عــدوهم، ولا ظهــر في قــوم عمــل قــوم لــوط الا ظهــر فــيهم الخســف، ومــا تــرك قــوم الأمــر بــالمعروف والنهــي عــن المنكــر الا لم ترفــع أعمــالهم ولم يســمع دعــاؤهم.) [1] (واتــە: هــەر قــەومێك فێــڵ لەتــەرازوو بكــات ، ئــەوا خــوای گــەورە توشــی وشــكە ســاڵیان دەكــات و بارانیــان لــێ دەگرێتــەوە. وەهــەر قــەومێك زینــا وداوێــن پیســی ببێتــە دیــاردە تێیانــدا ، ئــەوا خــوای گــەورە توشــی مردنیــان دەكــات"واتــە جۆرەهــا دەردو تــاعونی كوشــندەی وەك ئیــدز وســەیەلان وزوهــری تــوش دەكــات كەهــەر بــەتوش بوونیــان لــە ڕیــزی مــردوان دەژمێــردرێن ، چــونكە چارەســەریان ئەستەمەو دژوارە..... وەرگێڕ".)

وەهــەر قــەومێك ڕیبــا خــواردن ببێتــە پیشــەودیاردە تێیانــدا، ئــەوا خــوای گــەورە توشــی شــێتییان دەكــات. وەهــەر قــەومێك كوشــتن ویــەكتر كــوژی ســەرهەڵبدات لەناویانــدا، ئــەوا خــوای گــەورە دوژمنــەكانیان بەســەردا زاڵ دەكــات. وەكــرداری چڵێســی قــەومی لــوط واتــەنێر بــازی لەهــەر قەمێكــدا ســەرهەڵبدات، ئــەوا خــوای گــەورە توشــی ســزایی بــەناخی زەویــدا چــوونیان دەكــات. وەهــەر قــەومێك دەســت بــەرداری فــەرمان كــردن بەچــاكەو ڕێگــری لەخراپــەكردن ببێــت، خــوای گــەورە كــارو دوعایــان لــێ وەرناگرێــت ولێیــان قبوڵ ناكات.

---

[1] -(منــذری)لــە (الترغیــب والترهیــب)دا هێنــاویێتی .وە(مالــك)بــە(موقــوف)ی داوە لەئەلــەم. بەلام لەلای (الطبراني)و كەسانی تر "مرفوعە".

وه (ابن ابی الدنیا) لـه فـهرموودهى "ابـراهيم بـن الاشـعث"لـه "عبـدالرحمن بـن زيـد" لـه "بـاوكى يـهوه" ئـهويش لـه "سـعيد"ئـهم فهرموودهيانـه گێڕاوهتهوه.

وهلـه "مـسند" و سهرچـاوهى تـريش دا هـاتووه لهفـهرموودهى"عـروه"لـه "عائيـشه"ەوهﷺ دهڵێـت: (دخـل رسـول اللهﷺ وقـد حفـزه الـنفس، فعرفـت في وجهـه انـه قـد صـفزه شـيء فمـا تكلـم حتـى توضـأ، وخـرج فلـصقت بـالحجرة، فـصعد المنـبر فحمـد الله وأثنـى عليـه، ثـم قـال: يـا أيهـا النـاس ، إن الله عزوجـل يقـولكم: مـروا بـالمعروف وانهـوا عـن المنكـر قبـل ان تـدعوني فـلا أجيـبكم، وتستنـصرون فـلا أنـصركم، وتـسألونى فـلا أعطيكم.) [1] واتـه: چـووم بـۆلاى پێغهمبـهرى خـودا هەسـتم كـرد بهڕوخـساريدا شـتێك سـهرقاڵى كـردووه. هيـچى نـهووت تـا دهسـت نوێـژى گـرت ورۆيـشت بـۆ مزگـهوت دواتـر چـووه سـهر بڵندگۆيـهكى وفـهرمووى: ئـهى خهڵكينـه خـواى گـهوره پێتـان دهفـهرمێت: فـهرمان بهچـاكهو ڕێگـرى لـه خراپـه بكـهن، پـێش ئـهوهى بپاڕێنـهوه و داوابكـهن و وهڵامتـان نهدهمـهوه و داواى سـهركهوتنيش دهكهن سهرتان ناخهم.

وه (العمـرى الزاهـد) دهڵێـت: (يـهكێك لـهو سهركهشـيانهى تـۆ بهسـهر دهرونـى خۆتـدا دهيكـهيت و خـوداش لـهخۆت زويـر دهكـهيت ، ئهوهيـه كاتێـك كـه كـارێكى نـاڕهوا كـه دهبێتـه مايـهى تـوڕه بـوونى خـوداى گـهوره لـه پـێش چـاوت ئـهنجام دهدرێـت ، تـۆيش نـهڕێگرى دهكـهيت ونـه فـهرمان بهچـاك بـوونى دهكـهيت و وهتێيدهپـهڕێنيت لهترسـى كهسـانێكى تـر نـهوهك زيانـت پـێ بگهيـهنن، كهچـى لهڕاسـتيدا ئـهوان نـاتوانن زيـان وقـازانج بهخۆشـيان بگهيهنن، نهخوازه بهتۆ) .

وههـهروهها دهڵێـت: (هـهر كهسـێك لهترسـى كهسـانى تـردا دهسـت بـهردارى فـهرمان بهچـاكهو ڕێگـرى لهخراپـه بێـت، ئـهوا گوێڕايـهڵى وملكهچـى بۆ خواى گهوره لهدهست داوه. )

---

[1] – ئـهم فهرموودهيـه(ضـعيف الاسـناد) ه،(احمـد : ٦/١٥٩)وه(الهيثمـي)دهڵێـت لهسـهنهدهكهى دا (عاصم بن عاوى تيدايه)كهله (مجاهل)ه(٧/٢٦٦).

وە (امام أحمد) لە"مسند" دا لە فەرموودەی"قيس بن ابی حازم" هێناویێتی کە دەڵێت"ابو بکر الصديق"ﷺ ووتی: **(ايها الناس إنكم تتلون هذه الآية، وإنكم تضعونها على غير موضوعها:** (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ.... المائدة:١٠٥) **واني سمعت رسول اللهﷺ يقول: ان الناس اذا رأوا الظالم لم يأخذوا على يديه، وفي لفظ، اذا رأوا المنكر فلم يغيروه، او شك ان يعمهم الله بعقاب من عنده.)**[1]

**واتە: ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەخوێننەوەکەچی لەشوێنی خۆیدا بەکاری ناهێنن ، خوای گەورە دەفەرموێت:** (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ.... المائدة:١٠٥) .

**من گوێم لەپێغەمبەری خودا بوو کەدەفەرمێت:" ئەگەر خەڵکی ستەمکارێکیان بینی ستەمی کرد ورێگرییان لێ نەکرد. یاخود لە ووتەیەکی ترا ئەگەر ناڕەوایەکیان بینی و نەیانگۆڕی و ڕێگریان لێ نەکرد، ئەوا دوور نی یە خوای گەورە هەموویان توشی سزایەك بکات.**

وە (اوزاعی) دەگێڕێتەوە لە"يحيى بن ابي كثير"لە "ابي سلمة" لە"ابو هريرة"ﷺدەڵێت:پێغەمبەری خودا فەرمووی: **(اذا خيفت الخطيئة لم تضر الاصاحبها ، واذا ظهرت فلم تغير ضرت العامة.)** [2]

**واتە: ئەگەر تاوانێك پەردەپۆش کرا ئەوا تەنها خاوەنەکەی توشی سزا دەبێت، بەلاَم ئەگەر دەرکەوت وئاشکرا بوو و نەگۆڕدرا ئەوا زیانی بۆ گشت خەڵکی دەبێت.**

وە (امام احمد) دەگێڕێتەوە کە"عمر بن الخطاب"وتوویەتی: **(دوور نی یە ئەو دێهات وگوندانە بە ئاوەدانی کاول بکرێت؟ ووتیان چۆن کاول دەبێت کەخۆی لەخۆیدا ئاوەدانە؟ فەرمووی: ئەگەر تاوەنکارەکانیان زاڵ**

---

[1] – ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە،(احمد: ١/٧) و (ترمذي: ٣٠٥٧) وەبە "حسن صحيح"ی داناوە.

[2] – ئەم فەرموودەیە( ضعيف جداً) ە،وە(الهيثمي )لە(المجمع: ٢٦٨/٧) هێناویێتی وە"طبرانييش" لە(الاوسط)دا وە(مردان بن سالم الغفاری) تێدایە لەسەنەدەکەیدا کەئەم پیاوە (تروك ) ەو شتی لێ وەرناگیرێت.

بـبن بەسـەر پیـاو چـاکەکانیاندا و خراپـەکاران ببنـە سـەرۆکی خێـڵ وعەشیرەتەکانیان.)

وە (اوزاعـی) دەگێڕێتـەوە لـە "حسان بن عطیـة" لـە پێغەمبـەرەوە کـە فەرموویـەتی: (سـیظهر شـرار أمـتي علـى خیارهـا ، حتـى یـستخفی المـؤمن فـیهم، کمـا یـستخفی المـؤمن فـیهم، کما یـستخفی المنـافق فینـا الیـوم.) واتـە: خراپـەکارانی ئومەتەکـەم زاڵ دەبـن بەسـەر چـاکەکانیدا. وەبـاوەڕدار تێیانـدا وون وبـزر دەبێـت، هـەروەکو چـۆن ئـەمڕۆ دووڕووەکـان لەنێوانمانـدا بـزرن و وونن.[1]

وە (ابـن ابـی الـدنیا) لـە فـەرموودەی "ابـن عبـاس" دەگێڕێتـەوە کـە: (یرفعـه) قـال (یـأتي زمـان یـذوب فیـه قلـب المـؤمن کما یـذوب الملـح في المـاء. قیـل: مـم ذاك یـا رسـول الله؟ قـالﷺ: ممـا یـری مـن المنکـر لا یـستطیع تغـیره.) واتـە: ڕۆژێـك دێـت کـەدڵی بـاوەڕدار دەتوێتـەوە وەك توانـەوەی خـوێ لـەئاودا. ووتیـان ئـەی پێغەمبـەری خـودا چـۆن؟ فـەرمووی: بـەهۆی ئـەوەی کـە نـاڕەوایی وخراپـە دەبینێـت وناتوانێـت ڕێگـری بکـات وچـاکی بکاتەوە.

وە (امـــام احمـــد) لەفـــەرموودەی "جریـــر"ﷺ دەگێڕێتـــەوە کەپێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (مـا مـن قـوم یُعمـلُ فـیهم بالمعاصي، هـم أعـز واکثـر ممـن یعملـه لم یغـیروه إلا عمهـم الله بعقـاب.)[2] واتـە: هـەر قـەومێك پێڕێکـــی کـــەم تێیانـــدا خراپەکاروسەرپێـــچی بکـــات. وەزۆرینـــە کەبالأدەستیـشن، هـەولّی گـۆڕینی پێـڕە کەمەکـەیان نـەدا، ئـەوا خـوای گـەورە سزاوئازارێکی توند ئاراستەی هەرهەموویان دەکات.

وە لـە (صـحیح بخـاری) دا لەفـەرموودەی"اسـامە بـن زیـد" کـە دەڵێـت گـوێم لـێ بـوو کـە پێغەمبـەری خـودا فەرموویـەتی: (یُجـاء بالرجـل یـوم القیامـة، فیلقـی في النـار، فتنـدلق أقتابـه في النـار، فیـدور کمـا یـدور الحمـار

---

[1] -هەروەکو بلّێی پێغەمبەری خوداﷺ باسی ئەمڕۆ دەکات.

[2] - ئـەم فەرموودەیـە (صـحیح)ە،(احمـد ٤/٣٦١، ٣٦٤، ٣٦٦)وە (ابـو دواد: ٤٣٣٨)وە (ابن ماجە:٤٠٠٩) وە(البانی)بە صحیحی داناوە.

برحاه فيجتمع عليه أهل النار، فيقولون: أي فلان، ماشأنك؟ الست كنت تأمرنا بالمعروف وتنهانا عن المنكر؟ قال: بلى ، إني كنت آمركم بالمعروف ولا آتيه وأنهاكم عن المنكر وآتيه.) [1] واته: پیاوێك دەهێنن لەڕۆژی قیامەتدا فڕێی دەنە ناو دۆزەخەوە هەرهەموو ڕیخۆڵەکانی پەرش وبلاودەبێتەوە لەناو ئاگردا، جا بەشێوەی سوڕانەوەی گوێ درێژ بەدەوری مێخسکەکەیدا دەسوڕێتەوە، خەڵکی دۆزەخی لێ کۆدەبێتەوەو دەیناسنەوەو پێی دەڵێن:ئەی فلانە کەس تۆ چی دەکەیت لێرە؟ ئەی تۆنەبوویت لەدنیادا فەرمانت پێ دەکردین بەچاکەو ڕێگری ورێنمایت دەکردین لەخراپەدا. ئەویش دەڵێت: بەڵێ.. من فەرمانم دەکرد بەچاکە ، بەلام خۆم نەم دەکرد. وەڕێنمایم دەکردن لەنەکردنی خراپە، بەلام خۆم خراپەم دەکرد.

وە (امام احمد) دەگێڕێتەوە کە "مالك بن الدينار" ووتویەتی: "یەکێك لەپیاوە ئاینیەکانی بنی ئیسرائیل کە پلەی"حبر"ی هەبوو هەموو کاتێك پیاوان وئافرەتان دەهاتنە ماڵەکەی و ئەویش بەهەمیشەیی ڕێنمایانی دەکرد ویادی خوای دەخستنەوە. جارێکیان هەندێ لەکوڕەکانی خۆی بینی کە چاوبڕکێیان لەگەڵ ئافرەتان دەکرد ، ئەویش پێی ووتن: لەسەر خۆتان ئەی کوڕەکانم ،لەسەر خۆتان، کەوتەخوارەوەو توشی شەلەلی نیوە بوو، وەئافرەتەکەیش توشی شکست هات ، وەکوڕەکانیشی کوژران، خوای گەورە وەحی نارد بۆ پێغەمبەرەکەیان کەبە فلان حبر بڵێت: من بەهیچ شێوەیەك لە نەوەی تۆدا پیاو باش دروست ناکەم، وەتوڕەبوونی من لەتۆش تەنها لەبەرئەوە بوو کەلە ڕێگرتن لەکوڕەکانتدا ، تەنها ووتت لەسەر خۆتان کوڕەکانم.

وە (امام احمد) لە "عبدالله بن مسعود"وە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (إياكم ومحقرات الذنوب ، فأنهن يجتمعن على رجل حتى يهلكنه، وان رسولﷺ ضرب لهن مثلاً كمثل قوم نزلوا أرض فلاة، فحضر صنيع القوم، فجعل ينطلق فيجيء بالعود، والرجل

---

[1] – ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە، پێشتر باسمان کردووە.

يجيء بالعود، حتى جمعوا سواداً واجحوا ناراً، وأنضجوا ما قذفوا فيها.) [1] واته: وریایی تاوانه بچوكه‌كان بن ، چونكه كه‌ڵه‌كه ده‌بن له‌سه‌رتان تابه‌هیلاكتان ده‌به‌ن، پێغه‌مبه‌ر نمونه‌یه‌كی هێنایه‌وه وفه‌رمووی، وه‌ك نمونه‌ی پێرێك وایه له زه‌وی یه‌كی ووشك وچۆڵدا لایان داوه ،گه‌وره‌كه‌یان پیاوان ته‌رخان ده‌كات بۆ هێنانی پارچه دار ، تاداریكی زۆر كۆده‌كه‌نه‌وه وه‌ئاگری تێ به‌رئه‌ده‌ن، وه ئه‌وه‌ی خستیانه سه‌ر ئاگره‌كه كولاندی ، واته هه‌رچه‌نده داره‌كان بچوك بوون به‌لام كه‌زۆربوون ئاگری گه‌وره به‌رپا ده‌كه‌ن.

وه‌له (صحیح بخاری) دا هاتووه له" أنس بن مالك"ﷺ ووتی: (إنكم لتعملون أعمالاً هي أدق في اعينكم من الشعر، وإن كنا لنعدها على عهد رسول اللهﷺ من الموبقات.) [2] واته: ئێوه كاری واده‌كه‌ن له تاڵه موویه‌ك بچوكتره له چاوتاندا كه‌چی ئێمه له‌سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ردا به‌یه‌كێك له‌و تاوانانه‌مان داناوه كه مرۆڤ به‌هیلاك ده‌بات.

وه‌له (صحیحین) دا هاتووه له‌فه‌رمووده‌ی"عبدالله بن عمر"ﷺ كه‌پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رموویه‌تی: (عذبت امرأة في هرة سجنتها حتى ماتت، فدخلت النار ، لا هي أطعمتها ولا سقتها ولا هي تركتها تأكل من خشاش الأرض.) [3] واته: ئافره‌تێك خرایه ناو ئاگره‌وه به‌هۆی پشیله‌یه‌كه‌وه، كه‌به‌ندی كردبوو نه‌ئاوی پێ دابووو نه‌خۆراك ، وه‌نه‌مۆڵه‌تیشی داو نه ئازادیشی كرتا خۆی شتی زه‌وی بخوات تاوه‌كو مرد، خودا ئافره‌ته‌كه‌ی خسته دۆزه‌خه‌وه.

وه له (الحلیه) دا (أبی نعیم) ئه‌م ووته‌یه‌ی "حذیفة"ده‌هێنێت كه‌پێی ووتراوه: "ئایا بنی ئیسرائیل له‌یه‌ك رۆژدا ده‌ست به‌رداری ئاینی خۆیان بوون؟ حذیفة ده‌ڵێت: نه‌خێر. به‌لام ئه‌وان به‌سه‌ر هه‌ر خراپه‌یه‌ك

---

[1] – ئه‌م فه‌رمووده‌یه (صحیح)ه، پێشتر باسمان كردووه.

[2] – ئه‌م فه‌رمووده‌یه (صحیح)ه، (بخاری) (٦٤٩٢) گێراویتیه‌وه.

[3] – ئه‌م فه‌رمووده‌یه (صحیح)ه، (بخاری : ٣٤٨٢، ٣٣١٨ ، ٢٣٦٥) وه (مسلم: ١٤ ، ٢٤٧ ، نووی)گێراویانه‌ته‌وه.

تێپەڕینایە پشت گوێیان دەخست، وەهەر شتێکیان لەسەر قەدەغە بکرایە ،ڕاستەوخۆ دەیان کرد. بەم چەشنە بەردەوام بوون. تا لەئاینەکەیان جیابوونەوەو دەرچوونە دەرەوە، هەروەکو چۆن پیاو قەمیس وکراسەکەی دادەکەنێت ولێی دێتە دەرەوە."

وەهەر لەم ڕوانگەیە هەندێك لە زانایانی"سەلەف" ووتویانە: (تاوانکاری وسەرپێچی پۆستی بیێ باوەڕی یە.) هەر وەکو چۆن ماچ کردن پۆستی کاری سێکسی ژن ومێردە ، وەگۆرانی پۆستی داوێن پیسی یە"زینا". و تەماشاکردن ونەزەر پۆستی عیشق وشەیدابوونە، وەنەخۆشی پۆستی مردنە.

وە لە (الحليە) دا هاتووە لە "ابن عباس"ﷺ ووتوویەتی: (ئەگەر کەسی تاوەنکاریت، لەسەرئەنجامی تاوانەکەت بێ خەم مەبە وەبەردەوامیت لەسەر تاوانکاری لە خودی تاوانەکە گەورەترە) .

- وەبێ شەرمیت بەرامبەر فریشتەکانی سەر شانی ڕاست وچەپت گەورەترە لەخودی تاوانەکەت.
- وەدڵ خۆش بوونت بەئەنجام دانی تاوانەکەت گەورە ترە لەخودی تاوانەکە.
- وە غەمگینت بۆ لەدەست دانی تاوانێك کەلە دەستت چووەو فریایی نەکەوتیت ئەنجامی بدەیت ، گەورە ترە لەخودی تاوانەکە.
- وەنەترسان لەوەی کە خودا تەماشات دەکات ودەتبینێ ، وەلەهەمان کاتدا ترسانت لەوەی نەك یەکێك بتبینێ یان دەرگاکە بجولێتەوەو کەسێك تەماشات کات، گەورە ترە لەخودی تاوانەکە کە ئەنجامی دەدەیت.

قوربەسەر... ئایا دەزانیت هۆکاروتاوانی حەزرەتی یونس چی بوو کە خوای گەورە توشی ئەوهەموو بەلایەی کرد لەنەخۆشی وتیاچوونی ماڵ وحاڵ وکوڕو سامانی؟! تەنها ئەوەندە بوو کە کەسێکی ستەم دیدە داوای هاوکاری کرد لەدژی ستەمکارەکەی ،بەلام حەزرەتی یونس پشت گوێی خست. بۆیە خوای گەورە توشی ئەوهەموو بەلایەی کرد.

(امام احمد) دەگێڕێتەوە لە "ولید"ئەویش لە "اوزاعی" کە گوێی لێ بووەو "بلال بن سعد"وتوویەتی: (تەماشای بچوکی تاوانەکەت مەکە ، بەڵکو تەماشای گەورەیی ئەو کەسە بکە کەتاوانی لە پێش ئەنجام ئەدەیت.)

وە (فضیل بن عیاض) دەڵێت: (هەرچەندە تۆ تاوانەکەت بە بچوك بزانیت بە ئەندازەی ئەوە خوای گەورە بە گەورە تەماشای دەکات، وهەرچەندە تۆ تاوانەکەت بەگەورە بزانیت بەئەندازەی ئەوە خوای گەورە بە بچوك تەماشای دەکات.)

وە ووتراوە: کە خوای گەورە وەحی بۆ "موسی (س.خ) "ناردووە کە یەکەم کەس لەدروست کراوەکانم مردوونە. بریتی بووە لە (ئیبلیس) چونکە سەرپێچی کردم ویاخی بوو، چونکە من یاخی بووەکان لەریزی مردوان دەژمێرم.

وەلە "مسند" و (جامع الترمذي) دا هاتووە لەفەرموودەی "أبي صالح"کە "ابو هریرة" دەڵێت کە پێغەمبەری خودا فەرموویەتیﷺ: (ان المؤمن اذا أذنب"ذنبا" نكت في قلبه نكتة سوداء، فإذا تاب ونزع وأستغفر صقل قلبه، وإن زاد زادت، حتى تعلو قلبه، فذلك الران الذي ذكرهالله عز وجل:" كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ... المطففين:١٤"قال الترمذي هذا الحديث صحيح.)[1] واتە: کەسی باوەڕدار ئەگەر تاوانێك ئەنجام بدات ،ئەوا خاڵێکی ڕەش لەناو دڵیدا دروست دەبێت، جائەگەر تەوبەی کردو گەڕایەوە ئەوا خوای گەورە دڵی پاك دەکاتەوە. خۆئەگەر تاوانی زیاد کرد ئەوا ئەوخاڵە ڕەشە هەموو دڵی دەگرێتەوە. وەئەمەش واتای ووشەی (ران) ە.

کە خوای گەورە دەفەرمێت: (كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ... المطففين:١٤) واتە: نەخێروانی یە "ئەو نەفامانە تێ ناگەن

---

[1] – ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە.(احمد: ٢٩٧/٢)و (الترمذي: ٣٣٣٤)وە (ابن ماجه: ٤٢٤٤)وەدەڵێت "صحيح"ە لەسەر مەرجی"مسلم".

وداناچـەڵەکێن"بـەڵکو دڵیـان ژەنگـی هـەڵهێناوەو پیـسی وتـاوان داپۆشـیوە، لەسەر ئەنجامی ئەوکاروکردەوانەی کەدەیان کرد.

وە (حذیفـة) دەڵێـت: "هـەر بەندەیـەك تاوانێـك بکـات، ئـەوا خـاڵێکی ڕەش لـە دڵـی دروسـت دەبێـت، تـا دڵـی وەکـو مـەڕێکی سـپی لـێ دێـت کەخاڵێکی ڕەشی تێدایە."

(امـام احمـد) دەڵێـت "یعقـوب" بـۆی گێڕامـەوە لـە بـاوکی یـەوە لە"صالح" لـە"ابن شهاب"کـە "عبدالله بن عبدالله عتبە"بۆی گێڕاوەتـەوە لـە "عبـدالله بـن مـسعود" کـە پێغەمبـەری خـوداﷺ فەرموویـەتی: (أمـا بعـد یـا معـشر قـریش، فـإنكم أهـل هـذا الأمـر مـالم تعـصوا الله ، فـإنكم عـصیتموهُ بعـث علـیكم مـن یلحـاكم كمـا یلحـى هـذا القـضیب بقـضیبٍ في یـده، ثـم لحـي قـضیبه فـإذا هـو أبـیض یـصلد.)[1] واتـە: ئـەی پێـری قـوڕەیش، ئێـوە کەسـی شیاوی ئـەم ئاینـداری وکاروبـارەن تاسەرپێـچی خـودا نەکـەن، کەسـەر پێـچی خوداتـان کـرد، ئەوکاتـە خـوای گـەورە توشـی کارەسـاتێکتان دەکـات لاتـان دەدەن،هـەروەکو چـۆن ئـەم توێکڵـە لـەم دارە دەبێتـەوە ، لـەم کاتـەدا پێغەمبـەر دارێکـی بەدەسـتەوە بـوو ، توێژاڵەکـەی لـێ دەکـردەوە وپـاك وسپی بووەوە، واتە هیچتان بەدەستەوە نامێنێت.

وە (امـام احمـد) لـە "وەهـب"ەوە دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت:"خـوای گـەورە لـە بەشـێك لـەو ڕێنمایـەی کەبـە بـنی ئیـسرائیلی دەفـەرموو: مـن ئەگـەر ملکەچـیم بکرێـت ئـەوا ڕازی دەبم ، وەئەگـەر ڕازیـش بـووم ئـەوا پیـت وبەرەکـەت دەڕژێـنم بەسـەرتاندا. وەپیـت وبەرکـەتی منـیش کۆتـایی نایـەت. وەئەگـەر سەرپێـچیم بکرێـت ویـاخی بـن لـێم، ئـەوا تـوڕەدەبم، وەئەگـەر تـوڕەش بـووم ،ئـەوا نـەفرەتان لـێ دەکەموەنـەفرەتی منـیش تـا وەچـەی حەوتەمیشتان دەگرێتەوە."

هـەروەها (وکیـع) دەڵێـت: "زکریـا" لـە "عـامر" دەگێڕێتـەوە خـاتوو عائیـشە (خ.ڕ) ئـەم فەرموودەیـەی ئاراسـتەی "معاویـە بـن ابـی سـفیان" کـرد کـە تێیـدا هـاتووە: (امـا بعـد فـإن العبـد اذا عمـل بمعـصیة الله عـاد حامـده

[1] - ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(احمد: ١/٤٥٨)گێراویەتیەوە.

من الناس ذاماً.)[1] واته: هەرکاتێك بەندەکان کاریان کردو لە خوا یاخی بوون ، ئەوا ئەو کەسانەی لەخەڵکی پێشتر وەسفیان دەکرد و پێیاندا هەڵدەدا. ئەوا زەمی دەکەن بەخراپە باسیان دەکەن.

هەروەها (ابو نعیم) لە "سالم بن ابی الجعد" دەڵێت "ابو درداء" دەڵێت: (با مرۆڤ ئاگادارو وریایی ئەوە بێت کە دڵی بڕواداران نەفرەتی لێ نەکەن، ئەمیش بەخۆی نەزانێت، پاشان ووتی: ئەزانی ئەمە لەبەر چی؟ منیش ووتم: نەخێر. ووتی: چونکە ئەو مرۆڤە بەنهێنی دەست دەکات بە سەرپێچی ویاخی بوون لەخودا. خوای گەورەش ئەو مرۆڤە ناشرین دەکات لە دڵی بڕواداراندا کە چی بەخۆشی نازانێت.)

## تاوان شوێنەواری خراپی هەیە، هەرچەندە ئێستا دەرنەکەوێت

(عبدالله بن أحمد) لە کتێبی "الزهد"ی باوکیدا دەگێڕێتەوە لە" محمد بن سیرین": کاتێ قەرزاری زۆری بۆ هێنا زۆر دڵ تەنگ بوو ، ووتی: من

---

[1] - ئەم فەرموودەیە (صحیح لغیره)ه، (ترمذي:٢٤١٤) وە(ابن حبان:٢٧٦-أحسان)وەبڕوانە(الصحیحیه: ٢٢٣١١)"مرفوعه"وەبەم ووتەیە هاتووە:( من التمس رضا الله بسخط الناس کفاه الله مؤنة الناس، ومن التمس رضا الناس بسخط الله وکله الله الی الناس )ئەمە لفظ ی ترمذي یە. واتە: هەرکەسێك ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست بهێنێت ، بەپێچەوانەی ڕەزامەندی خەڵکی ، ئەوا خوای گەورە پشتیوانی لێ دەکات لە بری کەسانی تر. وەهەر کەسێك بەپێچەوانەوە ڕەزامەندی خەڵکی بەدەست بهێنێت لەسەر حسابی توڕەبوونی خودای گەورە ، ئەوا خودای گەورە توشی شەڕی خەڵکی دەکات.

وەدانەر دەڵێت: ئەمەبەسەر ئەوکەسانەدا دەچەسپێت کە هەمیشە هاندەرو پشتیوانی سەرکردەو پادشاکان دەکەن لەسەر مەبەستە خراپەکانەیان، وەهەروەها ئەوانەشی کەهاوکاری کەسانی بیدعەچی دەکەن کەخۆیان داوەتە پاڵ خواناس وشارەزاکان لەئاییندا. جا هەر کەسێك خوای گەورە یارمەتی بدات وڕێنمایی بکات، ئەوە خۆڕاگر دەبێت لەسەر ئەنجام نەدانی خراپەکاری، وەلەبەرامبەر ووتەو ڕەخنەی ناشرین ودژایەتی یەکانی خەڵکی خراپە ویست ئارام دەگرێت، وەسەرئەنجامی سەرفرازی دونیاو قیامەت بەدەست دەهێنێت. هەروەکو ئەوەی بەسەر پێغەمبەران وهاوەڵانیان هاتووە لەدژایەتی کردنیدا.

هەروەها دەڵێت: لە هەندێ حاڵەتی تایبەتی دا ڕێپێدراوە ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر هەندێ شتی ناڕەواوتایبەتی ،بەڵام لەدڵەوە زۆرت پێ ناخۆش بێت وەك دەرخستنی بێ باوەڕ، کەلە هەندێ شوێنی تایبەت ولەکەسانی تایبەت وبۆ حاڵانی تایبەت دا ڕوودەدەن، بڕوانە کتێبی(کنز الفوائد) بابەتی(باب المکروهات المقدره علی العبد).

ئـەم دڵ تـەگی وخەفەتـە دەزانم هـی چـی یـە، ئـەم هـی تاوانێکـە لـە چـل سـاڵ لەمەوپێش ئەنجامم داوە...

ئـا لێـرەدا ئەمـــە جێگـــەی تێڕامانـــە، کـــە زۆرێـــك لەخـــەڵکی لـــەبارەی کاریگـــەری وشـــوێنەواری تـــاوان بـــێ ئاگـــان، وا گومـــان دەبـــن کـــە چـــیتر شوێنەواری تاوان تێپەڕیوەو کاریگەری نەماوە ، هەروەکو شاعیر دەڵێت:

إذا لم يغير حائط في وقوعه فليس لهُ بعد الوقوع غبار

واتـە: ئەگـەر دیوارێـك لـەکاتی ڕوخانیـدا هیچـی بەسـەر نـەهات، ئـەوا لـە دوای ڕوخانی تۆزو غوباریش ناکات.

پـاکی وبـێ گـەردی بـۆ خـوا.... ئـەم بـێ ئاگـایی یـە چـی بەسـەر خەڵکیـدا هێنـا ؟ چـەندین نیعمـەتی لـەناو بـرد. چـەندین بـەڵاو ئاشـوبی هێنـا. چـەندین زانـاو خـاوەن پلەوپایـە لـەم بـوارەدا تـێ کـەوتن جـا نـەخوازە نەفامـەکان. چـونکە هەسـتیان بەوەنـەدەکرد کـەتاوان کاریگـەری وڕەهەنـدی زۆری هەیـە. وەبـێ ئاگـابوون لـەوەی کـە تـاوان هـەروەکو برینـی بۆگـەن کەلـەژێرەوە کـێم وچڵك دەکات ،هەر ڕۆژێك بێت کاریگەریەکەی دەردەکەوێت.

وە (امـام احمـد) دەگێڕێتـەوە کـە "ابـو درداء"وتوویـەتی: (بەشـێوەیەك خـودا پەرسـتی بکـەن خـودا دەبیـنن، وەخۆتـان لـەڕیزی مردووەکـان بـژمێرن ، وەدڵنیـابن کـە مـاڵێکی کـەمی بـاش ،باشـترە لـە زۆرێـك کـە مانـدووتان بکـات. ودڵنیـابن کەچـاکە بـزر نابێـت وەخراپـەش لـەبیرناکرێ. وەلەگـەڵ ئەمەشـدا تاوان سیمایەکی ڕاستەوخۆ دەبەخشێت بە بکەرەکەی.)

(سـلیمان التمیمـی) دەڵێـت:"مـرۆڤ کاتێـك کـەتاوان دەکـات بـەنهێنی، کەچی دواتر پێوەی دیارە."

وە (یحیـی بـن معـاذ الـرازی) دەڵێـت:"سەرسـوڕمانم دێـت بەکەسـانێك کـە لەنزاوپاڕانەوەکانیـدا دەڵێـت: خودایـە دوژمنـانم پـێ دڵ خـۆش مەکـە، کەچـی ئـەم خـۆی دڵـی دوژمنـەکانی خـۆش دەکـات، ووتیـان چـۆن؟ ووتـی: سەرپێچـی دەکـات ولـە خـودا یـاخی دەبێـت و وەسـەرجەم ناحـەزانی دڵ خـۆش دەبـن لەقیامەتدا پێی."

وه (ذو النـــون) دەڵێــت:"هەرکەسـێك ناپــاکی وخیانـــەت بەرامبـــەر خـــودا بکـات بـەنهێنی ، ئـەوا خـوای گـەورە پـەردەلەسـەری هەڵـدەماڵێت وبـە ئاشـکرا ڕیسوای دەکات."

## شـــوێنەوارە ناشـــیرینەکانی تـــاوان ، وە ئـــەو ســـزایانەی لەســـەر ئەنجامدەرەکەیەتی لە دونیادا

تــاوان ویــاخی بــوون.. شــوێنەوار و کاریگــەری ناشــیرین وخراپــی وزۆرە ، کــەزیان بەخــشە بــۆ دڵ وجەســتە لــەدونیاو قیامەتــدا. مەگــەر تــەنها خــوای گەورە بزانێت. لەو کاریگەریانە:_

### ١- بێ بەش بوون لەزانست:

زانـست ڕوونـاکی یـە خـوای گـەورە لـە دڵ داینـاوە، وە تـاوان ئـەو ڕوونـاکی یە دەشارێتەوە.

کـاتێ "امــام الــشافعي"ﷺ لەبەردەســتی "امــام مالــك" دا دەســتی کـرد بەخوێنــدن، وەزیرەکــی وبلیمـــەتی و لێهــاتووی وشــارەزای دەرکـــەوت. پێــی ووت: وا هەســـت دەکـــەم خـــوای گـــەورە ڕوونـــاکی یـــەکی لەدڵتـــدا کردۆتـــەوە، وریابە بە تاریکی تاوان کردن نەیکوژێنیتەوە...

وە (امام الشافعي) دەڵێت:

شكوت الى وكيع سوء حفظي ... فأرشدني الى ترك المعاصي
وقال: أعلم بأن العلم فـضلٌ ... وفضل الله لايؤتاه عاصـي[1]

واتـــە:گلـــەیم کـــرد لـــەلای "وەکیـــع"لەکـــەم تەرخـــەمیم لـــە لەبەرکردندا.....ڕێنمای کردم بۆ وازهێنان لە تاوانکاری

پێـــی ووتم: زانـــست بەخشـــشی خوایـــە.... وەبەخشـــشی خـــودا نادرێـــت بەیاخی.

---

[1] – لە دیوانی"امام شافعي"دا ئەم دێڕە شیعرانە هاتووە بەم چەشنانە:
وأخبرني بان العلم نور ... ونور الله لايهدي لعاصي
واتە: پێی ڕاگەیاندم کە زانست ڕووناکی یە ... وەڕووناکی خودا نادرێت بەیاخی.

### ٢- بێ بەش بوون لە ڕزق و ڕۆزی:

لــە (مســند) دا هــاتووە: (إن العبــد ليحــرم الــرزق بالــذنب يصــيبه)[1] واتــە: (مــرۆڤ بــێ بــەش دەبێــت لــەڕزق وڕۆزی بــەهۆی تاوانێکــەوە کەتوشــی دەبێت).

هــەروەکو چــۆن تــەقواو خۆپاراســتن مایــەی زیــادبوونی ڕزق وڕۆزی یــە، وەپشــت گــوێ خستنیشــی مایــەی هــەژاری ونــەداری یــە. وەهــەروەها واز هێنان لەتاوانکاری مایەی زیادبوونی ڕزق وڕۆزی یە.

### ٣- بێــزاری لــەدڵ ودەروونــی تاوەنکــاردا دروســت دەبێــت ، هەســت بەدوورکەوتنەوە دەکات لەخوا:

هــەموو خۆشــی وتــام وچــێژەکانی دونیــا ناتوانێــت شــوێنەواری ئــەو دووری ودڵتــەنگی و بێــزاری یــە بســڕێتەوە کەلــە دڵ ودەروونــی تاوەنکــاردا دروســت دەبێــت. وەئــەم حاڵەتــەش کەســانێك هەســتی پــێ دەکــات کــە دڵیــان زینــدووبێت، چــونکە هــیچ کاتێــك ئــازار بەجەســتەی مردووناگەیــەنێت. وەکەســێك هــاواری بــۆ یــەکێك لەخواناســان هێنــا لەدەســتی ئــەو دڵتــەنگی وبێزاری یەی کەلەدونیادا هەیە، خواناسەکەش پێی ووت:

إذا كنت قد او حشتك الذنوب فدعها إذا شئت واستأنس

واتــە: ئەگــەر بــەهۆی تاوانــەوە ئــەم بێزاریــەت تــوش بــوو ئــەوا دەســت بەرداری تاوان بە دڵخۆش بە ئەگەر ویستت.

وەهــیچ شــتێك نــی یــە هێنــدەی بێــزاری ودڵتــەنگی تــاوان لەســەر تــاوان کاریگەری هەبێت لەسەر دڵ.

### ٤- دڵیتــــەنگی وبێــــزاری تاوەنکــــار لەخــــەڵکی وەپیــــڕی چــــاکەخوازان بەتایبەتی:

بێــزاری ڕوودەکاتــە نێــوان کەســی تاوانکــارو خــەڵکی بەتایبــەتی پیــڕی چــاکەخوازان. کەهەرچــەندە لــەم پیــڕە لــە دانیشــتن وهاوڕێیــەتی یــان دوور

[1] – ئەم فەرموودەیە(حسن)ە. پێشتر باسمان کردووە.

بکەویتەوەتووشــی زیــان دەبێــت وەزیــاتر لەبەرامبــەردا لـــە حـــزب وپێــڕی شــەیتان نزیـك دەبێتـەوە، وەدەسـت بـەرداری حـزب وپێـڕی ڕەحمـان دەبێـت. تــا کاردەگاتــە ئــەوەی بێــزاری دەگاتــە نێــو مــاڵ وخێــزان ومنداڵەکانیشــی. دواتر تەنانەت لەخودی خۆیشی بێزاردەبێت.

هەنـدێك لــە "سـلف" دەڵـێن: کاتێـك کەلـە خـودا یـاخی دەبم وتاوانکـاری دەکــەم، تەنانــەت لــە خووڕەوشــت وئاکــاری مــاڵ وهاوســەرو وڵاغەکانیشــم دا ڕەنگ دەداتەوە وهەستی پێ دەکەم.[1]

## ٥- دژواربوونی کارەکانی:

دژواربــــوون وگــــران بەدەســــتەوەهاتنی کــــارە ئاســــاییەکانی مــــرۆڤ کاردانــەوەی تاوانکــاری یــە ، چــونکە خــوای گــەورە ئاســانکاری بــۆ لــەخوا ترســاوان دەکــات "مــتقین". وەکەســێك تاوەنکاربێــت وەدەســت بــەرداری تــەقوا بێـــت ، ئـــەوا دەرگـــای خێروچـــاکەی لـــێ دادەخـــات. وەدژواری لـەکارەکانی دا هەسـت پـێ دەکـات...ئـای چـەند مـرۆڤ هەیـە گرفتـاری ئـەم حاڵەتەن، بەڵام بەخۆیان نازانن هۆکارەکەی چی یە؟

## ٦- تاریکی وتارمایی دڵ ودەروونی دادەپۆشێت:

تاوانکـار هەسـت بـەم حاڵەتـە دەکـات، هـەروەکو چـۆن هەسـت بـەتاریکی شـــەوەزەنگ دەکـــات. تـــاریکی وتارمـــایی تـــاوان دڵ ودەروونـــی دەتـــەنێ. گوێڕایـــەڵی وملکەچـــی ڕوونـــاکین، وەیـــاخی بـــوون و تاوەنکـــاری تـــاریکی وســامناکین، هەرچــەندە ئــەو تــاریکی وســامناکی یــە زیــاد بکــات ، ئەوەنــدە زیـاتر ئەوکەسـە توشـی سـەرگەردانی وگـومڕایی دەبێـت. بـەبێ ئـەوەی خـۆی هەسـتی پـێ بکـات. نمونـەی وەکـو نابینایـەك وایـە کەلـە شـەوێکی تاریکـدا بەتـــەنها دەکەوێتـــە ڕێ. ئـــەم تـــاریکی یـــە ســـامناکی یەتـــەنها بەدڵـــەوە

[1] –(امـام جـوزی)لـە (الصـفوە: ٤٠٨/١)دا هێنـاویتی دەیداتـە پـاڵ(فضـیل بـن عیـاض)، بـەڵام بەم شێوازە لەبڕگەی(دابتی وامراتی) بڕگەی (فی خلق حماری وخادمی)داناوە.

ناوەستێت گەر ڕێگری لێ نەکرێت ئەوا بینایی وڕوخساریش دەگرێتەوەو خەڵکی بەئاسایی دەیبینێت و هەستی پێ دەکەن.

وە (عبدالله بن عباس) ﷺ دەڵێت: هەموو گوێڕایەڵی و چاکەیەك. ڕووناکی وڕۆشنایی یە بۆ ڕووخسارو دڵ. وە فراوانبوونی ڕزقە. وە هێزە بۆ جەستە. وە خۆشەویست بوونە لەدڵی خەڵکیدا. وەهەموو خراپەیەك. ڕەش بوونی چارە و ڕووخسارە ، وەتاریکی و خەمناکی یە بۆ دڵ. وەبارگرانی و سستی یە بۆ جەستە. کەمی ڕزق وڕۆزی یە. ناشیرین بوونە لەدڵی خەڵکیدا.

## ٧- تاوەنکاری سستی ولاوازی یە بۆ دڵ وجەستە :

<u>لاوازی یە بۆ دڵ</u>: بەبەردەوامی هێز لەدڵ دەبڕێت و لاوازی دەکات ، تاوەکو زیندوویەتی و وریایی لەدەست دەدات.

<u>لاوازی یە بۆ جەستە</u>: چونکە باوەڕدار هێزی لە دڵیدایەو جاهەرکاتێ دڵی لاواز بوو ، ئەوا جەستەشی لاواز دەبێت.

بەلآم تاوەنکار هەرچەندە جەستەو بازووی بەهێز بێت ، بەلآم ئەو هێزە لە کاتی پێویستدا ڕۆڵ نابینێت وناپاکی لێ دەکات. هەر بۆ ئەم مەبەستە تەماشای بەهێزیی وتوانایی "فارس وڕۆم" بکە ، چۆن ئەو هەموو هێزە ناپاکی لەگەڵ کردن وخۆیان نەگرت بەرامبەر بە هێزی دڵ ودەروونی باوەڕداران وچۆکیان دادا.

## ٨- تاوانکاری ڕێگری دەکات لە گوێڕایەڵی :

تاوانکاری خۆی لەخۆیدا پشت گوێ خستنی فەرمانی خودایە. هەندێ جار ئەوتاوانکاری یە دەبێتە مایەی ڕێگرتن لە بەگوێ کردن و گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە وبەجێهێنانی فەرمانەکانی. هەروەکو چۆن کەسێك بەهۆی خواردنێکی خراپەوە توشی نەخۆشی یەکی درێژخایەن دەبێت ودەبێتە مایەی ڕێگرتن لەخواردنی چەندین خواردنی خۆش و بەتام. "والله أعلم".

### ٩- تاوانكاری دەبێتە مایەی تەمەن كورتی:

هەروەكو چۆن چاكەكاری تەمەن درێژ دەكات[1]. بەپێچەوانەوە تاوانكاری تەمەن كورت دەكات.

**كەم وزیادكردنی تەمەن:**

خەڵكی لەم بابەتە ناكۆك و جودان:

پێرێك دەڵێن: كەم كردنی تەمەنی تاوەنكار، واتە نەمانی پیت وبەرەكەتە لەتەمەنیدا. كەئەمەش ڕاستەودروستە وەبەشێكە لە كاریگەری تاوان.

وەپێرێكی تر دەڵێن: بەڵكو بەڕاستی تەمەن كەم دەكات. هەروەكو چۆن ڕزق كەم دەكات، بەهەمان شێوە هۆكارهەن تەمەن كورت دەكەنەوە. هەروەها دەڵێن: ئەمە پێچەوانەی دیاری كردنی تەمەن وئەجەل نی یە، چونكە خوای گەورە بەختەوەری وتەندروستی نەخۆشی وهەژاری ودەوڵەمەندی و... هەموو ئەمانەی بەقەردەر خۆی دیاری كردووە وپەیوەستی كردوون بەهۆكارەكانەوە"الاسباب" ، وەتاوانكاریش هۆكاری كەم وكورت كردنی تەمەنە.

وەپێرێكی تریش دەڵێن: ڕاستی ودروستی ژیان بەندە بەدڵەوە، وەكاریگەری تاوانیش كار لەسەر زیندووی دڵ دەكات، هەربۆیە خوای گەورە بێ باوەڕەكان " كافرەكان "بە مردوو دادەنێت، هەرچەندە لاشەشیان زیندووە ، چونكە دڵیان مردووە. كە دەفەرمێت:" (أموات غير أحياء...نحل:٢١) واتە: تەمەن ، تەمەن وزیندووی دڵە." جا كاریگەری تاوانكاری لەسەر دڵە ودەیمرێنێت ولەناوی دەبات، بۆیە تەمەن كەم دەكاتەوە.جا گوێڕایەڵی وچاكەكاری تەمەنی زیندووی دڵ زیاد دەكات.

نهێنی ئەم بابەتە: تەمەنی ڕاستی ژیانی مرۆڤ ئەوەندەیە لە ملكەچی وگوێڕایەڵی وخواپەرستدا بەسەری بەرێت. جگە لەمە بەتەمەن ناژمێردرێت.

---

[1] -لە فەرموودەی (صحیح)دا هاتووە :(ان صلە الرحم تزید العمر) بڕوانە قسەكردنمان لەسەر (صحیح مسلم).واتە: پەیوەندی بەهێزی خزمایەتی تەمەن درێژ دەكات.

## ١٠- تـــاوان... تاوانی تر بەكێش دەكات وزیاد دەكەن:[1]

تـاوان، تـاونی تـر بـەكێش دەكـەن وزیـاد دەكـەن بـە ئەندازەیـەك مـرۆڤ دەربازبوونی لێیان دژوار وئەستەم دەبێت.

هـەروەكو هەنـدێك لـە "سـلف" دەڵـێن:" لـە چەرمەسـەری و سـلبیاتەكانی خراپـە ئەوەیـە كـە خراپـەی تـر بەشـوێنیدا دێـت. وەلـە باشـیەكانی چـاكە ئەوەیە كە چاكەی تری بەدوادا دێت."

مـرۆڤ كاتێـك چـاكەیەك ئـەنجام دەدات چـەندین چـاكەی تـر بـەدوای خۆیـدا بـەكێش دەكـات. وەتـا بێـت خێروچـاكەكانی زیـاتر دەكـات وپاداشـتی زۆر دەبێـت. وەبەهـەمان شـێوەش بـۆ خراپـە. تاكاردەگاتـە ئـەوەی هـەر یەكـە لەچـاكەو خراپـە دەبنـە ئاكـارو سـیفەتی هەمیشـەیی ئـەو مرۆڤـە. چـیتر ناتوانێت لێیـان جیابێتـەوە. وەك نمونـەی ماسـی كـە ناتوانێـت بـەبێ ئـاو بـژێت ، وەبەگەیشتنی بەئاو هێمنی وئارامی ڕووی تێ دەكات ودەبوژێتەوە.

هەربۆیـە ئەگـەر یـاخی بـوو وتاوانكارەكـان دەسـت لـەتاوانكاری هـەڵبگرن و وەدەسـت بكـەن بـەخودا پەرسـتی، ئەوسـاتە ناڕەحـەت دەبـن وپێیـان ناكرێـت و هـــەر زوو دەگەڕێنـــەوە ســـەر تاوانكاریـــەكانیان. تەنانـــەت هەنـــدێك لـــە خراپـەكارەكان"فاسـق" تـاوان دەكـەن نـەك لەبـەر چـێژ وەرگـرتن، بـەڵكو لەبەرئـەوەی نـاتوانن لـە تاوانكـاری جیاببنـەوە. هـەروەكو سـەركردەی ئـەم پێڕە (الحسن بن هانيء) بەڕاشكاوی دەڵێت:

وكأسٍ شربت على لذةٍ        واخرى تداويت منها بها

واتـە: پێكێـك مـەیم خـواردەوە بـۆ چـێژ        ئـەوی تـرم بـۆ چارەسـەری ئەوی تر خواردەوە.

---

[1] - بڕوانــە ڕاڤــەو تەفســیرەكانی ئایەتــەكانی(٥- ١٠)ســورەتی "اللیــل"وەهــەروەها بڕوانــە خاڵــــــــەكانی(١١- ١٢ -١٤ -١٨- ١٩- ٢٦- ٢٧- ٣٠- ٣١- ٣٤- ٣٦- ٤١- ٤٧- ٤٨)

وەیەکێکی تریان دەڵێت:

(فکانت دوائي وهي دائي بعينه كما تيداوى شارب الخمر بالخمر

واتــە: بەڕاسـتی هەرئـەو دەردو دەرمـانم بـوو هـەروەکو چـۆن مـەیخۆر بە مەی چارەسەری مەی دەکات.)

بەبـەردەوامی مـرۆڤ حـەزی بـەخودا پەرستی یە و خۆشـی دەوێـت تـاوەکو خـوای گـەورە بەسـۆزی خـۆی فریشـتە دەنێرێـت وپشـتیوانی لـێ دەکـات وهـانی دەدەن بـۆ خـودا پەرسـتی ومـل کەچـی خـودا. بەهـەمان شـێوە مرۆڤـی تاوانکـار بەبـەردەوامی حـەزی بـەتاوانکاری هەیـە تـاوەکو خـوای گـەورە شەیتانێك دەنێرێتو هانی دەدات بۆ تاوانکاری ویاخی بوون.

## ١١- تــاوان ئیرادەی دڵ لاواز دەکات:

ئەمـەیان لـە هـەموو مەترسـیەکانی تـر سـامناکترە ، کـە هێـزو توانـا وئـیرادەی یـاخی بـوون وتاوانکـاری زیـاد دەکـات. وەلەبەرامبەریشـدا ئـیرادەی تەوبـەکاری لەدڵـدا لاواز دەبێـت وتادەگاتـە ئەنـدازەی نـەمانی ئـەو ئیرادەیـە بەیـەکجاری. کەئەگـەر بێتـو لایـەکی لەجەسـتەی شـەلەل بهێنێـت ئـەو هـەر تەوبـە ناکـات. هەرچـەندە بـەدەم بەشـێوەیەکی درۆینـە تەوبـە دەکـات وداوای لـێ خۆشـبوون دەکـات ، بـەلام دڵـی پڕبـووە لـەتاوان ویـاخی بـوون، وەسـوورە لەسـەر تاوانکـاری کەئەمـە لەمـەزنترین وترسـناکترین جـۆری مەترسـی یـە. وەزۆر نزیکە خاوەنەکەی بەرەو هیلاك بوونی هەتاهەتایی بەرێت.

## ١٢- تاوان...ناشیرینی خۆی لەدڵدا ناهێڵێت:

واتـە لەدڵـدا هەسـت بەناشـیرینی تـاوان ناکـات و وەك نـەریتێکی لـێ دێـت. وەلـەکاتی ئەنجامـدانی تاوانـدا بینـینی خـەڵك وقسـەیانی بەخەیاڵـدا نایـەت وشـەرم ناکـات. بگـرە زۆرجـار شـانازی پێـوە دەکـات و وەلـەلای کەسـانی تـریش باسـی دەکـات کەچـی کـردووە. ئـەم جـۆرە دەرگـای تەوبـەکاریان

لەسەر داخراوە ، هەروەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (كل أمتي معافي الا المجاهرون وإن من الاجهار: ان يستر الله العبد ثم يصبح يفضح نفسه ويقول:: يا فلان عملت يوم كذا وكذا كذا وكذا، فهتك نفسه، وقد بات يستره ربه.) [1] واتە: هەموو ئومەتی من خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، تەنها ئەوکەسانە نەبێت کە ئاشکراکەری خودی خۆیانن وباسی تاوانەکانیان دەکەن ، کاتێك خوای گەورە بەندە تاوانکارەکەی پەردە پۆش دەکات ، کەچی بەیانی هەڵدەسێت خودی خۆی ئابڕوی خۆی دەبات و دەڵێت: فلأن کەس من لەفلأن ڕۆژدا ئەوە وئەوەو ئەوەم کرد، حەیاوئابڕووی خۆی دەبات، لەکاتێکدا خوای گەورە دەیپۆشێت.

## ١٣- هەر تاوانێك لەتاوانەکان پاشماوەی نەتەوەکانی پێشووترن کە خوای گەورە بەهیلاکی بردوون:

نێربازی پاشماوەی بەدڕەوشتی قەومی "لوط"ە. وەپارە وەرگرتن بەزیادەوە ودانەوەی بەکەمەوە لە پاشماوەی قەومی"شوعیب"ە. هەروەها تێکدانی زەوی ولووتبەرزی لە پاشماوەی قەومی"فیرعەونی یەکان"ە. وە خۆبەزل زانین لەپاشماوەی گەلی"هود"ە...هتد.

سەرجەم جۆرەکانی تاوان هەریەکەیان پاشماوەی بەدکاری یەکێکە لەگەلانی پێشوو کەهەموویان دوژمنی خوای گەورە بوون.

(عبدالله بن احمد) لە کتێبی "الزهد"دا لەباوکییەوە دەگێڕێتەوە کە "مالك بن دينار" وتوویەتی: (خوای گەورە وەحی بۆیەکێك لەپێغەمبەرانی بنی ئیسرائیل واتە جولەکە دەنێرێت کەبە گەلەکەت بڵێ: کەنەچنە شوێنی

---

[1] - ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە، (بخاری: ٦٠٦٩) و(مسلم: ٢٩٩٠)گێڕایانەتەوە.

دوژمنـــەکانم ، وەخـــواردن وپۆشـــاك و ولآغـــی دوژمنـــەکانم بەکارنـــەهێنن، چونکە دواتر وەك ئەوان دەبنە دوژمنم.)

وە لـە (مسند) دا هـاتووە لـە فـەرموودەی "عبـدالله بـن عمـر"دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەرﷺ دەفـەرمێت: (بعثـت بالسـيف بـين يـدي السـاعة.حتـى يعبـدالله وحـده لاشـريك لـه. وجعـل رزقـي تحـت ظـل رمحـي، وجعـل الذلـة والصـغار علـى مـن خـالف أمـري، ومـن تشـبه بقـوم فهـو مـنهم.)[1] واتـە: نێـردراوم بـە شمشـێرەوە وەبەهاتنیشـم قیامـەت نزیـك بووەتـەوە ،هـەتا خـودا بـەتاك وتـەنهایی بپەرسـترێت. وەرۆزی مـن لـەژێر سـێبەری ڕمەکەمدایـە، وسـەر شـۆڕی وریسـوایی بۆهـەر کەسـێکە سەرپێچـی فەرمانـەکانم بکـات ، وەهەرکەسێکیش هاوشێوەی هەرگەلێك بکات ئەوا لەئەوانە.

## ١٤- تـاوانکاری هۆکاری ڕیسوا بوونە :

(حسـن البصـری) دەڵێـت:ئەگـەر خـوای گـەورە کەسـێك ڕیسـوا بکـات کـەس نـی یـە بەچـاوی ڕێـزەوە تەماشـای بکـات. هەرچـەندە لەبـەر هۆکـاری ترسـان لێـی یـان ترسـان لەشـەڕی وادەرئەخـەن، بـەلآم لەدڵـەوە زۆر بـیَ ڕێـزو ڕیسـوایە، هەربۆیـە دەفـەرمێت: (وَمَـن يُهِـنِ اللَّـهُ فَمَـا لَـهُ مِـن مُّكْرِمٍ....الحج:١٨).

## ١٥- بە بچوك زانینی تـاوان:

ئـەو مرۆڤانـەی کـە بـە بـەردەوامی تـاوان ئـەنجام دەدەن، تاوانیـان لەبـەر چـاودا زۆر بچـوکە. کەئەمـەش نیشـانەیەکە لەنیشـانەکانی تیاچـوون، چـونکە

[1] – ئـەم فەرموودەیـە (صـحیح)ە،(احمـد. ٢/ ٥٠، ٩٢)گێڕاویەتیـەوە(البـانی)بـە (صـحیح)ی داناوە.

تــاوان هەرچــەندە بـچوك دەرکــەوێت لــەلای مــرۆڤ ، بــەلاَم لــەلای خــوای گــەورە گەورەیە.[1]

وە لــە (صــحیح بخــاری) دا هــاتووە کــە (ابــن مــسعود) ﷺ فەرموویــەتی: (بــاوەڕدار تــاوان لەســەر شــێوەی چــیایەك دەبینێــت کــە زۆر دەترســێت بروخێــت بەســەریدا، بــەلاَم تاوانکــار تــاوان ئەوەنــدە بەبــچوك دەبینێــت کــەوادەزانێت مێــشێکە بەســەر لووتیــەوە "کــەپوو" نیــشتووەتەوە، هــەر کەپێی بلێیت ئەه... بفڕێت.)[2].

**١٦- تـاوانکاری مرۆڤ کاریگەری خراپی لەسەر گیانلەبەرانیش هەیە:**

بــەهۆی تــاوانی مرۆڤــی تاوانکــارەوە زۆرێــك لەگیانلەبــەرانیش توشــی بــەلاَ دەبێت.

(ابــو هریــرة) ﷺ دەلێــت: (بالنــدەی"حبــاری" لــە هێلانەکــەی خۆیــدا لــەتاو ســتەمی ســتەمکاران گیــان لەدەســت دەدات) . وە (مجاهــد) دەلێــت:"گیانلەبــەران نــەفرەت لــە ئــادەمیزادی تاوانبــار دەکــەن کــە وشــکە ســالی دێــت وبــاران نابارێــت، دەلــێن ئەمــە بــەهۆی شــومی وتاوانکــاری ئادەمیزادەوەیە".

وە (عکرمــة) ﷺ دەلێــت: گیانلەبــەرانی زەوی ، تەنانــەت قالۆنــچە و دووپشکیش دەلێن: بەهۆی تاوانکاری ئادەمیزادەوە بارانمان لیّ گیراوە.

ئایــا ئەوەنــدە بــەس نــی یــە کــە تاوانکــار هۆشــی بێتــەوە کــە شــومی تاوانەکانی کەسانی تری پێوە تیّ دەگلێت.

**١٧- تـاوانکاری دەبێتە مایەی سەرشۆڕی:**

هــەموو ســەربەرزیەك وشــکۆمەندیەك لــە گوێڕایەلێدایــە بــۆ خــودا. ئــەوەتا

---

[1] -پێشتر ووتەی(فضیل بن عیاض)مان هێناوەتەوە لەسەر ئەم بابەتە.

[2] - ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە، (بخاری: ٦٣٠٨ ) وە(ترمذي: ٢٤٩٧ )گێڕایانەتەوە.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (مَـن كَـانَ يُرِيـدُ الْعِـزَّةَ فَلِلَّـهِ الْعِـزَّةُ جَمِيعًـا... فـاطر:١٠) واتـە: هەركەسـێك سـەربەرزی بوێـت بـاداوای سـەربەرزی بكـات لەخودا، كەئەویش تەواو لە گوێڕایەڵی دایە.

هـەر بۆیـە نزاوپاڕانـەوەی هەنـدێك لـە"سـلف" بـریتی بـووە لـە: (اللـهم أعزنـي بطاعتـك ولاتـذلني بمعـصيتك) واتـە: خودایـە سـەربەرزم كـە بەگوێڕایەڵیم بۆت ، وەسەرشۆڕم نەكەیت بەیاخی بوونم لێت.

وە (حـسن البـصری) دەڵێـت:ئەگـەر چـی دەنگـی پێـی ئەسـپەكانیان تەقـەی بێـت، خۆیـان بەسـەربەز بـدەن لەقەڵـەم، بـەڵام سەرشـۆڕی تـاوان لـە دڵیان جیانابێتەوە وخودا سەرپێچی كاران هەر سەرشۆڕدەكات.

وە (عبدالله بن مبارك) دەڵێت:

رأيت الذنوب تميت القلوب  وقد يورث الذل إدمانها

وترك الذنوب حياة القلوب  وخير لنفسك عصيانا

وهل افسد الدين الا الملوك  وأحبار سوءٍ ورهبانها

واتە:

بینم كە تاوان دڵ دەمـــرێنێت  ئاڵودەبوونی سەرشۆڕی دێنێت

دووركەوتنەوە لەتاوان ژیانی دڵە  باشترە بۆ تۆ وازی لێ بێنـــێت

كێ ئایین دەشێوێنێت جگە لــە  پادشاوپیاوانی ئایین یاخوا نەیبینێت.

## ١٨- تـاوان ژیری دەشێوێنێت:

ژیـری وعـەقڵ نیعمـەتی گـەورەی خـودان، وەڕوونـاكی و واتـا دەبەخـشێت بە ژیانی مرۆڤ ، تاوانكاری لەناوبەری ئەو ڕووناكی وهۆشیاریەیە.

هەنـدێك لـە (سـلف) دەڵـێن: كەسـانێك تاوانكـاری ویـاخی دەبـن لـەخودا ، كـەژیری وعـەقڵیان نـەماوە لـەو سـاتەدا. چـونكە عەقڵیـەتی مـرۆڤ هـیچ كاتێـك

ئامــادە نــی یــە مــاف کەســانی تــر پێشــێل بکــات و بەرژەوەنــدی خــۆی وچــواردەوری خــۆی بکاتــە مەترســی یــەوە. وە دواڕۆژی خــۆی پێشــێل بکــات وخولقێنــەری هــەموو جیهــان لــەخۆی بڕەنجێنێــت بــۆ تــەنها خۆشــی چــەند ساتێکی کەم.

لەهــەمان کاتــدا زۆر دوورە لــە عەقڵانیــەتی مرۆڤــی ژیــرەوە کــە یاســاکانی دەســەڵاتی بــەهێزی لــەبن نــەهاتووی خــوای گــەورە پێشــێل بکــات. کــە هــەموو کاتێــك دەبینێــت فریشــتەکان کارەکــانی تــۆ تۆماردەکــەن. وەقورئــانی پــیرۆز دەســت نیشــانی جــۆری ســزاکانی کــردووە ، وەمــردن لەپێشــدایە، وەدڵنیــاش بێــت دۆزەخ ســزای تاوانبارانــە. بــێ گومــان کەســێك لــەم ســاتە وەختانــەدا گــەر ژیری لەدەست نەدابێت کاری تاوانکاری ئەنجام نادات.

## ١٩- ڕۆچوون لەتاوانکاریدا مایەی تیاچوونی دڵە لە بێ ئاگایی:

خوای گەورە دەفەرمێت: (كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ.. المطففين:١٤).

هەندێك لە (سلف) پێیان وایە کە ئەمە "تاوان لەسەر تاوانە" کە دڵیان دادەگرێت.

وە (حسن البصری) دەڵێت: (رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم) واتە: تاوان لەسەرتاوان لە دڵیاندا کەڵەکە دەبێت تا سەرئەنجام دڵ توشی نابینای وبێ ئاگایی دەکەن.

وەکەسانی تریش دەڵێن: (هەرکاتێك تاوان و گوناهەکانیان زیادی کرد ئەوا دڵیان دەتەنێت لە تاوانکاریدا).

وە پوختەی ئەم بابەتە: دڵی مرۆڤ بەڕۆچوون لەتاوانکاریدا ژەنگ دەگرێت. جا ئەگەر ئەم ژەنگە زیادی کرد ئەوا دڵی قورس دەبێت (ران) دواتر گەر بەردەوام بوو ئەوا دەبێتە مایەی ژەنگاوی وقفلدان ومۆرکردنی، دواتر دڵ پەردەپۆش دەبێت و بینایی"بصیر"و هیدایەت لەدەست دەدات. وەدوژمن بەئارەزووی خۆی یاری پێ دەکات و وەئەو دڵە ڕەق دەبێت ودەمرێت، هیچ شتێك کاری تێ ناکات.

## ٢٠- مرۆڤی تاوانکار توشی نەفرەتی پێغەمبەرﷺ دەبێت:

پێغەمبەری خوداﷺ هەمیشە نەفرەتی لە یاخی بووان وتاوانکاران کردووە. جا چ تاوانکارێك زیانی بۆ خۆی هەبێت یاخود بۆ خۆی و بەرژەوەندی کەسانی تر، یاخود مەترسی هەبێت بۆ بەرژەوەندیە بالاکان.

ئەوەتا خوای گەورە نەفرەت لەو کەسانە دەکات کە: خاڵ دەکوتن و خاڵیان بۆ دەکوترێت. وەئەوانەی کە پرچی زیادە دەبەستن بۆ کەسانی تر وەئەوانەشی کە داوای پرچی زیادە دەکەن وەئەوانەی کە برۆ هەڵ ئەگرن وئەوانەی برۆیان بۆ هەڵ دەگیرێت.وەئەوانەی ددانیان بچوك

دەکەنـەوە تـا گـەنج دەربکـەون سـووڕیبا دەخـۆن ودەدەن وحـەلآلی دەکـەن ودەینوسن وشایەتی دەدەن ودزی دەکەن.

■ مەی خۆرەوەو دروستکەر وهەلگرو فرۆشیارەکەی.

■ ئەوەی کە ئازارو نەفرەت لەدایك وباوکی دەکات.

■ لەوپیاوانەی کەلاسایی ئافرەتان دەکەنەوە وبەپێەوانەوە.

■ لەو کەسانەی کە قوربانی بۆ غەیرە خودا دەدەن.

■ لە بیدعەکاران وداهێنەرانی بیدعە.

■ وەلەبەدکارانی نێربازو خوی گەلی لوط.

■ وەلەو مرۆڤانەی کە کاری سێکسی لەئاژەلآن دەکەن.

■ وەلە کەسانێك موسوڵمانان ئازارو عەزیەت دەدەن.

■ وەلـە کەسـانێك لەسـەر گۆڕسـتان مـۆم هەڵدەکـەن ومزگـەوت دروسـت دەکەن.

■ وەلە کەسانەی کەژیانی هاوسەرێتی خەڵك دەشێوێنن.

■ وەلـەو کەسـانەی لـەدواوە دەچـنە لای خێزانـەکانیان لـە کـاری سێکسیدا.

■ وەلـەو ئافرەتانـەی کـە شـەوجێی ناکـەن بۆکـاری سێکسـی لەگـەڵ هاوسەرەکانیاندا وەبەپێچەوانەوە.

■ وەلـەو کەسـانەی کـە ڕووی چـەك دەکەنـە براکانیـان وتەنانـەت فریشتەکانیش نەفرەتی لێ دەکەن.

■ وە کەسـانێك کـە جـوێن وشـتی نـاڕەوا بـە هـاوەلآنی پێغەمبـەرﷺ بڵێت، وەزۆری تریش.

وە خوای گەورە نەفرەتی لەو کەسانە کردووە کە:_

- ژیانی سەر ڕووی زەوی تێك دەدات ودەی شێوێنێت.
- کە پەیوەندی خزمایەتی ودۆستایەتی دەپچڕێنێت.
- کە دژایەتی و ئازاری پێغەمبەرﷺ بدات.

- که ڕێنماییەکانی خودا بشارێتەوە.
- که ئافرەتانی پاك ناوزەردو تاوانباریان دەکەن بە بوهتان.
- که بانگەوازکەربێت بۆ ڕێگەی بێ باوەڕی.

وەپێغەمبەری خوداﷺ نەفرەتی لەواستە چی یەکان کردووە کە بە (راشی ومرتشی) ناوی بردوون.

وەزۆر شتی تریش. جائەگەر کەسێکی هۆشیارو دانا هەست بەمەترسی نەفرەتنانەی خوداو پێغەمبەر بکات، ئەوا ڕاستەخۆ پاشەگەز دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا.

## ٢١- تاوانکار دەبێتە مایەی بێ بەش بوون لەنزاو پاڕانەوەکانی پێغەمبەر وفریشتەکان:

خوای گەورە فەرمانی بەپێغەمبەران وفریشتەکان کردووە کە داوای لێ خۆش بوون بکەن بۆ باوەڕداران، وەك دەفەرمێت: (الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ * رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدتَّهُم وَمَن صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ* وَقِهِمُ السَّيِّئَاتِ وَمَن تَقِ السَّيِّئَاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ.... غافر: ٧-٩) واتە:ئەو فریشتانەی کە هەڵگری عەرشی مەزنی خودان وەهەروەها ئەو فریشتانەشی کەبەدەوریدا دەسوڕێنەوە. وەباوەڕیان بەخوای گەورە هەیە و هەمیشە یادی دەکەنەوە پاك وبێ گەردی بۆ خودای مەزن دەردەبڕن وداوای لێ خۆش بوون بۆ بڕواداران دەکەن. وەدەپاڕێنەوەو دەڵێن: ئەی ئەو پەروەردگارەی هەموو شتێکت تەنیوە بەڕەحمەت وزانست. لەو کەسانە خۆش بە کەتەوبەیان کردووە و گەڕاونەتەوەو شوێنی ڕێبازی خودا کەوتن ، وەلە ئازاری دۆزەخ بیان پارێزە...ئەی پەروەردگار

بەهەشتی بەرینیان پێ بخەشە هەروەکو خۆت بەڵێنت پێ دابوون. هاوڕێ لەگەڵ ئەوکەسانەی کەچاك وخواناسن ، لەباوك ودایك وهاوسەرەکانیان ونەوەکانیان، بەڕاستی هەر تۆ خوایەکی بالآدەست ودانایت.

ئەم نزاوپاڕانەوەی فریشتە نزیکەکانی خودای گەورە بۆ ئەو کەسانەی کە تەوبە دەکەن و شوێنی "قورئان وسونەت" دەکەون. کە جگە لەم ڕێگە ڕاستە هیچ ڕێگایەکی تر نی یە بۆ ڕزگاربوون، جاهەرکەسێك لەم ڕیگایە لابدات و یاخی ببێت بێ بەش دەبێت لەم نزاوپاڕانەوەیە.

## ٢٢- سزای تاوانکاران لەگۆڕدا :

وەلە سزای تاوانکاران لە گۆڕدا لە (صحیح بخای) دا هاتووە لە فەرموودەی "سُمره بن جندب"ﷺ کە پێغەمبەرﷺ زۆرجار دەیووت بە هاوەڵەکانی: (هل رأي أحدمنكم البارحة رؤيا؟ فيقيص عليه ماشاء الله أن يقص. وإنه قال لنا ذات غداة: إنه اتاني الليلة آتيان وإنها وإنبعثا لي، وإنهما قال لي: إنطلق ، وإني انطلقت معهما وإنا اتينا على رجل مضطجع ، واذا آخر قائم عليه بصخرة وإذا هو يهوي بالصخرة لرأسه، فيثلغ رأسه فيتدهده الحجر ها هنا، فيتبع الحجر ، فيأخذه فلا يرجع إليه حتى يصح رأسه كما كان، ثم يعود عليه، فيفعل به مثل ما فعل فيه المرة الأولى. قال: قلت لها: سبحان الله ! ماهذا؟ قالا لي: إنطلق..إنطلق، فإنطلقنا ، فأتينا على رجل مستلق لقفاه وإذا أخر قائم عليه بكلوب من الحديد، وإذا هو يأتي احد شقي وجهه ويشر شر شدقه الى قفاه، ومنخره الى قفاه، وعينه الى قفاه، ثم يتحول الى الجانب الأخر ، فيفعل له مثل ما فعل بالجانب الأول فما يفرغ من ذلك الجانب حتى يصح ذلك الجانب كما كان. ثم يعود علية فيفعل مثل ما فعل في المرةالأولى. قال: قلت: سبحان الله! ما هذان؟ قالا لي: إنطلق.. إنطلق، فإنطلقنا ، فأتينا على مثل التنور. فإذا فيه لغط وأصوات، قال: فإطلعنا

فيـه، فـإذا فيـه رجـالٌ ونـساءٌ عـراةٌ، وإذا هـم يـأتيهم لهـب مـن أسـفل منهـا ، فـإذا أتـاهم ذلـك الهـبُ ضوضـووا. فقـال: قلـت لهـم: مـا هـؤلاء؟ قـالالي: إنطلـق.. إنطلـق، فانطلقنـا ، فأتينـا علـى نهـر أحمـر مثـل الـدم. فـإذا في النهـر رجـل سـابح يـسبَح، وإذا علـى شـط النهـر رجـلٌ قـد جمـع عنـده حجـارة كـثيرة، وإذا ذلـك الـسابح يـسبح ماشـاءالله أن يـسبح، ثـم يـأتي ذلـك الـذي قـد جمـع عنـده الحجـارة فيفغـر لـه فـاه، فيلقمـه حجـراً، فينطلـق فيـسبح. ثـم يرجـع عليـه كلمـا رجـع إليـه ، فغـر لـه فـاه فيلقمـه حجـراً، قلـت لهمـا: ماهـذان؟ قـالا لـي: إنطلـق.. إنطلـق، فانطلقنـا ، فأتينـا علـى رجـل كريـه المـرآة أو كـاكره مـا أنـت راء رجـل مـرأى، وإذا هـو عنـدهُ نـار يحـشها. ويـسعى حولهـا ، قـال قلـت لهمـا: مـا هـذا؟ قـال: قـالالي: إنطلـق.. إنطلـق، فانطلقنـا حتـى أتينـا علـى روضـة معتمـة. فيهـا مـن كـل نـور الربيـعَ وإذا بـين ظهرانـي الروضـة رجـل طويـلٌ ، لا اكـاد أرى رأسـه طـولاً في الـسماء ، واذا حـول الرجـل مـن أكثـر ولـدان رأيـتم قـط. قـال: قلـت: مـا هـذا؟ مـا هـؤلاء؟ قـال: قـالا لـي: إنطلـق..إنطلـق، فانطلقنـا ، فأتينـا الى دوحـة عظيمـة، لم أردوحـة قـط أعظـم منهـا ولا أحـسن، قـال: قـالا لـي: إرق فيهـا ، فارتقينـا فيهـا الى مدينـة مبنيـة بلـبن ذهـب ولـبن فيـضة. قـال:فأتينـا بـاب المدينـة فاسـتفتحنا، ففـتح لنـا فـدخلناها، فتلقانـا رجـال شـطر مـن خلقهـم كأحـسن مـا انـت راء وشـطر كـأقبح مـا أنـت راء، قـال: قـالالهم: أذهبـوا فقعـوا في ذلـك النهـر ، واذا نهـر معـترض يجـري كـأن مـاءهُ المحـض في البيـاض، فـذهبوا فوقعـوا فيـه، ثـم رجعـوا إلينـا ، قـد ذهـب ذلـك الـسوء عـنهم، قـال: قـالالي: هـذه جنـة عـدن، وهـاذاك منزلـك، قـال: فـسما بـصري صـعداً، فـإذا قـصر مثـل الربابـة البيـضاء، قـال:قـالا لـي: هـذا منزلـك ، قلـت لهـا: بـارك الله فيكمـا فـذراني فأدخلـه ، قـالا: أمـا الآن فـلا ، وأنـت داخلـه، قلـت لهـا: فـأني رأيـت منـذ الليلـة عجباً، فما هذا الذي رأيت؟ قال:قالالي: أما إنا سنخبرك:

أمـا الرجـل الأول الـذي أتيـت عليـه يثلـغ رأسـه بـالحجر، فإنـه الرجـل يأخذ القرآن، فيرفضه، وينام عن الصلاة المكتوبة.

وأمـا الرجـل الـذي أتيـت عليـه يـشرشر شـدقه الى قفـاه، ومنخـره الى قفـاه، وعينه الى قفاه، فإنه الرجل يغدو من بيته فيكذب الكذبة تبلغ آلافاق.

وأمـا الرجـال والنـساء العُـراة الـذين هـم في مثـل بنـاء التنـور، فـإنهم الزنـاة والزواني.

و أمـا الرجـل الـذي أتيـت عليـه يـسبح في النهـر، ويلقـم الحجـارة، فإنـه آكـل الربا.

واما الرجـل الكريـة المـرآة الـذي عنـد النـار يحشها ويـسعى حولها فإنـه مالـك حازن جهنم.

وأما الرجل الطويل الذي في الروضة، فإنه ابراهيم"عليه السلام".

وأمـا الولـدان الـذين حولـه ، فكـل مولـود مـات علـى الفطـرة. وفي روايـة البرقـاني: ولـد علـى الفطـرة. فقـال بعـض المـسلمين: يـا رسـول الله وأولاد المشركين؟ فقال رسول الله: وأولاد المشركين.

وأمـا القـوم الـذين كنـوا شـطر مـنهم حـسن وشـطر مـنهم قبـيح، فـإنهم قوم خلطوا عملاً صالحاً وآخر سيئا تجاوز الله عنهم.) [1]

واتـه: (پێغەمبـەرﷺ زۆر بـەهاوەڵانی دەفـەرموو: کـێ ئـەم شـەوی ڕابـردوو خـەوی بینیـوە، تاچـەندی پـێ خۆشـە باسـی بکـەن و وەپێـی خـۆش بـووە خـەوەکانی بـۆ بگێڕنـەوە.وەئـەویش گـوێ بیـستی دەبـوو. لـە نیوەڕوانێـك پێغەمبـەرﷺ پێـی فـەرمووین: ئـەم شـەو لەخەومـدا ، دوو فریـشتە هـاتن بـۆ لام و ووتیـان بـابڕۆین ، منـیش لەگەڵیانـدا ڕۆیـشتم تـا گەیـشتینە لای پیاوێـك ،ڕاکـشابوو کەسێکی تـر گابـەردێکی گـەورەی پـێ بـوو بـەرزی دەکـردەوەو دەیکێـشا بەسـەر پیاوەکـەدا، سـەری وردوخـاش دەکـرد،

[1] – ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ٧٠٤٧)گێڕاویەتیەوە.

هـەتا بەردەكـەی هەڵدەگرتـەوە دیسانەوە سـەری وەك جـارانی لـیٚ دەهاتـەوە بەهـەمان شـێوە بـەرزی دەكـردەوەو دەی كێشـا بەسـەریدا ، بـەم شـێوەیە بـەردەوام بـوو. منـیش ووتم: پـاك وبـیٚ گـەردی بـۆ خـودای گـەورە ، ئەمـە كـیٚ یـەو بـوای لـیٚ دەكـەن؟ فریشـتەكانیش ووتیـان: خێراكـە بـڕۆ...بـڕۆ، منـیش لەگەڵیاندا كەوتمە ڕیٚ.

تاگەیشـتینە لای پیاوێـك لەسـەر پشـت ڕاكشـابوو، وەكەسـێكی تـر بـەقولابێكی ئاسـنی لەسـەر سـنگی ڕاوەسـتابوو ، بەقولابەكـەی دەیكێشـا بەڕوومـەتی ڕاسـتی دا تـا پشـتەملی هـەڵی دەتلیشـان "هـەڵی دەدڕی"و شـەقی دەكـرد،پاشـان دەیـدا لـە لـووتی وتـا پشـتە ملـی هـەڵی دەدڕی ، دواتـر دەیدا لەچـاوی هـەڵی دەكـۆڵی تـا پشـتەملی ،دواتـر دەچـووە لای ڕوومـەتی چـەپی بەهـەمان شـێوە شـەق وپـەتی دەكـرد ، كاتێـك كـەلای چـەپی تـەواو دەكـرد لەوكاتـەدا یەكسـەر ڕوومـەتی ڕاسـتی وەك خـۆی لـیٚ دەهاتـەوە ، بـەم شـێوەیە بـەردەوام خـەریكی شـەق وپـەت كردنـی بـوو ، منـیش ووتم: پـاك وبـیٚ گـەردی بۆخـودا ، ئەمـە كـی یـە؟ چـی كـردووە؟ فریشـتەكان ووتیـان: خێراكە..بڕۆ...بڕۆ.

منـیش لەگەڵیانـدا كەوتمـە ڕیٚ تـا گەیشـتینە لای كورەیـەكی زۆر گـەورە كـە دەنگـە دەنـگ ونالـەو هـاواری لـیٚ دەهـات ، كاتێـك لێـی نزیـك بووینـەوە وتەماشـامان كـرد لـەناو كورەكـەدا پـڕی بـوو لـەژن وپیـاوی ڕووت وقـووت كەلـە ژێـری كورەكـەوە ئـاگرو گڕوتینیـان بۆدەهـات ودەبـرژان وهـاوارو فیزاحیـان دەكـــرد، منـــیش پرســـیم: ئەمانـــە كـــێن؟ فریشـــتەكانیش ووتیـــان: خێراكە..بڕۆ...بڕۆ. منیش لەگەڵیاندا كەوتمە ڕیٚ.

تاگەیشـتینە ڕووبـارێكی سـووری خوێنـاوی، كـەپیاوێك لەناویـدا مەلـەی دەكـــرد، لەكـــەناری ڕووبارەكـــەدا كەســـێكی لـــیٚ بـــوو بـــەردێكی زۆری كۆكردبـووەوە ، كـەدواتر ئـەو پیـاوەی كەمەلـەی دەكـرد دەهاتـە كـەناری ڕووبارەكـە ودەمـی دەكـردەوە ، ئـەویش پـڕ دەمـی دەكـرد لەبـەرد، وەئـەویش

دەیهاڕی ودەیخواردو دەچووەوە بۆ مەڵەکردن تا خودا ویستی لەسەر بووایە دیسانەوە دەهاتەوە کەنار ڕووبارەکە وپڕدەمی دەکرا لەبەرد وەك شێوەی جاران و ئەم دیمەنە دووبارە دەبووەوە. پرسیم ئەمانە کێن؟ فریشتەکانیش ووتیان: خێراکە.. بڕۆ...بڕۆ.

دواتر گەیشتینە لای پیاوێکی ڕووخسار ناشیرین ودیمەن ترسناك وەك بڵێی ناشیرینترین کەس کە بینرابێت، کەلە تەنیشتی ئاگرێکدا بووبەدەوریدا دەهات وهەڵی دەگیرساند. منیش پێم ووت: ئەمە چی یەو کێ یە؟ فریشتەکانیش پێیان ووتم: خێراکە..بڕۆ...بڕۆ.

منیش لەگەڵیاندا ڕۆیشتم تاگەیشتینە باخچەیەکی خۆشی پڕ لەدارو درەخت لە هەموو جۆرە گوڵێکی تێدابوو، وەلەناویاندا پیاوێکی بەژن درێژی تێدابوو بە ئەندازەیەك ئەوەندە بڵند بوو سەری بەجوانی دیارنەبوو. وەلە چواردەوریدا ژمارەیەکی زۆر مێردمنداڵی لێ بوو. ووتم ئەمە چی یە وئەمانە کێن؟ فریشتەکان ووتیان: خێراکە..بڕۆ...بڕۆ. منیش لەگەڵیاندا ڕۆیشتم.

تا گەیشتینە لای دارێکی مەزن کەتاوەکو ئێستا داری وا مەزنم نەبینیوە لەگەورەیی وچاکیدا. فیشتەکان ووتیان: سەرکەوە بەسەریدا. ئێمەیش سەرکەوتین تا گەیشتینە شارێك کە دروست کرابوو لە خشتی زێڕو زیو، کەگەیشتینە دەرگای شارەکە ،داوامان کرد دەرگاکەمان لێ کرایەوەو چووینە ژوورەوەو پێشوازیمان لێکرا لەلایەن هەندێك کەسەوە ،ڕوخساریان نیوەی هێندە قەشەنگ وجوان بوو لە جوانیدا کەسی وات نەبینی بوو وەنیوەکەی تری هێندە ناشیرین بوو لە ناشیریندا کەسی وا ناشیرینت نەبینی بوو. فریشتەکان پێیان ووتن: بڕۆن خۆتان فڕێ بدەنە نێو ئەو ڕووبارەوە ، ئاوی ڕووبارەکە لەپاکی وپوختیدا وەك ماست سپی بوو ،ئەوانیش خۆیان فڕێ دایە ناوی. پاشتر کەهاتنە دەرەوە لەئاوەکە هەموو دیمەنە ناشیرینەکەیان نەمابوو. فریشتەکان ووتیان: ئەمە

بەهەشتی (عدن) ە وەئەو جێگایە شوێنی تۆیە ، ئاماژەیان بۆ جێگایەك کرد ، کەچاوم هەڵبڕی تەماشم کرد کۆشکێکی مەزن کەلە پەڵە هەوری سپی دەچوو. فریشتەکان وتیان: ئەمە جێگای تۆیە، منیش ووتم: خودا ڕێزدارتان بکات ،مۆڵەتم بدەن بچمە ژوورەوە. فریشتەکان ووتیان:ئێستا نا، لەداهاتوودا.بەڕاستی من لەوشەوەدا ،شتی سەیرەو سەمەرەم بینی ، ئایا ئەمانە چی بوون؟ فریشتەکان ووتیان: ئێمە پێت دەڵێین ئەمانە چی بوون؟

ئەو پیاوەی کە بەبەردەکە سەری پان دەکرایەوە، ئەوە کەسێکە کە گوێ بیستی قورئان دەبوو ، پشت گوێی دەخست وڕەدی دەدایەوە ، وەنوێژی بەزایە دەداو دەنووست و نوێژی نەدەکرد.

وەئەو پیاوەی کەدەم وروخسارییان هەڵدەدڕی. ئەوە کەسێکە کەلەماڵ دەردەچوو درۆی دەکرد بەئەندازەیەك درۆکەی دەگەیشتە ئاسۆ لەناڕەوایدا.

وەپیاو وئافرەتە ڕووت وقووتەکان کەلەناو تەنوورەکەدا بوون، ئەوانە زیناکارو داوێن پیس بوون.

وەئەو پیاوەی کەلەناو رووبارە خوێنەکە مەلەی دەکرد وبەردی دەخوارد، ئەوە کەسێکە سوو"ڕیبا" خۆرە.

وەپیاوە ڕوخسار ناشیرینەکە لای ئاگرەکە، ئەوە (مالك) و بەرپرسی دۆزەخە.

وەپیاوە بەژن درێژەکە لە نێو باخچەکەدا، ئەوە حەزرەتی (ایبراهیم ) ەو مێردمنداڵەکانیش ئەو منداڵانەن کەلەسەر سروشت وفیترەت مردوون، هەندێك لەموسڵمانان ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ منداڵی بێ باوەڕەکانیش دەگرێتەوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ ئەوانیش دەگرێتەوە.

وه ئـەو پـیرەی کەبەشـێك لـە ڕوخسـاریان جـوان وبەشـەکەی تریـان ناشـیرین بـوو، ئـەوا ئـەو کەسـانەن کـە کـاری خراپـەو چـاکەیان ئـەنجام داوەو وەخوای گەورە لەتاوانەکانیان خۆش بوو.)

## ٢٣- تاوانکاری جۆرەها خراپەو گەندەڵی لەسەر زەویدا بەرپا دەکات:

جۆرەهـا فەسـاد لـە بونـەوەر بـەرپادەکات لـە ئاووهـەواو کێڵگـەومالّ... ئەوەتا خوای گەورە باسی دەکات دەفەرمێت: (ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ... الـروم:٤١) واتـە:تـاوان وخراپـەکاری دەرکـەوتووە و هـەموو سـەرزەوی ودەریاکانیشـی گرتووەتـەوە. بـەهۆی ئـەو تـاوان وگوناهانـەوە کـە خـەڵکی دەسـتیان داوەتـیّ، سـەرئەنجام دەبێـت تـاڵاوی هەنـدێك لـە کردەوەکانیـان بچێژن"کـە بـەرپابوونی جـەنگ وکارەسـاتە سروشـتی یەکانـە" بـۆ ئـەوەی بگەڕێنەوە بۆ یەك خواناسی.

(مجاهـد) دەڵێـت: بـەهۆی سـتەمی سـتەمکارانەوە کـە فەسـاد بـەرپا دەکـات. خـوای گـەورە بـاران بـارین دەگرێتـەوە ووشـکە سـاڵی بـاڵ دەکێشـێت بەسـەر گونـدو شـار وکوچـە دا. "پـاش ئـەوەی ئـەو ئایەتـەی سـەرەوەی خوێنـدەوە" ووتـی: مەبەسـت لەووشـەی (البحـر/ دەریـا) مەبەسـتی ئـەو ئاوانەیە کەلەگوندەکاندا هەیە لەڕووبارەکان.

وه (عکرمـه) دەڵێت: ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ.. مـن نـاڵێم مەبەسـتی ئـەم دەریایانەیـە، بـەڵکو مەبەسـتی ئـەو ڕووبارانەیـە کەلـە تەنیشـت گوندەکانەوە تێ دەپەڕێت.

وه (قتـادە) دەڵێـت: خـوای گـەورە ئـاوی شـیرینی بـە بحـر نـاو بـردووە کـە دەفـەرموێت: (وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ... فـاطر: ١٢) واتـە: هـەردووجۆری دەریاکـە وەك یـەك نـین، یـەکێکیان ئاوی سازگارو خۆشە ئەوی تریان سوێروتاڵە.

وه له دونیادا دەریایەکی شیرین نی یه ئاوەکەی ڕاوەستابێت، بەڵکو مەبەستی ئەو ڕووبارانەیە کە تیّ دەپەڕن. وەدەریایی ئاوی سوێر ئەوانەن کە ئاویان ڕاوەستاوە. جا ئەو گوند ولادێیانەی کەلەسەر ئاوی ڕۆیشتوو دان بەم جۆرە ئاوە باس کردووە.

وه (ابن زيد) دەڵێت: ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ... مەبەستی لەتاوانە.

منیش ووتم: ئەگەر مەبەستی ئەو تاوانانە بێت کە بەهۆکاری ئەو فەسادانەوە سەرهەڵدەدەن، یاخود مەبەستی ئە فەسادانەوە بێت کەبەهۆی تاوانەوە سەرهەڵدەدەن. جا بەپێی ئەو بەشەی ئایەتەکە کە دەفەرمێت: لِيُذِيقَهُم بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا...ئەم پیتی"لام"ە پێی دەوترێت (لامي العاقبە وتعليل) واتە بەو هۆکارەی پێشووەوە بووە.

وەپێم وایە: مەبەستی یەکەمی بە (الفساد) ئەوەیە تۆڵە سەندنەوەی خودایە لەکەمی بارانوشەڕوئاشوب ، لەبەرئەنجامی ئەوتاوانانەی کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات.

هەروەکو هەندێك لە "سلف" دەڵێن: هەرچەندە ئێوە تاوان بکەن خوای گەورە سزاتان دەدات و تۆڵەتان لێ دەسێنێتەوە.

وه ئەوەی ڕوونە"والله اعلم"مەبەست لەو فەسادە تاوان وپاشماوەکانێتی ، وەبەبەڵگەی ئەم ئایەتە کەدەفەرمێت: (لِيُذِيقَهُم بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا....الروم:٤١) [1]ئەمە حاڵی ئێمەیە کەبەشتێکی کەم لەسزای

[1] – لەم ئایەتەدا ئاماژە بۆ تێك چوون وپیس بوونی ژینگە دەکات، کەژینگە پێك دێت لە سیّ بنەمای سەرەکی ژیان(خاك وئاو وهەوا) کەلەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاماژەیان بۆدەکات کە بەهۆی خراپەوکردەوەکانی مرۆڤ زەوی دوچاری پیس بوون وگۆڕانی ئاووهەوای زەوی وبەرزبوونەوەی پلەی گەرماو مەترسی بەرزبوونەوەی ئاستی ئاوی زەریاکان بەهۆی توانەوەی بەستەڵەکە بەفرینەکانی جەمسەرەکانی زەوی،کەئەمەش دەبێتە هۆی نقوم بوونی بەشێکی زۆر لەوشکانی کەنار ئاوەکان وەهەندیّ دەوڵەتەت بەتەواوی ژێرئاو دەکەون وەك هۆڵەندە و بەشێکی زۆری دانیمارك. وەلەئەنجامی بەرزبوونەوەی ڕێژەی گازی دووەم

تاوانەکانمان و کردەوەکانمان دەچێژین. جا ئەگەر بێتو سزای هەموو کردەوەکانمان وەربگرین ، ئەوا سەر زەوی مێرووڵەیشی تێدا نەدەما ئەوەندە کاول دەبوو.

## ٢٤- تاوان دەبێتە مایەی ڕوودانی کارەساتەکانی بومەلەرزە و ڕۆچوونی زەوی:

تاوان دەبێتە مایەی دروست بوونی چەندین کارەساتی بومەلەرزەو ڕۆچوونی زەوی ونەمانی پیت وبەرەکەتی زەوی کە وەکو تۆڵەیەکی خوای گەورە ڕوودەدەن.

وە کاتێك پێغەمبەرﷺ لەگەڵ چەند هاوەڵێکیدا بەلای شوێنەوارو پاشماوەی گەلی (ثمود) تێپەڕێن ڕێگری کرد لەهاوەڵانی کەلەو شوێنە لابدەن، یاخود ئاو خۆنەوە،تەنانەت نەیهێشت حوشترەکانیش ئاوی لێ بخۆنەوە لە بەر کاریگەری ئەو تاوان ویاخی بوونەیان کە خودا تۆڵەی لێ کردنەوە، کەکاریگەری لەسەر بەرەکەت وبەپیتی ئەو شوێنە کردبوو، تەنانەت لە ئاوەکەشیان.

وە (اما احمد) لە "مسند"دا لە میانەی فەرموودەیەکدا دەڵێت: (لەمۆزەخانەی "بنی أمیە"دا دەنکە گەنمێکی گەورە هەبوو ، کەلە گەورەیدا هێندەی ناوکە خورمایەك بووە، وەلە پارچە شتێك نوسرابوو لە تەنیشتیەوە.کە ئەم دەنکە گەنمە لەسەردەمی دادپەروەریدا ڕوواوە.)

---

ئۆکسیدی کاربۆن و گازی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن کاریگەری خراپی کردووەتە سەر بەرگی چینی ئۆزۆن ئەتمۆسفیر"بەرگەگاز" کەلەهەندێ شوێن بووەتە هۆی کون بوونی. کە ئەمەش دەبێتە هۆی گەیشتنی تیشکە زیان بەخشەکان بەتایبەتی تیشکی سەروو وەنەوشەیی، کە مرۆڤ دوچاری نەخۆشی جۆراوجۆر دەکات بەتایبەتی نەخۆشیە کانی پێست. "وەرگێڕ"

وەهەروەها پێڕێك لە پیاوە بەتەمەنەکانی بیابانیش پێیان ڕاگەیاندووم. کە پێشتر بەروبومی کشتوکاڵ ومیوەهات زۆر لەقەبارەی ئێستا گەورە تر بووە.

وەزۆرێك لەم بەڵایانە کەبە سەر ژیاندا هاتووە ، لەبەرئەنجامی تاوانکاریدا ڕوویان داوە.

**٢٥- تاوان کاریگەری لەسەر شێوەی دیمەن و دروست کراوەکان هەیە :**

(ترمذی) لە "جامع" دەگێڕێتەوە ، کەپێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: **(خلق الله ادم وطوله في السماء ستون ذراعاً ، فلم يزل الخلق ينقص حتى الآن.)** [1] واتە: خوای گەورە "ئادەم"ی دروست کرد کە درێژی یەکەی شەست باڵ بوو،وەبە بەردەوامی تاوەکو ئێستاش قەبارەی مرۆڤە دروست کراوەکان لەبچوك بوونەوەدایە.

کە ئەمە ئاماژەیەکە بۆ بچوك بوونەوەی شێوەو قەبارەی مرۆڤ ودروستکراوەکانی تر.

خوای گەورە کە دەیەوێت سەر ڕووی زەوی لە تاوان وتاوانکاران و ناپاکان وستەمکاران پاك بکاتەوە، ئەوا یەکێك لەبنەماڵەو خانەوادەی پێغەمبەرﷺ ،واتە بەرەچەڵەك دەگەڕێتەوە سەر خانەوادەی پێغەمبەرﷺ [2] دەنێرێت، سەرزەوی پڕدەکات لە دادپەروەری خۆش گوزەرانی، وەدەجالی جولەکەو خاچ پەرستەکان لەناو دەبات. مرۆڤایەتی بەختەوەردەکات بە بڵاوکردنەوەو سەقام گیرکردنی ئیسلام. دیسانەوە پیت وبەرەکەتی زەوی دەگەڕێتەوە. تەنانەت پێڕێك لەمرۆڤ یەك هەنارێك

---

[1] – ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ٣٣٢٦)وە (مسلم :١٧٣/١٧–نووی) گێڕاویانەتەوە.

[2] – مەبەست لێرەدا سەرهەڵدانی(محمد مهدی)یە کە چەندین فەرموودەی صحیحمان لەسەری هێناوەتەوە. بڕوانە بابەتی:"علامات الساعه الکبری".

دەخـۆن ، ئەوەنـدە گەورەیـە. وەتـەنها هێشـوە"بۆڵـە" تـریَ یـەك هێنـدە گەورە بە بارە هوشترێکە[1].

هۆکـاری ئـەم گۆڕانکاریـەش نـەمانی تاوانکـاری وسـتەمە، کەدیسـان پیـت وبەرەکـەتی زەوی سـەرهەڵدەداتەوە. بـیَ گومـان ئـەو سـزاو تۆڵـە سـەندنەوەی خـوای گـەورە لـە گـەلانی کردۆتـەوە ، تـا ئێسـتا کاریگـەری وشـوێنەواری بەسـەر زەوی یـەوە مـاوە، چـونکە هاوشـێوە ونمونـەی ئەوتاوانـە گەورانـەی گـەلانی پێشـوو بـوونی هەیـەو مـاوە و لـەنێو کۆمەڵگـەی مرۆڤایەتیـدا ئـەنجام دەدرێـت. هـەر بۆیـە بـەپێی ئەوتاوانانـە سـزای خـودایی دەبینرێت. بەپێی ئەندازەی بچوکی ڕێژەی تاوانەکە سزاکەش دەدرێت.

بـەراوردی شـەیتان بکـە... کاتێـك کەسەرپێچـی کـرد خـوای گـەورە پیـت وبەرەکـەتی لەتەمـەن وکـارو پلەوپایـەو ماڵیـدا نەهێشـت، تەنانـەت لەهـەر جێگایـەکی زەویـدا ملکەچـی بکرێـت توشـی بـیَ بەرەکـەتی دەبێـت. وەلـە قیامـەتیش لەجێگایەکدایـە کـە بـەزەیی و ڕەحمـەت وسـۆزی تێـدا نـی یـە کـە دۆزەخە...

## ٢٦- تـاوان ڕووناکی غیرەت وپەرۆشی دەکوژێنێتەوە[2]:

غـیرەت وپەرۆشـی پێویسـتیەکی هەنووکـەیی یـە بـۆ ژیـان ، وەك پێویسـتیە غەریزیـەکان بـۆ جەسـتەی مـرۆڤ پەرۆشـی ئـەو ئاگرەیـە کـە هەرچـی خراپـە وئاکـارە ناشـیاوەکان هەیـە لێـوەی دەردەچـێت. هـەروەکو چـۆن لەڕێگـەی دەزگـای فـووکردن بـە کـورەی ئـاگردا هەرچـی مـاددەو بۆنـە ناخۆشـەکانی زیـو وزێـڕ وئاسـن هەیـە لێـوەی دەردەچـێت. وە شـکۆمەندترین مرۆڤ لە هەموو کەس زیاتر پەرۆشی وغیرەتی هەیە لەچاو خەڵکی تردا.

---

[1] – ئەمـە لەسـەردەمی هاتنـە خـوارەوەی (عیسـی کـوڕی مـریم) لـەپێش ڕوودانـی قیامـەت ڕوودەدات.

[2] – بڕوانە خاڵەکانی:( ١٠، ١١ ، ١٢، ١٤، ١٨، ١٩، ٢٧).

هەر بۆیە پێغەمبەرﷺ بە پەرۆشترین مرۆڤ بووە سەبارەت بەگەل و ئومەتەکەی. وەخوای گەورە لە پێغەمبەر زیاتر بەپەرۆشە بۆ بەندەکانی. هەر وەکو چۆن لە صحیح دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێت: (أتعجبون من غیرة سعد؟ لأنا اغیر منه ، والله اغیر مني.) [1] واتە: سەر سوڕمانن بەپەرۆشی سعد؟ من لەسعد بەپەرۆشترم ، وەخوداش لەمن بەپەرۆش ترە.

وەلە (صحیح) دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ لە واتارە خۆر گیراندا فەرمووی: (یا أمة محمد، ما احد أغیر من الله ان یزني عبده أوتزني امته.) [2] واتە: ئەی ئومەتی محمد: کەس نی یە بەئەندازە خوای گەورە بە پەرۆش بێت، کە کاتێك بەندەکانی داوێن پیسی وزینا دەکەن.

وەلە "صحیح"دا هاتووە کە پێغەمبەر دەفەرمێت: (لا أحد أغیر من الله ،من اجل ذلك حرم الفواحش ما ظهر منها وما بطن، ولا أحد احب إلیه العذر من الله ،من اجل ذلك أرسل الله الرسل مبشرین ومنذرین،ولا احد أحب الیه المدح من الله من أجل ذلك أثنی علی نفسه.) [3] واتە: کەس لەخودا گەرورە ترو بەپەرۆش تر نی یە، هەر لەبەر ئەوەیە کەبەد ڕەفتاری حەرام کردووە چ نهێنی بێت یان ئاشکرا. کەسیش نی یە پۆزش بۆ هێنانەوەی لەلا خۆشەویست تربێت لە خوای گەورە ، لەبەرئەوەشە کتێب و پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە وە کەس نی یە مەدح و پیَ هەڵدانی

---

[1] – ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە، (بخاری: ٦٨٤٦– ٧٤١٦)وە(مسلم: ١٢٢/١٠– نووی) گێڕاویانەتەوە.

[2] – ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ١٠٤٤) وە(مسلم:٦/٢١٠–نووی) گێڕاویانەتەوە.

[3] – ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ٧٤٠٣)وە (مسلم: ١٧/٨٠– نووی) گێڕایانەتەوە.

لەلا خۆشەویستر بێت لە خوای گەورە ، هەر لەبەر ئەوەیە مەدحی خۆی کردووە.

ئەم فەرموودەیە هەردوو بابەتی (پەرۆشی-غیرە) و (پۆزش-عذر) ی هێناوەتەوە و لەیەك بابەتدا ئاوێتەی کردوون. وەك دوو چەمکی گرنگ بۆ ژیانی مرۆڤایەتی.

بابەتی پەرۆشی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت رقی هەڵدەسێت لەئەنجام دەرانی کاری نارەواو ناشیاو. وە "پۆزشیش" لەوە سەرچاوە دەگرێت کە پێی خۆشە ئەنجام دەرانی ئەو کارانە پۆزشی بۆ بهێننەوە و ئەویش لێیان ببورێت، کەئەمە بەتەواوەتی سۆز ورەحمەت وخۆشەویستی خودایە بۆ بەندەکانی. هەر ۆیە خوای گەورە پێغەمبەران وکتێبی رەوانە کردووە بۆ مرۆڤایەتیوەك بەهانە هێنانەوەو پۆزش ، وەکو هەرەشەکردن وئاگادار کردنەوەیەك.کە ئەمەش تەواوی پرۆپوختی و بێ کەموکوریە.

بە پێچەوانەوە زۆرێك لەخەڵکی دەبینین کە کەسێك هەڵەیەك دەکات ، یەکسەر بەبێ ئاگادار کردنەوەو گوێگرتن لە پۆزشەکەی یەکسەر سزای بەسەردا دەسەپێنێت، یاخود زۆر جار زۆر شل گیرانە هەموو بیانوویەك بە پۆزش دادەنێت ، کەئەمەش نارەوایی وکەموکوریە لە خودی پەرۆشیدا.

هەروەکو پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرمێت: (إن من الغيرة ما يحبها الله ، ومنها مايبغضه الله، فالتي يبغضها الله الغيرة في غير ريبة.)[1] واتە: هەندێ پەرۆشی هەیە خودای گەورە پێی خۆشە، وەهەندێکی تری پێ ناخۆشە، ئەوەی کە خودا پێیخۆشە بریتیە لە پەرۆشی یەکی بێ توهمە.

وەپەرۆشی ستایش کراو: ئەو پەرۆشی یە کە هاورێك بێت لەگەڵ پۆزشدا. واتە لەکاتی پەرۆشیدا پەرۆش بێت، وەلەکاتی پۆزشیشدا ببورێت.

---

[1] - ئەم فەرموودەیە (حسن)ە، (احمد: ٥/٤٤٥) وە (النسائي: ٧٩/٥)گێرویانەتەوە.

## تەنها خوای گەورە شایەنی ستایشە...

خـــوای گـــەورە خـــاوەنی ســـیفات وئاكـــارە بڵنـــدەكان ونـــاوە جـــوان وپیرۆزەكانـــە. ســـەرجەم پڕوپـــوختی وكەماڵیـــەتی هەیـــە، وەهـــەر ئـــەو تـــەنها شـایەن وشایســـتەی ســـتایش وپێداهەڵـــدان ووەســـف ومـــەدح كردنـــە. هـــەروەكو چۆن خۆی وەسف وسەنای خۆی كردووە.

جـا خـوای گـەورە پێـی خۆشـە بەنـدەكانی بـە سـیفاتەكانی خـوای گـەورە خۆیـــان بڕازێننـــەوەو خوداپەرســـتی پـــێ بكـــەن. وەپەرۆشـــیش یەكێكـــە لەسـیفاتەكانی ، ئەگـەر بەندەیـەك پەرۆشـی تێـدا بێـت ، ئـەوا خـوای گـەورە خۆشـــی دەوێـــت. هـــەروەكو خـــوای گـــەورە بەبـــەزەیی وبەڕەحمـــە ، بەنـــدە بەبەزەییـــەكانی خـــۆش دەوێـــت.وەخـــوای گـــەورە كریمـــە، وە بەخشندەكانیشـــی خـــۆش دەوێـــت.وەخـــوای گـــەورە زاناودانایـــە ، بەنـــدە زانـــا ودانـاكانیشـــی خـــۆش دەوێـــت. وەخـــوای گـــەورە بـــەهێزە ، بۆیـــە بـــاوەڕداری بـــەهێزی زیـــاتر خـــۆش دەوێت بەبەراورد لەگەڵ باوەڕداری لاواز...هتد.

تاوانكـــاری ویـــاخی بـــوون ڕێگـــری دەكـــات كـــە خاوەنەكـــەی خـــۆی بـــەم ســـیفاتە پـــیرۆز وجوانانـــەوە بڕازێنێتـــەوە، بـــەڵكو مایـــەی ســـزای خوداشـــە. چـــونكە شـــێوازەكانی دروســـت بـــوونی تاوانكـــاری و یـــاخی بـــوون بـــەم چـــەند قۆناغە تێ دەپەڕێت:

**قۆناغی یەكـــەم**: تەنها كەوتنە دڵەوەیە وەك بیرۆكەیەكی سادە.

**قۆناغـــــی دووەم**: ئـــەو بیرۆكەیـــە دەبێتـــە وەسوەســـەو دوو دڵـــی بـــۆ دروست دەكات.

**قۆنـــاغی ســـێ یـــەم**: ئـەو وەسوەسـەیە دەبێتـە ئیرادەو بـیری لـێ دەكاتـەوە بەهەمیشەیی.

**قۆنـــاغی چـــوارەم**: ئـــەو ئیرادەیـــە دەچـــێتە قۆنـــاغی"عزیمـــە"نیـــازو بڕیـــارو سوور بوون لەجێ بەجێ كردنیدا.

قۆنــاغی پێنجـــەم: ئـــەو بیرۆکـــە و دوودڵـــی و وەسوەســـە وئیرادەیـــەو ســـوربوون وعەزیمەیـــە دەبێتـــە کـــردارو جـــێ بـــەجێ دەکـــات وە تاوانەکـــە بەرجەستە دەکات وەك تاوانێك.

قۆنــاغی شەشــەم: دواتــر گــەر لەســەر ئەنجامــدانی ئەوەتاوانــە بــەردەوام بێــت و پاشــەگەز نەبێتــەوە، ئــەوا ئەوتاوانــە دەبێتــە ســیفەت وئاکــارێکی هەمیشــەیی ودەبێتــە بەشــێك لــەژیانی کــەناتوانێت دەســت بــەرداری ببێــت وەك سەرجەم ئاکارو سیفاتەکانی تری.

مەبەســـتمان: مەبەەســـتمان لێـــرەدا ئەوەیـــە ئەگـــەر تاهۆکارەکـــانی تاوانکـــاری بـــەهێزبوون، ئـــەوا لەبەرامبـــەردا هێـــزی پەرۆشـــی لەدڵـــدا کـــەم دەکاتـــەوە و لاواز دەبێـــت بەرامبـــەر بـــەخودی خـــۆی و خـــزم وکەســـو کـــارو چـــواردەوری. تـــا کاردەگاتـــە ئەندازەیـــەك کـــەناتوانێت شـــتی نـــاڕەواو وناشـــیاوو ناشـــیرین لـــەخودی خـــۆی وچواردەوریشـــیدا مـــەحکوم بکـــات ، بـــەم شـــێوەیە دەگاتـــە دەروازەی تیاچـــوون.بـــەڵکو ئەمـــە هەنگاوێکـــە کـــە مـــرۆڤ بـــەرەو هەڵـــدێر دەبـــات وتەنانـــەت پێوەرەکـــانی دەگۆڕێـــت و وەشـــتی ناشـــیرین وداوێـــن پیســـی وســـتەمکاری...هتـــد، هـــەموو ئەمانـــە بـــە شـــتێکی جـــوان وشـــیاو دادەنێـــت و لایانگریـــان دەکـــات و بگـــرە بانگـــەوازو بانگەشەشـــیان بۆدەکـــات و دەبێتـــە مرۆڤێکی قێزەون.

هەربۆیـە "دەیـوث"واتـە گـەواد قێـزەونترین مرۆڤـە لای خـودای گـەورە کـە بەهەشـــتی لەســـەر قەدەغـــەکردووە، هـــەروەها بانگەشـــەکەرانی و بەحـــەلاڵ کردنـی سـتەم ونـاڕەوایی لـەنێو خەڵکیدا. ئەمانـەش مایـەی نـەمان وتیاچـوونی پەرۆشـــی یـــە لـــەدڵی ئـــادەمیزادادا. ئەمـــەش ئەوەدەســـەلمێنێت کـــە کرۆکـــی ئـــاین بـــریتی یـــە لـــە "غـــیرە- پەرۆشـــی" کـــە جیاکـــەرەوەی ڕەوا وناڕەوایـــە وەبزوێنـــەرو هەڵســـوڕێنەری کارەکانـــە. وەپارێزگـــاری دڵ ودەرونـــە. وەهـــەر کەسـێك غـیرەت وپەرۆشـی نـەبێت ئـەوا ئاینیشـی نـی یـە. وەنـەمانی پەرۆشـی دڵ دەمرێنێـت وپـەل وپۆکـان پـەك دەخـات،نمونـەی غـیرەت وپەرۆشـی وەك

هێزی بەرەنگاری نەخۆشی وایە لەجەستەی مرۆڤدا ، بەبێ بوونی ئەو بەرگریە، ئەوا مرۆڤ ڕووبەڕووبوونەوەی تیاچوون دەبێتەوە.

نمونەی وەك شاخ وقۆچەکانی گامێش"گا" وایە کەدەتوانێت بەهۆیەوە پارێزگاری لەخۆی ووەچەکانی بکات. جا هەرکاتێك ئەو شاخ وقۆچانەی شکان، ئەوا دەبێتە جێی تەماحی دوژمنانی ودەبێتە نێچیرێکی ئاسان بۆیان.

## ٢٧- تاوان ماددەی سەرەکی ژیانی دڵ لەناودەبات کە ئەویش شەرمە :

حەیاوشەرم وئابڕو سەرچاوەی هەموو خێروچاکەیەکە، وەبە تیاچوونی لەدەست دانی هەموو خێرێکە.

وەلە (صحیح) دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: (الحیاء خیر کلهٔ) [1]. وەهەروەها دەفەرمێتﷺ: (إن مما أدراك الناس من الكلام النبوة الأولى: اذا لم تستحفاضع ما شئت.) واتە: ئەوەی خەڵکی لە ووتەی پێغەمبەرانی تر فێربوونە ئەوەیە: ئەگەر شەرمت نەکرد چی ئەکەیت بیکە.

ئەم فەرموودەیە دوو جۆرە لێکدانەوە هەڵدەگرێت:_

[1] – ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(مسلم: ٢/٦-٧)گێڕاویەتیەوە.
وە(امام نووی)دەڵێت: شەرم وحەیا هێزێکە پاڵنەرە بۆ دەست بەرداربوونی نارەوایەکان ،وەڕێگرێکە لەدروست بوونی کەمتەرخەمی بەرامبەرماف ڕەواکان.
وە(الامام جنید)دەڵێت:(شەرم بینینی نیعمەتەکانی خوای گەورەو کەم وکورتیەکانی مرۆڤە، جا لەم نێوەندەدا شتێك دروست دەبێت پێی دەوترێت شەرم.)
وە(القاضي – عیاض)وکەسانی تریش پێیان وایە کە: هەرچەندە شەرم غەریزەیە"ڕەمەکە" بەلاَم بۆ جێ بەجێ کردنی بەپێی شەرعی خودا پێویستی بەهێزو نیەت وزانست هەیە، هەر بۆیە لەبەشێك ئیمان وباوەڕ دەژمێردرێت، وەهاندەری کاری خێرو ڕێگرە لەخراپەکاری. تەماشای (شرح مسلم)بکە لەلایەن(النووی: ٢/٩) وە(کنز الفوائد –باب الاخلاق)بکە.

یەکەم: کە هەڕەشەو ترساندنە. بەواتای ئەگەر تۆ شەرمت نەکرد ، ئەوا هەموو شتێکی نارەوا ئەنجام دەدەیت، وە تەنها ڕێگریەك لەم کارانە بریتی یە لەشەرم وحەیا. ئەمەش لێکدانەوەی "أبی عبیدە"یە.

دووەم: هەر کردەوەو کارێك گەر لەبەرخودا شەرمت نەکرد، ئەوا ئەنجامی بدە. وەئەگەر دەست بەرداری بوویت، تەنها لەبەر شەرم کردن لە خودا دەست بەرداری ببە. ئەمەش بۆچوون ولێکدانەوەی "امام احمد"ە.

واتە لەیەکەمدا شێوازی هەڕەشە ئامێز لەخۆ دەگرێت کە دەفەرمێت: (اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ... فصلت:٤٠) واتە:چی دەکەن بیکەن.

وە دووەمشیان ڕێ پێدان ومۆڵەتدانە.

جا ئەگەر ووترا: ئایا دەکرێت هەردوو لێکدانەوەکە وەری بگرین؟

ئەوا دەڵێم: نەخێر.. چونکە لەنێوان مۆڵەتدان وهەڕەشەدا پێچەوانەیەك هەیە.

پوختەی مەبەست: تاوانکاری شەرم وحەیا لاواز دەکات. وەدوور نی یە هەر بەیەکجاری لەدڵی مرۆڤدا بەیەکجاری دایبڕێنێت ، وەهەرچەندە کەسانی تر وشیاری بکەنەوە، بەڵام بێ سوود دەبێت تەنانەت دوور نی یە لەلای خەڵکی شانازی پێوە بکات و باسیان بکات. کە مرۆڤ گەیشتە ئەم قۆناغە چیتر چاك بوونەوەی ئەستەم ودژوار دەبێت.

جا ووشەی شەرم وحەیا لە ووشەی (حیاة –ژیانەوە ) سەرچاوەی وەرگرتووە ، چونکە هەر کەسێك شەرمی لەدڵدا نەبێت،واتە دابڕا (حیاة – ژیانەوە ) و وەلە ڕیزی مردووان و تیاچووانی دنیاوقیامەت دادەنرێت. جا هەریەکە لەتاوان وبێ شەری وبێ پەرۆشی یەکتری کەمەندکێش دەکەن. جاهەرکەسێك لەکاتی تاوانێکدا شەرمی لەخودا کرد ، ئەوا خودای گەورەش شەرمی لێ دەکات سزای بدات. وەبەپێەوانەشەوە هەرکەسێك شەرم لەخودا نەکات لەتاواندا ، ئەوا خودای گەورە لە قیامەتدا شەرمی لێ ناکات لەسزادانیدا.

## ٢٨- تاوان گەورەیی ومەزنی خودا لەدڵدا کەم دەکاتەوە:

کەسی تاوانکار هەیبەت وگەورەی و مەزنی خودای گەورەی لە دڵدا کەم دەبێتەوە ، هەر بۆیە بوێرانە دەست دەکات بەتاوانکاری. ئەگەر کەسێك بڵێت: نەخێر گەورەیی خودا هەر لەدڵیدایە ، بەڵام کاتێ تاوان دەکەین، پشتمان بەوە ئەستوورە کە خودای گەورە بەخشندەیە لەبەندەکانی دەبورێت. ئەوا ئەمە هەڵەیە و خۆ خەڵەتاندنە ، چونکە خوای گەورە بەمەزن بزانێت ، یاساکان وقەدەغەکراوەکانی بە مەزن دەزانێت و سەرپێچی ناکات.

## ٢٩- تاوان لەخودا ترسان لەدڵدا لەناو دەبات:[1]

ئەمە گەورە ترین سزایە توشی تاوانکار دەبێت. مرۆڤی تاوانکار ترسی لەخودا نامێنێت ، هەر بۆیە بەئاسانی سەرپێچی دەکات.بە ئەندازەی خۆشویستنی بەندە بۆ خودا ، خوداش بەندەکەی خۆش دەوێت، هەروەها بەئەندازەی ترسی بەندە بۆ خودا، خوای گەورە ڕێزی لێ دەنێت. وەچەندە خودا بەمەزن بزانیت ، ئەوەندەش خودای گەورە پایەدارت دەکات لەناو خەڵکی دا.

جا چۆن بەندە سنوورە قەدەغەکراوەکانی خودا پێشێل دەکات و لەهەمان کاتدا ئاواتی ئەوە دەخوازێت کە خەڵکی تر مافی پێشێل نەکات؟..

جا چۆن بەبچوکی دەڕوانێتە قەدەغەکراوەکانی خوای گەورەو سەرپێچی دەکات. ئەی چۆن خوای گەورە بە بچوك وبێ نرخ تەماشای نەکات. وەخوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لەمیانەی سزای سەرپێچی کاراندا کە چۆن لەبەرئەنجامی توانکاریاندا

---

[1] – بڕوانە خاڵی (١٤).

خـوای گـەورە دڵ ودەرونـی داپۆشـیون و مـۆری کـردەوەو لـەبیری کـردووون. وە بـێ نـرخ وڕێـز سـوکی کـردوون، وەك چـۆن ئـەوان بـە سـوکی وبـێ ڕێـزی تەماشـای ئـاینی خودایـان دەکـرد. هـەر بۆیـە خـودای گـەورە دەفـەرموێت: (وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَـا لَـهُ مِـن مُّكْـرِمٍ...الحـج:١٨) واتـە: هـەر کەسێك خـوای گەورە سوکی بکات وبێ ڕێزی بکات ئەوا کێ هەیە ڕێزداری بکات.

واتـە کاتێـك ئـەوان سـوجدەو کڕنـوش بردنیـان بـۆ خـودا لا بـێ ڕێـزی بـوو وە ئـەنجامیان نـەدا وگاڵتـەیان پـێ دەهـات ،ئـەوا خـودای گـەورە بـێ ڕێـزو ڕیسـوایان دەکـات. جـاکێ هەیـە لەپاشـاندا ڕێـزدارو بایەخـداریان بکـات؟ جگـە لەخودای گەورە؟

**٣٠- تـاوان دەبێتە مایەی ئەوەی کە خودای گەورە بەندەکەی لەبیر بکات:**

کەسـی تاوانکـار بـێ گومـان خـودای گـەورە لـەبیر دەکـات ، بۆیـە بوێرانـە یاسـاکانی خـودا پێشـێل دەکـات. ئـەم کـارە دەبێتـە مایـەی ئـەوەی کـە خـودای گـەورە ئـەو بەنـدە تاوانکـارە پشـت گـوێ بخـات ولـەبیری بکـات، ئەمـەش مەترسـیترین شـوێنەوارو کاریگەریـەکانی تاوانـە. کـەمرۆڤ چـاودێری خـوای گـەورەی لەسـەر نـەمێنێت و بەتـەنها لـەنێو دەرونـی تاوانکـاری وشـەیتاندا بمێنێتەوە وبەرەوهەڵدێرو نەهامەتی دەچێت.

خوای گەورە دەفـەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُـوا اللَّـهَ وَلْتَنظُـرْ نَفْـسٌ مَّـا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ * وَلَا تَكُونُـوا كَالَّـذِينَ نَسُـوا اللَّـهَ فَأَنسَـاهُمْ أَنفُسَـهُمْ أُوْلَئِـكَ هُـمُ الْفَاسِـقُونَ.... الحشـر:١٨-١٩) واتـە: ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە، خواناسـو پارێزگـاربن، لەسـنوورەکانی مـەترازێن. باهـەموو کەسـێك سـرنج بـدات وبزانێـت چـی بـۆ سـبەی دەسـت پـێش کـەری کـردووە ، هـەوڵ بـدەن هەمیشـە خوانـاس وپارێزکـاربن. چـونکە خـوای گـەورە ئاگـادارە بـە هـەموو ئـەو کردەوانـەی ئێـوە ئـەنجامی دەدەن، نەکـەن وەك ئەوانـە بـن کـە خوایـان فـەرامۆش کـردووە و شـوێنی بەرنامەکـەی نەکـەوتوون.

وەخـوای گـەورەش ئەوانـەی لـەبیر خۆیـان بردووەتـەوە، ئەوانـە لەسـنووره دەرچووەکان وتاوانکارەکانن.

خـوای گـەوره ڕێنمـای بـڕواداران دەکـات ،کەئەگـەر لەوکەسـانەبن کەتـەقوا ناکـەن ،دواتـر خـوا لەبیردەکـەن و وەئـەو هۆکارانـەش لـەبیر دەکـەن کـە دەبێتـە مایـەی ڕزگـاری لەقیامەتـدا.وەدەبێتـە بەنـدەی دەرونـی تاوانکـاری خـۆی وشـوێونی هـەواوئارەزوو وحـەزەکانی دەکـەوێت وبەرژەوەندیـەکانی هەمیشـەیی قیامـەتی لـەبیر دەکـات. وەخـوای گـەورەش ئەوبەندەیـە لـەبیر دەکـات. وەهۆشـیاری و وریـایی لەدەسـت دەدات، وەسـەرگەردان دەبێـت وقیامەت لەدەست دەدات بۆ خۆشیەکانی دونیا.

وەگـەورەترین سـزای سـزایی خـوایی ئەوەیـە کـە ئـەو بەندەیـە بـیٚ بـاك دەبێـت لـەخوای گـەورەو وەخـودی خـۆی لـەیاد دەچـێت، وەگرنگـی بـەئاین وبەرنامـەی خـودا نـادات ، وەبایـەخی تـەواو دەدات بـەدونیا. بـەلآم هـەموو شـتە دونیایـەکان ناتوانێـت فریادڕەسـی بێـت لـە دونیـاو قیامەتـدا، وەجێگـەی ڕەحمەتوچـاودێری خـوای گـەوره ناگرنـەوەو فریادڕەسـی ناکـەن ، چـونکە هـەموو شـتێك لەناودەچـێت وبـیٚ بایـەخ دەبێـت، تـەنها خـوای گـەوره نـەبێت. هەربۆیـە ئەوکەسـەی بەرنامـەو ڕێنمـای خـوای گـەوره پشـت گـویٚ بخـات ئـەوا خوای گەوره پشت گوێی دەخات وبەرەولەناوچوون هەنگاو دەنێت.

## ٣١- تـاوان مرۆڤ لەنزیکی خودا دووردەخاتەوە:

ئەگـەر دڵـی مـرۆڤ ئیحسـانی تێـدا بێـت، ئـەوا ڕێگـر دەبێـت لـەتاوانکاری، چـونکە ئەگـەر هـەموو کاتێـك هەسـت بـەنزیکی خـوداو چـاودێری خـودای کـرد، واهەسـتی کـرد کـەخودای گـەوره دەیبینێـت. خۆئەگـەر ئـەم خـودا نـەبینێت ، ئـەوا خـوای گـەوره دەیبینێـت. ئـەمهۆکاره بەربەسـت دروسـت دەکـات لەڕێگـەی تاوانکاریـدا ، بـەلآم ئەگـەر ئـەم لایەنـە لاواز بـوو، چـیتر لـەژێر چـاودێری وڕەچـاوی خـودای گـەورەدا نامێنێـت و دەترازێـت. هـەروەکو

پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرمێت: (لايزنى الزانى حين يزني وهو مؤمن، ولايشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن. ولا يسرق السارق حين يسرق وهو مؤمن. ولاينتهب النهبة ذات شرف يرفع إليه فيها الناس أبصارهم حين ينتهبها وهو مؤمن.)[1] واتە: داوێن پیس کاتێك زیناو داوێن پیسی دەکات ، باوەڕی نی یە. وەدزیش کاتێك دزی دەکات باوەڕی نی یە. وەعارەق ومەیخۆریش کاتێك مەی دەخۆنەوە باوەڕی نی یە.جەردەش لەکاتێکدا شتێکی گرانبەها کە خەڵك چاوی تێ بڕی بێ، تالآنی بکات باوەڕی نی یە.

**٣٢- تاوانکارو یاخی بوو... هاوەڵێتی باوەڕداران لەدەست دەدات:**

باوەڕداران کۆمەڵێك تایبەتمەندی تایبەتیان هەیە کە لەلای خوای گەورە وەك خەڵات وڕێزلێنان پێیان بەخشراوە. بەهۆی تاوانەوە تاوانکاران ویاخی بووان هاوەڵێتی باوەڕداران لەدەست دەدەن ودواتر لەو تایبەتمەندیانە بێ بەش دەبن. لەو تایبەتمەندیانە:

- پاداشتی مەزن: خوای گەورە دەفەرموێت: (وَسَوْفَ يُؤْتِ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا... النساء:١٤٦) واتە:لە ئاینەدەدا خوای گەورە پاداشتی زۆر بێ سنوور دەبەخشێت بەبڕواداران.
- پاڕانەوەی فریشتەکان وهەڵگری عەرشی مەزن بۆ لێ خۆش بوون لەبڕواداران: خوای گەورە دەفەرموێت: (الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا... الغافر:٧) واتە: ئەو فریشتانەی کە هەڵگری عەرشی مەزنی خودا وە ئەوانەیشی کەبەدەوریدا دەسوڕێنەوە و تەسبیحات وستایش

[1] – ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە،(بخاری: ٢٤٧٥) وە(مسلم: ٤٤/٢ – نووی) گێڕایانەتەوە.

وسوپاسی پەروەردگاریان دەکەن، باوەڕی پتەویان پێ یەتی.
داوای لێخۆش بوون دەکەن بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە.

- پشتیوانی خوای گەورە بۆ بڕواداران: کە هەمیشە پشتیوانیان دەکات وپشتیان بەرنادات: (اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ...البقرة:٢٥٧) واتە:خوای گەورە پشت وپەناو خاوەنی ئەوکەسانەیە کە بڕوایان هێناوە.
- چەسپاندنی باوەڕداران لەلایەن فریشتەکانەوە: (إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلآئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ: أنفال: ١٢) واتە: خوای گەورە وەحی بۆ فریشتەکان دەناردو دەیفەرموو من یارویاوەرتانم ، ئێوەش دڵی باوەڕداران پابەندو دامەزراو بکەن.
- پلەوپایەی بەرزی لێ خۆش بوون لەلایەن خوای گەورەوە:
- سەربەرزی وشکۆمەندی: (وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ... المنافقون:٨) واتە: شکۆمەندی وسەربەرزی بۆ خودای گەورەو پێغەمبەرو بڕوادارانە، بەڵام دووڕووەکان بەم ڕاستی یە نازانن.
- نزیک بوونی خوای گەورە بۆ بڕواداران: (إن الله مع المؤمنين...: انفال:١٩) واتە: خوای گەورە لەگەڵ بڕواداراندایە.
- بڵندبوونی بڕواداران لە دونیاو قیامەتدا: (يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ...المجادلة:١١) واتە: خوای گەورە پلەوپایەی بڕواداران وزانست خوازان بڵند ڕادەگرێت.
- پێدانی دووبەش لەڕەحمەتی خوداو وە پێدانی ڕووناکی کەڕێگەی پێ بکەن وە لێ خۆش بوون لەتاوانەکانیان.
- ئەو خۆشەویستی یەی خوای گەورە پێیان دەبەخشێت: وکەبریتی یە لەوەی کە خوای گەورە خۆشی دەوێن ، هەروەها خۆشەویستیان دەکات لەلای فریشتەوپێغەمبەر وپیاو چاکان.

وەدەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا... مريم:٩٦) واتە: ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکە ئەنجام دەدەن، خوای گەورە خۆشەویستی وڕێزی تایبەتیان بۆ ئامادەکات.

- سەرفرازبوونیان لە ترس وسامناکی ڕۆژی قیامەت: (فَمَنْ آمَنَ وَأَصْلَحَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ.... أنعام:٤٨) واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوەو چاکە خوازبوونەو هیچ مەترسی یەکیان نی یەو غەمگینیش نابن لە دونیاو قیامەتدا.
- ئەو کەسانەی کە پیت ونیعمەت دەڕژێت بەسەریاندا: ئەو کەسانەی کە ڕۆژانە حەڤدە جار داوا لە خودا دەکەن کەلەو کەسانە بیان ژمێرێت.
- قورئانی پیرۆز ڕێنمایی وشیفایە بۆیان: (قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاء وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِي آذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُوْلَئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ...فصلت:٤٤) واتە: ئەم قورئانە بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە هیدایەت وڕێنمایی وشیفاو چارەسەری هەموو دەردو نەخۆشی یەکان دەکات. جا ئەوانەی باوەڕناهێنن گوێچکەکانیان کەڕەو بەشتی تر ئاخێنراوەو دیدە کوێرن لەئاستیدا ئەوانە هەروەکو لەدوورەوە بانگیان لێ بکرێت وایە"نەدەنگەکە بەچاکی دەبیستن و نەڕەنگەکە بەڕوونی دەبینن".

<u>پوختەی مەبەست:</u>

باوەڕ مایەی فەراهەم هێنانی هەمووخێروچاکەیەکە لەدونیاو قیامەتدا. وەهۆکاری هەموو خراپەوناڕەواو شەڕێك بریتی یە لەبێ باوەڕی. جا چۆن مرۆڤ سەرکەشانە دەوێرێت هەندێ ناڕەوایی ئەنجام بدات ولەبازنەی باوەڕداری دەری بهێنێت و وەئەم هەموو بەرهەمانەی لەدەست بدات، بەلأم لەچوارچێوەی گشتی موسڵمانێتی ناچێتە

دەرەوە، بەڵام ئەگەر هەر سوور بوو لەسەر ئەوتاواناكاری وخراپەكاریەدا مەترسی دەرچوونی هەیە لەچوارچێوەی موسڵمانێتی وئاینی ئیسلام بەگشتی.

هەرئەمەیە پاڵ بەهەندێ لە"سلف"ەوە دەنێت كە بڵێن:"ئێوە لەتاوان دەترسن، بەڵام من لەبێ باوەڕی".

## ٣٣- تاوان بەربەستی دڵە لە گەیشتن بە بەزەیی خوای گەورە:

سروشتی دڵی مرۆڤ وایە كەزۆر بەخێرایی بەرەو خوای گەورە دەچێت، بەڵام ئەگەر ئەو دڵە دوچاری نەخۆشی یەكانی تاوان بوو ،ئەوا هێزی نامێنێت وبەربەستی بۆ دروست دەبێت. جائەگەر بەردەوام بوو لەسەر تاوانكاری ، ئەوا بەیەكجاری پەكی دەخات وڕێگری تەواوی دەكات ودەیمرێنێت.

تاوان دڵ دووچاری مردن یاخود نەخۆشی دەكات ،یان لاوازی دەكات وهێزی لەبەر دەبڕێت و توشی كۆمەڵە دەردێكی دەكات كە پێغەمبەرﷺ بە (هەشت) دەرد ناوی بردوون وپەنای گرتووە بەخوای گەورە، لەو هەشت دەردە بریتی یە لە: (**اللهم إني أعوذبك من الهم والحزن والعجز والكسل والجبن والبخل وضلع الدين وغلبة الرجال.**)[1] واتە: خودایە من پەنا دەگرم بەتۆ لە:خەموپەژارە،ولەپیری وبەساڵاچوونوەلەبێ دەسەلاتی وتەمەڵی ، وەلە ترسنۆكی وچاوچنۆكی وەلە كەڵەكەبوونی قەرزاری وزوڵم وستەمی پیاوان.

جاگەر بە وردی لەم فەرموودەیە ورد بینەوە دەبینین ئەم چەمكانە بەجووت هاتوون وهاوڕێكن: خەم وپەژارە.

[1] – ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە، (بخاری: ٦٣٦٩)وە (مسلم: ٣٣/١٧- سووی) گێڕایانەتەوە، وەبڕگەی(وضلع الدين وغلبه الرجال)لە مسلمدا نەهاتووە.

## ٣٤- تاوان نیعمەت لەناو دەبات و بەلا بەشوێنیدا دێنێت:

بەهەمیشـەیی تـاوان هۆکـاری لەدەسـت دانـی نیعمـەتی خـودای و تـوش بوونـە بەبـەلاو ناوخۆشـی هـەروەکو (علـی بـن ابـی طالـب) دەڵێـت: (تـاوان هۆکاری هاتنی بەلایە ، وەتەنها بە تەوبە ئەوبەلایە لادەچێت.)

هەروەها خوای گەورە دەفەرمێت: (وَمَا أَصَابَكُم مِّـن مُّصِـيبَةٍ فَبِمَـا كَسَـبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَـن كَـثِيرٍ.... الشـوری:٣٠) واتـە: هـەر بـەلاو نەهامەتیـەکتان بەسـەردا هاتبێـت ، ئـەوا دەرئـەنجامی ئەوکاروکردەوانەیـە کەبـە ئـارەزووی خۆتـان دەتـان کـرد، بـەلام خـوای گـەورە بـە میهرەبـانی خـۆی لەهەنـدێ لـەو تاوانانە خۆش دەبێت.

هەورەها دەفەرمێت: (ذَلِكَ بِأَنَّ اللّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّـرًا نِّعْمَـةً أَنْعَمَهَـا عَلَـى قَـوْمٍ حَتَّـى يُغَيِّـرُواْ مَـا بِأَنفُسِـهِمْ.... أنفـال:٥٣) واتـە: خـوای گـەورە هـیچ نازونیعمـەتێکی نـەگۆڕیوە کـە بەخشـیبێتی بەهـەر گـەل ونەتەوەیـەك، تـاوەکو خۆیـان بـەکردەوەی نـاڕەوای خۆیـان بووبێتـە مایـەی گـۆڕینی ئـەو نیعمەتـە، وەخوای گەورە بیسەروزانایە بەکردەوەکانتان.

خـوای گـەورە لێـرەدا جـەخت لەسـەر ئەوەدەکاتـەوە کـە هـیچ کاتێـك بەخشـش ونیعمـەتی خـۆی کەبەخشـیبێت بەسـەر بەندەکانیـدا نایگۆڕێـت، هـەتاوەکو هۆکـاری گۆڕینەکـە لەبەندەکانـەوە سەرچـاوەی نـەگرتبێت، کەلـەبری ملکەچـی یـاخی بووبێـت، وەلـەبری سـوپاس گـوزاری ،ناسـوپاس گوزاربێـت.وەهـەرکاتێکش بەنـدەکان لەخراپـەوە گۆڕابێـت بـۆ باشـە. بـۆ نمونـە یـاخی بـوونی گۆڕیبێـت بـۆ ملکەچـی وخواپەرسـتی ، ئـەوا خـوای گـەورەش بـەلای بـۆ کـردوون بەنیعمـەت و سەرشۆڕشـی وڕیسـوایی بـۆ کـردوون بەسەربەرزی وشکۆمەندی.

خوای گەورە دەفـەرموێت: (لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْـهِ وَمِـنْ خَلْفِـهِ يَحْفَظُونَـهُ مِنْ أَمْرِ اللّهِ إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَـا بِأَنْفُسِـهِمْ وَإِذَا أَرَادَ اللّـهُ بِقَـوْمٍ سُوءًا فَلاَ مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُم مِّـن دُونِـهِ مِـن وَالٍ...الرعـد:١١) واتـە: بـێ گومـان خـودای گـەورە بـارودۆخی هـیچ قـەوم وگـەلێك ناگۆڕێـت"لەخۆشـی یـەوە

بۆناخۆشی، یان لەزەلیلی یەوە بۆ سەربەرزی، یان لەگرانی یەوە بۆ هەرزانی" هەتا ئەوان ئەوەی بەخۆیان دەکرێت نەیگۆڕن ونەیکەن ، کاتێك خودا بیەوێت بەڵایەك بەسەر هەر میللەتێکدا بهێنێت"لەدەرئەنجامی سەرکەشی ویاخی بوونیان" ئەواهیچ هێزێك ناتوانێت بەری بگرێت، هیچ کەسیش ناتوانێت جگە لەخودا فریان بکەوێت ورزگاریان بکات.

وەلە هەندێ "آثاری الابصیە"دا هاتووە کەخوای گەورە فەرموویەتی: (وعزتي وجلالي لايكون عبد من عبدي على ماأحب. ثم ينتقل عنه الى ما اكره الا أنتقلت له مايحب الى مايكره. ولايكون عبد من عبدي على مااكراه ثم ينتقل عنه الى ما احب الا أنتقلت له مما يكره إلى مايحب.) واتە:هەر بەندەیەك لەبەندەکانم لەسەر شتێك بێت کەمن پێم خۆشە بیگۆڕێت بۆ شتێك کەمن پێم ناخۆش بێت. ئەوا منیش شتە خۆشەکانی بۆ دەگۆڕم بۆ ئەو شتناەی کەپێی ناخۆشە. وەهەر بەندەیەك لەبەندەکانم لەسەرشتێك بێت کە من پێم ناخۆشە ، وەبیگۆڕێت بۆ شتێك کەمن پێم خۆشە. ئەوا منیش شتە ناخۆشەکانی بۆ دەگۆڕم بۆ ئەوشتانەی کە ئەو پێی خۆشە.

## ٣٥- تاوان دەبێتە مایەی ترس وسامناکی لەدڵی مرۆڤدا:

مرۆڤی بڕوادار هەمیشە لەئاسایشدا دەژێ، چونکە خودا پەرستی وگوێڕایەڵی پەرژینی خودای مەزنە بۆ بڕواداران کەچاونەترس وسەربەرزن. بەپێچەوانەوە،مرۆڤی تاوانکار بەهەمیشەیی لەترس وسامناکیدا دەژێ ودڵنیایی وئارامی وئاسایشی لەژیانیدا بەدی ناکرێت، چونکە ئەمە جۆرێکە لەسزای خوای گەورە بۆیان. وەهەموو نارەحەتی ورووداوێك بە مەترسی بۆسەر خۆیان وبەرژەوەندیەکانیان دەزانن، دوودڵی وترس هەموو ژیانیانی تەنیوە لەدەروونەوە،[1] وەدەرونیان داڕووخاوەو زۆریش لەمەرگ دەترسن.

وەهەرکەسێك لەخودا بترسێت لەهیچی تر ناترسێت، وەهەر کەسێکیش لەخودا نەترسێت لەهەموو شتێك دەترسێت.

---

[1] –خوای گەورە لەباسی دووڕووەکاندا دەفەرموێت:( يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ... المنافقون:٤ ) واتە: هەر هاوارو ڕوداوێك و بانگ بکرێت،وادەزانن دژی ئەوانە.

## ٣٦- تـاوان مايەی خەمناكی وغەمباری وتەنهایی یە لەدڵی مرۆڤدا:

مرۆڤـــی تاوانكـــار هەمیشـــە هەســـت بەخـــەمناكی وغـــەمباری دەكـــات ، كەئەمـــەش بـــەهۆی ئـــەودابڕان و دووركەوتنەوەیەیـــە لـــەخوای گـــەورە ولـــە خـــەڵكیش، هەربۆیـــە ســـامناكی ودابـــڕان بـــاڵ بەســـەر ژیانیـــدا دەكێشـــێت. گـــەر مرۆڤـــی تاوانكـــار بـــەراوردێك بكـــات لـــەنێوان چـــێژی تـــاوان ئـــەودابڕان تـــەنهایی وخـــــەمناكی یـــــەی كـــــەبۆی دروســـــت دەبێـــــت گێلـــــی ونـــــەفامی خـــــۆی بۆدەردەكەوێت.

وەنهێنی ئەم بابەتەش بریتی یە لە:

ملكەچـــی وگوێڕایـــەڵی دەبێتـــە مایـــەی نزیـــك بوونـــەوە لـــەخوای گـــەورە. وەهەرچـــەندە ئـــەم نزیـــك بوونەوەیـــە بـــەهێزبێت، ئـــەوا هـــێمنی وئاســـودەیی بـــاڵ بەســـەرژیانیدا دەكێشـــێت. وەبەپێچـــەوانەوە هەرچـــەندە مـــرۆڤ تاوانكـــار بێـــت ئەوەنـــدە زیـــاتر لـــەخودای گـــەورە دووردەكەوێتـــەوەو توشـــی دابـــڕان وبـــێ كەســـی دەبێـــت. هەربۆیـــە مـــرۆڤ هەســـت بـــەدووری ودابـــڕان دەكـــات بەرامبـــەر دوژمنەكـــەی هەرچـــەندە نـــزیكیش بـــن.وەبەپێچـــەوانەوە هەســـت بـــەنزیكی خۆشەویستەكەی دەكات هەرچەندە كەلەیەكیش دووربن.

وە تـــەنهایی "الوحشـــە" هۆكارەكـــەی دەگەڕێتـــەوە بـــۆ بـــوونی بەربەســـتێك ،جـــا هەرچـــەندە ئـــەو بەربەســـتە لێـــڵ وتـــەم ومـــژاوی بێـــت، ئەوەنـــدە زیـــاتر هەســـت بـــەدابڕان وتـــەنهایی دەكـــات، وەبـــێ ئاگـــایی وگێلـــیش دابـــڕان وتـــەنهایی دروســـت دەكـــات. مەترســـیدارترین جـــۆری دابـــڕان و تـــەنهایی ، بـــێ بـــاوەڕی وهاوبەشی پەیداكردنە كەدڵ ودەروون دادەپۆشێت.

## ٣٧- تـاوان دڵ توشی نەخۆشی ولادان دەكات:

تـــاوان دڵـــی مـــرۆڤ توشـــی نەخۆشـــی دەكـــات، وەكاریگـــەری تـــاوان لەســـەر دڵ زۆرتـــرە لەكاریگـــەری نەخۆشـــی لەســـەر جەســـتە. ئەگـــەر چارەســـەری نەخۆشـــی

جەستە بریتیبێت لەچارەسەرکردن، بەلاّم تاکەچارەسەری تاوان بریتی یە لەوازهێنان و تەوبەکردن.

وەخواناسان دەڵێن: دڵ ناگات بەمەرام وئامانجی خۆی تا نەگات بەخوای گەورە. وەناگات بەخوای گەورە تا ساغ وتەندروست نەبێت. وەساغ وتەندروست نابێت تا لە نەخۆشی یەکان دەربازی نەبێت.وەلە نەخۆشی یەکان دەربازی نابێت تاوەکو دژی حەزوئارەزووەکانی نەوەستێتەوە، چونکە نەخۆشی یەکانی بریتی یە لەئارەزووەکانی ، جائەگەر نەخۆشی یەکە زاڵ بێت ئەوا ئەو دڵە تیادەچێت.

## دەروونی بڕوادار لە خۆشیەکانی دنیاو قیامەتدایە

مرۆڤی باوەڕدار خاوەنی دەرونی خاوێن کە ڕێگری وبەربەست لە ڕێی ئارەزووەکانیدا دروست دەکات ، ئەوا لەخۆشی یەکانی بەهەشتدایە چ لەدونیاو چ لەقیامەتدا. وەکەس هەست بەم ڕاستیە ناکات تەنها ئەوانە نەبێت کە چەشتویانە. وەنابێت لەم ئایەتە پیرۆزە واتێ بگەین کەتەنها مەبەستی خۆشی یەکانی بەهەشت بێت ،بەڵکو مەبەستی خۆشی یەکانی دونیاوقیامەتە کەبەسێ قۆناغدا تێ دەپەڕێت" دونیا، بەرزەخ، قیامەت". کەدەفەرمێت: (إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ * وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ.... الانفطار:١٣-١٤) واتە: چاکەکاران لەخۆشی یەکاندان* وەخراپەکاران لەدۆزەخدان.

وەئایا چ خۆشی ونیعمەتێك هەیە بگاتە خۆشی دڵ؟

وەچ سزاو ئازارێك هەیە بگاتە ئازاری دڵ ؟

وەچ سزایەك هەیە بگاتە ئازاروناڕەحەتی یەکانی خەم وترسو نەخۆشی دڵتەنگی و پشت کردن لەخوای گەورە وپشت گوێ خستی قیامەت و وەپەیوەست بوون بەغەیری خوای گەورەوەودڵنیابوون لە دواڕۆژ.

## هەرکەسێك شتی خۆش بوێت جگە لەخودای گەورە ئەوا پێی سزادەدرێت

هەرکەسێك شتێکی خۆش بوێت جگە لەخودا، ئەوا هەر ئەوشتە دەبێتە مایەی سزاوئازار بۆی. کە ئەویش بەسێ قۆناغی جیاجیا لەم دونیادا ڕوودەدات کەئەویش ئەمانەن:

قۆناغی یەکەم: ئازاروغەم وپەژارەی ئەوکاتەی کەلەهەولّی بەدەست خستنی ئەوشتەدایە.

قۆناغی دووەم: ئازارو غەم وپەژارە لەمەترسی لەناوچوون ولەدەست دانی ئەوشتەو وەپارێزگاری کردن لێی.

قۆناغی سێ یەم: جائەگەر شتە لەناوچوو ولەدەستی دا، ئازاروغەم وپەژارەی زیاتر دەبێت.

بەم سێ قۆناغە توشی سزا دەبێت لەدونیادا.

وەلەژیانی بەرزەخیشدا: واتە دوای مەرگ ومردن ئەوکەسە لەناڕەحەتترین جۆری سزادادەبێت، بەهۆی لەدەست دانی ئەو نیعمەت وژیانە پڕوپوچەی بەسەری برد. وەئازاری دابڕان ودوورە پەرێزی لەخوای گەورە کە کاریگەریەکی ئێجگار گەورەیان هەیە لەدەرونی ئەوکەسانە زیاتر لەکاریگەری کرم وماروميٚروو لەجەستەیدا. پاشتر لەدوای زیندووبونەوەیان ڕووەو سزای سەختر وتوندتر دەڕۆن.

بەراوردی ئەم حاڵەتانە بکە: لەگەڵ حاڵی باوەڕداران کەبەدرچوونیان لەم ژیانە ڕووەو خۆشی وشادی وژیانی ئاسودەیی دەبنەوە، وەبەدیداری خوای خۆیان شاد دەبنەوە. تەنانەت هەندێك لەپیاو چاکان لەکاتی سەرەمەرگیشدا دەڵێن: "ئای لەم شادی وخۆشی یە".

وەهەندێکی تر دەڵێن: "جا ئەگەر بەهەشتی یەکان لەم ژیانەدابن ئەوا خۆشی وشادی وا نمونەی نیە".

وەهەندێکی تر لەپیاوچاکان دەڵێن:"لەم دونیایەدا بەهەشتی خۆشی هەیە، جاهەرکەسێك نەی بینیبێت، لە قیامەتدا ناچێتە بەهەشتەوە.[1] "

جا هەرکەسێك بێ عەقڵی ونەفامی بگاتە ئەندازەیەك کە ژیان وبەختەوەری هەتاهەتایی لەدەست بدات بۆ چێژۆلەزەتێکی کاتی. ئای لەوکەسانەی کە خوای گەورە کڕیاری کاڵاکەی بێت بەرامبەر بە بەهەشتی بەرین، وەڕێکخەری ئەو کڕین وفرۆشتنەش پێغەمبەری نازداربێتﷺ. جاکەسێك بەم کڕین وفرۆشتنە ڕازی نەبێت و بەحەزوئارەزووەکانی بیفرۆشێت دوای لە دواڕۆژدا گلەیی لەکێ دەکات.

هەروەکو شاعیر دەڵێت:

إذا كان هذا فعل عبيد بنفسه        فمن ذا له من بعد ذلك يكرم؟

واتە: ئەمە کاری بەندەبێت بەدەرونی خۆی        جا ئیتر کێ هەیە ڕێزی لێ بنێت؟

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ... الحج:١٨) واتە: ئەوەی خوای گەورە قەدرو ڕێزی بشکێنێت و ڕیسوای بکات ئەوا هیچ ڕێزلێنەرێکی نی یە، بەڕاستی خوای گەورە ئەوەی بیوێت ئەیکات.

## ٣٨- تاوان بینایی دڵ کوێر دەکات و ڕووناکی لەناو دەبات و بەربەست لەڕێگەی زانست وهیدایەت دروست دەکات:

(امام مالك ) کاتێك ئەوهەموو زیرەکی وژیریەی لە "امام شافعی " بینی پێی ووت: من واهەست دەکەم کەخوای گەورە ڕووناکی یەکی باشی پێ بەخشیوی، ئاگاداربە بە تاریکی تاوان لەناوی نەبەیت.

---

[1] - بڕوانە خاڵی(٧٠) وەتەماشای (مدارج السالكين)ی نووسەر لەبەشی (منزلة الحياة الطيبة: ٤١٨/٢) وەکتێبی (السادة والأمان/ رضوان مع رضوان).

جا بە بەردەوامی ڕەشایی وتاریکی تاوان زیاد دەکات لە هێزی ئەو ڕووناکی یەی دڵ دەشارێتەوە، تا دواتر سیاپۆشی دەکات وەك شەوی تاریك.وەئەم تاریکی یە لەدڵەوە تەشەنە دەکات تا ڕوخسارو پەل وپۆکانیشی دەگرێتەوە. گەر بەم دیمەنە توشی مەرگ بێت ، ئەوا سەراپا گۆڕەکەشی سیاپۆش دەبێت. هەروەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (إن هـذا القبـور ممتلئـة علـى أهلـها ظلمـة، وإن الله منورهـا بصلاتي علـيهم)[1].
واتە: ئەم گۆڕانە سەراپا تاریکی سیاپۆشی کردوون بەوانەشی کەتێیدان و بەڵام خوای گەورە ڕوونی دەکاتەوە بە صلاوات دانی من لەسەریان.

وەلەڕۆژی حەشردا سەرجەم ڕوخساروکردەوەکانیان بڵندو بەرز دەبن کە هەموو کەسێك دەیانبینێت کە وەکو خەڵوز ڕەش داگیرساون ، ئەم حاڵەت ودیمەنە بەراورد ناکرێت بەهەموو خۆشی یەکانی دونیا.. ئای لەحاڵەتی ئەوکەسانە پەنادەگرم بەخودا.

### ٣٩- تاوان دەرونی مرۆڤ بچوك وڕیسوا دەكات:

دەرونی مرۆڤ ڕێز لێنراوە لەلایەن خوای بالادەستەوە ، بەڵام تاوانکاری ئەو دەرونە دەتەپێنێت و بچوك وڕیسوای دەکات و وەبێ ڕێزی دەکات ولەئاستی کەم دەکاتەوە. بەڵام بەخوداپەرستی وملکەچی بیرازێنێتەوە ئاوەدان وشکۆمەندتر دەبێت. هەروەکو خوای گەورە دەفەرمێت: (قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا * وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا... الشمس:٩-١٠) واتە: ئەو کەسە سەرفرازە کەدەرونی پاك وپوخت کردوە بەملکەچی وخواپەرستی * وەئەو کەسە نائومێدە کە دەرونی خۆی ناپوخت کردو ئالودەی تاوان وخراپەی کرد.

[1] - ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(مسلم: ٢٩/٧- نووی)گێراویەتیەوە لە ئەسڵدا لە(بخاری: ١٣٣٧ ،٤٥٨)دا هاتووە.

وه وشـەی (دَسَّــــاهَا) لــە بنەڕەتــدا لــە (تدسـيە) ەوە هــاتووە واتــە (تەپانـدن) يـاخود شـاردنەوە. وەكـو دەفـەرموێت: (أَمْ يَدُسُّــهُ فِــي التُّــرَابِ.. النحل:٥٩) واتە: لەخۆڵدا ونی كردوون.

واتــە يــاخی وتاوانكــار دەرونـــی خــۆی لەتاوانــدا وونــە كــردوەو ڕێــزی لەدەسـت داوەو شـكۆمەندی شـكاوە، وەلـەلای خـواو خـەڵكی بـێ ڕێـزو ڕيسـوا بـووە. خواپەرسـتی وملكەچـی بـوون بـۆ خـودا دەرونـی ڕێـزدارو شـكۆمەند و ئاسـت بـەرز دەكـات، كەئەمانـەش دەرئـەنجامی خـۆ بەكـەم زانيـی وملكەچـی بوونە بەرامبەر بەخودای گەورە.

## ٤٠- تــــاوان وتاوانكــــار... بەهەميشـــەيی ديلـــی شــــەيتان وبەنـــدی حەزوئارەزووەكانێتی:

كەسـی تاوانكــار هەميشــە ديــل وكــۆت وبەنــدەی دڕنــدەترين دوژمنــە كەشــەيتان ودەرونـێتی. كـەدژوارترين جـۆری بەنــدە ، بەنــدەی شــەيتانە. وەدژوارتــرين كــۆت، كــۆتی ئارەزووەكانــە. جــا ئەوكەســە چــۆن دەتوانێــت ڕووەو خوای گەورە هەنگاو بنێت كەدڵ ودەرونی بەند كراوە.

نمونــەی دڵ وەكــو باڵندەيــەك وايــە كەهەرچــەندەبەرز بێتــەوە بــەرەوقوڵای ئاسمــان بفڕێــت، ئــەوا ئەونــدە زيــاتر دوور دەكەوێتــەوە لەتەڵــەو ڕاوچــييان. وەبەپێچــەوانەوە، هەرچــەندە نــزم بێتــەوە ڕووەو مەترســی دەبێتــەوە. وەلــە فەرمودەيەكــدا هــاتووە كــە پێغەمبــەرﷺ دەفــەرمێت: (الشـيطان ذئـب الانسان)[1] واتە: شەيتان بۆ مرۆڤ وەك گورگ وايە.

هــەروەها مــەڕی دوور لەشــوان وپــەرژين زيــاتر توشــی مەترسـی گــورگ دەبێتــەوە. بەهــەمان شـێوەش كــە مــرۆڤ لــەخودا دووربێــت توشــی داوی شــەيتان دەبێتــەوە، وەهۆكــاری پاراســتنی بــريتی يــە لەخواپەرســتی

---

[1] – ئـەم فەرموودەيـە (ضـعيف الاسـناد)ە، (امـام احمـد: ٢٢٣/٥، ٢٤٣)بـە سـەنەدێكی لاوازەوە گێراوێتيەوە.

وپارێزگاری کردن. هەروەها گورگی درندە زیاتر فورسەت لەمەڕی دوور لە پەرژین ودوور لەشوان دەبات ، چونکەنێچیرێکی ئاسانە.

پوختەی باسەکە: پوختەی باسەکە ئەوەیە کەهەرچەندە بەندە دوور بێت لەخوای گەورە، زیاتر دوچاری مەترسی بەلا دەبێتەوە. وەدووریش جۆری زۆرە ، هەیانە کاریگەری ومەترسی زۆرترە. بێ ئاگایی مرۆڤ دووردەخاتەوە لەخوای گەورە، بەلام تاوانکاری وپاخی بوون دژوارترە لەوی تر. هەروەها دووری (بیدعە) زۆر مەزنتر وسامناکترە لەهەردووکیان. وەدووری دووڕوی وهاوبەشی پەیداکردن لەهەرهەموویان مەترسیدارترو سامناکترە.

## ٤١ - تاوان مایەی لەدەست دانی ڕێزوپلەوپایەیە لە لای خوا و خەڵك:

مرۆڤ ڕێزلێنراوە لەلایەن خوای گەورەوە. گەربێت و بتوانێت پارێزگاری بکات لەو ڕێزە وەك مرۆڤێك. وەلەنێو مرۆڤەکاندا ڕێزدارترینیان لای خوای گەورە ئەو کەسەیە کەلە خواترسەو گوێڕایەڵی بەرنامەکەیەتی، وەکەسی یاخی بوو تاوانکار ئەو ڕێزو بایەخە لەدەست دەدات و وەسەرئەنجام لەپێش چاوی خەڵکی دەکەوێت و نرخ وشکۆمەندی دەدۆڕێنێت.، چونکە هەموو مرۆڤێك ڕق وقینی لەتاوان وتاوانکاری یە، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بەزاندنی سنووری خودا وخەڵکی. هەربۆیە لەپێش هەردووکیان دەکەوێت وژیانی پڕدەبێت لەناڕەحەتی دەرونی وهیوابڕاوی وسەرگەردانی کەخۆی لەخۆیدا ئازارو سزاکەیە. جا ژیانی بەم چەشنە بە بەراورد لەگەڵ چێژی تاوانکاریدا چ ماناو واتایەکی هەیە... بەلام ئارەزوو سەرخۆشی کردوون وعەقڵی لەدەست داون.

وەلە مەزنترین نیعمەتەکانی خوای گەورە بەسەر بەندەکانی یەوەبریتی یە لەوەی کە خوای گەورە ناو وپلەو بایەخی ئەو خواناسانە بەرز ڕادەگرێت هەروەکو پێغەمبەران کەچۆن شکۆمەندی کردوون تا قیامەت

ناو وبایەخ وڕێزی پاراستوون ،کەدەفەرموێت: (وَاذْكُرْ عِبَادَنَا إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ أُوْلِي الْأَيْدِي وَالْأَبْصَارِ * إِنَّا أَخْلَصْنَاهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى الدَّارِ... ص:٤٥-٤٦) واتە:یادی بەندە بەڕێزەکانمان بکەرەوە لە ابراهیم واسحاق یەعقوب کە هەموویان دەستێکی بالأیان هەبوو لە گەیاندنی ئاینی خوداو چاکە خوازی ، هەروەها بەرچاوڕوونیان هەبوو لە هەموو ڕوویەکەوە ، وەئێمە کردمان بەبەندەیەکی تایبەتی خۆمان بە هۆی سیفەتی دونیا نەویستی کە ئەویش یادەوەری ڕۆژی قیامەتە.

مەبەست لێرەدا بەرزڕاگرتن وشکۆمەندی ناوڕووداوەکانەکەلەم دونیایەدا باس دەکرێت.وەئەمە ئەو زمانی ڕاستگۆیەیە کە پێغەمبەر ابراهیم (س.خ) وەك نزایەك داوای کرد لەخوای گەورە: (وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ... الشعراء: ٨٤) واتە: پەروەردگارم با یادی خێرم لەسەر زاری بەندەکانی داهاتوو هەبێت.

هەربۆیە خوای گەورەش دەفەرموێت: (وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا... مریم:٥٠) واتە: ئێمە لەڕەحم وبەخشندەیی خۆشمان هەموویانمان بەهرەمەند کردو ئێمە زمانی خەڵکی دیندارمان هێناوەتە گۆ کەهەتا هەتایە باسی ئەوانە بە چاکی وبڵندی بکەن.

هەروەها سەبارەت بەپێغەمبەر محمدﷺ دەفەرمێت: (وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ.. الشرح:٤) واتە: ئێمە ناو وناوبانگی تۆمان بەرزو بڵند ڕاگرتووە.

جا شوێن کەوتوانی پێغەمبەریش بەئەندازەی ملکەچیان بۆ خودا بەشیان لەو بەرزی وبڵندیە بەردەکەوێت، وەیاخی بووانیش بێ بەش دەبن لەو شکۆمەندیە.

## ٤٢- تاوانکار بێ بەش دەبێت لە ناوو سیفەتە جوانەکان:

کەسی تاوانکار بێ بەش دەبێت لە ناوە جوانەکانی بڕواداران کە وەکو ڕێز لێنانێك خۆی پێ بڕازێنێتەوە، وەکو ناوەکانی (باوەڕدار، خواناس ،

چاكەخوازى ، چاكەكار ، گوێڕايەڵ ، خواپەرست ، ژير...هتد.) . وەلەبرى ئەمانە ناوە ناشيرين وقێزەونەكانى بەسەردا دەبڕێت وەك: (تاوانكار، ياخى بوو ، سەرپێچى كار ، تێكدەر ، پيس ، چڵكن ، داوێن پيس ، دز ، جەردە ، درۆزن ، دووڕوو ، بێ وەفا ، بێ متمانە ، ستەمكار...هتد.) ئەمانە ناوى فاسقەكانە: (بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ.. الحجرات:١١) واتە: ئاى كەچەند ناشرين وناشايستەيە ناو وناتۆرەى خراپ لەدواى موسڵمان بوون.

ئەم ناوو سيفاتانەى كەدەبێتە مايەى ڕەنجاندنى خواى گەورە و شادبوون بەدۆزەخ ولەكەداركردنى كەسايەتى. جائەو كەسانەتى تاوانكارن شايستەى ئەم ناوانەن.

گەر نا ئەوا شايستەى ئەو ناوە جوان وپيرۆزانە دەبوون كەمايەى ڕەزامەندى خواوەند وشادبوونە بە بەهەشت وبەرز ڕاگرتنى كەسايەتيانە. بەلاَم هيچ ڕێگرى وبەربەستێك نيە لە بەخشينى خودا. وەهيچ بەخشينێك نى يە كە خودا ڕێگرى كرد، وەهەركەسێك خودا ڕيسواوسوكايەتى پێ بكات، كێ هەيە ڕێزى پێ بدات. وەخواى گەورە چى بوێت ئەنجامى دەدات. وەك دەفەرموێت: (وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ... الحج:١٨) .

## ٤٣- تاوان كاريگەرى لە سەر ڕادەى پڕوپوختى وكەم كردنى ژيرى هەيە :

هيچ كاتێك نابينى دووكەسى ژيروعاقڵ و هۆشمەند هەبن يەكێكيان خواپەرست وئەويتريان ياخى بوبێت ، چونكە كەسى هۆشمەندو ژير هەميشە خواناس وبيرتيژو ورياو دانا هەميشە كەسانى خواناسن. هەربۆيە دەبينين قورئانى پيرۆز وتووێژ ئاراستەى مرۆڤە ژيروهۆشيارو هۆشمەندەكان دەكات، هەروەكو خواى گەورە دەفەرموێت: (وَاتَّقُونِ يَا أُولِي الأَلْبَابِ... البقرة:١٩٧) واتە: ئەى خاوەن ژيروبيرو هۆشيارەكان پارێزگارى وتەقواى من بكەن.

هەروەها دەفەرموێت: (فَاتَّقُواْ اللّـهَ يَـا أُوْلِـي الأَلْبَـابِ لَعَلَّكُـمْ تُفْلِحُـونَ... المائـدة:١٠٠) واتـە: ئـەی هۆشمەنـدان لـەخوا بترسـن وپارێزگـاربن بـۆ ئـەوەی سەرفرازو سەرکەوتووبن.

هەروەها دەفـەرموێت: (وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُـواْ الأَلْبَـابِ... البقـرة:٢٦٩) واتـە: بەڕاسـتی تـەنها خـاوەن ژیـرو بـیرو هۆشمەنـدەکان پەنـدو ئامۆژگـاری وەردەگرن لەڕاستی شتەکان دەگەن.

وەچەندەها ئایەتی تری هاوشێوەی ئەمانە.

کـەی ئەوکەسـە ژیـرو هۆشـیارە کـە تاوانکـاری دەکـات بەرامبـەر بـە پەروەردگارەکـەی ولێـی یـاخی دەبێـت. لەکاتێکـدا لـەماڵ ومـوڵکی تەواودایـە ، وەلەنازونیعمـەتی ئـەو دەخـوات ودەخواتـەوە، لـەپێش چـاوی ئـەو نـاڕەوایی ئـەنجام دەدات، وەخـۆی لـەڕەحم ومیهرەبـانی خـودا بـێ بـەش دەکـات، وەبەهەشـتی بـەرین لـەخۆی حـەرام دەکـات ، وەدیـداری خـوای مـەزن لـەخۆی قەدەغـەدەکات. ئـەبێ ئـەو کەسـە چـی عاقڵێـك بێـت کـەبۆ چـێژی چـەند سـاتێکی کـەم بەختـەوەری هەمیشـەیی وڕەزامەنـدی خـودای لەدەسـت دەدات. خـۆی لـەڕیزی پیاوچـاکان وخواناسـان وەدەردێنێـت. وەخـۆی توشـی خەشـم قینـی خـوای گـەورە دەکـات[1]. جـامرۆڤی لـەم چەشـنە لـە کەسـانی شێت ئاست نزمترن.

***<u>بـەڵام کاریگـەری تـاوان لەسـەر کـەم کردنـی ڕادەی ژیـری</u>:*** بەڕاسـتی ئـەم حاڵەتـە جێـی سەرسـوڕمانە، ئەگـەر مرۆڤ هۆشـیار بێتـەوە لـە خـەوی غەفڵـەت بەئاگابێتـەوە ئـەو سـاتە بـۆی ڕوون دەبێتـەوە کـە خـۆش گـوزەرانی وبەختـەوەری هەمیشـەیی وچـێژولەزەت لـە ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە

[1] - هەروەکو شاعـــیر دەڵێت:
ئەی نفس بۆ هەوەس ملم مەشکێنە
ڕێی ڕاستی ژینم لێ مەشێوێنـــە
بۆ خۆشی تەنها چەند ساتێکی کەم
خالقی کەونم لێ مەڕەنجێنـــە
"وەرگێر"

ویاداشـتەکەیدایە. وەمەینـەتی وئـازارو تیاچـوون لـەیاخی بـوون وسەرکەشـی دایە، چونکە مرۆڤی باوەڕدار سەرفرازی هەردوو دونیایە.

هـەروەکو بـیٚ بـاوەڕان لەخۆشـی یـەکانی ئـەم دونیـا بەشـدارەو لـە نیعمـەت وبەخششـەکانی خـودای گـەورە بـیٚ بـەش نـی یـە، حـاڵی وەك هـەموو مرۆڤیٚکـی ئاسـاییە، چ باوەڕداربیٚـت یـان بـیٚ بـاوەڕ. وەهـەروەها سـەرەڕای ئەمانـەش چـاوەڕوانی خـەلاٚت وپاداشـت و نیعمـەتی بەهەشـتی بەرینـە لـە قیامەتـدا کـە بـیٚ بـاوەڕان لیٚـی بـیٚ بەشـن.هـەروەکو خـوای گـەورە دەفـەرمویٚت: (إِن تَكُونُـواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَـأْلَمُونَ كَمَـا تَـأْلَمونَ وَتَرْجُـونَ مِـنَ اللّـهِ مَـا لاَ يَرْجُـونَ.... النسـاء:١٠٤) واتــە: ئەگــەر ئیٚــوە هەســت بەئازارومانــدووکردن بکــەن برینـداری بکـەن، ئـەوا بـیٚ بـاوەڕانیش توشـی هـەمان حاڵـەت دەبـن. بـەلاٚم ئیٚـوە بەتـەمای بەهەشـت وپاداشـتن لەلایـەن خـوای گـەورەوە، بـەلاٚم ئـەوان ئەو ئومیٚدەیان نی یە.

پـەنا بـەخودا لـەو بـیٚ عـەقلٚ ونەفامانـەی کـە دونیـا بەقیامـەت دەگۆڕنـەوە، وەهاوڕیٚیـــەتی پیٚغەمبـــەراو پیاوچـــاکان وشـــەهیدەکان دەگۆڕنـــەوە بـــە خوانەناسان وتاوانکارو نەفرەت لیٚ کراوەکان.

٤٤- تاوان دەبێتە مایەی دابڕانی بەندە لەخودای خۆی:

تاوان بەندە دادەبڕێت لەخودای گەورە. واتە هەرکاتێك خوای گەورە دەستی میهرەبانی لەبەندەکەی بەردا ئەوا هۆکارەکانی چاکە خوازی لەدەست دەدات و توشی هۆکارەکانی خراپەکاری دەبێت. جا چی چاوەڕوان دەکرێت لە ژیانی کەسێك کەهۆکا رەکانی چاکەوباشەی لێ دابڕابێت وپەیوەندی لەگەڵ خوای بالآدەستدا بچڕابێت. وەلە بازنەی سۆزو میهرەبانی وچاودێری خوای گەورەدا ترازابێت و لەبازنەی شەیتان وخراپەکاراندا گیرسابێتەوە.

وەهەندێك لە سەلەف دەڵێن: مرۆڤەکان لە نێوان خوای گەورە وشەیتانی نەفرەتیدان. جائەگەر لەخودای گەورە دابڕاو پشتی تێ کرد ،ئەوا شەیتان باوەشی بۆ دەگرێتەوە. وەئەگەر لەخوای گەورە دانەبڕاو یاخی نەبوو، ئەوا شەیتان پێی ناوێرێت.

وەخوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا... الكهف: ٥٠) واتە: ئێمە کاتێك بەفریشتەکانمان ووت: سوژدەبەرن بۆ ئادەم هەرهەموویان سوژدەیان برد، جگە لە "ابلیس" کەلە دەستەی پەری یەکان بوو بەهۆی ئەوەوە لەفەرمانی پەروەردگاری یاخی بوو. ئایا ڕەوایە کەئەو ونەوەکەی بکەنە پالپشت ویارویاوەری خۆتان لەجیاتی من، لەکاتێکدا ئەوا دوژمنی هەمیشەیی ئێوەن. ئای کە چی سەرلێشێوان وئەنجام خراپێکە بۆ ستەمکاران کەلە جیاتی خودا گوێڕایەڵی دوژمنێکی وەك شەیتان بکەن.

خوای گەورە بەزمانی حاڵ پێتان دەڵێت: ئێمە ڕێزی تایبەتیمان لەباوکتان گرتووەو پلەوپایەیمان بەرز ڕاگرتووە ولەکەسانی تر جیامان کردووەتەوە، وەفەرمانمان بە فریشتەکان کردووە سوژدەی ڕێزی بۆ بەرن ، وەهەرهەموویان گوێڕایەڵ بوونە تەنها دوژمنەکەی من وئەو نەبێت،

کەلـەفرمان وبڕیـاری مـن یـاخی بـوون. جـا پـاش ئـەم ڕووداوەو دژایـەتی یـە چـۆن ئێـوە ڕێ بـەخۆتان دەدەن گوێڕایـەڵی بکـەن وسەرپێچـی پەروەردگارەکەتان بکەن لەکاتێکدا ئەو دوژمنی من وئێوەشە؟

وە ئێـوە پشـتیوانی دەکـەن لەکاتێکـدا مـن فـەرمانم پـێ کـردوون کەسەرپێچی بکەن. جاهەر کەسێك پشتیوانی لەدوژمنی خودا بکـات ، ئـەوا ئـەو ودوژمنەکـە لـەلای خـودا وەکـو یـەکن. جاگوێڕایـەڵی خـودا بـەبێ سەرپێچـی دوژمنەکـەی نایەتـە دی، چـونکە گوێڕایـەڵی کردنـی خـودا و پشتیوانی کردنـی دوژمنەکـەی لەیـەك کاتـدا دووشـتی مەحاڵـە ئەمەلەلایـەك، وەلەلایـەکی تـرەوە ئەمـە زۆر دژوارومەحاڵـە، کـە دوژمەنەکـە لەیـەك کاتـدا دوژمنی مرۆڤ وخوداش بێت.

دوژمنایـەتی تـۆو ئـەو لـەنێوان شـەیتان ونـەوەکانی ئادەمـدا هەیـە کـە زۆر قـوڵ وگـەورە تـرە لـە دوژمنایـەتی نێـوان گـورگ ومـەڕ. ئـەوەتا خـوای گـەورە دەفـەرموێت و ئاگادارمـان دەکاتەوەکـە دوژمنـی سەرسـەختی ئێوەیـە: (وَهُـمْ لَكُـمْ عَـدُوٌّ... الكهـف:٥٠) وەئامـاژە بـە دڕنـدەیی وناپەسـەنی ئـەو دوژمنـە دەکـات کەدەفـەرمێت: (فَفَسَـقَ عَـنْ أَمْـرِ رَبِّـهِ... الكهـف:٥٠) جاهۆکـاری سەرپێچـی شـەیتان بـۆ خـوای گـەورە بـریتی بـوو لـە هاتنـە بـوونی مرۆڤـەوە. شـەیتان لەیـەك کاتـدا دوژمنـی سەرسـەختی مرۆڤـەو یـاخی بـووی خوداشـە. کـە پێویسـتە نـەوەکانی ئـادەم دژایـەتی کردنـی شـەیتان بـەکاری هەنوکـەیی ژیانیان دابنێن. جا ئیتر ئەم گوێڕایەڵی وملکەچی یە لەپای چی؟

هـەروەکو بڵێیـت لەمیانـەی ئـەم ووتەیـەدا خـوای گـەورە نەرمـە گلەییـەك ئاراسـتەی مـرۆڤ دەکـات، کـەهۆکاری بنـەڕەتی دژایـەتی کردنـی شـەیتان بـۆ مـن ڕێزنـەگرتن بـوو لـەباوکتان، کەچـی ئێـوەش سـەرەڕای ئەمـەش پـەیمانی گوێڕایەڵی ئەدەنێ وملکەچی دەکەن وئاشتەوایی لەگەڵ دەبەستن؟

## ٤٥- تاوان بەرەكەتی دین ودونیا لەدەست دەدات:

هەربۆیە دەبینین پیت وبەرەكەت لەدین ودونیا وتەمەنی یاخی بواندا نی یە ، بگرە تاوانكاریەكانیان نەمانی پیت وبەرەكەتی سەرزەویشە. خوای گەورە دەفەرمویت: (وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُواْ وَاتَّقَواْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ... أعراف:٩٦) واتە:خۆئەگەر خەڵكی شارەكان بەڕاستی باوەڕیان بهێنایەو خۆیان بپاراستایە ، ئەوا بێ گومان ئێمە دەرگای فەڕوبەرەكەتی ئاسمان وزەویمان لەسەر دەكردنەوە.

هەروەها دەفەرمویت: (وَأَن لَّوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَاهُم مَّاء غَدَقًا * لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ... الجن:١٦-١٧) واتە: جائەگەر خەڵكی ڕێگەی خواناسیان بگرتایەتەبەر ئێمە بارانی پڕبەرەكەتمان بەسەردا دەباراند تا تاقیان بكەینەوە ، وەمرۆڤ بەهۆی تاوانەوە لەڕزق بێ بەش دەبێت.

وەپێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (ان روح القدس نفث في روعي أنه لن تموت نفس حتى تستكمل رزقها فاتقوا الله وأجملوا في الطلب، فإنه لاينال ما عندالله بطاعته، وان الله جعل الروح والفرح في الرضى واليقين. وجعل الهم والحزن في الشك والسخط.) [1] واتە: گیانی پیرۆز"واتە جبریل" خزاندیە"چرپاندیە"دڵمەوە كە هیچ كەسێك نامرێت هەتا هەرچی رزق هەیە تەواوی نەكات. جاخۆتان بپارێزن ولەخودا بەجوانی بپاڕێنەوەونزابكەن ، چونكە بەملكەچی خواپەرستی نەبێت بەمرازو ئومێدتان ناگەن لەلای خوای گەورە. جا خوای گەورە ئاسایش وخۆشی وشادی لە ڕەزامەندی ودڵنیایدا كۆكردۆتەوە، وەناخۆشی وخەمناكی لە گومان وتوڕەیدا كۆكردۆتەوە.

---

[1] – ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(ابن ماجە: ٢١٤٤)گێڕاویەتیەوە لە فەرموودەی جابرﷺەوە(ابو نعیم)لە (الحلیە: ٢٧/١٠)لە فەرموودەی (أبی امامە) لە (البانی) لە (صحیح الجامع) هێناویتی دەڵێت "صحیحە".

وەپێشتر ئەم (أثر) ەمان باس کرد لەکتێبی"الزهد"دا کە (امام احمد) دەگێڕێتەوە: (خوای گەورە دەفەرمێت کەمن ڕەزامەندیم نواند ئەوا بەرەکەت داری ئەکەم، وەسنووری بەرەکەتی من کۆتایی نایەت. وەئەگەر توڕەبووم ئەوا نەفرەت دەکەم، وەنەفرەتم بەحەوت نەوەو وەچەدا دەچێتە خوارەوە) .

جا فراوانی ڕزق بەزۆری کارکردن نی یە، هەروەها تەمەن درێژی بەزۆری مانگ وساڵ نی یە، بەڵکو لەبەرەکەتەکەی دایە.

پێشتر ئەوەمکان ڕوون کردەوە کە ئەو ماوەیەی لەتەمەنی مرۆۆ کەبە ژیان دەژمێردرێت کەبە دڵ وگیان ودەرون ملکەچی وپەیوەستی و خواپەرستی تێدا بکات بۆ خوای گەورە و ئارامی وهێمنی ودڵنیایی بەدەست بهێنێت بەیادوزیکری خوای گەورە. جاجگە لەم ساتانە ئەوانی تر بەژیان ناژمێردرێت کە مرۆۆ تێیدا یاخی وسەرگەردان و سەرکەشە لەخوای گەورە دوورە لە دەرەون وبیروهۆشی دەژێت ، بەڵکو ژیانی لەژیانی ئاژەڵ کەم بایەخترە، چونکە هیچ کەسێك ژیانێك نی یە بتوانێت قەرەبووی ئەو ساتانە بکاتەوە کەلە دەستی چووە. جائەگەر میهرەبانی وسۆزو بەخشندەیی خودا لەدەست بدات کێ هەیە جێگەو قەرەبووی بکاتەوە. کێ هەیە وەك خوای میهرەبان هەمیشە زیندوو وبالآدەست بێت، تابتوانێت قەرەبووی بکاتەوە.. جاکەسێ تەنها گەردیلەیەکی بەدەست نەبێت بەچی قەرەبووی دەکاتەوە؟..

## شەیتان نەفرەت لێ کراوە

یاخی بوون سەرپێچی کردنی خودا مایەی نەمانی بەرەکەتە، چونکە شەیتان نەفرەتی یە وەمایەی نەمانی بەرەکەت، وەپاڵپشتی یاخی بووان و دۆستی سەرپێچی کەران وتاوانکارانە، جا هەرکەسێك پەیوەندی بەشەیتانەوەهەبێت، مایەی نەمانی بەرەکەت. هەر بۆیە پێویست کراوە

لەشەرعی خودا کەناوی پیرۆزی خودا بهێنرێت وەك دەست پێکی هەموو کارێك، لەخواردن وخواردنەوەو بەرگ پۆشین وسواربوون وهەستان ورۆیشتن وتەنانەت چوونە لای هاوسەریش، چونکە ناوی خودا مایەی بەرەکەتە ، وەهەر بەناوهێنانی شەیتانی نەفرەت دووردەکەوێتەوەو بەرەکەت دار بێت.

وەهەر شتێك بۆ خودا نەبێت بەرەکەت دار نی یە ، چونکە خودا خۆی سەرچاوەی بەرەکەتە، جا هەرشتێك پەیوەست بێت بەخوداوە بەرەکەت دارە. ووتەی بەرەکەتدارە ، پێغەمبەری، بەندە خواناسەکانی، مالّی پیرۆزی... هەرهەموویان پیرۆز وبەرەکەتدارن. جا هەر شتێك وکەسێك وکردارێك بۆ خودا نەبێت بێ بەرەکەتە، وەبەرەکەتداری وپیرۆزی شتەکان بەندە بەرادەی نزیکیان لەخوای گەورەوە.

***نەفرەت دژی بەرەکەتە*** : هەر زەوی وکەس وکاروئاکارێك خودای گەورە نەفرەتی لێ بکات ئەوە پیرۆزی بەرەکەتداری لەدەست دەدات. وەخوای گەورە نەفرەتی لەئیبلیس کردووە. وەهەر شتێکیش لەلایەن ئەوەوەبێت نەفرەت دارە بەپێی دوورونزیکی لەئیبلیسەوە.

جا لێرەوەیە کاریگەری تاوانکاری وسەرپێچی لەنەهێشتنی بەرەکەت لەرۆزی وتەمەن وزانست وکاردا. جا هەرکات وکارو سامان وزانستێك سەرپێچی خودای تێدا کرابێت ئەوا لەسەر خاوەنەکەی دەکەوێت بەتەمەن ناژمێررێت تەنها ئەوساتە نەبێت کەئەو شتانەی سەروەی لە پێناو ملکەچی وخواپەرستیدا بەسەر بردبێت وبەکاری هێنابێت.

جا کەسی واهەیە سەد سالّ لەم دونیایەدا ژیابێت ،بەلاّم تەمەنی ڕاستی خۆی لە دە سالّێك تێپەڕنەکات. وەهەیە خاوەنی سەروەت وسامانێکی ئێجگار زۆرە بەلاّم سامانی ڕاستەقینەی لەچەند دینارێك تێ پەڕناکات کەلە پێناو ڕەزامەندی خودا بەکاری بردبێت. هەروەها بۆ زانست وکەسایەتی و...هتد.

وەلە (ترمذي) دا هاتووە لەفەرمودەی پێغەمبەر کە دەفەرمێت: (الدنيا ملعونة ملعون ما فيها إلا ذكر الله عزوجل وما ولاه وعالم او متعلم)[1] واتە: دونیا ئەوەی تێیدایە نەفرەت لێ کراوە ، تەنها یادی خواو خواپەرستی وزانا وزانست خواز نەبێت.

هەروەها لە (أثر) دا هاتووە کە: (الدنيا ملعونة ملعون ما فيها إلا ما كان لله.)[2] واتە: دونیاو ئەوەی تێیدایە نەفرەت لێکراوە ، تەنها ئەوە نەبێت کەبۆ خودایە. کە تەنها لەمەیاندا بەرەکەت هەیە ، پشتیوانی تەنها بۆ خودایە.

---

[1] - ئەم فەرموودەیە (حسن)ە،(ترمذي. ٢٣٢٢) وە (ابن ماجە: ٤١١٢)گێڕاویانەتەوە وەبەلای "ترمدي"یەوە "حسن"ە.

[2] - ئەم فەرموودەیە (ضعيف الاسناد)ە، (ابو نعيم) لە(الحليە: ١٥٧/٣، ٩٠/٧)وە (ابن الجوری) لە(العلل المتناهليە: :٣١٢/٢) وە(الهيثمي) لە (المجمع: ٢٢٢/١٠) گێڕاویانەتەوە لە فەرموودەی (ابي درداء)وەدایانەتە پاڵ (طبراني)لە (الكبير) وە ووتویەتی جگەلە (خداش بن مهاجر) هەموو کەسەکانی تر جێگەی متمانەن.

## ٤٦- تاوان مایەی سوکی ونزمی وڕیسواییە:

خـــوای گـــەورە دوو جـــۆر خـــەڵکی بـــەدیهێناوە کەئـــەوانیش: بڵنـــدو شـــکۆمەندەکان، وەســـوك ونـــزم وڕیـــسواکان. وەشـــکۆمەندەکانی لەپلـــەی بـــەرزو بڵنـــد دا جێگرکـــردووە، وەبـــەڕێزو بایەخـــدارترین جـــۆری بەنـــدەکانێتی و ســـەربەرزی دونیـــاو قیامـــەتیان دەکـــات. وەهـــەروەها (أســـفل الـــسافلين) جێگـــەی ڕیـــسواکانە، وەســـەر شـــۆڕی کـــەم بایـــەخی وبـــێ ڕێـــزی ســـوکی دونیـــاو قیامەتیان دەکات.

هـــەروەکو لـــە (مـــسند) ی "امـــام احمـــد"دا هـــاتووە لـــە فـــەرموودەی (عبـــدالله بـــن عمـــر) کـــە پێغەمبـــەرﷺ فەرموویـــەتی: (بعثـــت بالـــسيف بـــين يـــدي الساعة،وجعـــل رزقـــي ظـــل رمحـــي ، وجعـــل الـــذي والصغار علـــى مـــن خـــالف أمـــري.) [1] واتـــە: بەشمـــشێرەوە ڕەوانـــە کـــراوم، بەهاتینیـــشم قیامـــەت نزیـــك دەبێتـــەوە، وەڕۆزی مـــن لـــەژێر ســـایەی ڕمەکەمدایـــە، وەڕیـــسوایی و کـــەم ئاستی لەسەر پێچی کردنم دایە.

جـــا هـــەرکاتێك مـــرۆڤ سەرپێـــچی یـــەك بکـــات لەپلەوپایـــەی دادەبەزێتـــە خـــوارەوە وەبـــەردەوام لەگـــەڵ سەرپێـــچی کردنـــدا پلەبەپلـــە دادەبـــەزێت تـــا دەگاتـــە نـــزمترین ئاســـت. وەبەپێـــچەوانەوە لەگـــەڵ هـــەر چـــاکەیەك پلەیـــەك بەرزوبڵنـــد دەبێـــت تادەگاتـــە بـــەرزترین ئاســـت. مرۆڤـــی واهەیـــە لـــەڕۆژانی ژیانیـــدا توشـــی بەرزبوونـــەوەو نـــزم بوونـــەوە دەبێـــت ، بـــەڵام دواتـــر لەچـــی ئاســـتێکدا خـــۆی بینیـــوە ، ئـــەوا لەوانـــە دەژمێردرێـــت. وەناکرێـــت ئەگـــەر کەسێك ســـەد پلـــە ســـەرکەوت ،بـــەڵام پلەیـــەك دابـــەزی ئـــیتر لەئاســـت نزمـــەکان دەژمێردرێت. وەهەروەها بەپێچەوانەوە.

---

[1] – ئـەم فەرموودەیـە (صـحيح)ە،(امـام ابـن رجـب الحنبلـی) لـە(الحکـم جـديرة بالاذاعـة)دا هێناویێتی وە(البانی)دەڵێت"صحيح"ە، دەیداتە پاڵ (احمد) و(ابن عساکر)و (طبراني).

## هەندێك تاوان مرۆڤ توشی دابەزینی سامناك دەكات

هەندێك جار مرۆڤ تاوانێكی ناڕەوا دەكات بەشێوەیەكی زۆر سامناكانە دادەبەزێت ونزم دەبێتەوە بۆ ئاستە زۆر نزمەكان كە دووری نێوانیان وەكو دووری نێوان ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوابێت وەهەرچەندە هەوڵ بدات بەئاسانی سەرنەكەوێتەوە.

هەروەكو لە"صحیح"دا هاتووە كە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (ان عبد ليتكلم بالكلمة الواحدة لايلقى لها بالاً يهوى بها في النار أبعد مما بين المشرق المغرب)[1]. واتە: جاری واهەیە بەندەكان"مرۆڤ" تەنها ووشەیەك ئەدركێنێ وهیچ باكی نی یە، كەچی نازانێت ئەو ووشەیە بەناخی دۆزەخدا دەیباتە خوارەوە زیاتر لەدووری نێوان ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوا.

بە چ بەرزبوونەوەیەك دەگاتەوە ئاستی جارانی؟!

## دەرون بەرزی ونزمی هەیە

دابەزین كارێكی سروشتی یە بۆ ژیانی مرۆڤ، وە دابەزینیش جۆری زۆرە. جاری واهەیەمرۆڤ تووشی دابەزین دەبێت بەهۆی بێ ئاگاییەوە ، جاهەركاتێك بەئاگاهاتەوە دەگەڕێتەوە ئاستی جارانی خۆی یان زیاتر. وەهەیە بەهۆی كارێكی موباحەوە دادەبەزێت، جاهەركاتێ گەڕایەوە سەر ملكەچی پێشووی ئەوا دەگاتە ئاستی پێشووی خۆی یان زیاتر ،یان كەمتر. وەهەر بەهۆی سەرپێچی یەوە توشی دابەزین دەبێت. جا جۆرە سەرپێچی یەكە گەورە یان بچوك بێت ،لەم كاتەدا بۆ گەڕانەوەو بەرزبوونەوەی پێویستی بەتەوبەیەكی نەصوح هەیە.

---

[1] – ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ٦٤٧٧) وە(مسلم: ١٨/١٠٩– نووی)گێڕاویانەتەوە.

## ئایا تەوبەکار دەگەڕێتەوە ئاستی پێشووی خۆی

لــەم بابەتــەدا خــەڵکی نــاکۆکن وچــەند ڕاوبۆچــونێکیان هەیــە کــەئایا تەوبــەکار دەگەڕێتــەوە بــۆ ئاســتی پێشــووی بــەوەی کــە تەوبــەکردن تاوانەکــەی دەسـڕێتەوەو سزاکەشـی لـەناو دەبـات. هـەروەکو بلێـی ئـەم کـارە لەبنەڕەتدا ڕووی نەدابێت، بەلأم ناگاتە بەپلەی جارانی خۆی.

هەنــدێك لــەزانایان دەڵــێن: بــیٚ گومــان ناگەڕێنــەوە ئاســتی پێشــووتری ، چــونکە ئەوســاتانەی لەدەســت چــووە کەتوشــی سەرپێچــی بــووە. نمونــەی وەك بازرگانێــك وایــە کەهەرچــەندە ڕۆژانــە قــازانج بکــات وبیخاتــەوە گــڕ ، کــەزیاتر پارەوقــازانج بەدەســت دەهێنێــت. جائەوکەســە قــازانجی ئەوڕۆژانــەی لەدەســت داوە کەبەسەرپێچــی کــردووە ،نێــوان ئــەم دووقازانجــە ماوەیــەکی زۆرە.

وەهەنــدێکی تــر دەڵــێن: نمونــەی ئــەم حاڵەتــە وەك دووکــەس وایــە لەپەیژەیــەکی ناکۆتــا ســەردەکەون پێکــەوە، لــەپڕدا یــەکێکیان پلەیــەك دێتــە خــوارەوە ،پاشــان دەســتی کــردەوە بەســەرکەوتن ،بــەلأم ئــەویتریان لەســەرکەوتنی خــۆی بەردەوامــە. هەربۆیــە یەکــەمیان بــەوەی دووەمیــان ناگات.

وە شــیخ الاســلام"ابــن التیمیــە" تــوانی بڕیــارێکی پەســەند لــەم ڕووەوە بــدات کــەدەڵێت: هەنــدیٚ لەتەوبــەکاران دەگاتــە بــەرزترو بڵنــدتری لەئاســتی پێشووتری ، وەهەمیشە ناگاتە ئەوئاستەی جارانی.

وەمنــیش دەڵــێم: واتــە ئەمــە بەنــدە لەســەر جــۆرو بــەهێزی وپڕوپــوختی تەوبەکردنەوەکــەوە. کەئەگــەر تەوبەکــە ڕاســت وبــەهێزو دروســت بێــت وپڕبێــت لەپەشــیمانی وگریــان لەترســی خــودا و...هتــد. ئەمانــە ئەوتەوبەکارانــە دەگەیەنێتــە بەرزتروبڵنــدتر لەپلەوئاســتی پێشــووتری. وەکــو بلێــی ئــەو تەوبەکردنــە بووەتــە مایــەی خێــرو بەرەکــەت بــۆی ،وەدەروازەیەکــە بــۆ بەخۆداچــوونەوەو ڕزگــاربوون لــە دەردە کوشــندەکانی بــیٚ ئاگــایی. وەپێــی

گەیشتبێتە دەرگای میهروسۆزو لێبوردەیی خودای میهرەبان ، وەسەری زەلیلی وبێ کەسی وبێ هێزی خۆی بەوپەڕی خۆبەکەم زانینەوە کە چی کردبێت لە لووت بەرزی وخۆبەشت زانین وجۆروئاکارە ناڕەواکانی تری پێ لەگۆڕنابێت.

جا چی بەخششێك هەیە بگاتە بە نیعمەتی بەخۆداچوونەوەو هەستکردن بە بەخشین ولێ بوردەیی خودا ، وەخۆی زۆر بەکەمتر بزانێت بەرامبەر بەو لوتف ومیهرەبانی یەی کە خودا پێی بەخشیوە. وەچی بەلایەك هەیە مەترسیدارتر بێت لەوەی کەمرۆڤ خۆی لەوە بەگەورەتر ببینێت کە پێی دراوە لەلایەن خوداوە ، سزانەدان وتۆڵەنەسەندنەوەی خودا لێی بەلێهاتووی وپایەبەرزی خۆی بداتە قەڵەم، کەچی ئەوکەسە شایەنی سزایە چیاکان بەرگەی ناگرن،نەخوازە ئەو مرۆڤە لاوازە.

هەرچەندە تاوانەکە بچوك بێت بەلام تەماشای گەورەیی ومەزنی وبالادەستی وهەیبەتی ئەو خودایە بکە کە سەرپێچی دەکەیت کە بەخشێنەری هەموو نیعمەتەکانە. بێ گومان هەموو کەسێکی باوەڕدارو بێ باوەڕ وجوامێرو نامەرد لەلایا لەنگی یە کەبەرامبەر پیاوێکی گەورەو پایەدارو دەم سپی ودەسەلاتدار هەندێ شتی ناڕەوا ئەنجام بدات لەپێش چاوی، نەخوازە ئەمە بەرامبەر بەدیهێنەری ئاسمانەکان وزەوی وخوداو پەروەردگاری جیهان ئەنجام بدەیت،جا خۆئەگەر خوای مەزن بڕیاری نەدابوایە کەڕەحمەت وسۆزی پێش تورەیی وتۆڵەسەندنەوەی دابوایە ، ئەوا ئاسمانەکان دەڕوخان بەسەر یەکدا و زەوی خاپوردەبوو لەئەنجامی سەرپێچی بەندەکاندا. خوای گەورە دەفەرمێت: (إِنَّ اللَّـهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَن تَزُولَا وَلَئِن زَالَتَا إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّن بَعْدِهِ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا... فاطر:٤١) واتە: بەڕاستی هەر خودای مەزنە کە ڕاگری ئاسمانەکان وزەوی یە وناهێڵێت بڕوخێت وبترازێت بەسەریەکتریدا، جا ئەگەر بترازایەو بڕوخایە بەسەر یەکدا ،کێ هەیە جگە لەخوای مەزن

بتوانێت ڕایانبگرێت. وەخوای گەورە بەردەوام خۆگرو ئارامگرو لێ خۆش بووە.

لێرەدا تێبینی ئەوە بکە کە خوای گەورە کۆتایی ئەم ئایەتە پیرۆزەی بە دوو ناوی هەمیشە پیرۆز وجوان هێناوەکە ئەوانیش (حَلِيمًا غَفُورًا) ە. خۆئەگەر "حلیم"ی خودا نەبوایە بەرامبەر تاوانبارن وە "غفور"نەبوایە بەرامبەر بەسەرپێچی کاران ، ئەوا ئاسمانەکان وزەوی جێگیر نەدەبوون. وەخوای گەورە باسی لەسەرئەنجامی هەندێ لەبێ بڕوایی بەندەکان دەکات کەڕەحمی خودا نەبێت چی بەسەر بونەوەردا دەهات لەدەرئەنجامی تاوانەکانیان، کەدەفەرموێت: (تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا....مريم:٩٠) واتە: لەدەرئەنجامی ئەو گوفتارەناڕەوایانەدا خەریکە ئاسمانەکان بڕوخێن و خاپوربن بەسەر یەکتردا و زەوی شەق بەرێت ورۆچێت وچیاکان وردوخاش بن.

خوای گەورە لەدەرئەنجامی تەنها تاوانێکدا "دایك وباوکمانی" لەبەهەشت وەدەرنا، وە"ئیبلیس"یش لەدەرئەنجامی تەنها سەرپێچی یەك دووچاری نەفرەتی هەتاهەتایی بوو، بەلاَم ئێمەی مل هوڕو سەرگەردان ، هەروەکو شاعیر دەڵێت:

نصل الذنوب الى الذنوب ، ونرتجي درج الجنان لدى النعيم الخالد
ولقد علمنا أخرج الأبويت من ملكوته الاعلى بذنب واحد

واتە: ئێمە تاوان گرێ دەدەین بەدەم تاوانەوە ، وەئاواتەخوازی بەهەشتی بەرین دەکەین.

وەدەشزانین باوك ودایکمان ، لەبەر تەنها تاوانێك لەبەهەشت دەرکران.

پوختەی مەبەست: مرۆڤ هەندێك جار تەوبەکردنەکەی دەبێتە مایەی خێروبەرەکەت بۆی و ئاستی بەرزتر دەکاتەوە، وەبەپێچەوانەوە جاری واهەیە تاوانەکە ئاستی دادەگرێت وناگەڕێتەوە ئاستی جارانی.

ئـــەوە ســـەبارەت بـــەتاوانكاری، بـــەلأم خوانەخواســـتە دابەزینەكـــە بـــەهۆی ناڕەوایـــەكی وەكـــو گومـــان وبـــێ بـــاوەڕی وهاوبەشـــی پەیـــداكردن بێـــت ، ئـــەوا تـــەنها بەگەڕانـــەوەو تازەكردنـــەوەی بـــاوەڕو ئیســـلامەتی نـــەبێت دەربـــازبوون وگەڕانەوەی دژوارو زەحمەت ومەحاڵە.

**٤٧- تـاوان دەبێتە مایەی زاڵ بوونی خەڵكی بەسەر بكەرەكەی دا :**

شـــەیتان بەشـــێوەیەكی بوێرانـــە زاڵ دەبێـــت بەســـەر تاوانكـــاردا كـــە ئـــەویش بەدڵـــەڕاوكێ وترســـــاندن وغـــــەمباركردن ولـــــەبیركردنی بەرژەوەندیـــــەكانی. بـــەردەوام شـــەیتان هـــانی دەدات سەرپێچـــی خـــوای گـــەورەی پـــێ بكـــات. وەهـــەروەها مرۆڤـــە شـــەیتانیەكانیش بـــەردەوام ئـــازاری دەدەن لـــە ئامـــادەبوون وئامادەنەبوونیشـــدا. تـــەنها كـــەس وكارەكـــەش زاڵ دەبێـــت بەســـەریدا بوێرانـــە ئازاری دەدەن وتەنانەت دراوسێ وئاژەڵەكانیشی.

هەنـدێك لـە سـەلەف دەڵـێن: مـن كاتێـك سەرپێچـی خـودا دەكـەم ، هەسـت بەكاردانەوەكـــــەی دەكـــــەم لـــــە ئاكـــــاری هاوســـــەرەكەم وتەنانـــــەت ئاژەڵەكانیشمدا.[1]

هـــەروەها كاربەدەســـتانیش ئەگـــەر دادپـــەروەربن بوێرانـــە یاســـای خـــودای بەســـــەردا جـــــێ بـــــەجێ دەكـــــەن. بـــــەم چەشـــــنە هـــــەموو شـــــتەكان دژی دەوەســـتنەوە. تەنانـــەت دەرونـــی ســـەركەش دەبێـــت لـــە ژێـــرئیرادەو ویســـتیدا نامێنێـــت ،ئەگـــەر بیـــەوێت بـــەرەوكاری خواپەرســـتی بگەڕێتـــەوە ئـــەوا دەرونـــی گوێڕایـــەڵی ناكـــات ویـــاخی دەبێـــت لێـــی وبەرەوهـــەڵ دێـــری دەبـــات، چـــونكە مرۆڤـــی بـــاوەڕدار لەنێوپـــەرژین وشـــورای پـــۆلاینی خـــودای گەورەدایـــەو پـــارێزراوە لەهـــەموو شـــتێ. وەكاتێـــك یـــاخی دەبێـــت لەونێوەنـــدە نامێنێـــت و چیـتر كـەس ناپارێزێـت. ئـیتر هـەموو چەتەو ڕێگرێـك فورسـەتی لـێ دەهێنێـت

---

[1] –ئەمە ووتەی(فیضل بن عیاض)ە.

، بەپێی ئەندازەی ئەو بوێریەی ئەنجامی داوە لەسەرپێچی کردنی خوای گەورەدا کەسانی تریش بوێرانە زاڵ دەبن بەسەریدا.

جا هەمیشە بەلاو مەینەتیەکان لە کێ برکێ وڕوبەڕوبوونەوەدان بەرامبەر بەچاکەکان، وەسەرکەوتن بۆ بەهێزترینیانە. وەهەروەها خوای گەورە بەرگری لەباوەڕداران دەکات وەباوەڕیش ووتەوکردارە، بەپێی بەهێزی باوەڕەکەو بەرگری لەخراپەکان زیاتر دەکات. جا خودا پشت وپەنامان بێت.

## ٤٨- تاوان دەبێتە مایەی لە دەستدانی تواناکان:

هەموو مرۆڤێك پێویستی بەناسین وزانینی هۆکارەکانی قازانج وزیانی خۆی هەیە لەژیانی ڕۆژانەیدا. وەلێهاتووترین کەس لەم بوارەدا ئەوەیە کەزانیاری تەواوی هەبێت لەسەر باشەوخراپەکانی خۆی وچواردەوری، تابەتەواوی بەشێوەیەك بەگڕیان بخات کەلە بەرژەوەندی خۆیدا بێت.

پەی بردن بەم زانیاریانەو زانستە لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە ،باشترینیان ئەوەبوو کەباسمان کرد کە بتوانێت بەرژەوەندیەکانی خۆی بپارێزێت. وەتیاچووترین وهەژارترین کەس لەبوارەدا ئەوەیەکە بەرژەوەندی خۆی نەپارێزێت وهیچ وریایی وتێگەیشتنێکی لەم بوارەدا نەبێت.

تاوان دەبێتە مایەی پەردەپۆش کردنی ئەو زانست و وریایی وتێگەیشتنە، هەر بۆیە دەبینین کەسی تاوانکار سەرقاڵی کارە لاوکی وبێ نرخەکانە و وەکارە هەنوکەییەکان پشت گوێ دەخات و نەدڵی وریایی هەیەو نە هۆش وبیری ژیردارە نەجەستەی گوڕوتین وهێزی هەیە تا بەئاگای بهێنێتەوە. واتە هەر هەموو ئەندامەکانی جەستەی خۆی ناپاکی لێ دەکات و وەك کەسێکی دوژمندار وایە لەکاتێ کە دوژمن هێرشی کوشتنی بۆ دێنێت و پەلاماری شیرەکە "شمشێرەکەی" دەدات ، بەلام

نایەتــە دەســتی یــەوەو ژەنــگ گرتوویــەتی وخیانــەتی لــیّ دەکــات وتوشــی مەترسـی کوشـتنی دەبێتـەوە. بەهــەمان شـێوە دڵ ژەنــگ دەگرێـت وتوشــی نەخۆشـی دەبێـت وهێـزی لـیّ دەبڕێـت. وەلـەکاتی ڕووبەڕووبوونـەوەی لەگـەڵ دوژمنـدا دڵـی هـیچ خـرۆش وپاڵنـەرێکی "غیرەتـی"تێـدا نـی یـە تـا هانـدەرو پاڵنــەری دەســت وبازووەکــان بێــت وبــەرەنگاری دوژمــن ببێتــەوە، چــونکە بنــەڕەتی جەنگانـدن وبەرەنگاربوونـەوەی مـرۆڤ لـەخودی دڵ دایـە نـەك بـازوو. کــەمرۆڤ غیرەتــی لەدەســت دا چــیتر بــازوو وچــەك هــیچ ڕۆڵێکــی کاریگــەر نابینن.

هـــەروەها دەرونـــیش بـــەتاوان توشـــی گەنـــدەیی وپیســـی دەبێـــت. لــەدەرونێکی دڵنیــایی و ئــارامی یــەوە بــەرەو دەرونێکــی خراپــەکار هــەنگاو دەنێــت، وەپشــت ئەســتور دەبێــت بــەتاوانکاری و چــیتر ئــارامی و دڵنیــایی ڕووناکاتـــە دەرونـــی ودەرونـــی دەمرێـــت چ لـــەدونیاو بـــەرزەخ وقیامەتیشـــدا، واتە سودی لیّ نابینێت.

پوختـــەی مەبەســـت: هـــەرکاتێك مـــرۆڤ کەوتـــە حاڵـــەتی نارەحـــەتی وبـــەڵای بەســـەردا هـــات ، ئـــەوا ئەندامـــەکانی جەســـتەی ناپـــاکی لەگەڵـــدا دەکـــەن ودڵـــی نایەتـە ژێـر بـاری پشـت بەسـتن بـەخوداو گەڕانـەوە بـۆ لای ونوانـدنی ئەوپـەڕی شـێوازی بەندایـەتی، وەزمـانی گۆناکـات ویـادی خـودا بکـات و وەهەماهـەنگی نابێـت لەگـەڵ دڵیـدا. وەئەگـەر یادیشـی بکاتـەوە تـەنها بەزمانـەو بـەس هـیچ کاریگەریـەك لەسـەر دڵ دروسـت ناکـات ، چـونکە پێشـتر لەسـەر ئـەم کـارە ڕانـەهێنراون وژەنگـی تاوانکـاری لـیّ داوون ولـەکاری خسـتوون، وەك کەسـێك وایـــە چـــەند ســـەربازێك بیپارێزێـــت لـــەدوژمن ،بـــەڵام لـــەکاتی هێرشـــەکەدا کەسیان ئامادە نین پارێزگاری لیّ بکەن.

## تاوان ڕێگرە لەکۆتا خێری

لەهەموو شتێك سامناكترو مەترسیدارتر ئەویە كە مرۆڤ لەسەرەمەرگ وكاتی گیان كێشانی دا زمانی گۆنەكات و شایەتمانی بۆنەیەت ونەتوانێت شەهادەت بڵێت. كەدیمەنی لەم جۆرە زۆر بینراوەلە خەڵكی.

تەنانەت لەسەرە مەرگدا بەهەندێك كەس ووتراوە شەهادەت بێنەو بڵێ (لا إلـه إلا الله) ووتویەتی: "ئـاه...ئـاه... نـاتوانم". وەهەندێكی تر لەبری ووتنی (لا إلـه إلا الله) ووتویەتی[1]: (شـاه،روخ. لێتم بردەوە) یەكسەر گیانی دەرچووە. وەیەزكێكی تر ووتویەتی بڵێ: (لا إلـه إلا الله) ئەویش ووتویەتی: (یـا رب قائلـة یومـاً، وقـد تعبـت كیـف الطریـق الى حمـام منجـاب؟) واتەخودایە كچێك ڕۆژێك ووتی: ئەرێ زۆر ماندوو بووم ،ڕێگەی حەمامی منجاب لەكوێ یە؟

پاشان گیانی دەرچووە.

وەبەیەكێكی تر ووتویانە بڵێ (لا إلـه إلا الله) لەبری ئەوە گۆرانی ووتوەو تاتنا وتنتنا، پاشان گیانی دەرچووە. وەبەكەسێكی تر ووتویان بڵێ (لا إلـه إلا الله) ئەویش ووتویەتی: جا چ سودێكی هەیە ووتنی ئێستاكە من هەرچی تاوان هەبێت كردوومە، نەیتوانیوە بیڵێ.

وەیەكێكی تر لەوساتانەدا دەڵێت: چ سودێكی هەیە بیرم نایەت تاكە نوێژێكم بۆ خودا كردبێت، نەیتووەو مردووە.وەبەكەسێكی تر كەپێیان ووت ئەو ووتی من كافرم وبەوەی تۆ دەیڵێت مرد.

وەكەسێكی تر هەرچەندە هەوڵی دەدات دەیووت زمانم بەستراوە. بۆیان گێڕامەوە كەیەكێك لەسواڵكەرەكان لەسەرەمەرگیدا لەبری (لا إلـه إلا الله) دەیووت: توخوا دینارێك..توخوا دینارێك، پاشان مرد.

---

[1] -ئەم دوو ووشەیە ناوی ناوی دوو بەردو داشی یاری شەترەنج ودامەن.

وەهەنـــدێك لەبازرگانـــەكان پێیـــان ڕاگەیانـــدم كەیـــەكێ لەبازرگانـــەكان لەســـەرەمەرگدا بـــوو، ئـــەوانیش پێیـــان ووت: بڵـــێ"لا إلــه إلا الله" كەچـــی ئـــەو دەیـــووت: ئـــەم پارچـــە قوماشـــە زۆر هەرزانـــە ، ئەمـــە كڕیـــارێكی زۆر باشە...هتد ، هەتا گیانی دەرچوو.

ســبحان الله... خــەڵكی چــەندین دیمــەنی لــەم شـێوانەیان بینیـوە وپەنـدی لــێ وەرنــاگرن، جانەگــەر مرۆڤێـك لەپــەڕی توانـاو هێزوهۆشـدا بێـت شـەیتان زاڵ بووبێـــت بەســـەریداو سەرپێچـــی خـــودای پـــێ كردبێـــت ولەتاوانكاریـــدا ڕۆچـووبێت ، ئـەی ئـەبێت لەحاڵـەتی بـێ هێـزی وپەككـەوتنی پـەل وپـۆو ئەندامــەكانی و نەخۆشـی جەسـتەیی داوەشـانبێت، وەلـە سـەرەمەرگدا بێـت شـەیتان چـی پـێ بكـات؟ بـێ گومـان شـەیتان بەهـەموو هێزێكـی یـەوە هـەوڵی ئــەوەدەدات كەئــەم هەلــە زێڕینـــەی لەدەســـت بـــدات كەهـــەلی شـــەیتانە لەســـەرەمەرگدا. وەلەوســـاتانەدا ئـــەو مرۆڤـــە لـــە بـــێ هێزتـــرین كاتدایـــە و وەشەیتانیش لەوپەڕی بەهێزی دایە.

جا لێرەدا خوای گـەورە دەفـەرمێت: (يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُـواْ بِـالْقَوْلِ الثَّابِـتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللّـهُ الظَّـالِمِينَ وَيَفْعَـلُ اللّـهُ مَـا يَشَـاء.... ابـراهيم:٢٧) واتـە:خـوای گـەورە بـاوەڕداران پایـەدار دەكـات لەسـەر گوفتـاری بـەجێ ودروسـت لـەژیانی دونیـادا، وەلەسـەرەمەرگ وقیامەتیشـدا "بـاوەڕی دامـەزراو فریایـان دەكـەوێت"و گوفتاریـان ڕێـك وپێـك دامـەزراودەبێت بـەباوەڕەوە دەمـرن ، وەسـتەمكارانیش گـومڕا دەكـات وەئـەوەی خـوای گەورە هەرچی یەكی بیەوێت دەیكات.

جـا چـۆن خـوای گـەورە كۆتـایی ژیـانی سـتەمكارو خوانـەناس وتاوانكـاری چـڵێس خـۆش بـەخت دەكـات؟! كەلـەم دونیـادا بەرامبـەر بـە بەرنامەكـەی لـوت بـەرزو خۆبـەزل زان بـووەو دیـل وبەنـدەی حـەزو ئارەزووەكـانی بووەویـادی خـودا بەزمانیـدا نـەهاتووە وبـەردەوام سەرپێچـی خودایـان كـردووە. وەك بڵێـی پـەیمان نامـەی لـێ خـۆش بوونیـان بـۆ ئامـادەكراوە

لەسەرەمەرگدا، کەچی باوەڕدارو خواناسەکان زەندقیان چووە لەترسی مەینەتی یەکانی سەرەمەرگدا. (أَمْ لَكُمْ أَيْمَانٌ عَلَيْنَا بَالِغَةٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ * سَلْهُم أَيُّهُم بِذَلِكَ زَعِيمٌ.... القلم: ٤٠-٤١) واتە: یان سوێندتان لەسەرمانە کە ڕۆژی قیامەت هەرچیتان بوێت ئەوە دەبێت، پرسیاریان لێ بکەن بزانە کامیان زامنی ئەو کارەیە.

یاخود هەروەکو ووتراوە:

یاآمنا مع قبح الفعل منه أهل
اتاك توقية أمنٍ انت تملكه؟
جمعت شيئين: أمنا ، واتباع هوى
هذا ، واحداهما في المرء تهلكه
والمحسنون على درب المخاوف قد
ساروا ، وذلك درب لعت سالكه
فرطت في الزرع وقت البزر من سفهٍ
فكيف عند حصاد الناس تدركه
هذا ،واعجب شيءٍ فيك زهدك في
دار البقاء بعيش سوف تتركه
من السفينه إذا بالله؟انت ام الـ
ـ مغبون في البيع غبناً من تدركه

واتە:

ئەی ئەو کەسەی خۆت بەئەمین دەزانی لەگەڵ ئەوەی ڕەفتارت ناشیرینە...

ئایا پارێزەرێکت بۆ هاتووە کە بتپارێزێت یان خۆت هەتە؟
دوو شتت کۆکردۆتەوە ئەمینی وبێ باکی لەگەڵ ئارەزووبازی...
کەبوونی هەریەکێکیان لەهەرکەسێکدا بەهیلاکی دەبات
چاکەکاران لەسەر ڕێگای مەترسیدا هەنگاویان نا....

ئەو ڕێگایە بوو کەتۆ نەت گرتە بەر
زیادەڕەویت کرد لەچاندنی تۆو بەنەفامی....
جا چۆن لەکاتی دروێنەی خەڵکی پیادەگەیت؟
ئەوەی جێی سەرسوڕمانە لەگەڵ ئەمانەشدا تۆ بەچاوی کەم...
دەڕوانیتە ماڵی کۆتایی لەپێناو ژیانێك کەجێی دەهێڵیت
جا توخوا کێ نەفامە؟ تۆ یان ئەوەی لەمامەڵەدا...
زەرەرێ دەکات ، دڵنیابە ڕۆژێ پێی دەگەیت

## ٤٩- تاوان بینایی دڵ کوێر دەکات یاخود لاوازی دەکات؛[1]

بێ گومان دڵ بینایی تایبەتی خۆی هەیە، پێشتریش باسی ئەوەمان کرد کەتاوان بینایی دڵ لاواز دەکات ، بەڵام ئەگەر بەیەکجاری کوێری بکات ، ئەوا بۆ دواجار هیدایەت نابینێت وشاڕێگای ڕاستی بەیەکجاری وون دەکات.

کەماڵی مرۆڤایەتی لەسەر دووبنەما بەندە کەئەویش:_

١- ناسینی حەق وڕاستی یە.
٢- هەڵبژاردنی ئەو حەقە.

ڕێزوپلەوپایەی مرۆڤەکان لەدونیاو قیامەتدا بەندەلەسەر ڕادەی پەیوەست بوونیان وڕادەی مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئەم دووبنەمایەدا.

وەهەربوونی ئەم دووبنەمایە بووەتە مایەی وەسفی پێغەمبەران لەلایەن خوای گەورەوە کە دەفەرمێت: (وَاذْكُرْ عِبَادَنَا إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ أُوْلِي الْأَيْدِي وَالْأَبْصَارِ... ص:٤٥) واتە: باس ویادی بەندە بەڕێزەکانمان بکە" ابراهیم وئیسحاق ویەعقوب" کەدەستێکی باڵایان هەبوو لە حەق وحەق ویستی و بەرچاوڕوونیو شارەزاییەکی تەواویان هەبوو لە هەموو ڕوویەکەوە.

---

[1] -بڕوانە خاڵەکانی: ١-١٩-٣٦

برگـەی (الْأَيْــدِي) کەلـە ئایەتـە پیرۆزەکـەدا بـە واتـای هێـز دێـت لـە جـێ بـەجێ کـردن وگەیانـدنی حـەق وحـەق ویسـتیدا ، وەبرگـەی" وَالْأَبْصَـــارِ " بـەواتای بەرچـاو ڕوونـی و بینـایی تـەواو لەئاینـدا. کەواتـە وەسـف وپێناسـەی کـردوون بەکـەماڵی ناسـینی حـەق وکـەماڵی جـێ بـەجێ کردنـی حـەق ویسـتی، بەلاّم خەڵکی لەم بوارەدا دابەش بوونە بەچوار بەشەوە:_

بەشـی یەکـەم: ئـەوەبوو کـەباسمان کـرد لەپێغەمبـەران کەبـەڕێزترین وجوامێرترین دروست کراوەکانی خوای گەورەن.

بەشـی دووەم: بـە پێچـەوانەی بەشـی یەکەمـەوەن کـە هـیچ بیناییـەك وبەرچـاوڕوونیەکیان نـی یـە لـەئایین وحـەق وجـێ بـەجێ کردنـی حەقـدا. کەئەمانـە زۆرینـەی زۆری گـێلن، ئەوانـەن کەبەرچـاویان برسـی وتـەنگ وژێرتەسـك وبیرکـورت وبـێ هۆشـن ، جگـە لەڕیسـوایی هیچـیان لـێ بەرهـەم نایەت.

بەشـی سـێیەم: ئـەم بەشـە بیناییـان حـەق وڕاسـتی دەبینێـت ،بـەلاّم زۆر بـێ هێـزو بـێ دەسـەلاّتن نـاتوانن پشـتگیری بکـەن وبانگەشـەی بۆبکـەن وجـێ بـەجێی بکـەن ،بـەڵکو بـەباوەڕداری بـێ هێـز نـاودەبرێن، کـەخێر وباشـەیان کەمترە لەچاو باوەڕدارە بەهێزەکان.

بەشـی چـوارەم: ئـەم بەشـە هێزودەسـەلاّت وتواناییـان زۆرە وەبـەهێزن وهیمـەت بـەرزن، بـەلاّم بیناییـان زۆر کـورت بـێن وسسـتە کـە نـاتوانن حـەق وڕاسـتی لـە ناحـەق جیابکەنـەوە، وەدۆسـتانی خـودا جیابکەنـەوە لەدۆسـتانی شـەیتان. کـەزۆر جـار هـەموو ڕەنگێکـی ڕەش بـەخورما دەزانـن وهـەموو سـپی یەك بەهێلکەو چارەسەر بەژەهر و ژەهریش بەچارەسەر...

ئـەم پێـرە بـەهیچ شـێوەیەك بـۆ پێشـەوایەتی کردنـی ئاینـداران وبـڕواداران دەسـت نـادەن، بـەڵکو پێشـەوایەتی تایبەتـە بەبەشـی یەکەمـەوە کـەخوای گـەورە دەفـەرمێت: (وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَـبَرُوا وَكَـانُوا بِآيَاتِنَـا يُوقِنُــونَ.... الســـجدة:٢٤) واتـە: ئێمـە ئـەوانمان کـردووە بـە پێشـەوایانی

خەڵكی وبە ڕێنماییەكانی ئێمە كاردەكەن ، چونكە ئارامگر بوون وبڕوای تەواویان هەبوو بە ئایەتەكانمان.

خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاماژە بۆ دوو هۆكاری سەرەكی دەكات وەك مەرجێك بۆ پێشەوایەتی ، كەئەویش (صبر–ئارامگری ، یقین– بڕوای تەواوبوون) كەخوای گەورە ئەم پێرەی پێ بەهرەدار ورێزدار كردووە لەبەشەكانی تر.

**بۆچی خودا سوێند بەكات دەخوات؟**

خودای گەورە كات وزەمەن هەڵدەبژێرێت وسوێندی پێ دەخوات ، چونكە كات مەودای هەوڵ وكۆششی سەربەرزان ودۆڕاوەكانە. كەدەفەرمێت: (وَالْعَصْرِ * إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ * إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ.... العصر:١-٢-٣) واتە: سوێند بێت بەكات * بەبەردەوامی مرۆڤ لەخەسارەت مەندی دایە* تەنها ئەوكسانە نەبێت كە باوەڕیان هێناوەو كردەوەی چاك ئەنجام دەدەن وحەق دەناسن پشتگیری دەكەن وبانگەشەی بۆدەكەن وئارمگرن لەسەر بەجێ گەیاندنی.

لێرەدا تەنها ناسینی حەق مەبەست نی یە، بەڵكو گەیاندن وپشتگیری كردن وبانگەشە بۆ كردن ورێنمایی بۆ كردن مەبەستە.

جا جگە لەم پێرە هەموو پێرێكی تر دۆڕاوو خەسارەمەندن. ئاشكرایە كەتاوان و سەرپێچی بینایی دڵ لاواز دەكات حەق وڕاستی بەپێی پێویست ناناسێت ، وەلە هەمان كاتدا هیمەتی بێ هێز دەبێت وئارامگرنابێت لە پێناویدا. بەڵكو زۆرجا ژەنگی تاوان پێوەرەكانی دڵ دەگۆڕێت ناحەق بەحەق و خراپە بەچاكە دەداتە قەڵەم ،ڕێگەی خودا ون دەكات و ڕێگەی نەفامی هەڵدەبژێرێت و دونیا پەرستی بەڕاست وحەق دەزانێت، وەلە ڕاستی وحەق ویستی ئایەتەكانی خودا بێ ئاگادەبێت. جا تەنها ئەمە

بەسـە لـە کاریگەریـە خراپـەکانی تـاوان تـا دەسـت بـەرداری بـین و خۆمـانی لـێ دەرباز بکەین.

## ٥٠- تاوان شەیتان لەدڵدا جێنشین دەکات:

تـاوان ڕێ خۆشـکەرە بـۆ شـەیتان تـا بتوانێـت جێگـەی لـە دڵـی تاوانکـاردا بکاتـەوە وهێلانـەو مۆڵگـەی خـۆی تێـدا دابمـەزرێنێت وە هەنگاوێکـە بـۆ گـومڕاکردنی یـەکجاری. بەپێچـەوانەوە ملکەچـی وگوێڕایـەڵی و خـودا پەرسـتی دڵ ڕوونـاك وڕۆشـن دەکاتـەوە ودەیڕازێنێتـەوە وەك ئاوێنـەی سـاف بریقـەداری دەکـات و پڕدەبێـت لەیـەك پارچـە نـور وڕوونـاکی. کـە زۆرجـار شـەیتان لـەم جـۆرە دڵانـە هەڵـدێت وڕادەکـات ، چـونکە بەرگـەی تیشـك وڕوونـاکی یەکـەی ناگرێـت. هـەروەك هـەڵهاتنی گـورگ لەترسـی شـێری نێـو بێشەدا.

کـە ڕوونـاکی تیشـکی بـەر شـەیتان بکـەوێت ڕاسـتەوخۆ دەیبورێنێتـەوە ، دواتـر کەشـەیتانەکانی تـر لێـی کۆدەبنـەوە دەپرسـن چـی یـەتی؟ دەڵـێن: ئادەمیزاد پێکایەتی، یان بەرچاوی ئادەمیزاد کەوتووە.

فیا نظرة من قلب حر منور      یكاد لها الشیطان بالنور یُحرق

واتـە: ئـای لـەڕووناکی دڵـی ئـازاد      کـە خەریکـە لەڕووناکیـدا شـەیتانەکان بسوتێنێت.

ئایـا ئـەم دڵـەو دڵێکـی کرمـاوی و مۆڵگـەی شـەیتان زاڵبـوو بەسـەریدا وجـێ بـەجێ کـەری حـەز وئارەزووەکـانی وەك یـەکن؟ کـە هەمیشـە هـاوەڵێکی خراپـەکاری لەگەڵدایـە بـۆ سـەرلێ شـێواندنی. خـوای گـەورە دەفـەرمێت: (وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ * وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ * حَتَّى إِذَا جَاءَنَا قَالَ يَا لَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ الْقَرِينُ * وَلَن يَنفَعَكُمُ الْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ.... الزخرف:٣٦-٣٩) واتـە: کەسێك خـۆی کـوێر بکـات لەئاسـتی

قورئـان و يـادی خـودای میهرەبـان ، ئـەوا ئێمـە شـەیتانێك دەكەینـە ملـۆزمی و"هـاوەڵی خـراپ" هەمیشـە دەبێتـە یارویـاوەری لەگەڵیـدا دەبێـت ،بـیٚ گومـان ئەوشـەیتانە ڕێگـەی ڕاسـتییان لـیٚ دەشـێوێنێت و دەیانخاتـە سـەر ڕێگـەی خراپـەكاری كەچـی وادەزانـن لەسـەر ڕێگـەی چـاكەن تـا ڕۆژی قیامـەت هـەموو شـتێك ڕوون دەبێتـەوەو وەلـە كـاتی لێپرسـینەوەدا بەشـەیتانەكەی دەڵێـت: خۆزگـە نێـوانی مـن وتـۆ بەقـەدەر ڕۆژهـەڵات ورۆژئـاوا لەیـەك دوور بووینایـە.. ئـای كـە چ هـاوەڵێكی خـراپ ونالـەباری ، ئـەمڕۆ ئـەو قسـەوگلەیی وگازندەیانـە بـیٚ سـوودن، چـونكە ئێـوە كـاتی خـۆی سـتەمتان لـە خۆتـان ولـە خـەڵكیش كردووە ،بیٚ گومان هەردوولاتان لە لەسزاو ئازاردا بەشدارن لە دۆزەخدا.

خـوای گـەورە لـەم چـەند ئایەتـە پـیرۆزەدا ئامـاژە بـەوە دەكـات كـە هەركەسـێك پشـت هـەڵ بكـات لـە بەرنامـەی خـودا وپێغەمبەرەكـەی و دژایـەتیان بكـات وهـەوڵی تێگەیشـتن وخواناسـین نـەدات ئـەوە گـیرۆدەی شـەیتانێكی خـراپ خـوازی دەكـەین كەهەمیشـە ڕیٚ نیشـاندەری دەبێـت لەخراپەكاریدا.

وەهـەروەها خـاڵێكی گـرنگ دەسـت نیشـان دەكـات كـە بـریتی یـە لـەوەی كاتێـك ئـەو مرۆڤـە سـەرگەردانە كـە ڕێگـای ڕاسـتی وون كـردووە، ئەوەنـدەی تـر شـەیتانەكە گـومڕای دەكـات بەشـێوازێك كەهەرچـی ڕێگـای خراپـە وخراپـە خـوازی هەیـە لـەلای ئـەو بـەكاروكردەوە وڕێگـەی چـاكە خـوازی دەیداتـە قەڵـەم واتـە یـەك بـۆ یـەكتری تەواوكـەری خراپەكاریـەكانن هەربۆیـە سـاتیٚ لەقیامەتـدا بەڕاسـتی كارەكانیـان دەگـەن هەریەكـە نـەفرین لـەوی تـر دەكـات وە هیواخوازی یەكتر نەناسینن وەدووری لەیەكتر دەخوازن.

هەرچـەندە سروشـتی ژیـان وایـە گـەر یـەكێك لـە بـەلاٚو نارەحەتیـەك هاوبەشـت بێـت ،بـیٚ گومـان دەبێتـە مایـەی سـوك كردنـی خـەم وپەژارەكـە لەسـەر دڵ ودەرونـت. هـەروەكو (خنسـاء) لـە بـارەی كـوژرانی براكەیـەوە دەڵێت:

فلولا كثرة الباكين حولـــي على أخوانهم لقتلت نفسي

وما يبكون مثل أخي ، ولكن أعزي النفس عنه بالتأسي

واتـــه: ئەگـــەر زۆری شـــیوەن کـــاران نەبوونایـــە لـــە چـــواردەورم کـــە بـــۆ براکانیان دەگرین ئەوا من لە هەژمەتا خۆم دەکوشت.

هەرچـەندە کەسـی وەك براکـەمی تێـدا نـەبووە کوژراوەکـان ، بـەلام بـۆمن باروخەم سوکی یە بینینی ئەوان کە دەگرین.

بـــەلام لەقیامەتـــدا خـــوای گـــەورە ئـــەم سروشـــتە دەگۆرێـــت وەك لەئایەتەکـەدا ئامـاژەی بـۆ کـراوە ، بگـرە بوونیـان پێکـەوە لـە سـزادا هـیچ بـار سـوکی یـەك بـۆ هـیچ لایـەکیان دروسـت ناکـات.خـوای گـەورە ئـەو بـار سـوکی یـەی لەسـەر لابـردوون وئـەو سروشـتەی لاگۆڕیـوون وەك دەفـەرمێت: ولـن يـنفعكمْ اليـوم إذ ظلمـتم أنكـمْ في الْعـذابِ مُشـتركون الزخـرف: ٣٩) واتـــە: بـوونی هـەردوولاتان لەسـزادا هـیچ بارسـوکیەك پەیدا ناکـات بـۆ ئـەوی ترتـان چونکە ئێوە ستەمکار بوون.

٥١- تاوان وسەرپێچی لە چەکە بەهێزەکانی شەیتانە:

یەکێکی تر لەکاریگەریە خراپەکانی تاوان وتاوانکاری بریتی یە لەوەی کەتۆ هەمیشە دوژمنەکەت چەکدار دەکەیت و کار ئاسانی بۆ دەکەیت تا بەباشترین شێواز لە دژی خۆت بجەنگێت.

دوژمنێك کە هەمیشە لەگەڵتدایە ، تەنانەت بە ئەندازەی چاو پروکانێك لێت بێ ئاگا نابێت. بەردەوام دەت بینێ کەچی تۆ ئەو نابینی و هەموو جۆرە تەڵەو پیلان وفێڵێك لە دژت بەکاردەهێنێت. بەردەوام شەیتانی گەورە بانگیان دەکات وهانیان دەدات و پێیان دەڵێت:دوژمنەکەتان دوژمنەکەی باوکتان کە مرۆڤە. نەهێڵن لەدەستتان ڕزگاری ببێت کە بەهۆیانەوە ئێمەی شەیتان توشی نەفرەت ودەربەدەری بووین. مۆڵەت نەدەن ئەوان بچنە بەهەشت و خۆتانیش بۆ دۆزەخ. ئەوان بەر ڕەحمەت کەون وئێمەش بەر نەفرەت. وەك ئێمە بێ بەش بووین لەبەهەشت وناتوانین لەگەڵیاندا بەشداربین ، بائەوان لەگەڵماندا بەشداربن لە دۆزەخ..

جا خوای گەورە ئەم دوژمنە سەرسەختەی پێ ناساندووین فەرمانی پێ کردووین کە خۆمان ئامادە کەین لەدژیان. کاتێك خوای گەورە ئادەم ونەوەکەی بینی توشی سەرسەخترین دوژمن بوونە ، هۆکارو چەك و پێداویستی ئەو جەنگەی بەهەردولا بەخشی و بانگەشەی جیهادوبازاڕی جەنگ و شەڕی کرد لەسەر زەوی لەماوەی تەمەندا ، وەماڵ ودەرونی لە باوەڕداران کڕی کە بجەنگێن تێ بکۆشن وکوشتار بکەن لەبەرامبەر خەڵاتی بەهەشتی بەرین.

وەئەمەی بەبەڵێن وپەیمان باس کردووە لە کتێبە پیرۆزەکاندا کە "تەورات وئینجیل وقورئانە". جاهەر کەسێك دەیەوێت ئەو گرێ بەستە مۆر بکات با تەماشای کڕیارو خەڵاتەکە بکات وەچ بازرگانیەك وچ قازانجێکە؟ کە دەفەرمێت: ﴿تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ * يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ

وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّات تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ * وَأُخْرَى تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ مِّنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ.... الصف:١٠-١٣) واته: ئەی باوەڕداران دەست نیشانی بازرگانیەکتان بۆ بکەم کەلە سزایەکی بەئێش ڕزگارتان بکات ، سەرەتا باوەڕ بهێنن بەخوای گەورە و پێغەمبەرەکەی وەتێ بکۆشن لەپێناوی ئەم ڕاستی یەدا بە ماڵ وسامان وبەخت کردنی جەستەو گیانتان"واتە: ماندووکردنی جەستەوبیروهۆش تا دەگاتە گیان بەخت کردن" بێ گومان ئەم کارە چاکتر وبەفرتره بۆتان ئەگەر بزانن وتێ بگەن، ئەوسا خوای گەورە لەبری ئەمانە لەتاوانەکانتان خۆش دەبێت وبەهەشتی بەرین وپڕشادی وخۆشیتان پێ دەبەخشێت کە ڕووبارەکان بەژێرکۆشك وتەلارو دەرخت وباخەکانتاندا تێ دەپەڕێت، بەڕاستی ئەمەیە سەرکەوتن وسەرفرازی دواتر ئەوەی کە ئێوە زۆر حەزی پێ دەکەن پێتان دەبەخشێت کە سەرکەوتنە بەسەر دوژمنەکانتان وکردنەوەی وڵات ودڵەکانە ، وەئەم مژدەیە بدە بە بڕواداران لە هەموو سەردەمێکدا بەمەرجێ ئەوان بۆ خودا یەکلابن.

خوای گەورە بەم جەنگە ویستی ئەوە بووە کە ڕێزوپلەوپایەی باشترین دروستکراوەکانی بنرخێنێت پایەداریان بکات، ئەویش بە پێدانی بەیداخ وئالای تێ کۆشان لەدژی خراپەکاری. دڵی ئادەمیزاد کە چەقی خۆشویستنی خوداو خواپەرستی یە ڕۆڵی گرنگ دەبینێت لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەدا. وەکۆمەکی کردووە بەسەربازەکانی خۆی کە فریشتەکانن کە هەمیشە وەك گارد پاسەوانی دەکەن.کەدەفەرمێت: (لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ.... الرعد: ١١) واتە: فریشتە بێ شومارەکانی خودا بەنۆرە بەدوای یەکدادێن تا چاودێری ئادەمیزاد بکەن لەبەرو پشت وهەموو لایەکەوە بیپارێزن بەفەرمانی خودا.

شەفت بەشەفت نۆرە دەکەن و چەسپاوی دەبەخشن بەباوەڕداران وهاندەری چاکەن بە زمانی حاڵ بە ئادەمیزاد دەڵێن: کاتژمێرێك ئارامگر

بـــەتا بەختـــەوەری هەتاهـــەتایی بەدەســـت بهێنیـــت. هـــەروەها خـــوای گـــەورە جگـە لەمانـە هــەر هــەمووی پشــتیوانی تــەواویان دەكـات لــەم جەنگــەدا ئــەویش بەرەوانــە كردنــی پێغەمبــەران وكتێــب بۆیــان تــا پاڵپشـــت وپشـــت گـــیری باوەڕداران بن.

جگەلــە هــەموو ئەمانــە خــوای گــەورە بــە عــەقڵ وژیــری مرۆڤــی بەهرەمەنــد كــردووە ، بەزانســـت وشـــیاری كردۆتـــەوە بـــەباوەڕ چەســـپاندویەتی بـــەڕێنمای ڕاســت و هەڵــەی بــۆ ئاشــكرا كــردووە. گــەر ورد بینــەوە دەبیــنین خــوای گــەورە بەهـــەموو چەشـــنێك پشـــتگیری وهاوكـــاری مرۆڤـــەكان دەكـــات لـــەم جەنگـــەدا دەبینین:

ژیری وعەقڵ: سەركردایەتی سوپادەكەن

زانســـت ومەعریفـــە: هۆكارەكـــانی جـــەنگ وپێداویســـتی یـــەكانی دابـــین دەكات.

باوەڕ: بەهێزو خۆڕاگری دەكـات.

دڵنیایی: هەڵمەتەكانی بۆ ساز دەكات دژی دوژمنەكەی.

چاوەكان دەزگای بینین وپشكنینێتی.

گوێیەكان: دەزگای هەواڵگری یەتی.

زمان: دەزگای وەرگێڕان وڕادەربڕێنێتی.

دەستەكان وپێیەكان:دەزگای جێ بەجێ كردن وهەوڵەكانێتی.

ســـەرەڕا ی ئەمانـــەش فریشـــتە نزیكـــەكانی خـــودای گـــەورە هـــەڵگرانی عەرشـــی مـــەزن، بەشـــێوازی پشـــتگیری مەعنـــەوی دەكـــەن ودەپاڕێنـــەوە كـــە خوایە سەریان خەیت و لەتاوان بیانپارێزیت وبە بەهەشتیان شادكەیت.

وەخــوای گــەورەش خــودی پــیرۆزی خــۆی بــەرگری لــەباوەڕداران دەكــات بـــەپێرو حیزبـــی خـــۆی ناویـــان دەبـــات. كەهـــەر حزبـــی خـــودا ســـەركەوتوو سەرفرازە. (أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّـــهِ هُـــمُ الْمُفْلِحُـــونَ... المجادلـــة:٢٢) . هـــەروەها خـــوای گـــەورە لـــە چـــوار ووشـــەی پوخـــدا شـــێواز وتـــەكنیكی ئـــەم

جەنگەی پیێ فەرمووین کە دەفەرمێت: (یاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ...آل عمران:٢٠٠) واتە: ئەی باوەڕداران خۆگروئارامگر بن ، وەئارامگری بەسەرخۆتاندا بهێنن هەمیشە لەسەنگەری کۆشش وخەباتدا بن ، لەخوابترسن پارێزگارین بۆ ئەوەی سەرفرازیو سەرکەوتنی هەمیشەیتان دەست کەوێت.

ئەم جەنگە بەبێ ئەم چوار تەکنیکە سەرناگرێت ، واتە: ئارامگری و خۆڕاگری ناکرێت تا "مصابرە"نەبێت. واتە بەرەنگاربوونەوەی دوژمن وڕووبەڕووبوونەوەی ، جا ئەگەر دوژمنەکەشی ئارامگربوو، ئەوا پێویستە "مرابطة"هەبێت واتە: "سەنگەر چۆڵ نەکردنی دڵ" نەك دوژمن زەفەربێنێت وە سەنگەرەکانیش بسریتیبێن لە سەنگەری (چاوەکان ، گوێیەکان ، زمان ، سك ، دەست ،قاچەکان) . چونکە دوژمن لە هەوڵ دایە لەم سەنگەرانەوە هێرش بهێنێت وخۆی بگەیەنێتە دڵ، وەجەستەوبیروهۆش بشێوێنێت وتێکیان بدات.

ئەوەتا هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوداﷺکەلە دوای پێغەمبەران بەڕێزترین پێڕی مرۆڤن، لە هەموو کەسێك زیاتر پارێزراوبوون لەشەیتان، کاتێك سەنگەری خۆیان چۆڵ کرد لەجەنگی "ئوحد"دا دوژمن زەفەری پێهێنان وئەوەی کەڕوویدا ڕوویدا..

وەبڕبڕەی پشتی هەر سێ بنەماکە کەبریتی یە لە"تقوی"پارێزکاری کردن ولە خواترسان، چونکە بەبێ تەقوا نەخۆگری وئارامگری وسەنگەر چۆڵ نەکردن سوودیان نابێت ، هەروەها تەقواش بەبێ ئارامگری نابێت.

جا ئێستا لە خودی خۆتدا تەماشای لەیەکدانی ئەو دوو سوپایە بکە ، شەڕی ئەو دوو لەشکرەبکە کەچۆن هەندێ جار زاڵ دەبن بەسەرتدا ، وەهەندێ جاریش تۆ زاڵ دەبیت.

## پیلانەکانی شەیتان بۆ لەخشتە بردنی مرۆڤ

بێ گومان شەیتان پیلانی تایبەتی خۆی هەیە لەم بوارەدا. شەیتان لەدەست وپێوەندەکان وسەربازەکانی خۆی پرسیاری کرد ، کام سەربازەی مرۆڤ لە مرۆڤ زۆرتر نزیکترە وکاریگەری هەیە لەسەر مرۆڤ؟ ئەوانیش ووتیان: "نەفس– دەرونی". شەیتان ووتی: لەدەرونەوە دەستی پێ بکەن وخاڵە لاوازەکانی بدۆزنەوەو کاری لەسەر بکەن و حەزو ئاواتەکانی بۆ بکەنە داوی ڕاوکردنی وشەووڕۆژ کۆڵی لێ نەدەن تا لەخشتەی دەبەن. گەر هاتوو دەرون هەڵگەرایەوە دژی پاشا "دڵ"، وەبووە هاوکاری من، ئەوا ئیتر هەریەکە لەم سەنگەرەگرنگانە داگیر دەکەین وسەنگەرەکانی (چاو، گوێ ،زمان ، دەم ، دەست ،قاچ) جا لەسەر ئەم سەنگەرانە تێ بکۆشێن وبجەنگێن.

## ئامۆژگاری ئیبلیس بۆ نەوەکانی

هەرکاتێك توانیتان دەست بگرن بەسەر عەرشی دڵدا ، ئەوا ئەو مرۆڤە یان کوژراوە یان دیلە یاخود برینداریکی سەختە سەنگەرتان چۆڵ نەکەن ، وەمۆڵەت ودەرفەتی هێز و دەستەی دوژمن نەدەن هێرش بهێنن بۆ ڕزگارکردنی دڵ. وەئەگەر هێرشەکەیان زۆر بەهێزبوو ،ئێوە کۆڵ نەدەن، بەردەوام بجەنگێن تا کاتێ ئەو هێزە دەگاتە دڵ زۆر لاوازو بێ توانا دەبێت، چونکە گەر وابوو ئەوا هیچیان پێ ناکرێت.

## مەترسی تەماشای نادروست"نەزەری حەرام"

ئیبلیس دەڵێت: ئەی هێزەکانمان ، کەدەستان گرت بەسەر ئەو سەنگەرانە ، ئاگەداری سەنگەری چاوبن ، دەرفەتی نەدەن تەماشاکردنەکانی سەرەنج دارو وردەکاربێت ، ڕاستەوخۆ لێی تێك بدەن بەنەزەری بێ ئاگایی وئارەزووبازی ،چونکە دەرونیشی حەزی پێیەتی.

دڵنیابن سەنگەری "چاو" کاریگەری تەواوی هەیە لەسەری ، من تەنها لەو ڕێگایەوە سەرم لەئادەمیزاد شێواند، چونکە بەنەزەری حەرام تۆوی ئارەزووبازی وشەهوەتم لەدڵیدا ڕواندو بە ئاوی حەزوئاوات ئاوی دەدەم تا هیمەت بەرزی دەکەم لەتاوانکاری وسەرپێچیدا نغرۆی دەکەم. جا چی دەتوانن لە تێکدانیی وسەرلێ شێواندنیان لەم سەنگەرەوە بیکەن. گومڕای بکەن وبڵێن: جا خودا چاوی بۆچی پێ داوین؟ وەجوانی بۆچی دروست کردووە؟ ئەگەر بۆ تەماشاکردن نەبێت؟

خۆ ئەگەر ئادەمیزادەکان نەفام بوون ، پێیان بڵێن: ئەم تەماشاکردنە تێیدا گەورەیی خوای بەدیهێنەرمان بۆ دەردەخات، جوانی بوارێکە لەبوارەکانی گەورەیی شوێن دەستی پەروەردگار ، پێویستە تێربین لە تەماشاکردن وپێ هەڵدانیدا.

وەپێیان بڵێن: ئەم وێنەیە بەشێکە لەدیاردەکانی حەق هەوڵ دەن بیری یەك پارچەیی بوون وحەقیان لادروست کەن ، گەر ڕازی نەبوون ،ئەوا باسی توانەوەو حلولی گشتی وتایبەتیان بۆ بکەن تا دەبنە برای نەسرانیەکان کە خودا دابەش دەکەن لەچەند جەستەیەکدا.

بەم چەشنە دواتر بیری دوورە پەرێزی دونیاویستیان لادروست بکەن ، وەخەڵکی ساویلکەی پێ لەخشتە بەرن، چونکە ئەمانە لەچەکە بەهێزەکانمانە.

## مەترسی گوێگرتن لەحەرام

## لەئامۆژگاری ئیبلیس بۆ سەربازەکان

ئاگاداری سەنگەری گوێ یەکان بن. شتانێك نەبیستێت کە ببێتە مایەی شێواندنی کارەکانتان. جگە لە شت و دەنگی پڕوپوچ هیچی تر نابیستێت ، خۆشترین ئاواز بە پڕوپوچترین ووشە بڕازێنێتەوە وبیدەن بەگوێیدا. چی دەرونی پێی خۆش بوو باهەرئەوە ببیستێت، نەك ئەوەی کە عەقڵی دەیەوێت.

بەهیچ شێوەیەك مۆڵەت نەدەن ووتەی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی ببیستێت یان ووتەی بانگەوازان وڕێنمایی کاران، خۆ ئەگەر شتی وا ڕوویدا دەرفەت نەدەن بگاتە بیروهۆشی لێی بشێوێنن، یاخود بیخەنە دڵی یەوە کەوا ئەم کارە دژوارەو بەتۆ ناکرێت وەسەرقاڵی بکەن بەشتی لاوکی یەوە. وەئەوەی بۆ دروست بکەن کە دەست بگرە بەکڵاوی خۆتەوە با با نەیبات و کێ ئەمڕۆ لەحەق دەپرسێتەوە، خۆتۆ لەو خەڵکە زیاتر نیت بۆ ژیان وبەرژەوەندی خۆت توشی مەترسی دەکەیتەوە...هتد. تادەتوانن ناحەقی بۆ بڕازێننەوەو حەق لەدڵیدا دەربهێنن.

## پیلانی شەیتان بۆ دەست بەرداربوون لە پرۆسەی فەرمان کردن بەچاکەو ڕێگری لەخراپە

شەیتان پیلانی خۆی هەیە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد دەست بەرداری گەورەترین فەرمانی خودای بێت کە "فەرمان کردنە بەچاکەو ڕێگرتنە لەخراپە". جا ئەگەر بتەوێت لەپیلانی شەیتان شارەزابیت ، بڕوانە پیلانی براکانی لەو مرۆڤە شەیتانانە کەچۆن ئەم پرۆسەیە لەناو دەبەن بەوەی کە ئەمە خۆ هەڵقورتاندنە لە کاروماڤی خەڵکی تردا، وەشوێن کەوتنی کەم وکوڕی وناتەواویەکان وعەیبی خەڵکی ترە، وەخۆتووش کردنە بەبەلاّ ودروست کردنی ئاشوبە لەنێوخەڵکیدا.

## پیلانی شەیتان لە شێواندنی یەکتاپەرستی وڕەدکردنەوەی سیفاتەکانی خوای گەورە

پیلانی شەیتان لەم بوارەدا لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە شوێن کەوتوانی سونە لەڕێ دەربکەن وسیفات وکارە جوانەکانی خوای گەورە پەك بخەن لە ژێر ناوی"جەستە ڕێژی- التجسیم" وە"لێکچواندن- التشبیە" وە "چۆنیەتی- التکییف". بۆ نمونە:

"بڵنــدبوونی خــودای گــەورە"وە لەنگــەرگرتنی لەســەر تــەختی عەرشــی مەزن بەلایەنگیر باس دەکەن.

وە"دابــەزینی خــودا بــۆ ئاسمــانی دونیــا" وەفەرموودەکــەی: (مــن سـألني فأعطيــه[1].... کــێ پرســیارو داوا بکـات داواکـاری یەکـە بـۆ جــێ بــەجێ دەکــەم) .بەجولاندنەوەو گواستنەوە وەسف دەکەن.

وە وەســفی خــودا بــۆ خــودی خــۆی بــە"دەســت وڕوخســار"بــە ئەندامــەکانی لەش لێك دەدەنەوە.

وەکارەکــانی خــودا بــەنوێ"حــوادث"دادەنــێن ، وەسیفەتەکانیشــی بـــە "اعراض"لێك دەدەنەوە.

بەم چەشنە سیفاتەکانی خودا ڕەد دەکەنەوە.

وەســەر لەگەوجــەکان دەشــێوێنن کــە بــۆ ســەلماندنی ســیفاتەکانی خــودا لــەقورئان وســونەدا هــاتووە پێویســتی بــەم کارانــە هەیــە. جــا ئــەم ڕوون کردنەوەیــە پەکخســتنە لــەقاڵبی پــاك وبێگــەردی ومــەزنی وگــەورە ڕاگرتنــی خــودا پــێش کــەش دەکــەن. وەزۆرێــك لــەکاڵ فامــەکان ئــەم شــتانە وەك خــۆی وەردەگــرن وبەووشــەی جیــاوازتر گوزارشــتی لــێ دەکــەن. خــوای گــەورە دەفەرمێت: (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نِبِــيٍّ عَــدُوًّا شَــيَاطِينَ الإِنــسِ وَالْجِــنِّ يُــوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْــرُفَ الْقَــوْلِ غُــرُورًا... الأنعــام:١١٢) واتــە: جـا بۆهــەر پێغەمبــەرێك وبڕوادارێــك دوژمنێکمــان لەشــەیتان وپــەری ســازاندووە، کەبــەردەوام قســەی زل وڕازاوە دەدەن بــەگوێی یەکـداو خۆیـان وخــەڵکی پــێ سەرگەردان وگومڕادەکەن.

---

[1] - ئەمە بەشێکە لەفەرموودەیەکی(صــحیح) لەدابــەزینی خودای گــەورە بـۆ ئاسمـانی دونیـا لـە سـێ بەشـی شـەودا بەچـەندین سـەنەدی ڕاسـت ودروسـتەوە، هـەروەها (بخـاری ومسـلم)و کەسـانی تـریش ئـەم فەرموودەیـەیان گێڕاوەتـەوە. بـۆ ئـەم مەبەسـتە بڕوانـە (اجتمـاع الجیـوش)و(مختصـر الصواعق)ی نوسەر.

جـا خـوای گـەورە ئـەو ووتـەو قسـانەی بـەڕازاوە بـاس کـردووە ، چـونکەناحەقە بـۆ قبـوڵ کردنـی دەیڕازێنێتـەوەو دەیـدات بـەگوێی نـەفام وسەرکەشەکاندا وپێی گومڕادەبن.

پوختەی مەبەست:

شـەیتان لەسـەنگەری گوێیـدا مۆڵگـەی دامەزرانـدووە وجگـە لەشـتنای پڕوپـوچ وبـێ خێـر نـەبێت مۆڵـەتی شـتی بـاش وچـاکە نـادات بێتـە ژوورەوە و قازانجی پێ بگەیەنێت، وەئەگەر هاتە ژوورەوەش بێ سوودی دەکات.

## مەترسیدارترین سانمە،سانمەی زمانە

شـەیتان بـەیاردو دەسـتەکانی دەڵێـت:سـەنگەری زمـان مـەزنترین سـەنگەرە بۆکـاری ئێمـە، دەزگـای گوزارشـت و وەرگێڕانـی دڵـە. جـا زۆر پێویسـتە بەوریاییـەوە لەسـەنگەردا کاربکـەین ، کەمەنـد کێشـی بکـەین بـۆ ووتـەی نابـەجێ وناپەسـەند کەهەرهـەمووی زیـان بـەخش بێـت ومۆڵـەت ودەرفـەتی یـادی خـوداو قورئـان خوێنـدن و ووتـەی ئامۆژگـاری مـەدەن لـەزمانی یـەوە دەربچـێت. وە ئێـوە لـەم سـەنگەرەدا دووکـاری مـەزنتان هەیـە پێویستە دەست بەرداری هیچیان نەبن:_

١. قسـەی نـاڕەواکردن: چـونکە هەرکەسـێك قسـەی نـاڕەوا بکـات ئـەوا برایەکە لەبراگەورەکانتان و لەسەربازە گەورە کانتانە.

٢. بـێ دەنـگ بـوون لەئاسـتی حـەق: جـا هەرکەسـێك لەسـەر حـەق بـەوەلام نەیـەت وە بـێ دەنگـی هەڵبـژێرێت ،برایەکـە کـەڕولاڵی ئێوەیـە ، هـەروەك یەکـەمیان قسـەکەری ئێوەبـوو ئەمـەش برایـەکی کەڕولاڵتانە.

جـا ئـەمان نـەك مۆڵـەتیان بـدەن بـە ووتـەی حـەق بـدوێن و بـێ دەنـگ بـن لەووتـەی نـاڕەوا، بەهـەموو ڕێگاکـان نـاڕەوایی بڕازێننـەوە، حـەق بێـژان بترسـێنن کەسـەرئەنجامیان بـاش نابێـت. دڵنیـابن ڕۆڵـەکانم کـە سـەنگەری

زمــان هۆكــارێكی ســەرەكی ســەرگەردانی ئادەمیزادەكانــە. چــەندیان لــەم ڕێگەیەوە دوچاری گرتن وكوشتن وتیاچوون بووە.

ئامۆژگاریتــان دەكـــەم بـــەوەی یـــەكێكتان ووتەیـــەك لەســـەر زاری برائادەمیزادەكەتانـــەوە بڵـــێ، ئـــەوی تریـــشتان لـــە گوێگرەكـــەی گـــەورە بكاتـــەوە سەرســـوڕمانی لادروســـت بكـــات وپێـــی دووبـــارە بكاتـــەوە، بەهەمیشەیی هاندەرەوهاوكاریان لە گوێگرتن و ووتنی قسەی ناڕەوادا.

هـــەموو دەرگـــاو گۆشـــەیەكیان لـــێ بتـــەنن ، مۆڵـــەتیان مـــەدەن وەبـــیری ئـــەوەتان دەهێنمـــەوە كـــە مـــن چـــی بـــەڵێن وسـوێندێكم خـــوارد لەبەرامبـــەر خوداكـەیان كـەووتم: (ثُمَّ لآتِيَنَّهُم مِّن بَيْنِ أَيْـدِيهِمْ وَمِــنْ خَلْفِهِــمْ وَعَــنْ أَيْمَــانِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلاَ تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَـاكِرِينَ * قَـالَ فَبِمَـا أَغْـوَيْتَنِي لأَقْعُـدَنَّ لَهُــمْ صِرَاطَكَ الْمُـسْتَقِيمَ... أعـراف:١٦-١٧) واتـە:شەیتان ووتـی: بـەهۆی ئـەوەی كـەتۆ منـت گـومڕاو سـەرگەردان كـرد ، ئـەوا سوێندبێت منـیش لەسـەر ڕێگـەی ڕاسـتەكە بۆیـان دانـشم ولایـان بـدەم وبیـان تـرازێنم.پاشـان سـوێند بێـت بـەخودا لـە هـەموو لایەكـەوە بۆیـان بێم، لـە پـشت وپـاش وچـەپ وڕاسـتەوە، وەدونیایـان لاخۆشەویـست دەكـەم و گومـان دوودڵیـان لەسـەر قیامـەت بـۆ دروسـت دەكـەم، وەزۆربـەیان گومڕادەكـەم، كـەمیان بەسـوپاس گوزاریـت دەمێننەوە.

ئایـا نابینیـت مـن لەهـەموو ڕیگایەكـەوە پـیلان دەگێـرم بـۆ ئـادەمیزاد تادەربـازی نـەبێت وگـیرۆدەی بكـەم وكـۆڵ نـادەم. وەپێغەمبەرەكـەیان ئاگاداریـانی كردۆتـەوە كـە بـەئادەمیزادی ووتـوە: (إن الـشيطان قـد قعـد لأبـن آدم بطرقـه كلها، وقعـد لـه بطريـق الاسلام. فقـال: أتـسلم وتـذر دينـك ودیـن أبائـك؟ فخالفـة وأسـلم، فقعـد لــه بطريــق الهجـرة. فقـال: اتهـاجر وتــذر ارضـك وسمائـك ؟ فخالفـه وجـاهر. فقعـد لـه بطريـق الجهـاد. فقـال: أتجاهـد

فتقتل فيقسم المال وتنكح الزوجه؟.)[1] واته: شەیتان لەسەر هەموو ڕێگاکان سەنگەری لەئادەمیزاد گرتووە، هەتا سەر ڕێگەی ئیسلام، ووتی: ئیسلام دەبێت دەست بەرداری ئاینی باوباپیرانی خۆت دەبیت؟ کەچی سەرپێچی کردنی ئیسلام بوو. دواتر هاتە سەر ڕێگای کۆچ کردن. ووتی: ئایا کۆچ دەکەیت وخاك وولاتی خۆت بەجێ دەهێڵیت؟ کەچی سەرپێچی کردو کۆچی کرد. پاشان هاتە سەر ڕێگەی جیهاد، ووتی:ئایا تۆ جیهاد دەکەیت ودەکوژرێیت ومالْ وسەروەتت دەبرێت ودابەش دەکرێت وخێزانیشت شوودەکاتەوە؟

جا بەهەمان شێوە لەسەر هەموو ڕێگایەکی چاکە خوازی ڕێیان لێ بگرن. ئەگەر ویستی خێرو پارە ببەخشێت ڕێگری بکەن وپێی بلێن:ئایا ئەو پارەو ماڵەی خۆت ئەیبەخشیت سەرئەنجام وەك ئەو سولكەرەودرۆزە چیەت لێ دێت؟ ئایا نەتان بیستووە چیم خستە سەر زمانی کەسێك کەهەژارێك داوای هاوکاری لێ کرد، ئەویش ووتی: ئەمە پارەی خۆمانە ،جائەگەر بیدەین بەئێوە ،ئەوا ئێمەش وەك ئێوەمان لێ دێت. جا ئەگەر بچیت بۆ حەج کردن پێی بلێن: ئەو هەموو ڕێگە دوورو درێژە دەبڕیت دوور نی یە خۆت وماڵەکەت توشی تیاچوون نەبێت.

بەم چەشنە هەموو ڕێگەیەکیان لێ بتەنن وباسی مەترسی ودژواری وزەحمەتیان بۆ بکەن. دواتر ڕێگاکانی تاوان وخراپەکارییان بۆ ئاسان بکەن وبۆیان بڕازێننەوە وخۆشی بکەن لەدڵیاندا. وەزیاتر پشت بەئافرەت ببەستن وبەکاریان بهێنن بۆ ئەم مەبەستە، وەلەدەرگای ئافرەتانەوە هێرشیان بۆ بەرن، چونکە باشترین پێڕن بۆ ئاسانکاری کارەکانتان.

[1] – ئەم فەرموودەیە(حسن)ە،(أحمد: ٤٨٣/٣)گێراویەتیەوە.

## سەنگەری دەست وپێ یەکان

ئـەم سـەنگەرە بەباشـی بیتـەنن ومۆڵـەت نـەدەن کـا ری چاکەوچـاکەخوازی پـێ ئـەنجام بـدرێت. وەبـۆ بەدەسـت هێنـانی ئـەم مەبەسـتە پێویسـتە هاوکـاری لـەدەرونی خراپــەکارەوە وەربگریـت، وەبخرێتــە گـڕ بـۆ دژایـەتی کـردن ولاواز کردنــی ڕۆڵ وهێـزی دەرونــی چـاکەکار ، بـەدڵنیایی ئـەم کـارەش بـە ڕێگـری کردن دەبێت لە پێ گەیشتنی یارمەتی بۆی.

وەلەهــەمان کاتــدا پشــتگیری وهاوکــاری بــەهێزبوونی دەرونــی خراپــەکار بکرێــت. بــەم چەشــنە دەتــوانن بگەنــە تــەختی عەرشــی دڵ،وەپێویســتە لەمەملەکەتەکــەی دوور بخرێتــەوە دەرونــی خراپــەکار لــەبری دڵ جێنیشــین کـەن. جـا ئـەو کاتـە هـەموو شـتێك بـەئارەزووی خۆتـان دەبێـت و وەهەرچـی بڕیارێــك بــدات لــە بەرژەوەنــدی ئێوەدایــە ، وەمــەرج وبڕیارەکانتــان هەرهەمووی جێ بەجێ دەکرێت لەلایەن ئەو دەروونەوە.

وەئەگــەر هەســت بەجوڵــەو هــەوڵی دڵــت کــرد بــۆ هاتنــە ســەر تــەختی پاشـایەتی، ئەوکاتـە هـەوڵ بـدەن ئـەو دەرونـەی بـۆ جـوان وشـیرین بکـەن وەلـە پـێش چـاوی بیڕازێننــەوە ووەك بوکێـك هاوسـەرگیری پــێ بکـەن لـە گـەڵ دڵـدا. وەسەرمەسـتی بکـەن وپێـی بڵـێن تـامی خۆشـی بچێژە هـەروەکو تـامی شـەڕو ناخۆشــیەکانت چەشــت ، ئەوســاتە بــەراوردێك بکــە لەنێوانیانــدا. وەدەســت هــەڵبگرە لەجــەنگ وشــەڕ ، چــونکە شــەڕی ئێمــە کۆتــایی نایــەت تــا مــەرگ، وەتۆش ئەی دڵ بەرگەی جەنگی درێژخایەن ناگریت...

## سەربازەکانی ئیبلیس

وەئــەی نــەوەکانم پشــت بــەدوو ســەربازی مــەزن ببەســتن کەلەگەڵیانــدا بەهیچ شێوەیەك توشی بەزین نایەن، ئەو دووسەربازەش بریتین لە:

١. ســەربازی بــێ ئاگــایی: بــە هەمیشــەیی هــەوڵ دەدەن بــە هــەموو شــێوەیەك دڵــی ئــادەمیزاد بــێ ئاگــا بکــەن لــە خــودا وقیامــەت ،

چـونكه ئەمـه خـاڵی وەرچـەرخانه لـه جـەنگی ئێـوەدا. هـەركاتێ دڵـــی بـــێ ئاگـــابوو لـــەخودا ، ئەوكاتـــە زاڵ بـــوون بەســـەریداو دەسەمۆكردنی زۆر ئاسانه.

٢. ســـەربازی ئارەزووبـــازی: ئـــارەزوو بـــازی لـــەپێش چـــاوی جـــوان لەدڵیانـدا شـیرین بكـەن، وەبـەهێزی هـەردوو سـەربازگەكە هێـرش بكـەن بەسـەریاندا ، چـونكه چـەك وسـەرباز لـەم دووانـە باشـتر وبـەهێزترمان نـی یـە ، وەبـۆ بەئـەنجام گەیانـدنی بـێ ئاگـایی بـە ئـارەزوو خـەریكیان بكـەن ، وەبـۆ گەیشـتن بـەئارەزوو بـازی بـەبێ ئاگایەوە سەرقاڵیان بكەن.

جـا هێـرش بەنـە سـەر كەسـە خواناسـەكان ، چـونكه ئێـوە بـەبوونی ئـارەزوو بـازی وشـەیتانەكەش وئـادەمیزاد بـەوە دەبنـە چـوار كـەس وزاڵ دەبـن، وەپێـری خواناسـان تێـك بـدەن وبیشـێوێنن بـە پشـت بەسـتن بـە بەكارهێنانی ئادەمیزادە بێ عەقڵ وژیرەكان بۆ شێواندنی كۆڕەكانیان.

پوختەی مەبەست:

ئـادەمیزاد سەرمەسـت بكـەن بـە ئارەزووبـازی وبـێ ئاگـایی، وەئەگـەر خـوای گـەورە فـەرمانی كـردەوە بـەئادەمیزاد بـەوەی كـە ئـارامگرو خـۆگرو سـەنگەر چـۆڵ نەكـەن، ئێـوەش بەهـەمان شـێوە خـۆگرو ئـارامگر بـن وسـەنگەرەكان چـۆڵ مەكـەن. وەلـەكاتی دروسـت بـوونی هـەر دەرفـەتێك لەدەسـتی مـەدەن، بەتایبـەتی لـەكاتی تووڕەبـوون و ئـارەزوو بازیـدا كـە دوو هەلی بێ وێنەن.

وە ئاگـادار بـن كـە ئـادەمیزادی وا هەیـە ئارەزوبـازی زاڵـە بـە سـەریدا و كـەمتر تـووڕە دەبێـت. جـا ئێـوە گرنگـی بـە بـواری ئارەزوبـازی بـدەن و سەرگەردانی بكەن. وە دەست بەرداری تووڕە بوونی بن.

وە هەیانـە بـە پێچـەوانەوە ڕادەی تـووڕە بـوون و هەڵچـونی زیـاترە و كـەمتر حـەز بـە ئـارەزوو بـازی دەكـات.جـا لێـرە دا گرنگـی بـە بـواری هەڵچـوون

و تورشــه بونەكـەی بـدەن.هەرچـەندە ســەنگەری ئـارەزووی چـۆل مەكـەن. چـونكە هەركەسـێك لـە كـاتی تـوڕە بـوون و هەڵچـوندا خۆگرنـەبێت ئـەوە بـە دڵنیایـەوە لــە كــاتی ئارەزووبازیــدا خــۆگر نابێــت. جــا پێویســته ئێــوە ئاوێتەیـەك دروســت بكــەن لــە نێـوان حــەز و ئــارەزوو و تورشــە بــوون دا. بانگەشەی توڕە بوونی بكەوە لە ڕێگەی ئارەزووبازیەوە.

وە بانگەشەی ئارەزووبازی بكەن لە ڕێگەی توڕە بوونەوە.

وە بـزانن كاریگـەرترین چـەك لــە ئـادەمیزاد بـریتین لـەو دوانـە. چـونكە بــەهۆی حــەزو ئــارەزووە (باوكیــان ودایكیــان) لــە بەهەشـت دەركـران. وە بــەهۆی تــوڕە بوونــەوە نــەوەكانیان (هابیــل و قابیــل) دەســتیان چــووە خـوێنی یـەكتری وە هــەر بـەو دوانـە پەیوەنـدی و دۆسـتایەتی و خزمایـەتیان لە دەست داوە وە خوێنی یەكتریان ڕژاندوە.

وە دڵنیـابن تـوڕە بـوون پشـكۆیەكە لـە دڵـی ئـادەمیزادا وە حـەز و ئـارەزوو گڕێكـە لـە دڵێـەوە دەجۆشـێت. وە وریـا بـن ئـاگر و پشـكۆ بـە ئـاوی دەسـت نوێـژ و یـادی خـودا و نوێـژ و الله أكـبر دەكوژێتـەوە.جـا ئاگـادار بـن مۆڵـەت نـەدەن لـەو دوو سـاتە دا لـە نوێـژ و دەسـت نوێـژ و یـادی خـودا نزیـك ببنـەوە. هــەر لــە بــەر ئــەم هۆیەیــە كــە پێغەمبەرەكــەیان ئامۆژگــاری كــردوون و دەفــەرموێت: (إن الغضــب جمــرة في قلــب إبــن ادم ، أمــا رأيــتم (مــن) إحمــرار عينــة ، وإنتفــاخ أوداجــة ؟ فمــن أحــس بــذلك فليتوضــأ) [1] (واتــە: تـوڕە بـوون پشـكۆیەكە لـە دڵـی ئـادەمیزاد دا ئایـا نابینیـت كـە تـوڕە دەبێـت چـاوەكانی چـۆن سـور هەڵدەگـەڕێت و دەمارەكـانی ملـی هەڵدەسـێت ، جـا هەركەسـێ هەسـتی بـەم حاڵەتـە كـردوو بـا دەسـت نوێـژ بگرێـت.) وە

---

[1] – وە ئــەم فەرمودەیــە( حســن و لغــيره)یــە ،( أحمــد : ۱۹/۳) وە (عبــدالرزاق: ۲۰۲۸۹) گێڕیانەتەوە.

هـەروەها پێغەمبەرکـەیان پێـی وتـوون: (إنمـا تطفـأ النـار بالمـاء) [1] واتــە: "ئـاگر بە ئاو دەکوژێتەوە".

[1] - وە ئـەم فەرمودەیـە( حسـن و لغـیره)یـە ،( أحمـد : ۱۹/۳) وە (عبـدالرزاق: ۲۰۲۸۹) گێڕیانەتەوە.

وە ئـەم فەرمودەیـە ( حسـن و لغـیره)یـە ( أحمـد -۲۲٦/٤)وە (أبـوداود ٤۷۸٤). وە (البخـاري) لـە (تاریخـە) وە (طبراني -۲٦۷/۱۷) گێڕیانەتـەوە هەرچـەندە ئـەم لـە سـەنەدەکەیدا (أبـي وئـل القـاص) هەیـە.کـە ناوەکـەی = (عبـدالله بـن يحيـى)یەکـە (إبـن حبـان) دەڵێـت : شـتی سـەیر و سەمەرە دەگێڕێتـەوە..هەرچـەندە (إبـن معـين) متمانـەی پێـی هـەبووە. بڕوانـە (السلسـلة الضـعيفة -۵۸۲).

دکتـۆر أحمـد شـوقی (ئەنـدام لـە کۆلێـژی پزیشـکی پادشـای لـە لەنـدەن) دەڵێـت :- چارەسـەری دەروونی لـە حاڵـەتی ئـەویترو کرژبـوون و تـوڕە بوونـدا بـە دوو شـێواز دەکرێـت کەئـەویش: بـە خاوکردنەوەی ماسولکەیی و دەرونی وە بە کەم کردنەوەی هەستی هەڵچوونی.

هـەر بۆیـە دەبیـنین لـە فەرمودەیـەکی پێغەمبـەری خـودا ﷺ بـاس لـە دەسـت نوێـژ گـرتن و نوێـژ دەکـات ،چـونکە لـە دەسـت نوێـژ و نوێـژ کردنـدا کرداریچـکی پراکتیزەکردنـی خاوبوونـەوە و هـێمن بوونـەوەی ماسـولکە و ڕەواندنـەوەی تـوڕەی و هەڵچـونی دەرونـە. وە زانسـتی سـەردەم گەیشـتۆتە ئـەو ڕاسـتیە زانسـتیەی دەڵێـت : لـە کـاتی تـوڕە بـوون و هەڵچـوندا گەربێتوپرشـی ئـاو بـەر ئـەو کەسـە بکـەوێت لـە ڕوونـاکی‌دا،ئـەوا هێمنـی و بـاری دەرونـی بـۆ دێتـەوە و ماسـولکەکانی خـاو دەبێتـەوە هۆکـارە زانستیەکەشـی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی کـە ڕوونـاکی لـە دڵۆپـە ئاوەکانـدا بارگـەی سـالب دروسـت دەکـات کـە دەبنـە خاوبوونـەوەی ماسـولکەکان.وە لـە گـەڵ بـوونی ڕوونـاکی‌دا خۆشـۆردن هێمنـی دەروونـی دروسـت دەکـات . لە چاو ئەوەی حەمامەکە تاریك بێت.

وە زۆر لـە زانیـان دەڵێـت :- لـە خۆشـۆردندا هێزێکـی سـیحری هەیـە لـە چـلاك کردنـەوەی جەسـتە و هـێمن کردنـەوەی بـواری دەرونـی و وەدەرنـانی تـوڕەیی و هەڵچـون. دوور نـی یـە هـەر ئـەم هۆکـارە بێـت لـە لەشـی ئـەو کەسـانەوەکە کـە لـە کـاتی خۆشـۆردندا لـە خۆشـیاندا گۆرانی دەڵێن ،چونکە هێمنی دەرونی‌یان بۆ دەگەڕێتەوە.

وە هـەر ئـەوە نهێنـی و حیکمـەتی ئەوەیـە کـە ئـاینی ئیسـلام لـە پـێش هـەموو نوێـژێك دا فـەرزی کـردووە کـە دەسـت نوێـژ بگیرێـت تـاوەکو لـە کـاتی نوێـژدا وە وەسـتان لـە بەرامبـەر بـە گـەورەیی خـودادا.هێمنـی و ئـارامی بـاڵی کێشـا بێـت بـە سـەر دەرون و جەسـتەدا ،وە دڵ و دەرون ئارام و هێمن بێت.

وە لێـرەدا بۆمـان دەردەکـەوێت کـە بۆچـی پێغەمبـەری خـودا ﷺ هـەرکاتێ تووشـی نارەحـەتی و غەم و پەژارەیەك بوایـە ڕاسـتەوخۆ هانـای بـۆ نوێـژکردن دەبـرد ، وە هـەر بۆیـە هـەرکاتێ گـوێ بیسـتی بـانگ بوایـە لـە لایـەن (بـیلالی الحبشـي)یـەوە پێغەمـەر ﷺ دەیفـەرموو (أرحنـا بهـا یـا بیلال). واتە "بمان حەوێنەوە و هێمنیمان بکە پێی ئەی بیلال".

وه خـوای گـەورە ڕێنمـایی بـۆ کـردون کـە پشـت ببەسـت بـە نوێـژ و ئـارامگری. بـەڵام ئێـوە دەرفـەتیان مـەدەن بـە تـوڕە بـوون و ئارەزووبـازی لـە بیریـان بەرنـەوە چـونکە چـەکی کوشـندەی ئێـوە بریتـی یـە لـە (بـێ ئاگـایی و ئارەزووبـــازی) . جـــا هــــەر کـــاتێ کەســـێکتان بینـــی دژ و پێچـــەوانەی ئارەزووەکانیـــەوە دەوەســـتێتەوە ، ئـــەوا بـــە هـــەموو شـــێوەیەك لێ ی دوور بکەونەوە.

**پوختەی مەبەست:**

تـاوان و تاوانکـاری چـەندێك کوشـندەن بـە دەسـتی شـەیتانەوەیە کـە بـە چـەکی خـۆت جـەنگت لـە گـەڵ دا دەکـات ،وە خـۆت هاوکـاری دەکـەیت و دژی خۆت کە ئەوەش لوتکەی بێئاگای و گێلی یە.

مایلبغ الاعدا عمن جاهل مایبلغ الجاهل من نفسه

واتــە:- ئــەوی کەســی گێـل و گەوجـە بـە خـۆی دەکـات ،دوژمنەکانیشـی ئەوەی پێ ناکەن.

وە ئـەوە جـێ ی سـەر سوڕمانە کـە مـرۆڤ خـۆی بـە دەسـتی خـۆی هاوکـاری و لـە ناوچـونی خـۆ بـدات وا بزانێـت ڕێـزی لێ دەنێـت. وە هـەوڵی لـە دەسـتدانی بەختـەوەری خـۆی بـدات کەچـی وا بزانێـت بەختـەوەری دەکـات. هـەروەها ڕێـز و پلـە و پایـەی خـۆی لەکـەدار و بچـوك بکاتـەوە کەچـی وا بزانێـت شـکۆمەند و سەربەرزی دەکات.

هــەر بۆیــە هەنــدێ لــە (ســلف) لــە وتارەکانیانــدا دەیــان ووت:- " دوور نــی یــە کەســێك خــۆی ڕیســوا بکــات کەچــی وا بزانێــت شــکۆمەند بــووە. وە خــۆی بچـوك بکاتــەوە کەچــی وابزانێــت بایەخــدار و ئاســت بــەرزی کــردووە ، وەخـۆی لـە دەست بـدات وا بزانێـت ڕزگـاری کـردووە. کـێ هەیـە لـەوە گێـل و گەوجـە تـر کـە دەسـت لـە گـەڵ دوژمنەکەیـدا تێکـەڵ بکـات بـۆ لـە نـاودانی خۆی.

## ٥٢- تاوانكار خودی خۆی لە بیر دەكات:[1]

مرۆڤـی تاوانكـار خـودی خـۆی لـە بـیر دەكـات و دەرونـی پشـت گـوێ دەخـات وێرانـی دەكـات ،جـا ئەگـەر وتـرا چـۆن مـرۆڤ دەرونـی خـۆی لـە بـیر دەكات ؟ وە چۆن دێتەوە یادی ؟ وە واتای لە بیر كردنی خود چی‌یە ؟

ئـەوا دەڵـیین:- بـەڵێ خـۆی لـە بـیر دەكـات مەترسـیترن لـە بیركـردن ئەوەتا خودای گـەورە دەفـەرموێت: (وَلَا تَكُونُوا كَالَّـذِينَ نَسُـوا اللَّـهَ فَأَنسَـاهُمْ أَنفُسَهُمْ أُوْلَئِكَ هُـمُ الْفَاسِـقُونَ... الحشـر:١٩) واتـە: " وەك ئـەو كەسـانە نـەبن كـە خـوای گـەورەیان لـە بـیر كـرد ، خـوای گـەورەش خـودی خۆیـانی لـە بـیر بردنەوە بە ڕاستی ئەوانە تاوانكارن و خراپەكارن.

واتـە خـوای گـەورە خـودی خۆیـانی لـە بـیر بردنـەوە وەك سـزایەك بـۆ لـە بـیر كردنـی خـوای گـەورە.بـەڵێ خـوای گـەورە لـە سـزای ئـەم تاوانـەدا. بـە دوو جۆر سزا دەدات:-

یەكەم: خوای گەورە لە بیریان دەكات.

دووەم: خودی خۆشیات لە بیر كرد.

وە خـوای گـەورە لـە بیریـان دەكـات بـە واتـای پشـتیان تێدەكـات و لـە ڕەحم و سۆزی بێبەشیان دەكات و ڕێنمایان ناكات تیادەچن.

وە خـودی خۆیـان لـە بـیر كـرد بـە واتـای ڕێـز و بایـەخی خۆیـان لـە بـیر كـرد و هۆكارەكـانی بەختـەوەری و سـەربەرزیان لـە بـیر كـرد وە هـیچ كاتێـك بەرژەوەندیـەكانی خۆیـان نایەتـەوە یـاد و بـۆ یـەكجاری خۆیـان لـە یـاد دەكـەن وێـڵ و سـەرگەردان دەبـن. هـەروەها كـەم و كـوڕی كەمتەرخەمیـەكانی خۆشـیان لـە یـاد دەكـەن لـە بـیری ئـەوەدا نـابن كـە چاكسـازی لـە خـودی خۆیاندا ئەنجام بدەن.

---

1 - بڕوانە خاڵكانی (١٤-٢٩)

وه لـه گـەڵ ئەمانەشـدا هەرچـی بـرین و ئازارەكـانی دڵ و دەرونیشـیان لـە یـاد دەكـەن وەك نمونـەی سـەرخۆش بیرێـك لـە ژیـان و جەسـتە و دڵ و دەرونـی خۆیـان ناكەنـەوە و چارەسـەری ئـێش و ئازارەكانیـان ناكـەن كـە دواتـر بـە هیلاكیـان دەبات چونكە هـەموو جەستە و دڵیـان پـڕە لـە نەخۆشـی. كـە ئەمـە گـەورەترین سزایە خـوای گـەورە توشـیان دەكـات بـە گشـتی و بـە تایبـەتی.جـا چـیتر بـەلآو نەهامـەتی هەیـە بگاتـە ئـەم دەردە كوشـندەیە كـە مـرۆڤ خـودی خـۆی و بەرژەوەندیـەكان و بـەلآكانی لـە یـاد بكـات و بـەرەو تیاچوون بچێت و دواتر بەهەشتی بەرین لە دەست بدات ؟!

جـا هەركەسـێك بـە وردی حـاڵ و بـارودۆخی خـەڵكی بـە گشـتی بكۆڵێتـەوە بـۆی دەردەكـەوێت كـە زۆرینـەی خـەڵكی ئێسـتا ڕاسـت و دروسـتی خـودی خۆیـان لـە یاد كـردووە دواتـریش قیامـەتیان و خۆیـان فرۆشـتووە بـە بەرامبـەر بـە تەمـەنێكی كـورت و كـرچ و كـاڵ و بـێ نـرخ ،فرۆشـتنێكی گێـل و گەوجانـە. وە ئـەم ڕاسـتیانەیان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە لـە كـاتی مـردن و دوای مردنـدا بـە ئاگـا دێنـەوە كـە بـە چـی گـرێ بەسـتێكی بێنـرخ و بـێ بـەها قیامـەتی لـە دەسـت داوە بازرگـانی پێـوە كـردووە بـۆ تەمـەنێكی كـورتی دونیـا. كـە چـی بـە پێچـەوانەوە خـەڵكی دونیـا دەفرۆشـێت بـۆ بـە دەسـتهێنانی قیامـەت و ژیـانی هەتا هەتایی.

**جا دۆڕاوەكان:**

ئـەو كـەس و گـەوج و گێلانـەن كـە لـە گـەڵ هـەموو دۆڕانـدن و سـەر لێ شـێواویە و خـۆو خـوا لـە یادكرنـە كـە ژیـانی دونیـا سەرسـام بـوون و حـەزو ئارەزووەكانیـان تێركـردووە قیامـەتیان بـە دونیـا گۆڕیوەتـەوە و ژیـانی دروسـت و ڕاسـتی لـە لای ئـەوان بریتـی بـوو لـە تێـر كردنـی حـەزو ئارەزووەكانیـان و ڕابـواردن كـە چـی هێشـتا هـەر خۆیـان بـە بـراوە و قـازانجگر دەزانـن هـەروەكو یـەكێك دەڵێـت: (خـذ مـاتراه ودع شـيئاً سمعت بـه) واتـە:

پەلاماری ئەوە بدە کە دەبینی و شتێ لە بیر بکە کە تەنها بیستووتە و نەت بینوە.

جگە لەمەش لاوازی باوەڕ و چاولێکەری لە خەڵکی و زاڵ بوونی حەز و ئارەزووەکانی هەر هەموویان کاریگەریان لە سەر ئەم بیر و بۆچوونەیان هەیە.

هەر بۆیە زۆرینەی خەڵکی لەم بازرگانیە دا دۆڕاو خەسارەت مەندن. هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (أُولَـئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُاْ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالآَخِرَةِ فَلاَ يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلاَ هُمْ يُنصَرُونَ.... البقرة:٨٦) . واتە: ئەو کەسانەی کە ژیانی دونیایان هەڵبژاردو گۆڕیانەوە بە ژیانی قیامەت. لە بەر ئەوە سزایان لە سەر کەم ناکرێتەوە و ئەوانە هەرگیز یارمەتی نادرێن و سەر ناخرێن.

هەروەها دەفەرموێت: (فَمَا رَبِحَت تِّجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ.... البقرة:١١) واتە: ئەوانە بازرگانیەکەیان قازانجی نەکردووە ،سەرمایەکەشیان کە هیدایەتە لە دەستیان دا. وە مایە پوچ بوون و ڕێبواری ڕێگای هیدایەت نەبوون.

جا لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێ ڕاستی هەموو شتەکان بە ڕوونی دەخرێنە پێش چاو ،ئەو کەسانە گێل و گەوجەی خۆیان بۆ دەردەکەوێت و پەشیمانی دایان دەگرێت هەر چەندە بێ سودە.

ئەوانەی قازانجیان کرد:-

ئەو کەسانە بوون کە ڕێز و قەدری خۆیانیان زانی و بە ژیانی کاتی هەڵنەخەڵەتان و بەرق و بریقی دونیا سەرەنجی ڕانەکێشان ،خۆشیەکی کاتیان گۆڕیەوە بە خۆشیەکی نەبڕاوە و هەتا هەتایی خوای گەورە و پاداشت و خەڵاتی خودایان لە بیر نەکرد. هەر بۆیە تەمەنی دونیا لە لایەن زۆر بێ نرخ و کەم و کورت بووە ،چونکە بە چاوی بینایەوە تەماشای قیامەتیان دەکرد.

خوای گەورش دەربارەیان دەفەرموێت: (وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُواْ إِلاَّ سَاعَةً مِّنَ النَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ.... يونس:٤٥) واتە: ڕۆژێك كە خودا هەر هەموویان كۆ دەكاتەوە ، وا هەست دەكەن كە تەنها سەعاتێك لە ڕۆژێكدا پێچووە " خزمان و ناسیاوان و دۆستان " هەمووان یەكتر دەناسنەوە.

هەروەها دەفەرمێت: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا * فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَاهَا * إِلَى رَبِّكَ مُنتَهَاهَا * إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَاهَا * كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا..... النازعات:٤٢-٤٦) واتە: پرسیارت لێ دەكەن "ئەی پێغەمبەر" كە قیامەت كەیە؟ وەچ كاتێك بەرپا دەبێت؟ جا تۆ لەكوێ دەزانیت كەی بەرپادەبێت ، تۆ لەكوێ ئەوباسە لەكوێ؟ بێ گومان كۆتایی دونیاو هاتنی قیامەت تەنها خودا دەیزانێت. ئەركی تۆ تەنها بێ داركردنەوەی ئەو كەسانەیە كەلەو ساتانە دەترسن، ئەو ڕۆژەی قیامەت بەرپادەبێت. باوەڕداران وا دەزانن تەنها سەر لەئێوارەیەك یان سەر لەبەیانیەك تەمەن درێژەی ژیانی دونیایان بووە.

هەروەها دەفەرموێت: (كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ.... الأحقاف:٣٥) واتە: ئەو ڕۆژەی كەبەڵێنیان دراوەتێ كە پێشهات وادەزانن تەنها ساتە وەختێكیان لەڕۆژێكدا پێ چووە.

هەوروەها دەفەرموێت: (قَالَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي الْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ * قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَاسْأَلْ الْعَادِّينَ * قَالَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ... المؤمنون:١١٢-١١٤) واتە:خوای گەورە دەپرسێت: ئەوە چەند ساڵە لە زەویدا ژیانتان بردە سەر؟ ئەوانیش دەڵێن: ڕۆژێك یان كەمتر، لەو كەسانە بپرسن كە بیروهۆشیان لای خۆیانەو حسابی ژمارەو كات دەكەن، خوای گەورە دەفەرموێت: بەڕاستی مانەوەتان لە دونیادا هەر زۆر كەم بووە ئەگەر بەڕاستی دەتانزانی.

هەروەها دەفەرمێت: (يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ وَنَحْشُرُ الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا * يَتَخَافَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا * نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ

طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا..... طه:١٠٢-١٠٤) واته: ڕۆژێك دێت كه فوو دەكرێت به "صور"دا. ئەو ڕۆژە تاوانباران چاویان كوێر دەبێت. بەچپەوسرتە بەیەك دەڵێن تەنها دە شەو نەبێت "لە دونیا یان لەبەرزەخدا" هیچی ترتان پێ نەچوو. ئێمە چاك دەزانین سەرئەنجام چی دەڵێین ، چونكە ژیرترین و وریاترینیان دەڵێت: تەنها ڕۆژێك نەبێت هیچی ترتان پێ نەچووە ! !

ئەمە ڕاستی ودروستی ژیانی دونیایە لەچاو قیامەتدا. كەكاتێ بۆ مرۆڤایەتی ڕوون دەبێتەوە كە جگە لەژیانی دونیای كاتی و كەم وكورت و پڕ لە كێشەو چەرمەسەری ، دونیایەكی تری پڕ لەشادی وكامەرانی وهەتاهەتایی هەیە، كەئەمان بەدەستیان هێناوەو فەرامۆشیان نەكردووە وهەولیان بۆ داوە، لەبازرگانیەكی قازانكراوی سەت دەرسەتدا بەدەستیان هێناوە ، لەبەرامبەر ژیانی دونیای كاڵ وكرچ وكورتدا. هەموو مرۆڤێك لەم دونیایەدا فرۆشیارە...

## نرخی فرۆشتنەكە بەهەشتە...

پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (كل الناس يغدو فبائع نفسه، فمعتقها او موبقها) واته: هەموو مرۆڤێك كەڕۆژ دەكاتەوە فرۆشیاری دەرونی خۆیەتی ، یان ڕزگاری دەكات یاخود توشی هیلاك وتیاچوونی دەكات.[1]

خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ اللّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللّهِ فَاسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ

[1] – (امام نووی) لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت : واتای ئەم فەرموودەیە ئەوەیەكە هەموو مرۆڤێك هەوڵ دەدات بە دەرونی خۆی. هەیە دەیفرۆشێت بەخوای گەورە بە ملكەچی وخواپەرستی كردن ، ئەوا دەرونی ڕزگاردەكات لەسزای خوای گەورە. وەهەیشە بەشەیتان دەیفرۆشێت بە شوێن كەوتن وملكەچی كردن بۆی ئەوا دەرونی بەهیلاك دەبات وەتوشی سزای خودای دەكات(شرح مسلم).

وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ... التوبة:١١١) واته: خوای گەورە ماڵ وگیانی لە باوەڕداران کڕیوە بەوەی کە بەهەشت بۆ ئەوانەو بەشیانە، ئەو بڕوادارانەی کەلە پێناو خودادا دەجەنگن وکوشتار دەکەن ، دەکوژن ودەکوژرێن.ئەوە بەڵێنی "کڕینی بەهەشتە" پەیمان وبەڵێنی ڕاستیی خودایە بۆیان تەنانەت لە کتێبە پیرۆزەکانی"تەورات وئینجیل وقورئان"یشدا باس کراوەو دوپات کراوەتەوە ، جا کێ هەیە هێندەی خودا بە وەفاو بەئەمەك بێت لە جێ بەجێ کردنی بەڵێنەکانی. کەواتە مژدەتان لێبێت بەو مامەڵە کڕین وفرۆشتنەتان، بەڕاستی هەر ئەوەیە بردنەوەو قازانج وسەرفرازی هەمیشەیی.

جا ئەمە یەکەم گرێ بەستە لە نرخی ئەو بازرگانیە کە کاڵاکەی بەهەشتە. جا ئەی بێ پارەو سامانەکان فریاکەون وبازرگانی بکەن وئەم هەلە لەدەست مەدەن. وەئەگەر کەسێك توانای بەستنی ئەم گرێ بەستەی نەبوو ، ئەواهەڵێك وگرێ بەستێکی تریش هەیە بۆ کەسانێك بیەوێت بەهەشتی بەرین بکڕێت ،ئەوا ئەم بازرگانیەی تر بکات،: (التَّـائِبُونَ الْعَابِدُونَ الْحَامِدُونَ السَّائِحُونَ الرَّاكِعُونَ السَّاجدونَ الآمِرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّاهُونَ عَنِ الْمُنكَرِ وَالْحَافِظُونَ لِحُدُودِ اللّهِ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ.... التوبة:١١٢) واتە: تەوبەکاران و خواپەرستان وسوپاس گوزەران وگەڕۆکان "کەبیردەخاتە کار بۆ ناسینی خودا"[1] سوژدەبەران وکڕنوش بەران ،فەرمان کەران بەچاکەو ڕێگران لەخراپە ، پارێزەرانی سنووری خودا،پاشان مژدە ببەخشە بە بڕواداران.

هەروەها دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ * تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ... الصف:١٠-١١) واتە: ئەی

[1] – ئەمەش هەشت"٨" جۆری ترە لە نەخت(نقد) بۆ کڕین وبەدەست هێنانی بەهەشت.

باوەڕداران بازرگانیەکتان بۆ دەست نیشان بکەم کە ڕزگارتان کات لەسزاوئێشێکی گەورە ، باوەڕبهێنن بە خوداو پێغەمبەرەکەی ،وەتێ بکۆشن بەماڵ وسامان وگیان ودەرونتان لەپێناوی خوای گەورەدا. وەئەمە چاکترو باشترە بۆتان گەر ئێوە بزانن.[1]

**٥٣ و ٥٤- تاوان نیعمەتە بەردەستیەکان لەناودەبات ونیعمەتە بەردەوامەکانیش ڕادەگرێت:**

خوای گەورە نیعمەتی زۆرە بەسەر بەندەکانی یەوە بەردەوامی پێ دەدات. جا تاون وتاوانکاری دەبێتە مایەی لەدەست دانی نیعمەتە بەردەستەکان وڕاگرتنی نیعمەتە بەردەوامەکان. خوای گەورە بۆ هەموو شتێك هۆکاری سازاندووە بۆ بەدەست خستنی، وە هۆکارێکشی داناوە بۆ لەکارخستنی. جا بەردەوامی نیعمەتەکان بەهەموو جۆرەکانی یەوە بەندە بەملکەچی وگوێڕایەڵی وخواپەرستی بۆ خوای گەورە ومیهرەبان. وەهۆکاری لەدەست چوون ونەمان وڕاگرتنی نیعمەتەکانٌ بەندە بەسەرکەشی وسەرپێچی ویاخی بوون وتاوانکاری ولادان لەبەرنامەی خودا.

لە ڕاستیدا جێگەی سەرسوڕمانە کە مرۆڤ هەست بەم ڕاستی یەدەکات و وەك مێژووش بیستوویەتی کە هۆکاری لەدەست دانی نیعمەتەکانە، کەچی سەرەڕای ئەمانەش هەر سوورە لەسەرپێچی وسەرکەشی ویاخی بوون لەخودای گەورە هەروەك بڵێی بۆ ئەم لەم یاسایە جیاکاری کراوە وئەم ناگرێتەوە وتایبەتە بەخەڵکی ترەوە. کەئەمەش ئەوپەڕی بێ عەقڵی وستەمکاری یە مرۆڤ لەدەرونی خۆی دەکات.

---

[1] – وە"تێ کۆشان لەپێناو خودادا"دەکاتە نەختی"پارە"ی ئەم بازرگانی کردن و کڕینی کالای خودا کەبەهەشتە.

## ٥٥- تاوان مایەیی دوورخستنەوەی پشتیوانی فریشتەیە:

خوای گەورە مرۆڤەکانی بەهرەمەند کردووە بە پشتیوانی کردنی فریشتەکان لێی ، بەتایبەتی فریشتەیەك کە هەمیشە ڕێنمایی کارو هاوەڵ ودۆستە بۆی و نزیکترین کەسە لێوەی لەلایەن خوای میهرەبانەوە تەرخان کراوە بۆی لەبەرامبەر خراپترین وزیان بەخشترین کەس بۆی کەشیتانە هاوەڵەکەیەتی کە لەلایەن شەیتانی نەفرەتی گەورەوە تەرخان کراوە بۆ سەرلێ شێواندنی.

جا هەرکاتێ کەمرۆڤ تاوان وسەرپێچی بکات ئەوا ئەو فریشتەیە لێی دوور دەکەوێتەوە، بەم دوورکەوتنەوەیەش گەورەترین پشت وپەنا لەدەست دەدات. تەنانەت دەڵێن لە "ئەثەر"ێك داهاتووە: بەئەنجام دانی درۆیەکی بچوك مەوداو ماوەیەکی زۆر دووردەکەوێتەوە لێی بەهۆی ناخۆشی بۆن وبەرامی ئەو درۆیەوە.

جا ئەمە بەهۆی تەنها درۆیەکی بچوکەوە بێت، ئەی ئەگەر تاوانی گەورە تر ئەنجام بدات چی؟

وەپیرێك لە سەلەف دەڵێن: ئەگەر تاوانێکی نێربازی ئەنجام درا ،ئەوا لەهەژمەتا زەوی هاوار دەکات ودەقیژێنێت، وەفریشتەکانیش بەرەو خوای گەورە هەڵدێن گلەیی وئەو تاوانە دەکەن کە بینییان.

هەروەها پیرێکی تر لەسەلەف دەڵێت: کاتێك مرۆڤ ڕۆژ دەکاتەوە ، فریشتەکەو شەیتانەکە لێی نزیك دەبنەوە، جا ئەگەر دەستی کرد بەسوپاس گوزاری وناوهێنان ویادکردنەوەی خودا،ئەوا شەیتانەکە بەدوور دەنێت وراوی دەنێت.بەلآم ئەگەر بەپێچەوانەوە بوو ،ئەوا فریشتەکە هەڵدێت وشەیتانەکە لێی نزیك دەبێتەوە.

جا ئەگەر خواپەرست بێت ئەوا بەردەوام ئەو فریشتەیە لێی نزیك دەبێتەوە تا دەبێتە دۆستی هەمیشەیی وبەردەوام فەرمانی چاکەوچاکە خوازی پێ دەکات لە دونیاو لەکاتی مردن وناوگۆڕو قیامەتیشدا. ئەوەتا

خوای گەورە دەفەرمویێت: (إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ * نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ... فصلت:٣٠-٣١) واتە: ئەوانەی ووتیان "الله"خوامانەوە لەسەر ئەو شاڕێگایە سەقامگیر بوون ئەوا لەسەرەمەگدا دەستەدەستە فریشتە دادەبەزن بۆلایان وپێیان دەڵێن: هیچ ترستان نەبێت لەداهاتوودا هیچ غەم وپەژارەیەکتان نەبێت بۆ ڕابردوو. مژدەتان لێبێت بەو بەهەشتەی خوا بەڵێنی پێ داون. خوای گەورەو فریشتەکان دەفەرموون: ئێمە یارویاوەرو پشتیوانتانین لەدونیاو قیامەتدا، وەمژدەی بەهەشتتان لێبێت کە تێیدا هەرچی دڵ ودەرونتان ئارەزووی دەکات بۆتان ئامادەیە.

بەم شێوەیە فریشتەکان بەگشتی فریشتە تایبەتەکەشی پشت وپەنای دەکەن ودەی چەسپێنن و پشتگیری دەکەن.

خوای گەورە دەفەرمێت: (إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلاَئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ.. النفال:١٢) واتە: خوای گەورە وەحی نارد ۆ فریشتەکان کەمن یارویاوەرتانم ئێوەش دڵی بڕواداران پابەند ودابمەزرێنن.

وەفریشتەکە لەسەرەمەرگدا پێی دەڵێت: مەترسە ناڕەحەت مەبە مژدەت لێبێت.... دەیچەسپێنێت وپشتگیری دەکات بە ووشەو دەربڕینی جوان وڕەوان لە دونیاو سەرەمەرگ و لەناوگۆڕیش لەکاتی پرسیارکردنیدا. هیچ کەسێك نی یە وەك ئەو فریشتەیە دڵسۆزو خەم خۆری ئەو مرۆڤە بێت کە هەمیشە پشت وپەنایەتی لە نوستن وبەئاگابوون وژیان وڕۆیشتن وهاتن وکاروتەنهادا وەبەردەوام بەرگری لێ دەکات ودەجەنگێت لە دژی شەیتانەکاندا ،وەهاوکاری خێروچاکەی دەکات.

هەروەکو لە (ئەثەر) دا هاتووە بە "مرفوع موقوف": (إن للملك بقلب ابن آدم لمة وللشيطان لمة فلمة الملك إيعاد بالخير وتصديق بالوعد، ولمة

الشيطان إيعاد بالشر وتكذيب بالحق) .[1] واته: هەريەکە لەفريشتەو شەيتانەکان شت دەخەنە دڵی مرۆڤەکەوە ، جا ئەوەی فريشتەکە پاڵپشتيە بۆ چاکەو چاکەخوازی وبەڕاست زانينە بۆ قيامەت، بەڵام ئەوەی شەيتان پاڵپشتيە بۆ خراپەوخراپە خوازی بەڕاست نەزانينی حەق وڕاستی يە.

وەهێندە ئەو فريشتەيە لەمرۆڤەوە نزيك دەبێتەوە تەنانەت لەسەر زاری مرۆڤەکەوە قسەی چاکەوچاکە خوازی دەردەبڕێت و وە ووتەی ڕاست وحەق بێژی دەخاتە سەرزاری مرۆڤەکە. بەهەمان شێوە گەر کەسەکە شەيتانەکە دۆستی بێت ئەوساتە لەسەر زاريەوە ووشەی ناشرين ونارەوا دەردەبڕێت وهانی خراپەخوازی دەدات. تەنانەت ئەم ڕاستی يە خودی کەسەکان هەستی پێ دەکەن هەروەکو لەفەرموودەيەکدا هاتووە: (إن السكينة تنطق على لسان عمرﷺ) واتە: بەڕاستی دڵنيايی لەسەر زاری عمرەوە دەردەچێت.

وەکاتێ يەکێکيان ووتەی ڕاستو دروست وچاکەخوازی دەردەبڕێت ،ئەويتريان دەيووت ئەمە فريشتەکە خستۆتيە سەرزارت، وەکاتێ ووتەو ووشەی نارەوای دەبيست دەيووت ئەوە شەيتانەکەت ئەم ووتانەی خستۆتە سەرزارت ، جا کاری فريشتەو شەيتانەکە لەسەر دڵ وزاريشە.

## تاوان هۆکاری دوورکەوتنەوەی فريشتەو دۆستەکەيەتی

ئەو فريشتەيەی کە هەميشە پشتگيری دەکردو هاوکاری دەکرد ودژايەتی ناحەزەکانی دەکرد بەهۆی تاوانەوە لێی دووردەکەوێتەوەو هەڵدێت، وەلەهەمان کاتدا شەيتانەکەی لێ نزيك دەبێتەوەو بەرەو هەڵدێری دەبات.

---

[1] – ئەم فەرموودەيە(حسن)ە،( ترمذي: ٢٩٨٨ )گێراويەتيەوە دەڵێت ئەم فەرموودەيە(حسن غريب)ەو نازانين ئەمە(مرفوعە)يان تەنها لەفەرموودەی........

تەنانـەت ئـەو فریـشتەیە زۆرجـار ئەگـەر کەسـێك شـتی ناشـیرینی پـێ بڵێت ئـەو وەڵامـی دەداتـەوە وبـەرگریت لـێ دەکـات. هـەروەکو لـەم فەرموودەیـەدا هـاتووە: (اختـصم بـین یـدي الـنبيﷺ رجلان فجعـل احـدهما یـسب الآخـر، وهـو سـاکت، فـتکلم بکلمـة یـرد بهـا علـی صـاحبه، فقـام الـنبيﷺ فقـال: یارسـول الله لمـا رددت علیـه بعـض قولـه قمـت ، فقـالﷺ: کـان الملـك ینـافع عنـك، فلمـا رددت علیـه جـاء الـشیطان فلـم اکـن لأجلـس.)[1] واتـە: دووپیـاو لەبـەردەم پێغەمبـەر بـوو بەناخۆشـیان ، یـەکێکیان جـوێنی ناشـیرینی بـەوی تـردا،بـەڵام ئـەو بـێ دەنـگ بـوو ،بـەڵام دواتـر وەڵامـی دایـەوە. پێغمبـەرﷺ یەکـسەر هەسـتا. دواتـر لێـی پرسـی ووتـی ئـەی پێغەمبـەر هەرچـەندە ئـەو قـسەی بـەمن ووت تـۆ هەڵنەسـتایت ،بـەڵام کاتێـك مـن وەڵامـم دایـەوە تـۆ هەسـتایت.پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: فریـشتەیەك بـەرگری لـێ دەکردیـت بـەڵام کاتێك وەڵامت دایەوە ئیتر شەیتان هات ،منیش لەشوێنی وادا دانانیشم.

تەنانـەت لـەکاتی پاڕانـەوەو نزاکـردن بـۆ برایـەکت بـەنهێنی فریـشتەکە "ئـامین"دەکـات ،وەدەڵێـت: (لـك بمثلـه[2]...واتـە تـۆش هـەروەها) . وەهـەروەها لـەکاتی خوێنـدنی سـورەتی (الفاتحـە) دا ئـەو فریـشتەیە "ئـامین" دەکـات.[3] وەکاتێـك کـە کەسـێکی بـاوەڕدار تاوانێـك ئـەنجام دەدات فریـشتەکان بەتایبـەتی هـەڵگرانی عەرشـی مـەزن بـۆی دەپاڕێنـەوە وداوای لـێ خۆش بوونی بۆ دەکەن.[4]

---

[1] – ئەم فەرموودەیە(حسن)ە،(أبو داود: ٤٨٩٦) گێڕاویەتیەوە.

[2] –ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(مسلم: ١٧/٥٢نووی)و(أبو داود:١٥٣٤)گێڕاویانەتەوە.

[3] –ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(بخاری: ٧٨٠)و(مسلم:١٣٢/١٤)گێڕاویانەتەوە.

[4] – ئەم ئایەتە ئاماژە بۆ ئەو ڕاستی یە دەکات کە دەفەرمێت: (الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ *رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدتَّهُم وَمَن صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ * وَقِهِمُ السَّيِّئَاتِ وَمَن تَقِ السَّيِّئَاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ.... غافر:٧-٩ )واتە: فریشتەکان هەڵگری عەرش وتەختی خوای گەورە ،وەئەو فریشتانەی بەدەوری عەرشدا دەسوڕێنەوە، هەمیشە

هــەروەها ئەگــەر مــرۆڤ بەدەســت نوێــژەوە بنوێــت ،ئــەوا فریشــتەکە لەتەنیشــتیەوە دەبێــت ، وەدەیپارێزێــت هاوکــاری دەکــات وســەری دەخــات و لەهەڵمــەتی ناحــەزان دەیپارێزێــت، بگــرە وەك درواســێیەك ومیــوانێکی ئــازیزی وایــە. وەئەگــەر ڕێزگرتنــی میــوان یــەکێك بێــت لــە پێداویســتی یــەکانی بــاوەڕداریێتی ، ئــەوا ڕیزنــان وخزمــەت کردنــی ئــازیزترین وبــەڕێزترین میــوان ئەبێ چی بێت؟..

جــا ئەگــەر هــاتوو ئــەو مرۆڤــە ئــازاری ئــەو ئــەو میوانــە ئــازیزەی دا بــەتاوانکاری وسەرپێچــی ، ئــەوا فریشــتە میوانەکــە گلــەیی وگازنــدە لــەلای خــوای گــەورە دەکــات و دەڵێــت: خــودا پاداشــتت نەداتــەوە ، وەبەپێچــەوانەوە ئەگــەر هــاتوو بــە خواپەرستی وملکــەچ بــوون بــۆ خــودا ڕێــزت لــێ گــرت، ئــەوا لەخودا دەپارێتەوەو نزات بۆ دەکات.

تەنانــەت پێرێــك لــە هــاوەڵان ووتویانــە: ئێــوە فریشــتەتان لەگــەڵ دایــە هــیچ کاتێك لێتان دوور ناکەوێتەوە،جا ڕێزیان لێ بنێن وشەرمیان لێ بکەن.

وەئەمــە واتــای ئــەو ئایەتــە پیرۆزەیــە کەدەفــەرمێت: (وَإِنَّ عَلَــيْكُمْ لَحَافِظِينَ * كِرَامًا كَاتِبِينَ * يَعْلَمُــونَ مَــا تَفْعَلُــونَ... الانفطــار:١٠-١٢) واتــە: ئێــوە چــاودێریتان لەســەر دانــراوە. لــە فریشــتە بــەڕێزە تۆمارکارەکــان. هەرچــی کارێــك ئــەنجام بــدەن ئــەوان لای خۆیــان تۆمــا ری دەکــەن وە ئاگاداری هەموو کارو گوفتارێکتانن.

---

ســوپاس گــوزاری خــودا دەکــەن وبــاوەڕی پتــەویان بــە خــودا هەیــە. وەداوای لــێ خــۆش بــوون دەکــەن بــۆ بــاوەڕداران ودەڵــێن: پــەروەردگار ڕەحمــەت ومیهــری تــۆ ،زانســت وزانیــاری تــۆ هــەموو شــتێکی پــێ گرتووەتــەوە. کــەوابوو خۆشــببە لــە وانــەی تەوبــەیان کــردووەو پاشــەگەزبوونەتەوەو شــوێنی بەرنامەکــەت کــەوتوون ، وەلــە ئــاگری دۆزەخ بیــان پــارێزە. پــەروەردگارا بیــان خــەرە نــەو بــاخ وباخاتــەی بەهەشــتی عەدەنــەوە کــە بــەڵێنت پــێ داون و هــاوڕێ لەگــەڵ ئەوکەســانەی کــە خوانــاس وچــاکن، لــەباوك ودایــك وهاوســەرو نــەوەکانیان. بەڕاستی بەتەنها هەر تۆ خاوەن بالادەست وتوانایت.

واتــه شــەرم لــەو پارێزگــارە بەڕێزانــە بکــەن ، وەبــەکردەوەی ناشایســتە نارەحــەتیان مەکــەن کەتەنانــەت حەزناکــەن کەســی وەکــو خۆتــان ببینێــت. واتـــە ئەگـــەر مـــرۆڤ بـــەبینینی تاوانکـــاری دەبێـــت ،بەهـــەمان شـــێوە فریشتەکانیش بەبینینی تاوانکاری ئازاریان پێ دەگات ونارەحەت دەبن.

## ٥٦- تـــاوان هێنـــەرو ڕاکێشـــەری کەرەســـەکانی لەناوچـــوونی مـــرۆڤن لـــە دونیاو قیامەتدا :

تـــاوان خـــۆی لەخۆیـــدا نەخۆشـــی یـــەکی کوشـــندەیە گـــەر بێتـــوو بەتـــەواوی توشـــی مـــرۆڤ بێـــت. هـــەروەکو چـــۆن جەســـتە بـــەخۆراکی بـــاش وچـــاك بـــــەهێزدەبێت ، وەلـــــە ڕێگـــــەی دەرەچـــــەوە لەســـــەرجەم پاشـــــەڕۆیە زیانبەخشـــەکان دەربـــازی دەبێـــت، جـــا ئەگـــەر ئـــەو دەرەچـــانە نەبووایـــە پاشەڕۆ زیان بەخشەکان بەهیلاکی دەبردن.

## دڵ بە باوەڕوکرداری چاکە زیندوو دەبێتەوە

بەهـــەمان شـــێوەش دڵ پێویســـتی بـــە خـــۆراکی تایبـــەتی خـــۆی هەیـــە تـــا بـــەهێزوپاراوبێت کـــە بـــریتی یـــە لـــە"بـــاوەڕ وکـــرداری چـــاکە خـــوازی". وەلەهـــەمان کاتـــدا پێویســـتی بەدەرچـــەیەك هەیـــە بـــۆ دەربـــازبوون لـــەکردەوە ناشایستەکان کە بریتی یە لە"تەوبەی نەسوح".

جـا "تقـوى" ناوێکـە بـۆ هەرسـێ کـارە سـەرەکی یەکـە (بـاوەڕو کـرداری چـاکەوتەوبەی نەسـوح) وە لـە پێـك هێنـەرەکانی تـەقوان. جـا هەریـەك لـەم سـێ بنەمایـە لاوازبـوو وکـەمی کـرد ،ئـەوا کـزی وکـەم وکـورتی ڕوودەکاتـە تـەقوای ئـەو کەسـە. جـا تـاوان وتاوانکـاری دژەتەقوایـە واتـە ڕوخێنـەرو دژی پێکهێنـەرەکانیتی. بگـرە هۆکـاری لـەناوبردنی هەریەکەیانـە. جـا هـەرکاتێ نەخۆشـی تـاوان شـالآوی هێنـا بـۆ مـرۆڤ ئـەوا کردارەکـانی دەشـێوێنێت وتەوبەکردن ڕادەگرێت وتەندروستی دڵ وباوەڕ دەشێوێنێت.

جـا پێویسـته خۆمـان لەنەخۆشـی تـاوان وتاوانکـاری بپـارێزین تـا دڵ ودەرونمـان سـەلامەت دەبێـت زیـاتر لـەوەی کەجەسـتەمان دەپـارێزین. هەروەکو شاعیرێك دەڵێت:

جسمك بالحمية حضته مخافة من ألم ضـــارى

وكان اولى بك ان تحمي من المعاصي خشية البارى

واته: تۆ جەستەی خۆت دەپارێزیت لە ترسی ئازارێکی لەناکاودا

باشتر وایە لەپێشدا خۆت لە تاوان بپارێزیت لەترسی خودا

جـا هەرکەسـێك تـوانی خـۆی بپارێزێـت بـە گوێڕایـەڵی ودوورکەوتنـەوە لـە یاسـاغەکانی خـودا بەتەوبـەکردن وەبـە لەدەسـت نـەدانی خێروچـاکەخوازی، ئەوا دوور دەبێت لە مترسی یەکانی تاوان وتاوانکاری.

## سزا شەرعیەکانی تاوان

جـا ئەگـەر کەسـێك ئـەم سـزایانە نەیترسـاندووەو کاریگـەری لەسـەر نـەبووە ئەوا با فریایی خۆی بکەوێت.

## سزا شەرعیەکان

سـزا شـەرعیەکان کـە خـوای گـەورەو پێغەمبـەرﷺ دایاننـاوە بـۆ لەتۆڵـەی تاوانکـاری وتاوانبارانـدا، وەك دەسـت دزی بـڕین و وەهـەروەها بـڕینی دەسـت وپێـی ڕێگـرو چـەتەکردن و بـەتالآن بردنـی مـاڵ وسـامان وکوشـتن ولێـدانی قامچـی ولـەت کردنـی پێسـت لەتۆڵـەی هەڵبەسـتنی کـاری نـاڕەوا بـۆ ئافرەتـانی داوێـن پـاك. وەبـەردباران کردنـی پیـاوێکی زیناکـەرو وەدارکـاری کردنـی گـەنجی زیناکـەر و دوورخسـتنەوەی بـۆ دەرەوەی وڵات بـۆ مـاوەی سـاڵێك وەلـە سێ دارەدانـی کەسێك کـە دەسـت درێـژی بکاتـە سـەر کچ یـان دایـك یـان خوشـکی...هتـد لـە نزیکـەکانی خانەوادەکـەی خـۆی یـان هەڵگەڕانـەوەو دەسـت لەنوێژهـەڵگرتن.. هـەروەها کوشـتنی نێربـاز لەبکـەرو پێکـراو...هتـد.

وەچـەندینی تـر لـەجۆرەکانی سـزا. کەبـەپێی لێکەوتنـەوەی خراپـە سـزاکەی بۆ دارێژراوە.

جـا هـەر تاوانێـك هـەڵقولاّوی سروشـتی کەسـەکە نـەبێت ،تـەنها سـزایەکی "تعـدزیر" ی هەیـە. وەك خواردنـەوەی خـوێن ، یـان خـواردنی گۆشـتی مـردوو...هتـد ، بـەلاّم ئەگـەر هـەڵقولاّوی سروشـتی کەسـە کـەبوو وەك زینـا ئـەوا سـزاکەی گـەورەترە ، چـونکە مەترسـیدارترە لەسـەر بەرژەوەنـدی گشتی.

لێـرەدا تەماشـای دانـای خـوای گـەورە بکـە لـە دەسـت نیشـان کردنـی جـۆری سـزاکە ، بـۆ نمونـە ئـەو ئەندامـەی بـەکاهێناوە لـەو تاوانـەدا سـزای تایبـەتی بەردەکـەوێت هـەروەکو لەدەسـت بـڕینی دزدا هەیـە، چـونکە دزی خراپەیـەکی گەورەیـە ، بـەلاّم ئەگـەر سـزادانی ئـەو ئەنـدامی جەسـتەیە زۆر گـەورەتر بـوو وەخراپـەکانی زیـاتر بـوو ئـەوا سـزاکە دەگۆڕدرێـت بـۆ هـەموو جەسـتەی. وەك سـزای کەسـێك کـە بوهتـانێکی نـاڕەوا هەڵبەسـتێت بـۆ ئـافرەتێکی داوێـن پـاك کەلـەم تاوانـەدا زمـانی بـەکارهێناوە ، خۆناکرێـت لەتۆڵـەی دا زمـانی ببڕدرێـت، چـونکە شـوێنەوارو خراپەکـەی زۆر زیـادە لەسـەر کەسـەکە، هەربۆیـە بەبەرکـەوتنی سـەرجەم جەسـتەی بـە سـزای لێدانی حەد دیاری کراوە.

جـا ئەگـەر ووتـرا: ئـەی بۆ لەسزای کەسـی داوێـن پـیس وزیناکـاردا ،داوێـنی نابڕدرێت یان ناشێوێنرێت؟

لەوەلاّمدا وتراوە: لەبەر چەند لایەنێك:

یەکـەم: بـەبڕین یـان شـێواندنی داوێـن شـوێنەوارێکی زۆر خراپـی لـێ دەکەوێتـەوە کـە گـەورەترە لـەتاوانی زینـا وەلـە بنبڕکردنـی وەچـەونەوەی ئادەمیزادو بە هیلاك بردنی ئەوکەسەدا.

دووەم: داوێـن وعـەورەت ئەنـدامێکی هەسـتیاری داپۆشـراوی ئـادەمیزادە، بـەبڕینی یـان شـێواندنی ئـەو ئامانجـە ناپێکێـت لـەوەی خـەڵکی بـەبینینی

کەسەکە پەندو عیبرەت وەربگرێت، چونکە عەورەت وداوێن داپۆشراون ونابینرێت.

سێ یەم: ئەگەر دەستی دزێکی دیارو ناسراو بڕدرا ،ئەوا دەستێکی تری هەیە کە دەتوانێت کاری پێ بکات، بەلاّم داوێن وعەورەت تەنها یەك دانەیە بەبڕینی هیچی تر نی یە کاری ئەوە بکاتەوە.

چوارەم: چێژوخۆشی زینا هەموو جەستەی گرتۆتەوە ،جا پێویستە هەموو جەستە سزا بدرێت نەك تەنها یەك ئەندام لەلەش.

جا سزای خوای گەورە بەجوانترین و پوختترین شێواز داڕێژراوە کەبەرژەوەندی هەموو لایەك دەپارێزێت.

**پوختەی مەبەست:**

تاوان وتاوانکاری سزای لەتۆڵەدا دەدرێت جا سزای شەرعی بێت یان قەدەری، یان هەردووکیان پێکەوە ،یاخود خوای گەورە بەهۆی تەوبەکردن وچاکەکاریەوە لێیان خۆش دەبێت.

## جۆرەکانی سزا

سزای تاوانەکان دوو جۆرن:

**سزا شەرعیەکان وقەدەریەکان...**

**ئەگەر سزا شەرعیەکان ئەنجام دران** بەسەرتاوانباردا ،ئەوا سزا قەدەریەکان هەڵدەگیرێت ونامێنێت یاخود سوك دەبێت، چونکە کەم جار خوای گەورە هەردوو جۆری سزاکە دەسەپێنێت بەسەر بەندەکانی. ئەویش لەحاڵەتێکدایە کەسی تاوانبار شایستەی هەردوو جۆرەکە بێت. جا هەرکاتێك بەربەست هەبوو لەبەدەم جێ بەجێ کردنی سزاشەرعیەکاندا ،لەو کاتەدا سزاقەدەریەکان دێتە کایەوەو دوور نی یە سەختر بێت لەوی تریان یان سوکتربێت، بەلاّم خاسیەتی سزا قەدەریەکان ئەوەیە کە گشتی یەو هەمووان دەگرێتەوە، بەپێچەوانەی سزا شەرعیەکان تایبەتە بەکەسی

تاوانبـــارەوە، چـــونكە خـــوای گـــەورە بـــە ســـزا قەدەریـــەكان هـــەمووان سزادەدات.

**بـــەڵام ســـزا قەدەریـــەكان:** ئـــەوا توشـــی تـــاك وكۆمـــەڵ دەبێـــت بەتایبـــەتی وگشـــتیش ، چـــونكە هـــەركاتێ تاوانكـــاری وسەرپێچـــی بـــە نهـــێنی ئـــەنجام دراو ئاشـــكرا نـــەكرا،ئـــەوا زیـــان وزەرەری تـــەنها بـــۆ ئەنجامدەرەكـــەی دەبێـــت ، بـــەڵام ئەگـــەر هـــاتوو تاوانكـــاری وسەرپێچـــی ئاشـــكراكراو خـــەڵكی بەگشـــتی ڕێگرییـــان لێ نەكرد ئەوا دوور نی یە هەرهەموویان توشی سزای خودای گەورە ببن.

## جۆرەكانی سزا شەرعیەكان

هـــەروەكو پێشـــتر ڕوونمـــان كـــردەوە كـــە ســـزا شـــەرعیەكان خـــوای گـــەورە لـــە بەرامبـــەر ڕادەی زیـــان ومەفســـەدەی تاوانكاریـــەك داینـــاوە كـــە بـــریتین لەســـێ جۆر: (لە سێ دارەدان ، بڕین ، داركاری) [1].

لـــە ســـێ دارەدان: بـــۆ دژی تـــاوانی"كفـــرە" كـــە ئـــاین تێـــك دەدات ،وەزینـــاو نێربازی یە كە وەچە تێك دەدات.[2]

(امـــام احمـــد) دەڵێـــت: لـــە دوای كوشـــتن مـــن تـــاوانێكی بـــە گـــەورەتر نـــازانم جگـــە لـــەداوێن پیســـی"زینـــا" وەبەڵگـــەی لەســـەر ئـــەم ووتەیـــە فـــەرموودەی (عبـــدالله بـــن مســـعودؓ) ە، كـــە لەپێغەمبـــەری پرســـیوە: (**یارســـول الله أي الـــذنب أعظـــم؟ قـــالﷺ: ان تجعـــل لله نـــداً وهـــو خلقـــك، قـــال: قلـــت: ثـــم أي؟ قـــالﷺ: ان تقتـــل ولـــدك مخافـــة ان يطعـــم معـــك. قـــال: قلـــت: ثـــم أي؟ قـــالﷺ ان تزنـــي بحليلـــة جـــارك.**) [3] واتـــە: ئـــەی پێغەمبـــەرﷺ كـــام تـــاوان بـــە

---

[1] – ئـەم سـزایە بـۆ تاوانـە گەورەكانـە، بـەڵام بـۆ بچـوكەكان تـەنها سەرزەنشـت كردنـە بـەپێی حاڵەتی تاوانباریەكەی.

[2] –دیـارە هـەموو كـافرێكیش لەئیسـلامدا ناكوژرێـت، چـونكە كـافر جـۆری هەیـە. تـەنها شـەڕكەریان دەكوژرێـت كـەڕێگرو شـەڕكەرە لەبەرامبـەر ئیسـلامدا، چـونكە كافرمـان هەیـە "مسالم"یە وەهەیە"متحالفا". "وەرگێڕ"

[3] –ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە، (بخاری:٤٤٧٧)و (مسلم:٨٣/٢ نووی)گێڕاویەتیەوە.

گەورەترین تاوان دەژمێردرێت؟ فەرمووی: شەریك وهاوەڵ بۆ خودا بڕیاردان. دیسان ووتی چیتر؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کوشتنی منداڵەکەت لە ترسی برسێتی دا. دیسان ووتی چیتر؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: زینا بکەیت لەگەڵ هاوسەروحەلاڵی دراوسێ کەتدا.

وەخوای گەورە وەك پشت ڕاست کردنەوەی ئەمە دەفەرمێت: (وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ... الفرقان:٦٨) واتە: هەروەها ئەوانەی لە پەرستندا هاوبەشی بۆ خودا بڕیارنادەن ، وەکەسیش بەناحەق ناکوژن کە خودا کوشتنی حەرام کردووەوزینا ناکەن، بەلاّم ئەوانەی ئەم کارە خراپانە ئەنجام بدات ئەوا توشی سزاو ئازارو ڕیسوای دەبێت.

## گەورەترین تاوانە گەورەکان

پێغەمبەرﷺ لەسەر ئەو پرسیارەی لێ کرا جۆرەکانی تاوانەگەورەکانی خستە ڕوو کەبەم شێوەیە:_

**گەورەترین جۆری شیرك:** بریتی یە لە هاوبەش وهاوتایەك بۆ خودا بڕیاربدەیت.

**گەورەترین جۆری کوشتن:** بریتی یە لەکوشتنی منداڵەکەت لەترسی برسێتیدا، کەهاوبەشت بێت لەخواردن وخواردنەوە.

---

امام نووی دەڵێت: لەم فەرمودەیەدا دەست نیشانی تاوانە گەورەکان دەکات کەبریتین لە: هاوەڵ وشەریك بۆ خودا بڕیاردان، هەروەها کوشتنی بەناحەق.
بەلاّم جگە لەشەریك پەیدا کردن وکوشتنی ناحەق، ئیتر چی تر هەیە لەزیناو نێربازی ، ڕیبا خواردن"سو" وەئازارادانی دایك وباوك، جادوگەری ،بوهتان کردن بەکچانی داوێن پاك. هەڵهاتن لەبەرەکانی جەنگ، وەجۆرەکانی تر لەتاوانە گەورەکان ، ئەوا بەپێی جۆر وڕێژەو ئەندازە وهۆکاری تاوانەکەیان حوکم ویاسای تایبەتی خۆیانیان هەیە، وەکاتێك بەمانە دەوترێت تاوانە گەورەکان مەبەست لێرەدا وەك ئەوەیە بلێیت لەبەرامبەر ئەمەدا (کارو چاکە گەورەکان)هەیە، بۆیە دەوترێت تاوانە گەورەکان... والله أعلم. (شرح مسلم: ٨٤/٢).

**گەورەترین جۆری زینا**: بریتی یە لەزیناکردن بەهاوسەروحەلاڵی دراوسێکەت.

واتە زینا کردن جۆری هەیە ، جا زیناکردن لەگەڵ ئافرەتێکدا کەهاوسەرومێردی هەبێت زۆرگەورەترە لەکچێك و ئافرەتێك کە هاوسەری نەبێت، چونکە بەئەنجامدانی ئەم کارە تۆ خیانەت لە حەلاڵی کەسێك دەکەیت وسەرجێگەی دەشێوێنیت وەهەرچەندە وەچەو نەوەی تێکەڵ ودەشێوێنیت. جا زینا کردن لەگەڵ ئافرەت وهاوسەری دراوسێ کەتدا زۆر مەترسیدارترو گەورەترە لەلای خوای گەورە لەگەڵ زیناکردن لەگەڵ سەد ئافرەتی بێ مێرد دا ، چونکە هەربەوەی کە مێردەکەی دراوسێتە ئیتر چەندین ماف پێشێل دەکەیت کەلە هەرەتاوانە گەورەکانە. وەپێغەمبەری خوداﷺ دەفەرمێت: (لایدخل الجنة من لا یأمن جاه بوائقه.)[1] واتە: ناچێتە بەهەشتەوە ئەوەی دراوسێ کەی لەشەڕو خراپەی ئەمین نەبێت.

جا بەئەندازەی دووری ونزیکی کەسەکان ڕێژە تاوانکاریەکە گەورەتردەبێتەوە. بۆ نمونە: ئەگەر زینا بکەیت بەرامبەر دراوسێ کەت، ئەگەر خزم وکەست بن ئەوا زیاتر لەڕێژەی تاوانەکە زیاد دەکات لەپێشێل کردنی مافی تر...

جا ئەگەر"مێردی ئافرەتەکە" دراوسێتانەو زینات کردووە لەگەڵی لە ماڵ دەرچووبێت یان بۆ شارێك چووبێت بۆ"نوێژ ، خوێندنەوەو وەرگرتنی زانست ، کار ،جیهاد" ئەوا تاوانەکە زیاتر دەبێت. تەنانەت ئەگەر زینا لەگەڵ خێزانی تێکۆشەرێکدا بکەیت کەلە پێناو خودادا تێ دەکۆشێت ،

[1] -ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(مسلم: ٢/٢٠نووی)گێڕاویەتیەوە لە فەرموودەی(ابی هریره) وە(بخاری: ٦٠١٦)بەم جۆرە گێڕاویانەتەوە: (والله لایؤمن ، والله لایؤمن، قیل:من یارسول اللهﷺ: الذي لایأمن جاره بوائقة)واتە: وەالله ی باوەڕی نی یە، والله ی باوەڕی نی یە. ووتیان: کێ ئەی پێغەمبەری خودا ؟ فەرمووی: ئەو کەسەی درواسێ کەی لەشەڕی پارێزراو نەبێت.

ئـــەوا لەقیامەتـــدا بەتێکۆشـــەرەکە دەوترێـــت: (خـــذ مـــن حـــسناته ماشـــئت. قـــال الـــنبي: فمـــا ظـــنكم؟)[1] واتـــە: بـــەئارەزووی خـــۆت لەخێروچـــاکەکانی بـــەرە چـــەندت دەتـــەوێ. وەپێغەمبـــەر فـــەرمووی: ئایـــا پێتـــان وایـــە هیـــچی بـــۆ جـــێ دەهێڵێـــت؟ واتـــە: ئایـــا گومـــان دەبـــەن لەوکاتـــەدا بـــاوك خواخوایـــەتی مـــافێکی لـــەلای منداڵەکـــەی بێـــت تـــا لێـــی وەربگرێتـــەوە، ئایـــا لەوکاتـــە نارەحەتـــدا هـــیچ خێرێك بۆ کابرای زیناکەر دەهێڵێتەوە؟ بێ گومان نەخێر.

جـا ئەگـەر ئـەو ئافرەتـەی زینـات کـرد لەگەڵیـدا لەکـەس وکـاری خـۆت بێـت ،ئـەوا تاوانەکـە زیـاتر دەکـات بـەوەی کـە خیانـەت وناپاکیـشت کـرد لـە خـزم وکـەس وکارەکـەت. وەئەگـەر کەشـی زیناکـەر خێزانـدار بێـت، ئـەوا تاوانەکـە زیـاتر گـەورەتر دەبێـت لەسـەری. خـۆ ئەگـەر زیناکـەر بەتەمـەن وپیربێـت ، ئـەوا لەهـەمووی خـراپترو گـەورەترو مەترسـیدار تـرە. وەبەیـەکێك لـەو سـێ کەسـە دادەنرێـت کـە خـوای گـەورە لـە ڕۆژی قیامەتـدا تەماشـایان ناکـات، نەقـسەیان لەگەڵـدا دەکـات وەنـە پـشتیوانیان دەکـات وسـزایەکی سـەختی بـۆ بڕیـاردەدات کـە پێغەمبـەر دەفـەرمێت: (ثـلاث لایکلمهـم الله یـوم القیامـةولا یـزکیهم. قـال أبـو معاویـة: ولاینظـر إلـیهم ولهـم عـذاب ألـیم: شـیخ زان ،وملـك کـذب، وعائـل مـستکبر.)[2] واتـە: سـێ کـەس لەقیامەتـدا خـوای گـەورە

[1] -ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(مسلم: ۱۳/٤٦نووی) گێڕاویەتیەوە.

[2] -ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(مسلم: ۱۱٦/۲)گێڕاویەتیەوە لەفەرموودەی (ابی هریرە).

وە(امام نووی) دەڵێت: قـسەی چـاکەو باشـەیان لـەگەڵـدا ناکـات ، بـەڵکو بـەزمانی تونـدو تیـژ وتوڕەییـەوە قـسەیان لـەگەڵـدا دەکـات. وەجـەماوەری ڕاڤـەکاران"جمهـور المفـسرین" پێیـان وایـە کـە : مەبەسـت لـەوەی کـە قـسەیان لـەگەڵـدا ناکـات ، واتـا بەشـێوازێك نادوێـت تـا سـودمەند ودڵ خۆش بن. وە ووتراوە کە:فریشتەکان پێشوازیان لێ ناکەن وبەخێرهاتنیان ناکەن.

وەمەبەسـت لـە"تەماشـایان ناکـات" واتـە: ڕوویـان تـێ ناکـات، چـونکە تەماشـاکردنی خـوای گەورە لەو ڕۆژەدا واتای ڕژاندنی سۆز ومیهرەبانی بۆیان.

وەمەبەسـت لـە"پێشوازیان ناکـات"(زجـاج) دەڵێـت: واتـا ستایـشیان ناکـات. وەوتـراوە : واتـە پاکیان ناکاتەوە لە پیسی وژەنگی تاوانکاری.

نەقسەیان لەگەڵ دەکات نە پشتیوانیان دەکات "معاویە دەڵێت":وەنە تەماشایان دەکات، وەسزایەکی توندوتیژیان هەیە بریتی یە لە: پیرێکی زیناکەر، دەسەلاتدارێکی درۆزنکار، هەژارێکی لووت بەرزو خۆ بەزل زان.

جا کات وشوێن وجێگاش ڕۆڵی خۆی هەیە لەزیادکردنی قەبارەی تاوانەکەدا. بۆنمونە ئەگەر ئەو تاوانکاریە لە مانگی حەرام وڕەمەزاندا بێت، یاخود لەشاری مەککەی پیرۆزدا بێت ، یان کاتێکی مەزن وپیرۆز لەلای خودا گەورە بێت وەك کاتی نوێژ یان گیراوقبوڵ بوونی نزا...کەواتە بەپێی ئەم هۆکارانە کاریگەری زیادوکەمی یان گەورەیی وبچوکی قەبارەی زیانی تاوانەکە دەردەکەوێت وپلەداردەکرێت. خودا پشت وپەنامان بێت.

## حیکمەت ودانایی لەبڕینی دەستی دزدا[1]

خوای گەورە دەست بڕینی دزی کردۆتە سزایەك بۆ ئەوبەدکاریەو تاوانکاریەی کە لەشێوە ودیمەنی پشیلەو ماردایە کەهەر نازانێت چۆن ولەکوێ پەیدا دەبن وکاری چەپەڵی خۆی ئەنجام دەدات وبەرهەمی

---

وە(قاضي عياض)دەڵێت: ئەمە زەنگی مەترسی یە هەرسێکیان جۆرە تاوانێکیان ئەنجام داوە کە نەدەبوو بیان کردایە ، چونکە دووری هەیە لەنێوان خودی خۆیان وتاوانەکەیاندا ، چونکە هیچ پێویستیان پێیان نی یە وبیانووی ئەنجام دانی ئەم تاوانەیان نی یە، لەکاتێکدا پێویست بوو هەر سێکیان زیاتر ڕوویان بکردایەت خوای گەورە.
بابەتی"پیری زینا کەر" کە ژیری بەرەو پوختی دەچێت و حەزو ئارەزووی کەم دەبێتەوە و تەمەنی بەسەر چووەو لە مردن نزیك بووەتەوە، لەهەمان کاتدا حەزوئارەزووی سێکسی تەنگی پێ هەڵچنیوە وەك لاوێك ، پاشان کە حەلاڵی خۆی هەیە بۆ پەنا دەبات بۆ ئەم کارە.... بڕوانە شەرحی نووی بۆ "مسلم : ۱۱۹/۲).

[1] – تێبینی ئەوە دەکرێت کە هەموو دزێك دەستی نابڕێتەوە، چونکە سیاقی ئایەتە قورئانیەکە بە (السارق والسارقة )واتە سەرەتای بە (الف ولام)ی مەعریفە دەست پێ کردووە. واتە کەسێك کە پیشەی هەمیشەیی بریتیبێت لەدزی وە ناسرابێت بەم کارە چەپەڵە. وەدوور بێت لەسەردەمی گرانی ونەهامەتی وبرسێتی ووەبیانووی تەواوی نەبێت لەسەر ئەنجام دانی ئەم کارە، چونکە لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب ئەم حوکمی دەست بڕینی دزە هەڵگیرا بەهۆی بڵاوبوونەوەی بێ کاری وبرسێتی وگرانی بەسەر ولاتدا. "وەرگێڕ"

مانــدووبوون وهــەوڵ وكۆششــی چــەندین ســاڵەی مرۆڤــەكان بەناحــەق دەبــات ومـاڵی خــەڵكی كـاول دەكـات. هەربۆیــە خــوای گــەورە ســزای داوە بــە بڕینــی ئــەو ئەندامــەی كــە كـاری دزی پــێ ئــەنجام دەدات، وەسـزای كوشـتن ودارکـاری لەم دوور خستۆتەوە.

## جۆرەكانی كەفارەتی تاوان

خــوای گــەورە بــۆ لــێ خــۆش بــوون لەتاوانــەكان كــەفارەتی دانــاوە وەك بەرامبــەرێك و نیــەت ســافیەك بــۆ لێخۆشــبون لــە تاوانــەكان. هــەروەكو ســێ جـۆر سـزا هەیـە لـە هـەموو تاوانـە گـەورەكان. بـە هـەمان شـێوەش سـێ جـۆرە كـەفارەت هەیـە كـەفارەت هەیـە كـە بـریتین لـە (ڕزگـاركردن – خـواردن دان– ڕۆژووگـرتن) ڕزگـار كـردن مەبەسـت لێـی –ڕزگـاركردنی بەندەیەكـە مرۆڤێكـی كۆیلە ئازادی بكەیت وەنان دان و خواردن و بەخشاندنەوە

### بەشەكانی تاوانكاری بە پێی كەفارەتەكەی

خوای گەورە تاوانكاریەكانی كردووە بە سێ بەشەوە.

**بەشــی یەكــەم:** كــە ســزای حــەد (الحـد) ی بـۆ دانـاوە پێویسـتی بـە كەفارەت نەكردووە.

**بەشـــی دووەم:** پێویســـتی بـــە (حـــەد) نـــەكردووە لـــە بـــری ئـــەوە كــەفارەتی بــۆ دانــاوە.وەكــو تاوانــەكانی (چــونە لای خێــزان لــە ڕۆژانــی مــانگی ڕەمــەزان) و كــاتی ئیحــرام پۆشــین لــە حــەج و عــەمرە دا ) وە كوشتنی بێمەبەست و سوێند خواردن بە درۆ.

وە **بەشـی سـێ یـەم:** كـە نـە پێویسـتی بـە كـەفارەت هەیـە وە نـە (حـەد) یش كە ئەمەش دەبێتە دوو بەشەوە:

١. ئەوانەی کە قەدەغە کردنیان سروشتییەو هەر لە سروشتی مرۆڤ دان نەشیاوە وەك: خواردنی پیسایی و خواردنەوەی میز و خوێن.

٢. جۆرێکە مەفسەدەو خراپیەکەی کەمتر بێت لە ئاستی ئەوەی کە پێویست بە (حەد) بکات ،وەك نەزر کردن و ماچ کردن و بەرکەوتن ،قسەکردن-وە دزی بچوك (دزینی پارەی کەم) و هاوشێوەکان.

## ئەو جۆرەی کە کەفارەتی پێویستە

ئەو جۆرەی کە کەفارەتی پێویستە سێ جۆرە:_

یەکەم: ئەو کارەی کەلە بنەڕەتدا موباحە وڕێپێدراوە، بەلأم دواتر لەکاتێکدا یان دواتر بۆ ماوەیەك قەدەغەو حەرام کراوە. وەکو چوونە لای خێزان لەکاتی ئیحرامی حەج وڕۆژووگرتندا. بەلأم زانایان لە چوونەلای ئافرەت لەکاتی"بێ نوێژی-سوڕی مانگانە"دا ،ناکۆکن کەئایا لەم جۆرەیە یان حوکمی جیاوازترە.ئەمە لەبابەتی سەرزەنشت کراوەکانە. "زواجر"

دووەم: کارانێك وەکو"نەزرکردن بۆ خودا یان سوێندخواردن یان پەیماندانێك بەخودا"یان حەرام بوویەك کە بیەوێت حەلأڵی بکات، ئەوا *لەسزایدا خوای گەورە کەفارەتی بۆ داناوە وەناوی ناوە (تحلە)* ، جا ئەم کەفارەتە تاوانی ئەو بێ ڕێزی یە ناسڕێتەوەکە سوێندی بەدرۆ بەخودا خواردووە وەکو هەندێك لەزانایان گومان دەبەن. چونکە دەگونجێت سوێند خواردن واجب بێت، وەهەندێ حاڵەتیش "موستەحەب"بێت یان "مباح"بێت، بەڵکو کەفارەتەکە حەلأڵ کردنی بەڵێنەکەیە.

ئەمەیان لەبابەتی حەڵاڵ کردنی "تحله".

سێ یەم: ئەو شتانەی کە پێویستی بەقەرەبوو هەیە وەك کوشتنی بێ مەبەست، کوشتنی بێ مەبەست لەڕاوکردندا هەرچەندە باتاوانیش نەبێت. کەئەمانە لەبابەتی قەرەبووەکانن"الجوابر".[1]

## هیچ کاتێک لەسزای تاوانکاریدا ئەم شتانە کۆنابێتەوە

لە سزادانی کەسی تاوانکاردا هیچ کاتێك لەیەك کاتدا حەد وسەرزەنشت کردن کۆنابێتەوە. ئەوەی پێویستی بەسەر زەنشتە ئەوا حەدی ناوێت. ئەوەیشی حەدی ویست سەرزەنیشتی ناوێت. وەهەروەها ئەگەر کەفارەتی ویست ئەوا پێویستی بەحەد نی یە، وەئەگەر حەدی ویست ئەوا پێویستی بە کەفارەت نی یە.

## ئایا سزای سەرزەنشت کردن تعزیروکەفارەت کۆدەبێتەوە لەتاوانێکدا کە پێویست بە حەد نەکات؟

وەك چوونە لای خێزان لەکاتی ئیحرام ورۆژووگرتندا وسوری مانگانەدا"حەیز"کە پێویستی بەکەفارەت هەیە. لەم بارەدا دوو بۆچوون هەیە:

وتراوەکە: پێویستی بەسزای"تعزیر" هەیە کەیاساکانی پێشێل کردووە کە چووەتە لای خێزانی لەکاتی حەیزدا.

وە وتراوەکە: پێویست بە"تعزیر" ناکات تەنها کەفارەتی هەیە، چونکە کارەکە دەسرێتەوە وقەرەبوو کراوەتەوە.

---

[1] – کەفارەتی ئەم جۆرەیان: زواجر–سەرزەنشت کراوەکا. تحلە: حەڵاڵ کراوەکان. جوابر: قەرەبووکراوەکن. بڕوانە(فتح الباري: ١٢/٨٠، ١٨٤، ١٨٦).

## سزا قەدەریەکان

سزا قەدەریەکان دوو جۆرن. جۆرێکیان تایبەتە بەدڵ ودەرون، وەجۆرەکەی تریان تایبەتە بەجەستەومالٚ وسامان.

### ٥٧- سزا قەدەریەکانی تایبەت بە دڵ:

ئەوەی تایبەتە بەدڵەکان دووجۆرن:

یەکەمیان: ئێش وئازار بەدڵ دەگات.

دووەمیان: ڕێگرتن وبن برکردنی ئەو شتانەی کەژیانی دڵیان بەدەستە. جا ئەگەر ئەم حاڵەتە ڕوویدا ئەوادژەکانی دروست دەبن. جا ئازارو ئێشی دڵ لەهەموو ئێشەکانی تر بەئێش وئازارترەو بنەڕەتی سزای جەستەیە. جا ئەم سزایە کەم وزیاد دەکات، لەدڵەوە بۆ جەستە دەچێت وەلە جەستەشەوە بۆ دڵ دەچێت. جاکاتێک دەرون وڕوح لەجەستە جیادەبێتەوە ئەوکاتە سزاکە تایبەت دەبێت بە دڵ ودەرون کەپێی دەوترێت سزای گۆڕ یاخود جیهانی بەرزەخ. کە سزای ئەم جیهانە وەك سزای جیهانی دونیا وایە.

## جۆرەکانی سزا قەدەریەکان لەسەر جەستە

### ٥٨- سزا قەدەریەکان بەسەر جەستەدا:

دیسانەوە ئەم جۆرە سزایە دەکرێتە دوو بەشەوە:_

جۆرێکیان لە دونیادایە ، وەجۆرەکەی تریان لەقیامەتدایە. وەسەختی وبەردەوام بوونیان بەندە لەسەر ڕێژەی وجۆر وزۆری بەرئەنجامی ئەو خراپیەی کەلێی کەوتووەتەوە. وەلە بنەڕەتدا نەلە دونیاو نەلە قیامەتدا شەڕو خراپەکاری نی یە تەنها تاوانکاری وسزاکەی

نەبێت. وەبنەڕەتی هەموو تاوانێکیش شەڕو خراپەی دەرون وبەدکرداریە کەناوی خراپەو شەڕ بڕواتەوە بەسەر هەموویاندا.

وەهەر ئەو دووانەیە کە پێغەمبەرﷺ هەمیشە لەسەرەتای وتارەکانیدا پشت وپەنای دەبەست بەخودا لە مەترسیاندا کەدەیفەرموو: (ونعوذبالله من شرور أنفسنا ، وسيئات أعمالنا.)[1] واتە: پەنا بەخودا دەگرین لەشەڕو خراپەی دەرونمان وبەدکرداری کردوەکانمان.

جا بەدکرداری کردەوەکانمان "سيئات الاعمال"بەشێکە لەبەشە زۆر خراپەکانی دەرون، واتە دەرون "نفس" سەرچاوەی هەموو خراپەیەکە.

**واتای برگەی (وسيئات أعمالنا) لەفەرموودەکە:**

لە واتای ئەم برگەدا ڕای جیاواز هەیە کەئایا مەبەستی تەنها "کارە خراپەکانمانە"؟ وەك بلێی باسی لقێك بکات لەبنەمایەك لەڕەگەزی خۆی؟یاخود پیتی (من) بۆ زیاتر خستنەڕووکارەکە هاتووە؟

ڕایەك هەیە ووتراوە: واتاکەی لەوەدا کۆبووەتەوە کەپەنا بەخودا دەگرم لەهەموو شەڕێك کەسەرچاوەکەی دەرونە کەمایەی هێنانی بەلاوسزایە بۆسەر مرۆڤ. جا مەبەست لێرەدا پەناگرتنە لەسەرچاوەولقەکانی شەڕوخراپەومەبەستەکان وبەرئەنجامەکەی. هەربۆیە کاتێك فریشتەکانیش بۆ باوەڕداران دەپاڕێنەوە دەڵێن: (وَقِهِمُ السَّيِّئَاتِ وَمَن تَقِ السَّيِّئَاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُ... غافر: ٩)

---

[1] – ئەمە بەشێکە لەفەرموودەیەکی درێژی(صحيح)(اصحاب السنن) وەکەسانی تریش گێڕاویانەتەوە. وەشیخ الیانی دەڵێت:وەبەڕاستی سەلمێنراوە لە پێغەمبەرەوە کە ئەم فەرموودەیەی فێری هاوەڵانی دەکرد کەلە ووتار ودەست پێکی گوتارەکانیاندا بیلێنەوەو وەك پێشەکی یەك پشتی پێ ببەستن لە داواکاریەکانیاندا. ا هـ، بڕوانە (مقدمە حقيقە الصيام:ص٩).

واتـــه:خوادايـــه لەخراپەوخراپـــەكاری بيـــان پـــارێزه، وەهەركەســێكت لەخراپەوخراپـــەكاری پاراســـت واتـــه ڕەحـــم وميهـــری خـــۆت ڕژانـــدووه بەسەريدا.

جا ئەم نزايه لەم ئايەته پيرۆزەدا دووشتی لەخۆ گرتووه:

يەكـــەميان پاراســـتنيانه لەخراپـــەی كردەوەكـــان ، دووەميـــان لەتۆڵـــەو ســـزای خراپـــەی كردەوەكـــان كـــەژيانی مـــرۆڤ دەشـــێوێنێت. جاكەواتـــه هـــەركاتێك خـــودای گـــەورە مرۆڤـــی پاراســـت لەبـــەدكاری، ئـــەوا ڕاستەوخۆ دەيپارێزێـــت لەتۆڵەوســـزای بەدكاريەكانيشـــی. هەرچـــەندە ئـــەم ئايەتـــه پـــيرۆزه ئامـــاژه بـــۆ ئـــەوه دەكـــات كـــەبۆ تـــێ نەكـــەوتن لەتۆڵەوســـزای كارەكانمـــان، پێويســـته خۆمـــان لەخراپـــەكاری بپـــارێزين وخـــوای گـــەورەش بمان پارێزێت.

جـا ئەگـەر ووتـرا: مەبەسـت لـەم نزايـه پاراسـتنی مرۆڤـه لەسـزاكانی دۆزەخ، كەواتـــه خراپـــەكان"السـيئات" مەبەســـت لێـــی خراپەكارييـــەو بـەدكاری يـه، واتـه ئـەوەی فريشـتەكان بـۆت دەپارێنـەوه هـەمان مەبەسـته كـه پێغەمبـەرﷺ پـەنای گرتـووه لێـی. جـا لێـرەدا ووشـەی (يَوْمَئِـذٍ) واتـه لـــەوڕۆژەدا ڕەدی ئـــەم بۆچـــوونه نادرێتـــەوه، بـــەڵكو مەبەســـت لێـــی پاراسـتنی لەخراپـەكاری وبـەدكاری يـه لـەوڕۆژەدا، كەبريتيـه لـه خراپـەكان لەدەروندا.

وه ووتراوه: پاراستن لەخراپەكان دوو جۆره:

١. پاراستن لەئەنجام نەدانی بەدكاری وخراپەكاری.

٢. پاراســـتن لـــه تۆڵـــەو ســـزای بـــەدكاری ئەگـــەر ئـــەنجام درا ، بـــەلێخۆش بوون.

كه ئەم ئايەته پيرۆزه هەردوو داواكاريەكەی لەخۆگرتووه.

جا با لەناوەڕۆکی ئەم داواکارییەی فریشتەکان ورد بینەوە لەو ئایەتە پیرۆزەدا. چۆن چۆنی باسی گەورەیی باوەڕوباوەڕداران دەکەن و کردەوەی چاکە دەنرخێنن وداوای لێ خۆش بوون بۆ باوەڕداران دەکەنوەلە میانەی نزاو پاڕانەوەکەیانسدا لە خودای میهرەبان دەپاڕێنەوە کە خاوەنی زانست وسۆزو میهرەبانی یە. زانیارە بەلاوازی مرۆڤ وسەرسەختی دوژمنەکەیان، بەحەزو ئارەزووەکانیان، بەسەرچاوەی تاوانەکانیان.کە بەمیهرەبانی وزانیاری خۆی کاتێك کە کۆرپەلەی لەسکی دایکیدا گەورەی کردن و وەسۆزو ڕەحمەتی بەسەردا ڕشتن ، ئەو سۆزو ڕەحمەتەی کە هەموو جیهان وهەموو شتێکی داپۆشیوە. کەڕەحمیان پێ بکات وەباوەڕداران ویەکتاپەرستان توشی سزای کارەکانیان نەبن ، چونکە خوای گەورە خاوەنی فراوانی ڕەحمەتە. هەرکەسێك ئەو سۆزو میهرەبانیە نەیگرێتەوە ،ئەوا بەدکارترین وسەرلێشێواوترین مرۆڤە ،وەدواتر دەپاڕێنەوە تا خای گەورە لەتەوبەکاران خۆشبێت، کەبوونەتە ڕێبواری کروانی خواپەرستی ودەست بەرداری خراپەکاری بوونە ، دواتر داواو نزا دەکەن کە خوای گەورە لە تۆڵەو سزای دۆزەخ پارێزراویان بکات وەباوەڕداران بەخۆیان وهاوسەرەکانیانەوە بەبەهشتی بەرین شاد بکات.

خوای گەورە خاوەنی بەڵێن وپەیمانی خۆیەتی و وەبەڵێنی بەهەشتی پێ داون بەهۆی کۆمەڵێ هۆکارەوە.

پوختەکەی بریتی یە لەپاڕانەوەونزای فریشتەکان بۆیان کە خودا ڕەحم وبەزەییان بەسەردا برژێنێت وەبەوەش لەکارەکانیاندا سەرکەوتووبن تا فریشتەکانیش لەڕوانگەی کارەکانیانەوە بۆیان بپاڕێنەوە. پاشان فریشتەکان کۆتایی نزاوپاڕانەوەکەیان بەم برگە

پـیرۆزه تـەواو دەکـەن. (إنـك أنـت العزیـز الحكـیم) واتـە: بەڕاسـتی تـۆ عەزیزودانایت.

جـا "عزیـز"لـە (عزەتـەوە) هـاتووە، کـە کـەماڵی هێـزو قودرەتـە. وەدانـایش"الحكـیم" لوتکـەو کـەماڵی زانیـاری وزانسـتە. کەواتـە بـەم دووسـیفەتە پـیرۆز وشـکۆیە خـوای گـەورە بڕیـارو فـەرمان دەدات وەکارەکـان یـەکلا دەکاتـەوە، کەسەرچـاوەی هـەموو دروسـت کردنێـك وشەریعەت وفەرمانێکە.

**پوختەی مەبەست:**

تۆڵەوسـزای خراپـەکاری جۆراوجـۆرە لـە سـزا شـەرعیەکان ووسـزاقەدەریەکان کەتوشـی یـان دڵ دەبێـت یـاخود جەسـتە ،یـاخود هـەردووکیان لەیـەك کاتـدا ، وەهـەروەها سـزاکانی ژیـانی بـەرزەخ لـەپاش مـردن، وە سـزاکانی جەسـتە لـە ڕۆژی حەشـردا. جـا تاوانکـاری خـاڵی نـی یـە لەسـزا ،بـەڵام کەسـی تاوانکـار وەك سـەرخۆش وبـیێ هـۆش وایـە هەسـت بـەئازارو ئـێش ناکـات تاکاتێـك بەئاگادێتـەوە.جـا کەڵەکـەبوون وکۆبوونـەوەی سـزاکان لەسـەر یـەکتری ،نمونـەی زۆر مانـەوەی سـوتاوە لەنێو ئاگردا، وەمانەوەی خنکاو لەنێو ئاودا.

جـا زۆر کەسـی تاوانکـار هەسـت بەخراپـەکانی ناکـات ، چـونکە هـیچ دیاردەیـەك هەسـت پـیێ ناکـات،بـەڵام نازانێـت کـە ئەمـە کەمەنـدکێش کردنـە وەك کـاری لەسـەرخۆی ژەهـری کوشـندەوایە لەنێوجەسـتەدا. جـا ئەگـەر زوو فریـای چارەسـەرکردن کـەوێت،ئـەوا بەرەوچـاك بوونـەوە دەچـێت گـەر نـا ئـەوا ئـەوە بـەرەو هەڵـدێر و تیاچـوون هـەنگاودەنێت. جـا بەهـەمان شـێوە کەڵەکـەبوون وکۆبوونـەوەی تـاوان لەسـەر تـاوان مـرۆڤ توشـی تیاچوون دەکات...پەنادەگرین بەخوا.

## جۆرەکانی سزاقەدەریەکان لەسەر دڵ

لێرەدا هەندێك لە تۆڵەوسزاکان دەهێنمەوە یاد کەلەبەرئەنجامی تاوانکاریدا دروست دەبن بەئومێدی ئەوەی بێتە مایەی هەڵهاتن ودورگرتن لەتاوان وتاوانکاران.

### ٥٩- تاوان مایەی پەردەپۆش کردنی دڵ وبیستن وبینایی یە :

تاوان دڵەکان دادەخات ومۆری بێ ئاگایی لێ دەدات وەبینایی کوێردەکات وگوێیەکان کەڕدەکات هۆشو هەستی مرۆڤ لەناودەبات یادی خودا بیردەباتەوە، وەمرۆڤ خودی خۆشی لەبیر دەکاو دڵەکان ژەنگاوی دەکات ، سنگ وئاسۆ وبیرتەسك دەکاتەوە. دەردو نەخۆشی وبەلا بەسەر دڵ وجەستەدا دەبارێنێت و ئارەزووی جڵەوی دەسەلات بەدەست دەهێنێت ،ڕاستیەکان لەدەست دەدات.

هەروەکو (امام احمد) دەگێڕێتەوە کە (حذیفة بن الیمان) دەڵێت: دڵەکان چوار جۆرن:دڵێکی خاوێن وپرشنگ دار کەدڵی باوەڕدارە ، وەدڵێکی تاریك وپەردەپۆش کراو کەدڵی بێ باوەڕە، وەدڵێکی نەخۆش وشکست خواردوو کەدڵی دووڕووەکانە. وەدڵێك کەهەمیشە لەنێوان دوو جەمسەردایە ،جەمسەری دووڕووی وەجەمسەری باوەڕ، جاکامیان زاڵ بوون سەرئەنجامەکەی بەندە لەسەری.

### ٦٠- تاوان دەبێتە هۆی نەهێشتنی گوێڕایەڵی وتەمەڵی لە پەرستندا :

### ٦١- تاوان دڵ کوێر وکەڕولاڵ دەکات :

تاوان دڵ ژەنگن دەکات وپەردەپۆشی دەکات لەبەرامبەر بەحەق وحەق ویستی وڕاستی کوێرو کەڕولاڵی دەکات، ڕاستی بەناڕاستی

دەبینێــت وڕوونــاکی بــەتاریکی و وەبەپێــچەوانەوە، چــونکە هــۆش وهۆشـیاری دڵ لەدەسـت دەدات. لـەو کاتـەدا چـەندێ کەسـێکی نابینـا لـە ڕەنگـەکان تـێ دەگـات. وەچـەندە کـەڕ لەناسـینەوەی دەنگـەکان دەگـات وەچـەندە لاڵ دەتوانێـت ئـاوازی جـوان بـچڕێت و وشـەی جـوان دەربڕێـت. ئەویش هێندەی ئەمانە لەحەق وحەق ویستی دەگات ودەیناسێتەوە.

دواتـریش کوێروکـەڕو لاڵـی دڵ دەگوازرێتـەوە بـۆ ئەندامـەکانی جەسـتە ، چـونکە هۆشـیاری وبینـای ڕاسـت ودروسـت لـەدڵ ودەروندایـە. وەخـوای گـەورە دەفـەرمێت: (فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُــوبُ الَّتِــي فِــي الـصُّدُورِ..الحـج:٤٦) واتـە: چاوەنـەبێت هـەر چـاوان کوێرونابینـا بوبێـت ، بـەڵکو ئەودڵانــە کــوێر دەبــن وا لەسـینەکاندان"چــونکە هــەر ڕواڵــەت دەبینێت وناوەڕۆك لێك ناداتەوە".

جـا ئـەم ئایەتـە مەبەسـتی لـەوە نـی یـە کـە بـەهیچ شـێوەیەك چـاوکوێرنابێت ونابینـا نابێـت ، ئـەوەتا لەشـوێنێکی تـردا لەباسـی باسـی حـوکمی کـاری شـەرعی دا ،دەفـەرمێت: (لـیس علــى الأعمــى حــرج... النور:٦١) واتە: لە کاری شەرعیدا کوێرونابینا گلەییان لەسەر نی یە.

هـەروەها دەفـەرمێت: (عَبَسَ وَتَوَلَّى * أَن جَـاءهُ الْـأَعْمَى..عـبس:١-٢) واتـە: پێغەمبـەر ڕووی گـرژ کـردو ڕووی وەرگێـڕا، کاتێـك بڕوادارێکـی کـوێر هات بۆ لای.

بـەڵکو مەبەسـت لێـرەدا هۆشـیاری وبینـایی ڕاسـتەقینەو دروسـتە کەلـە دڵدایــە[1] ،هــەر بۆیــە پێغەمبــەر دەفــەرمێت: (لــیس الــشدید بالــصرعة،

[1] – ئەوەتا مەحوی شاعیر دەڵێت:
سەر کەجۆشێکی نەبێ ، ررکەتاڵم بۆچـــــی یە
دڵ کەجۆشێکی نەبێ ،شیشەی بەتاڵم بۆچی یــە " وەرگێڕ"

ولكنه الذي يملك نفسه عند الغضب.)[1] واته: بەهێز ئەوکەسە نی یە کە زۆرانبازو پاڵەوان بێت، بەڵکو ئەو کەسەیە کەلە کاتی تورەیدا خۆگربێت..

هەروەها دەفەرمێت: (ليس المسكين بالطواف الذي ترده اللقمة واللقمتان، ولكن المسكين الذي لايسأل الناس، ولايفطن له فيتصدق عليه.)[2] واته: هەژارو فەقیر ئەو کەسە نی یە کە دەرۆزەدەکات لێرەو لەوێ پاروویەك یان دوو پارووی بدرێتێ ، بەڵکو هەژار ئەوکەسەیە کە دەرۆزە ناکات داوا لەکەس ناکات، وەکەسیش هەستی پێ ناکات کەهەژارە تاخێری پێ بکات.

**پوختەی مەبەست:**

تاوان دەردو بەلآیەکەیە دڵ کرمە رێزو ژەنگاوی دەکات وەلە راستی وکوێرو کەروڵاڵی دەکات.

## ٦٢- تاوان دەبێتە مایەی رۆچوونی دڵ بۆ ئاستە نزمەکان:

دڵ خوای گەورە رێزی لێ ناوەو کردویەتیە جێگایەکی پیرۆز ، کەخۆشەویستی وترس وبینی خۆی تێدا رواندووە. وەجێگەی چەکەرەبوونی بیروباوەری پاك وبێ گەردە کەهەمیشە بەیادی خودا ئارام وهێمن ودڵنیا بێت. وەبەکردەوە جوانەکانی بەرزدەبێتەوە تا دەگاتە ئاستی عەرشی مەزنی خودا لەئاسمانی میهروسۆزی خودادا مەلەدەکات، بەلآم بەهۆکاری تاوان وتاوانکاری وسەرپێچیەوە، ئاستی

---

[1] -ئەم فەرموودەیە(صحيح)ە،(بخاری: ٦١١٤) وە(مسلم:١٦/١٦٦- نووی) گێراویانەتەوە.

[2] -ئەم فەرموودەیە(صحيح)ە،(بخاری: ١٤٧٩)وە(مسلم: ١٣٢/٧نووی)گێراویانەتەوە.

نــزم دەبێتــەوەو وەبــەرۆخی خــوارەوەدا "ئاســته نزمــەکان" رۆدەچێت.کە هەمیشە دەبێتە جێگەی شتە پڕوپوچ وقێزەونەکان.

**٦٣- تاوان دڵ کوێر دەکات:**

هــەروەکو چــۆن وێنــە رەش وکــوێر دەبێتــەوە، دواتــر ئــەو دڵــە رووونــاکی نامێنێــت و وەلــەدڵی ئادەمیزادێکــەوە دەگۆڕێیــت بــۆ دڵــی ئاژەڵێــك کــە دواتر لەئاکاری خاونەکەیدا رەنگ دەداتەوە.

جــا هەنــدێ دڵ هەیــە خــوای گــەورە کــوێری دەکــات وەلەســەر شــێوازی "بــەراز" دەردەکــەوێت کــە لێــك چــوون هەیــە لــەنێوان ئــەو ئاژەڵــەو کــاری ئەوکەســەدا. وەهەیــە لــەو دڵانــە دەچــێتە ســەر ئاکــاری "ســەگ وگوێدرێــژ ومــار ودوپشــك"، ئەمــە لێکدانــەوەی (ســفیان بــن عینــە) یــە بــۆ ئــەم ئایەتــە پیرۆزە کەدەفەرمێت: (وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِــي الأَرْضِ وَلاَ طَــائِرٍ يَطِــيرُ بِجَنَاحَيْــهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم... الأنعــام:٣٨) واتــە: هــەر زینــدەوەرو گیانــەوەرێك بەســەر زەویــدا بــڕوات ،وەهــەر باڵندەیــەك بــە باڵــەکانی بفڕێــت ، وەکــو ئێــوە خاوەنی گەل وئومەتن.

کــە "ســفیان" دەڵێــت: مــرۆڤ هەیــە دڵــی لەســەر ئاکــاری شــێرە، وەهەیانــە لەســەر ئاکــاری ســەگ وبــەرازو گوێدرێــژە، وەهەیــە لەســەر شــێوەی تــاوس دا بــەجل وبەرگیــدا خــۆی دەنوێنێــت ، هەیــە وەکــو گوێدرێــژ بــارکراوە وەهەیانــە وەکــو کەڵەشــێرە، وەهەیــە لــەرۆح ســوکیدا وەك کــۆتر وایە، وەهەیانــە وەکــو مــەڕ هــەر خێــر وپیــت وفــەڕن. وەهەیانــە وەکــو رێــوین لــە مامەڵــەوکاردا ، وەخــوای گــەورە کەســانی گێــل وگــەوجی هەنــدێ جــار بــە گوێدرێژ چوواندووە، وەهەندێ جاریش بەسەگ وئاژەڵ.

ئــەم لێــك چــوونانە لەناخــەوەدا زۆر بــەهێز دەبێــت تــا کاریگــەری هەیــە لەســــەر ئاکــارو روخســارو مامەڵــەی ئــەو کەســانە کــە مرۆڤــی وردبــین

وخاوەن فیراسە هەستی پێ دەکات. کەهەندێ جاریش وێنەو ڕوخساریان چووەتە سەر ئەو جۆرە ئاژەڵە کەلە مێژوودا ڕوویداوە کەخوای گەورە بەسەر جولەکەکانیدا هێناوە.[1] وەخوای گەورە ئەم کارە بەسەر قەومێکی ئەم ئومەتەدا دەهێنێت کەدەیان کات بە مەیمون وبەراز.[2]

جا سبحان الله چەند دڵی شێواو شکست هەیە خاوەنەکەی بێ ئاگایە؟وەچەند دڵ کوێر بوو وڕۆچوو هەیە؟ وەچەندین کەس سەرگەردان بووە بە پیاهەڵدانی خەڵکی؟ وەمەغرور وسەرکەش بووە بەپەردەپۆشی خودا بۆی ؟ وەکەمەندکێش بووە بەنیعمەتەکانی خودا بۆی؟!

ئەمانە هەر هەمووی سزاو ڕیسواییە ،بەلأم خاوەنەکەی وادەزانێت ڕێزی لێنراوە.

**٦٤- فێڵ کردنی خوای گەورە لە فێڵبازان:**

**٦٥- خەڵەتاندنی فێڵبازان لەلایەن خوای گەورەوە:**

**٦٦-گاڵتە کردنی خوای گەورە بە گاڵتەجاران:**

**٦٧- کەنار خستنی ئەو دلأنەی کەلەحەق لایان داوە:**

**٦٨- تاوان دڵ تێك دەشکێنێت و ئاوەژووی دەکاتەوە:**

تاوان دەبێتە مایەی شێواندنی سەرجەم پێوەرەکانی دڵ ودەرونی تاوانکار ،بەشێوازێك کە حەق بەناحەق دەزانێت وەڕاستی بەناڕاستی ،وەخێروچاکە بەشەڕ دەزانێت.

---

[1] – بڕوانە سەرگوزەشتەی(قریە القرود)لە زنجیرەی (قصص من القران : رضوان جامع رضوان).

[2] –ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە، (بخاری: ٥٥٩٠)بە هەڵواسراوی"معلق".و (حافظ) هێناویێتی لە(الفتح: ١٠/ ٥٤)گێڕاویانەتەوە، بڕوانە (الفتح المغیث)ی(الحافظ سنحاوی: ١/١٠٥).

گــــومڕایی وســــەرگەردان دەکرێـــت وادەزانێـــت ڕێگـــای هیدایـــەتی خودایەتی.کەئەمەش یەکێکە لەسزاکانی تاوانکاری.

**٦٩- تـاوان دڵ پەردەپۆش دەکات لەخوای گەورە لەدونیاو قیامەتدا:**

هەروەکو حوای گـەورە دەفـەرمێت: (كَلَّـا بَـلْ رَانَ عَلَـى قُلُـوبِهِم مَّـا كَانُوا يَكْسِبُونَ * كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِـذٍ لَّمَحْجُوبُـونَ... المطففـين:١٤-١٥) واتـە:نـەخێر وانـی یـە"ئـەو نەفامانـە تـێ ناگـەن وبـێ دارنابنـەوە" بـەڵکو دڵیـان ژەنگـی تـاوان دای پۆشـیوە لەسـەر ئـەنجامی ئـەو کردەوانـەی کــەدەیان کــرد، نـــەخێر ڕزگاربوونیـــان ئەســـتەمە، چـــونکە ئـــەو ڕۆژە بەربەسـت هەیـە لـەنێوان تاوانبـارن وخـوای گـەورەدا ، وەلـەبینینی ئـەو زاتە پیرۆزەدا بێ بەشن.

تـاوان وەك ئاسـتەنگێك وبەرەسـتێك وایـە لـەنێوان هەسـت کردنـی دڵ بەگـەورەیی فـەزڵی خـوای گـەورە تـا بەتـەواوی ڕاسـتی ودروسـتی یـەوە هەسـت بەگـەورەیی ومـەزنی خـودا بکـەن وەگـرێ بەسـتی بەندایـەتی لەگەڵـدا ببەسـتن، وەبەختـەوەری هەمیشـەیی بەدەسـت بهێـنن.بـەڵکو بەبـەردەوامی تـاوان ڕێگـرو پەردەپۆشـێکی ئەسـتووری سـامناکە لـەنێوان ناسینی بەندە بۆ دڵی خۆی و وەلەنێوان دڵی وپەروەردگاری مەزندا.

**٧٠- تـاوانکـار توشـی دژوارتـرین ژیـان دەبێـت لـە دونیـاو بـەرزەخ وقیامەتدا:**

خوای گەورە دەفـەرمێت: (وَمَنْ أَعْرَضَ عَـن ذِكْـرِي فَـإِنَّ لَـهُ مَعِيشَـةً ضَنكًا وَنَحْشُـرُهُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ أَعْمَـى.... طـه: ١٢٤) واتـە: هـەر کەسێك پشـت لـە یـادی خـوداو بەرنامەکـەی بکـات، ئـەوا ژیـانێکی پڕنەهامـەتی ودژواری تـوش دەکـەین ، وەلـە قیامەتـدا بـەکوێری ونابینـایی حەشـر دەکرێت ولێی دەپرسینەوە.

وەبڕگەی" مَعِيشَـــةً ضَـــنكًا " بەسزای گۆڕ لێکدراوەتەوە.کەواتە خوای گـەورە ناخۆشـترین ژیـانی بـۆ کەسـانێك بڕیـارداوە کـە پشـت لەبەرنامـەی خــودا دەکــەن وسەرپێچــی دەکــەن. هەرچــەندە لــەدونیادا بەچــەندین نیعمـەتی خـودا ژیانیـان ڕازاوەتـەوە، بـەڵام لەناخـدا دڵـی لەوپـەڕی بێـزاری وڕیســوایی وحەســرەتی ومەینــەتی وهیــوا بــڕوای دایــە. وەلەوپــەڕی گــومڕایی وسەرخۆشـیدایە، بـەهۆی مەسـت بـوونی بەحـەز وئارەزووەکـانی وەحەزی بۆ دەسەڵات ومانەوە...هتد.

بــێ گومــان سەرخۆشــی ومەســتی بــەدونیاوە ،زۆر مەترسـیدار تـرە لەسەرخۆشـی ومەسـتی بـە مـەی خواردنـەوە، چـونکە دووەمیـان هـەرکاتێك مـەی لـێ دوورخرایـەوە مەسـتیەکەی بـەری دەدات وبەئاگادێتـەوە، بـەڵام بەپێچــەوانەوە بــێ هۆشــی ومەســتی بــەدونیاوە تــەنها لەســاتەکانی ســەرەمەرگدا بەئاگادێتــەوە. جــا ژیــانی ڕیســوایی وسەرشــۆڕی وناسـۆری بەشـی ژیـانی یـاخی بـووان وسەرپێچی کـاران لـە دونیـاو ژیـانی بـەرزەخ لـە پاش مردن وەلە قیامەتدا توندترین سزایان هەیە.

بـێ گومـان بەختــەوەری وئـارامی دڵ ودەروون وســەرجەم ئەندامــەکانی جەسـتەی مـرۆڤ تـەنها بـەیادی خـوداو ملکەچـی بـوون بـۆ خـودا دێتـە دی. خوای گـەورە دەفـەرمێت: (مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَــى وَهُــوَ مُــؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَــانُواْ يَعْمَلُــونَ... النحــل: ٩٦) واتــە: ئــەو بڕوادارانــەی کــە کــاری چــاکە ئــەنجام دەدەن لــەپیاوو ئــافرەت، ئــەوا توشــی ژیــانێکی کامــەرانی وئاســوودەییان دەکــەین لــە دونیــادا. وەلــە قیامەتــدا بــەجوانترین شــێوە پاداشــتیان دەدەینــەوە لەوەی کەئەوان دەیان کرد.

جـا بـاوەڕو کـردەوەی چـاکە وئاکـاری جـوان مایـەی فەراهـەم هێنـانی بەختــەوەری وشــادی وخــۆش گــوزەرانی هــەردوو دونیایــە. وەهــەروەها

خوای گەورە دەفەرمێت: (لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ فِي هَـذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَلَدَارُ الآخِرَةِ خَيْرٌ وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ... النحل:٣٠) واتە:واتە ئەوکەسانەی کەچاکەیان ئەنجام داوە لەم دونیادا چاکە دێتە ڕێیان ، وەلەقیامەتدا ڕازاوەترین ونایابترین پاداشتیان هەیە ،کەخۆشترین جێگا ساز کراوە بۆ خواناسان.

وەدەفەرمێت: (وَأَنِ اسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَاعًا حَسَنًا إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ فَضْلَهُ... هود:٣) واتە:ئەی خەڵکینە داوای لێ خۆش بوون بکەنوتەوبە بکەن بۆ خوای گەورە چێژو خۆشی ولەزەتی ژیانتان پێ دەبەخشێت تا کاتێکی دیاری کراو، وەخوای گەورە پاداشتی هەموو خاوەن چاکەیەك بەزیادەوە دەداتەوە.

کەواتە باوەڕداران وئاکار جوانان وخواناسان سەرفرازی وئارامی دونیاوبەختەوەری قیامەتیان بەدەست هێنا. بە خۆپاراستن لەحەز وئارەزووە چڵێسەکان و دوورکەوتنەوە لە گومانە خراپەکان ، خۆشی وشادی ڕاستەقینەی ڕوح و دڵ و دەرونیان بەدەست هێنا کەلە هەموو خۆشیەکانی دونیا گرنگترو مەزنترە.

تەنانەت لەخواناسان هەیە کە گوزارشت لەم حاڵە دەکات ودەڵێت: ئەگەر پادشاو نەوەکانیان درك بەم خۆشی وچێژە ڕوحی ودەرونیەی ئێمە بکەن ،ئەوا بۆ بەدەست خستنی لەگەڵمان بەشەڕ دێن و بەشیر دەجەنگان لەگەڵمان.

وەهەروەها یەکێکی تر دەڵێت: هەندێ جار ساتی واخۆش بەسەر دڵمدا ڕادەبورێت لە خەیاڵی خۆمدا دەڵێم ئەگەر بەهەشتیەکان لەم جۆرە ژیانەدا بن، ئەوا ژیانێکی خۆشیان هەیە.

وەیەکێکی تر دەڵێت: لەم دونیایەدا بەهەشتێکی خۆشی وئارامی ڕوحی هەیە لەدڵ ودەروندا هاوشێوەی بەهەشتی قیامەت. جا هەرکەسێك بچێتە ئەوبەهەشتەی دونیاوە، ئەوا بەهەشتی قیامەتی بەنسیب دەبێت وەهەر کەسێکیش دووری بژێت ، ئەوا لەبەهەشتی قیامەت بیٚ بەش دەبێت.

وەتەنانەت پێغەمبەریشﷺ ئاماژە بۆ ئەم بەهەشتە دەکات ودەفەرمێت: (اذا مررتم بریاض الجنة فارتعوا، قالوا:وما ریاض الجنة؟قال:ﷺ حلق الذكر.) [1]واتە: ئەگەر بەلای باخەکانی بەهەشتدا تێپەڕن ەشی خۆتان بەرن. ووتیان ئەی پێغەمبەری خودا باخەکانی بەهەشت کامانەن؟ فەرمووی: کۆڕەکانی زیکرویادی خودایە.

وەهەروەها دەفەرموێت: (ما بین بیتي ومنبري روضمة من ریاض الجنة.) [2]واتە: لە نێوان ماڵەکەم وبڵندگۆی مزگەوتەکەم باخێکە لەباخەکانی بەهەشت.

جا کاتیٚ خوای گەورە دەفەرمێت: (إِنَّ الْـأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ * وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ... الأنفطار:١٣-١٤) واتە: چاکە خوازان لەبەهەشت دان وە خراپەکاران لەدۆزەخدان.

واگومان نەبەیت کەمەبەستی ئەم ئایەتە تەنها بەهەشت ودۆزەخی قیامەت بێت؟ بەڵکو لێرەدا مەبەستی سیٚ قۆناغە بۆ هەریەکەیان کە بەهەشتی دونیاو بەرزەخ وقیامەتە. وەهەروەها سزای دۆزەخی دونیاو بەرزەخ وقیامەت.

---

[1] – ئەم فەرموودەیە(حسن لغیره)ە، (ترمزی: ٣٥٠٩، ٣٥١٠) و(امام احمد: ١٥٠/٣)گێڕاویانەتەوە، بڕوانە (السلسلة الضعیفة: ١١٥٠).

[2] –ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە، (بخاری: ١٩٥)وە (مسلم:٩/١٦٠نووی)گێڕاویانەتەوە

جا چ نیعمەت وچێژێك دەگاتە شیرینی وخۆشی ناسینی خودا وپاکی دڵ ودەرون وئاکارجوانی ورەوشت بەرزی؟ وەئایا هیچ ژیانێك هەیە بگاتە ئاستی ژیانی پاکی وساغی پتەوی دڵ؟ کە خوای گەورە ستایشی خۆشەویستی خۆی دەکات کە "ابراهیم ی پێغەمبەر"ە بەهۆی پاکی وساغی دڵ ودەرونی یەوە کە دەفەرمێت: (وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِ لَإِبْرَاهِيمَ * إِذْ جَاء رَبَّهُ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ... الصافات: ٨٣-٨٤) واتە: وەیەکێك لەپەیڕەوان وشوێن کەوتوانی "نوح" بریتی یەلە (ابراهیم) سەلامی خوای لێبێت. کاتێك ڕووی کردە خواپەرستی بەدڵێکی پاك وساغ وپڕلەباوەڕەوە.

کە گرنگی وبەنرخی ومەزنی ئەوجۆرە دڵە لەقیامەتدا دەردەکەوێت کە چەندە کاریگەری هەیە لەسەر دیاری کردنی پاشەڕۆژی خاوەنەکانیان. کە خوای گەورە ئەو دیمەنانەمان دەخاتە پێش چاو دەفەرمێت: (يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ * إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ... الشعراء: ٨٨-٨٩) واتە: ئەو ڕۆژەی"قیامەت" کە نەماڵ وسامان وکوڕو نەوە هیچی فریادڕەسی نی یە وفریای مرۆڤ ناکەوێت، تەنها مەگەر کەسێك خاوەنی دڵێکی ساغ وپاك وپڕ لەبڕوا نەبێت.

## ئاکارەکانی دڵی پاك وساغ

دڵی پاك وساغ: ئەو دڵەیە کەساغ وپاك وسەلامەت بێت لەهاوبەشی و"شیرك" ڕق وکینەو حەسودی وچروکی ولووت بەرزی وحەزکردن بەدەسەلات. پاك بێت بەدووربێت لەهەموو بەلایەك کە دوورەبخاتەوە لە خوای گەورە ، دوور بێت لە هەموو گومانێك لە ڕاستێتی خودا. دووربێت لە هەموو ئارەزوویەك ببێتە مایەی سەرپێچی و یاخی بوون لە خودا. وە دووربێت لە هەموو شتێك کە لات دات لە بەمەبەستی خودا. وە دوور بێت لە هەموو ئاستەنگێك و بەربەستێك کە دایبڕێت لە

خـــودا. جـــا ئەميـــە دڵـــی ســـاغ و پـــاك -كەلـــە دونيـــا و قيامـــەت دا لـــە بەهەشتی شادی و كامەرانی دا دەژێت.

## هۆكارەكانی خراپ بوونی دڵ

دڵـی مـرۆڤ بـۆ ئـەوەی دوور بێـت لـە خـراپ بـون و شـێواوی پێویـستە پـارێزراو بێـت لـە پێـنج بـەڵای كوشـندە. لـە (شـيرك) كـە دژی يەكتاپەرستی‌يە ،لـە (بيدعـە) تازەگـەری لـە ئاينـدا كـە دژی سـوونەتە ،وە لـە (ئـارەزوو بـازی) كـە دژی گوێرايەڵيـە ،وە لـە (بێئاگـايی) كـە دژی يـادی خودايـە ، وە لـە (حـەزەكان) كـە دژی دڵـسۆزيە. جـا ئـەم پێنجە هۆكاری تێكدان و شێواندن و خراپ بوونی دڵە.

## مرۆڤ پێويستی بە پشتيوانی خودايـە تـا ڕێنمـايی بكـات بـۆ ڕاسـت و ڕەوان

جـا بـۆ ئـەوەی دڵـی مـرۆڤ دووربێـت لـە بەڵايانـە. وە ڕێنمـايی بكرێـت بـۆ سـەر ڕێگـای ڕاسـت و ڕەوان و لـە نەخۆشـی و ناخۆشـيەكانی دڵ سـەلامەت بێـت. پێويـست هەميـشە داوای هاوكـاری و كۆمـەكی لـە پـەروەدگاری مـەزن بكـات تـا ئـەو شـا ڕێگايـە وون نـەكات و لـە نێـو كـوچ و كۆڵانـەكانی نەهامەتيـدا بـزر نـەبێت. چـونكە شـا ڕێگـای ڕاسـت و ڕەوان (صـراط المـستقيم) پێويـستی بـە هيمـەت و هـەوڵ و كۆشـش و كاروئاكـاری جـوان هەيـە لـە نـاخ و دەرەوەشـدا. جـا ووردەكاريـەكانی (شـاڕێگای ڕاسـتی) زۆرن.دوور نی‌يـە مـرۆڤ هيـچی لـێ بزانێـت ، لـەوە دەچـێت شـتی زۆری لێ بزانێت.

لـەوە دەچـێت ئەوەشـی كـە بيزانێـت بـە هۆكـاری تەمـەڵی و تەوەزەلی‌يـەوە يـان هـەر ئاسـتەنگێكی تـرەوە بـۆ بەرجەسـتە نـەكرێت.وە دوور نی‌يـە ئەوەشـی كـە دەزانێـت بـۆی بـچێتە سـەر ،وە دەشـێت ئەوەشـی

گـەر بەرجەسـتەی دەكـات دلـسۆزی ئیخلاسـی تێـدا نـەبێت.وە دەشـێت ئـەوەی كـە بەرەسـتەی دەكـات بـەو پـەڕی دڵـسۆزیەوە بـەڵام تـەواو پـڕو پوخـت نـەبێت یـان ببێـت. جـا ئەمانـە و چـەندانی تـری هاوشـێوەی ئەمانـە ڕۆژانـە چـەندین بـارە دەبێتـەوە. جـا پێویـستە هەمیـشە داوای كۆمـەك و سەرفرازی لە خودای گەورە داوا بكەین

## نەزانین و ستەم كاری بنەڕەتی دەرونی ئادەمیزادە

بنـەڕەتی دەروونـی ئـادەمیزاد بریتیـیە لـە نـەزانین و سـتەم كـاری جـا هـەركاتێ ئـادەمیزاد گەڕایـەوە سـەر بنـەڕەتی خـۆی ئـەوا ڕێگـەی هیدایـەت و ڕاسـتی نادۆزێتـەوە و گـومڕا دەبێـت. هـەر ئەوەیـە خـودای گـەورە دووڕوەكـانی گەڕاندۆتـەوە سـەر بنـەڕەتی سروشـتی خۆیـان بـەهۆی تـاوان كاریەوە.

خـوای گـەورە لـە سـەر (شـاڕێگای ڕاسـتی یـە) (صـراط المستقیم) لـە هـەموو بڕیـار و فـەرمان و ڕێگـرتن و قەدەغـە كردنێـك دا. خـودای گـەورە بـە دانـایی وزانـایی خـۆی ڕێنمـای وهێدایـەتی ئـەو كەسـانە دەدات كـە مەبەسـتێتی بـۆ سـەر (شـا ڕێگـای ڕاسـتی) وە ئـەو كەسـانەی كـە مەبەسـتیان نیـە دووریـان دەخاتـەوە و هیدایـەتیان نـادات چـونكە شایستەی ئەو شاڕێگایە نین.

جـا لـە ڕۆژی قیامەتیـشدا خـوای گـەورە شـاڕێگایەك دروسـت دەكـات بـۆ بەنـدەكانی تـاوەكو لـە ڕێگەیـەوە بگەنـە ڕەحمـەت و بـەزەیی و میهرەبـانی خـودا. چـونكە خـودای گـەورە شـا ڕێگـای ڕاسـتی یـە. خـودای گـەورە لـە ژیـانی دونیـا دا شـاڕێگایەكی بـۆ سـەرجەم بەنـدەكانی هەڵبـژاردووە و دەسـت نیـشانی كـردووە. وە داوای لـە هـەموان كـردوە لـەو

شا ڕێگایە لانەدەن و لە سەری بەردەوام بن کە خۆی لە خۆیدا حوجە و بەڵگەیە.

وە لە قیامەت دا خوای گەورە دیسانەوە شارێگایەك دیاری دەکات[1] بۆ گەیشتن بە خەڵاتی خودای کە بەهەشتە جا هەرکەسێك لە دونیادا لە سەر ئەو شارێگەیە سەقامگیر بووبێت ئەوا بە ئاسانی دەتوانێت لەو پردی شارێگەیەی قیامەتدا بپەڕێتەوە. سەقامگیرانە هەنگاو بنێت وە نوور و ڕووناکی باوەڕەکانیان دەدرەوشێتەوە و گۆڕ و قیامەت وڕێگای (سیراط) یان بۆ دەکاتە چراخان. بەڵام ئەو کەسانەی کە لە دونیادا لەو شارێگایەدا لایان داوە و ترازاون یان خزاوون. ئەوا ناتوانن لە سەر ئەو شارێگایەی قیامەتدا بپەڕنەوە و سەقامگیر بن ،هەرچۆن لە دونیادا سەقامگیر نەبوون.

وە تاریکی وسامناکی و گۆڕوحەشەر و قیامەت و سەر پردی (سیراط) یان دەکاتەوە شەوەزەنگ قولابە دڕکاوەیەکانی سەر پردەکە ڕێگریان دەکات و ناتوانن لێی دەربازبن. چونکە ئەو ڕووناکیانەی لە دونیادا هەبوو ئەمانە بە تاریکی و تاوان و سەرپێچی کردنی خودا سیا پۆشیان کردوو لە دەستیان دا و نغرۆی نێو تاریکستان نەفامی و ستەمکاری بوون. ڕێکردنیان لە سەر ئەو پردە وەك پاشگەز بوونەوەیانە و هەڵهاتنیانە لە شارێگای خواپەرستی لە دونیادا. وە هەروەها خوای گەورە کانیاوی سازگای (کوثر) ی سازکردووە بۆ ئاو خواردنەوەی ئەو کەسنەی کە لە دونیادا تینوو و تامەزرۆی شەرعی خودا بوون. بەو ئەندازەیە ئاو دەخۆنەوە. وە یاساغ و قەدەغەی

---

[1] – مەبەستی لەشارێگای دونیا"ئاینی ئیسلامە". وەمەبەستی لەشارێگای قیامەت"پردی صیراط". "وەرگێر"

کردووه له سەر ئەو کەسانەی کە پشتیان لە شەرعی خودا کردووه و لێی هەڵهاتوون.

جا ئەگەر بێتو بە چاوی تێڕامان و ووردبینانەوە ژیرانە بڕوانینە قیامەت و دونیا – بۆمان روون دەبێتەوە کە دونیا کێڵگەی قیامەتە چی بچێنیت تیایدا لە قیامەتدا دەیدوریتەوە. پلە و پایەو خەڵاتی خودای و پێگەکانی بەهەشت بەندە لە سەر رێژەی باوەڕو کاری چاکەخوازی لە دونیادا. وە بە پێچەوانەشەوە خودا پەنامان بدات.

## ٧١-تاوان و تاوانکاری دەبێتە مایەی ترازان و خزان لە سەر شاڕێگای ڕاستی " صراط المستقيم":

## بنەڕەتی تاوان و جۆرەکانی

بەهۆی ئەوەی تاوان پۆلین و ڕیزبەندی و جۆری زۆری هەیە. هەر بۆ ئەم مەبەستە لەم بابەتە کورتەدا بە پشتیوانی خودای گەورە تیشك دەخەینە سەریان و دەڵێین:

بنەڕەتی تاوان دوو بنەمایە:

(جێ بەجێ نەکردنی ئەرك و فەرمان،وە ئەنجامدانی قەدەغە کراوەکان)

واتە: جێبەجێ نەکردنی ئەرك و فەرمانێکی خودای کە پێویستکراوە لە سەرت. کە ئەمە خۆی لە خۆیدا تاوانە. هەروەها ئەنجامدانی یاساغ کراو و قەدەغە کراوێك کە پێویستکراووە لە لایەن خوداوە کە دوور کەویتەوە لێی. جا ئەم دوو جۆرەی تاوان بوو کە هەر یەکە باوکانی (جن و ئادەمیزاد) ی پێتاقیکرایەوە. یەکەمیان (ئیبلیس) بوو فەرمانی پێکرا بە ئەنجامدانی ئەرکی سوجدە بردنی ڕێز

بـۆ (ئـادەم) دووەمیـان (ئـادەم) بـوو کـە هەسـتا بـە ئەنجامـدانی قەدەغـە کراوێك کـە نەدەبوایـە بیکردایـە. جـا هەریەکـەیان دابـەش دەبێـت بـە پێـی ویـست و مەبەسـتی دڵ. وەهــەروەها بـە پێـی ئەندامــەکانی جەسـتە لـە ڕواڵەتـدا ، واتـە پەیوەسـتە بـە مـافی خـودا و مـافی خـەڵك. هەرچـەندە ئـەوەی پەیوەنـدی بـە مـافی خەڵکیـەوە دەبێـت هـەر دەچـێتە ژێـر نـاوی مـافی خـوداوە. بـەڵام پەیوەسـتکراووە بـە داواکردنـی خـاوەن مافەکە لە خەڵك یان دەست بەردار بوونی لەو حەق و مافە.

**پاشان تاوان دابەش دەبێت بۆ چوار جۆر:**

**(موڵکیەکان ، شەیتانیەکان ، دڕندەییەکان ، ئاژەڵیەکان )**

## تاوانەموڵکیەکان ( الملكية )

تاوانەموڵکیـەکان: واتـە خـۆ نوانـدن بـە هەنـدێ ئاکـاری نەشـیاو و ناشایـستە بـۆ خـود بەنـدەکان. وەك نوانـدنی ئاکارەکـانی پەروەردگاریـەت (الربوبیـة) وەك خـۆ بـە مـەزن زانـین ،خـۆ بـە پـیرۆز زانـین ،خـۆ بەبڵنـد زانـین ، خـۆ بـە پەرسـتراو زانـین ،کـە شایـستەی مـرۆڤ نیـە و لـەو سـنورە دەرچـونی مرۆڤـە لـە توانـا و قـەوارەی خـۆی ،تەنانـەت شـەریك و هاوەڵدانان بۆ خودای گەورەش دەگرێتەوە.

## جۆرەکانی هاوبەشی بڕیاردان (الشرك)

هاوبەش بڕیاردان بۆ خودا دوو جۆرە:

١. هاوبـەش بڕیـاردان لـە ئاکـار و نـاوە جوانـەکانی و هـاوەڵ بـۆ پەیـدا کردن لە پەرستندا.

٢. وە هاوبەش بڕیاردان لە مامەڵە کردن لە گەڵ خودادا.

کـە ئـەم بەشـەیان هەنـدێ جـار مـرۆڤ ناباتـە دۆزەخـەوە هەرچـەندە خودی ئەو کارە پوچەڵ دەکاتەوە کە هاوبەشی تێدا بڕیارداوە.

جا ئەنجامدانی تاوانە موڵكیەكان بە گەورەترین و مەترسی ترین تاوانبارن دەژمێرێن. چونكە بەرامبەریان لە پەروەردگار گرتووە و خۆیان بە هاوبەشی دەزانن لە خودایەتی و پەروەردگاریەتیدا. بە بێ زانست و زانیاری قسە لە خودا و خەلق و شەریعەتیدا دەكەن و خۆیان لەو بە باشتر دەزانن.

ئەم جۆرە تاوانە هەڵوەشێنەرەوە و پوچەڵكردنەوەی كارەباشەكانە.

## تاوانە شەیتانیەكان

تاوانە شەیتانیەكان: واتە خۆچواندن بە ئاكارەكانی شەیتان لە بوونی "حەسودی وبوغزوكینەو ڕق وفێڵ وخەڵەتاندن وسەرپێچی وڕێگری لەچاكەو فەرمان كردن بەخراپە وبیدعەو وتازەگەری لە ئاینی خودادا. وەگومراكردن "واتە ئەم جۆرە ئاكارە شەیتانیانە ئەنجام دەدات وتاوانبار دەبێت وزیان بەخودی خۆی وخەڵك وكۆمەڵگا دەگەیەنێت وهاوڵاتیەكی چاك خواز نابێت ، وەئەم جۆرە تاوانە بەڕیزبەندی دووەم دێت لە مەترسیدا لەپاش تاوانە موڵكیەكان.

## تاوانە دڕندەییەكان وئاژەڵیەكان

**تاوانە دڕندەییەكان"السبعية"**: واتە ئەنجام دانی ئاكارە ناشرین ودڕندەییەكان كە مایەی مەترسیە بۆ خودی خۆی وچواردەورەكەی. وەك ئەنجام دانی دوژمنایەتی ، توڕەیی، خوێن ڕشتن، چەوساندنەوە، بێ بەزەییەتی، هەلپەرستی، ستەمكارێتی...هتد.

**تاوانە ئاژەڵیەكان"البهيمة"**: واتە سووربوون لەسەر ئەنجامدانی ئاكارە ئاژەڵیەكان كەئاژەڵان پێی ناسراون وپیشەیی هەمیشەییانە.وەك: سووربوون لەسەر تێركردنی بێ مەرجی

حەزوئارەزووی برسێتی وسێکس، کە دەبێتە مایەی دروست بوونی (دزی وزیناو داوێن پیسی) ، هەروەها خواردنی ماڵ وسامانی هەتیوان وخەڵکی بەناحەق، چروکی ورەزیلی، ترسنۆکی وشەپرزەیی وسەرکەشی، بەرەلآیی، بێ ئابرووی وبێ شەرمی...هتد.

جا ئەم جۆرەیان زۆرینەی خەڵکی تێ کەوتوون بەهۆی نەتوانینی ئەنجامدانی هەریەکە لەتاوانە "مولّکی ودڕندەییەکان"زۆرینە گیرۆدەی ئەم جۆرە *تاوانانەبوونەتەوە*. وەهەروەها ئەم جۆرەیان دەرگاو *دەروازەی چوونە شیوی دونیای تاوانەکان وبەشەکانی تری تاوانکاریە*، بەشێوەی کەمەندکێش کردنیان لەم بەشەوە بۆ جۆری تری تاوانە دڕندەییەکان وشەیتانیەکان.پاشان بوغرابوون ودژایەتی کردنی خودای گەورە هەنگاودەنێت.

## تاوانکاری پۆستەی بێ باوەڕی یە

جا هەرکەسێك بەچاوی تێڕامانەوە وردبێتەوە لەوڕاستیانە،بۆی ڕوون دەبێتەوە کەتاوان وتاوانکاری پۆستەی هاوبەشی دانان وبێ باوەڕی ودژایەتی کردنی پەروەردگارە. سەرەتاکەی تاوانە وەکۆتایەکشی بێ باوەڕی یە.

## تاوان دوو جۆرە:

## گەورەو بچوك

بێ گومان تاوان دوو جۆری هەیە گەورەو بچوك. ئەم ڕاستیەش هەریەکە لەقورئان وسونەت وتێکڕای هاوەڵان وشوێن کەوتوانیش تەنانەت پێشەوایانیش سەلماندویانە.

خوای گەورە دەفەرموێت: (إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلاً كَرِيمًا... النساء:٣١) واتە: ئەگەر ئێوە خۆتان بپارێزن لەتاوانە گەورەکان کە قەدەغەکراوە ، ئەوا چاوپۆشی لەتاوانەکانی ترتان دەکەم ودەتان خەینە خۆشترین وسازگارترین شوێنەوە "کەبەهەشتە".

هەروەها دەفەرمێت: (الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ... النجم:٣٢) واتە: ئەوانەی کەلە تاوانە گەورەکان خۆیان دەپارێزن تەنها گوناهەبچوکەکان نەبێت.

## کردەوە چاکەکان پوچەڵ کەرەوەی تاوانە بچوکەکان

لە (صحیح) دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: (الصلوات الخمس: والجمعة الى الجمعة، ورمضان الى رمضان، مكفرات لها بينهن اذا اجتنبت الكبائر.) [1] واتە: پێنج نوێژە فەرزەکە ، هەینی بۆ هەینی، ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان. سڕینەوەی تاوانە بچوکەکانن کەلەو نێوەندەدا ئەنجامت داوە، بەمەرجێك خۆت بپارێزیت لەتاوانە گەورەکان.

**ئەو کردەوانەی تاوان دەسڕنەوە سێ پلەیان هەیە:**

---

[1] -ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(مسلم: ١٤-١٦/٢٣٣)گێڕاویانەتەوە.

١. لەبەر بچوکی کارەکە ولاوازی ودڵسۆزی تیادا تەنها تاوانە بچوکەکان بسڕێتەوە یان نا. لە شێوەی چارەسەرێکی بێ هێزدایە کە لەبەرامبەر نەخۆشی یەکی کەمدا دەوەستێتەوەوچارەی دەکات.

٢. کارە چاکەکە ڕووبەڕووی تاوانەکە دەوەستێتەوە وەبە تەواوی دەیسڕێتەوە.

٣. لەبەرگەورەیی وبەهێزی کارە چاکەکە جگە لەسڕینەوەی تاوانە بچوکەکە ،ڕووەو سڕینەوەی تاوانە گەورەکانیش هەنگاو دەنێت وکاریگەریان تێ دەکات.

وەلە هەردوو (صحیحین) دا هاتووە ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (الا أنبئکم بأکبر الکبائر؟ قلنا: بلی یا رسول الله. فقال: ﷺ: الإشراك بالله والحقوق الوالدین، وشهادة زوور.)[1] واتە: ئایا لەگەورەترین تاوانە گەورەکان ئاگادارتان کەمەوە؟ ووتیان:بەڵێ ئەی پێغەمبەر. پێغەمبەرﷺفەرمووی: هاوبەش بڕیاردان بۆ خوای گەورە، وەئازاردانی دایك وباوك، وەشایەتی دانی ناحەق وناڕاست.

وەهەروەها لەهەردوو (صحیحین) دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (اجتنبوا السبع الموبقات، قیل:وما هن یارسول الله؟ فقالﷺ: الإشراك بالله ، والسحر، وقتل النفس التي حرم الله إلا بالحق، وأکل مال الیتم، وأکل الربا، والتولی یوم الزحف، وقذف المحصات الغافلات المؤمنات.)[2] واتە: خۆتان بپارێزن لە حەوت تاوانە بەهیلاك بەرەکان. ووتمان:کامانەن ئەی پێغەمبەر، فەرمووی: هاوبەشی بڕیاردان بۆ خوای گەورە، سیحروجادوگەری، وەکوشتنی مرۆڤ

---

[1] –ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(بخاری: ٢٦٥٤)وە (مسلم:٢/٨٤نووی)گێڕاویانەتەوە.

[2] –ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(بخاری:٢٧٦٦)وە(مسلم:٢/٨٥نووی)گێڕاویانەتەوە.

بەناحەق، وەخواردنی ماڵی هەتیو بەناحەق، وەسووخواردن، وەهەڵهاتن لەبەرەکانی جەنگ، وەبوهتان هەڵبەستن بۆ ئافرەتانی باوەڕدارانی پاك وبێ ئاگا.

وە لەهەردوو (صحيحين) دا هاتووەکە: (سئل: اي الذنب أكبر عندالله؟ قال ﷺ: إن تدعوا لله ندآ وهو خلقك، قيل: ثم أي؟ قال: ان تقتل ولدك مخافة ان يطعم معك ، قال: ثم اي؟ قال: ان تزني بحليلة جارك. فأنزل الله تصديقها: ( (وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ... الفرقان:٦٨) )[1] واتە: پرسیار کرا لەپێغەمبەر: کام تاوانە بەگەورە دادەنرێت. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: هاوەڵێك بۆ خودا بڕیاربدەیت کەچی ئەویش دروستی کردووی، پاشان پرسیان چی تر؟فەرمووی: منداڵەکەت بەناهەق بکوژی لەترسی برسێتی. پاشان پرسیان چیتر؟ فەرمووی: وەزیناو داوێن پیسی بکەیت لەگەڵ حەلاڵی هاوسێکەتدا.جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ڕەوانە کرد: (وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ... الفرقان:٦٨) واتە: ئەو کەسانەی کە هاوەڵ وپەرستراوێك بۆ خودا بڕیار نادەن وەمرۆڤ بەناحەق ناکوژن وەداوێن پیسی ناکەن.

## ژمارەی تاوانە گەورەکان

لە دەست نیشان کردن وژمارەی تاوانە گەورەکاندا دوو ڕای تایبەت هەیە:

ڕای یەکەم: دەڵێن تاوانە گەورەکان دەست نیشان کراوو ژمێرراوە.

ڕای دووەم: دەڵێن دەست نیشان نەکراوە

[1] -ئەم فەرموودەیە(صحيح)ە، پێشتر باسمان کردووە.

ئێستاش دێینە سەرهەریەکەیان:

**ڕای یەکەم:**

پێیان وایە تاوانە گەورەکان دەست نیشان کراوە، بەلاَم لەدیاری کردنی ژمارەیاندا ناکۆك وجیاوازن. (عبدالله ی بن مسعود) دەلێت: ژمارەیان چوارە. (عبدالله ی بن عمر) دەلێت: ژمارەیان حەوتە. (عبدالله یبن عمرو بن عاص) دەلێت: ژمارەیان نۆیە.

وەهەندێکی تر پێیان وایە ژمارەیان یانزەیە. وەکۆمەلێکی تر پێیان وایە ژمارەیان"حەفتایە".وە (ابو طالب المکی) دەلێت:پاش کۆکردنەوەی ووتەی هاوەلاَنی پێغەمبەرﷺ لەم بارەیەوە ،وەکۆم کردەوە پاش لێکدانەوەی بۆم دەرکەوت کە ژمارەی تاوانە گەورەکان بەم شێوەیە:_

- (چوار) تاوان لەدلدا: کەبریتی یەلە هاوبەشی بۆ خودا بڕیاردان، سووربوون لەسەر تاوان، وەمەویست بوون وبێ هیوابوون لەڕەحمەتی خودا، وەبێ باکی لە سزای خودا.
- (چوار) تاوان لە زمان: کەبریتین لە شایەتی درۆ، بوهتان هەلبەستن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك ، سوێندی درۆ ، سیحرو جادوگەری.
- (سێ) تاوان لە سك دا: مەی خواردنەوە ، خواردنی مالَی هەتیوان بەناحەق، وەسووڕیبا خواردن.
- (دوو) تاوان لە داوێن"دامێن": داوێن پیسی" زینا "، نێربازی.
- (دوو) تاوان لەدەست دا: کوشتن ودزین.
- (یەك) تاوان لە قاچەکاندا: هەلهاتن لەبەرەکانی جەنگ.

- (یەك) تاوان كە هەموو جەستە تێیدا بەشداره: كەبریتی یە لەئازاردانی دایك وباوك.

ڕای دووەم:

ئەوانەی كەدەست نیشانیان نەكردووه: پێیان وایە كەدەست نیشان وژماره نەكراوەو ڕای تایبەتیان هەیە لەم بارەیەوه:

هەیانە دەڵێن: هەرتاوانێك خوای گەوره لە قورئاندا ڕێگری لێ كردبێت،ئەوا تاوانی گەورەیە. وەهەروەها هەرتاوانێكش پێغەمبەرﷺلە سونەتدا ڕێگری لێ كردبێت ئەوا تاوانی بچووكە.

وەڕای تریان هەیە دەڵێت: هەرتاوانێك ڕێگری كرابوو بەتوڕەبوون ونەفرەت وسزاوهەڕەشە لەئەنجام دانی كرابێت ،ئەوا تاوانی گەورەیە.وەهەرتاوانێكش لەم سیانە بەدەربوو ،ئەوا تاوانی بچوكە.

وەهەروەها ووتراوه: هەرتاوانێك لەتۆڵەیدا سزای حەدی بۆ دانرابێت لە دونیاو وەلەقیامەتدا بەڵێنی سزا درابێت بۆی ،ئەوا تاوانی گەورەیە. جگە لەمە تاوانی بچوكە.

هەروەها ووتراوه:هەرتاوانێك لەهەموو شەریعەتەكاندا حەرام وقەدەغەكرابێت ،ئەوا تاوانی گەورەیە. وەهەر تاوانێكیش تەنها لەشەریعەتێكدا قەدەغەكرابێت ،ئەوا تاوانی بچوكە.

وەهەروەها ووتراوه: هەرتاوانێك كەخوداو پێغەمبەری خودا نەفرەتیان لەبكەروئەنجام دەرەكەی كردبێت ،ئەوا تاوانی گەورەیە.

وە ووتراوه: هەر تاوانێك لەسەرەتای سورەتی "النساء" باس كرابێت، ئەوا تاوانی گەورەیە كە خوای گەوره دەفەرمێت: (إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ... النساء:٣١) .

## ئەو پێڕەی کە تاوان لەلایان هەرهەمووی یەك ئاستە:

ئـەم پێـڕە دەڵـێن: تاوانـەکان گەورەوبـچوکیان نـی یـە و وەهــەموویان یـەك ئاسـتە، چـونکە تـاوان زیـان بـە خـوای گـەورە ناگەیـەنێت وکاریگـەری لەسـەر خـودای گـەورە نـی یـە. هەربۆیـە ناکرێـت هەنـدێکیان لـەلای بـچوك بێـت وئـەوانی تـر گـەورە. بـەڵکو پـوختی بابەتەکـە لـەبوێری وسـنوور شـکاندنی تاوانکارانـە کـە دەوێـرن وجەرائـەت دەکـەن لـە سـنوور شـکاندن وسەرپێچی کردنی.

جـا هەرکەسـێك سـنوور بـشکێنێت بـێ گـوێی خـوای گـەورە بکـات ئـەوا تـاوانی ئـەنجام داوە.کاتێـك کەسـێك مــەی دەخواتــەوە یـاخود زینایــەك دەکــات و بەحــەرام وقەدەغــەکراوی نازانێــت ، ئــەوا لێــرەدا دووشــتی کـردووە کـە لـەنێوان نـەفامی وخراپەکاریـدا ، جـا لێـرەدا ئەوکەسـە نابێـت سـزابدرێت ، چـونکە نـەفام ونەزانـە. بـەڵام ئەگـەر زانـی کـە قەدەغـەکراوو حەرامـە ،بـەڵام هەرسـوور بـوو لەسـەر ئـەنجام دانـی ئـەوا تـاوانێکی گـەورەی ئـەنجام داوە لەبنەڕەتـدا کــەبریتی یــە لــە"بــوێری وچاونەترســی" لــە شکاندن وسنور بەزاندنی قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە.

وەدەڵـێن:خراپــی تــاوان بـریتی یـە لـەگوێ نـەدان بەفــەرمانی خـوای گــەورەو پــشت گــوێ خــستنی و بــوێری وچاونەترســی لــە ئەنجامــدانی وسەرپێـچی کردنــی. کەئەمــەش هــیچ جیــاوازی یــەك نــی یــە لــەنێوان تاوانەکاندا.

وەدەڵـێن: پێویـستە مـرۆڤ تەماشــای گەورەوبـچوکی تــاوان نــەکات ، بــەڵکو پێویــستە تەماشــای گــەورەیی ئــەو خودایــە بکرێــت کــەتاوانی بەرامبـەر دەکرێـت ویاسـاو فـەرمانی دەشـکێنرێت.جـا ئـیتر لـەم حاڵەتـەدا جیاوازی لە نێوان تاوانەکاندا نی یە.

جا ئەگەر پاشایەك فەرمان دەركات بۆ دووكەس كە بچێت بۆ شارێك وكارێكی پێ بسپێرێت كەئەنجامی بدات ، كاتێك كەهیچیان كارەكە نەكەن سەرپێچی دەكەن. ئایا هەردووكیان هەر فەرمانی پاشایان پشت گوێ نەخست؟ ئایا هەردووكیان بەهەمان چاو تەماشا ناكات؟ وەسزایان نادات؟

وەهەروەها دەڵێین: جا ئەگەر كەسێك سەد دەرهەمی بدات ئەو زەكاتی نەداو سەرپێچی كرد، وەهەروەها كەسێكی تریش هەزار دەرهەم ئەوا ئەویش زەكاتی نەداو سەرپێچی كرد. ئایا هەردووكیان هەر یەك تاوانیان نی یە؟ كەرێگری یەو زەكات نەدانەبەبێ ڕەچاوكردنی ژمارەو ڕێژەی زۆری وكەمی ماڵەكەی.

## گەورە ترینی تاوانە گەورەكان

### هاوبەشی بڕیاردان بۆ خودا

**لادانی پەردە لەسەر ئەم بابەتە:**

خوای گەورە سەرجەم پێغەمبەرانی ڕەوانە كردووە وكتێبە پیرۆزەكانی ناردووە وەزەوی وئاسمانەكانی دروست كردووە تەنها بۆ یەك مەبەست كەیەكتاپەرستانە بپەرسترێت وگوێڕایەڵی وملكەچی تەنها بۆ ئەوبێت. (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ... الذاريات:٥٦) واتە: ئێمە پەری وئادەمیزادمان تەنها بۆ خواپەرتی دروست كردووە.

وەدەفەرمێت: (وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلاَّ بِالْحَقِّ... الحجر:٨٥) واتە: ئێمە زەوی وئاسمانەكان وهەرچی لەنێوانیاندایە ،تەنها بۆ چەسپاندنی حەق دروستمان كردووە.

وەدەفەرموێت: (اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ

بِكُلِّ شَـيْءٍ عِلْمًـا.... الطـلاق:١٢) واتـه: خـوای گـەورە ئـەو زاتەيـە كـە حـەوت چـينی ئاسمـانی دروسـت كـردوەو زەويـشی بەوێنـەی ئـەوان وەفـەرمانی خـودا لەنێوانيانـدا دادەبـەزێت وجـێ بـەجێ دەبێـت تـا ئاگـاداربن وبـزانن كـە خـوای گـەورە بەسـەر هـەموو شـتێكدا زاڵ وبەتوانايـە.وەخـوای گـەورە بەزانـست وزانيـاری خـۆی گـەمارۆی هـەموو شتێكی داوە.

وەهـەروەها دەفـەرموێت: (جَعَلَ اللّهُ الْكَعْبَةَ الْبَيْتَ الْحَـرَامَ قِيَامًـا لِّلنَّـاسِ وَالشَّهْرَ الْحَرَامَ وَالْهَدْيَ وَالْقَلاَئِـدَ ذَلِـكَ لِتَعْلَمُـواْ أَنَّ اللّـهَ يَعْلَـمُ مَـا فِـي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَأَنَّ اللّهَ بِكُلِّ شَـيْءٍ عَلِـيمٌ... المائـدة:٩٧) واتـە: خـوای گـەورە كەعبـەی كـردووە بـەهۆی هەسـتانەوەو بوژاندنـەوەی خـەڵكی "لەهـەر دوو دونيـادا"،هـەروەها مانگـە حەرامـەكان وديـاری قوربانيـە ديـاری كراوەكـانی دانـاوە، تـابزانن وئاگـادار بـن كـەخوای گـەورە ئاگـادارە بەهەرچـی لەئاسمانـەكان وزەويدايـە، وە خـوای گـەورە بەهـەموو شتێك زانايە.

خـوای گـەورە لێـرەدا ئامـاژە بـۆ ئـەوەدەكات مەبەسـت لەدروسـت كـردن وشـەريعەت ناردنـدا، بـريتی بـووە لـەوەی كـە خـەڵكی نـاوو سـيفات وئاكارەكـانی خـودا بناسـێت و بـەتاك وتـەنها ملكەچـی وبەندايـەتی بـۆ ئـەو ئـەنجام بـدەن. وەخـەڵكی لـەنێو خۆيانـدا دادپـەروەربن ، ئـەو دادپەروەريـەی كـە هـەمو ئاسمانـەكان وزەوی لەسـەر بنيـات نـراوە.
وەهـەروەها دەفـەرمێت: (لَقَـدْ أَرْسَـلْنَا رُسُـلَنَا بِالْبَيِّنَـاتِ وَأَنزَلْنَـا مَعَهُـمُ الْكِتَـابَ وَالْمِيـزَانَ لِيَقُـومَ النَّـاسُ بِالْقِـسْطِ... الحديـد:٢٥) واتـە: ئێمـە پێغەمبـەرەكانمان ڕەوانـە كـردووە هـاوڕێ لەگـەڵ مـوعجيزاتی ڕوونـدا، لەگـەڵ كتێبـە پيرۆزەكانـدا، تـەرازو پێـوەری شـەرعی ودادپـەروەرەمان

روون کردووەتـەوە تـاوەکو خـەڵکی دادپـەروەری بەرپابکـەن وجـێ بـەجێی بکەن.

خـوای گـەورە مەبەسـتی لەڕەوانـە کردنـی پێغەمبـەران ونـاردنی کتێبـە پیرۆزەکـان بـریتی بـووە لەبـەرپاکردنی دادپـەروەرێتی. وەچـڵەپۆپەی دادپـەروەرێتی بـریتی لـە بـەتاك وتـەنها پەرسـتن وناسـینی خـودای گـەورە. وەلـە بەرامبەریشدا چڵەپۆپەی ستەمکاری ونادادپـەروەرێتی بـریتی یـە لـە هاوبەشـی بڕیـاردان بـۆ خـوای تـاك وتـەنها. هـەروەکو دەفـەمێت: (إن الشرك لظلم عظـيم) جـا هـەر بۆیـە "هاوبەشـی وبڕیـاردان"بـۆ خـوای گـەورە بەگەورەترین تاوانە گەورەکان هەژماردەکرێت.

کەواتـــە بەرێـــژەی دووری ونزیکـــی لەبنـــەمای دادپـــەروەرێتی کەمەبەسـتی خـوای گەورەیـە، ئـەوا رێـژەی حـەق وناحـەق وەهـەروەها حـەرام وحـەلاڵ دیـاری دەکرێـت. تەنانـەت لـە کـرداروو ئاکارەکانیـشداله خواپەرستی وسەرپێچیشدا. جـا چـونکە هاوبـەش بڕیـاردان بـۆ خـودا تـەواو پێـچەوانەیە لەگـەڵ بنـەمای دادپـەروەرێتی، هەربۆیـە بەگـەورەترین تـاوان هـەژمێردەکرێت ووەبەهەشـت لەسـەر ئـەنجام دەرەکـەی قەدەغـە دەکرێـت ووەمـاڵو خـوێنی حـەلاڵ دەبێـت، وەهـیچ کـارێکی لـێ قبـوڵ ناکرێـت، وەهـیچ تکایـەکی تاوانکـاران نایگرێتـەوە. چـونکە هاوبـەش دانـەر "مـشرك" نـەفامترین وگـەوج تـرین کەسـە کەدەچـێت دروسـت کـراو دەهێنێتـە ڕیـزی بەدیهێنـەرو دروسـتکەر. بـەم پـێ یـە دەبێتـە سـتەمکارترین کـەس کەسـتەم لەخۆی وبونەوەر دەکات.

## بیانووی هاوبەش دانەران

لێـرەدا هاوبـەش دانـەران پێیـان وایـە کەمەبەسـتیان لـە هاوبـەش بڕیـاردان بـۆ خـوای گـەورە.مەبەسـتیان بەگـەورەو مـەزن ڕاگرتنـی خـوای

گەورەیە کەڕاستەوخۆ پەیوەندی پێوە ناکەن، بەڵکو هانا بۆ کەسانی پلەوپایە بەرز بەرن تا تکایان بۆ بکات وکاریان بۆ ئاسان بکات بەنمونەی پادشاکانی سەر ڕووی زەوی.

واتە ئەو هاوبەشیە وەك هۆکارێك و واستەیەك بووە بۆ گەیشتن بەخودای مەزن. (وما نعبدهم الا ليقربونا الى الله زلفي... الزمر:٣٠) .

جا هەربە بەکارهێنانی ئەم هۆکارو تاکاکرانە ، دەبێتە مایەی خەشن وتوڕەیی خوای بالآدەست ، وەمانەوەی هەتاهەتایی ئەوکەسانە لەناو ئاگر. وەدەبێتە مایەی خوێن ڕشتنیان ومال وسامان حەلاڵ بوونیان.

جا لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵ دەدات ئەویش ئەوەیە: ئایا دەگونجێت خوای گەورە ڕێگا بدات بۆ بەندەکانی بۆ نزیك بوونەوە لێی ،پەنابەرنە بەر تکاکەرو ناوبژیوان ونێوەندێك ؟ ئایا قەدەغەکردنی ئەمە تەنها لە ڕێگەی شەریعەتەوەیە ؟ یاخود هەر بەسروشتیش ئەمە ناشیرین وژیریش ڕێگری ئەوە دەکات کە شەریعەت ڕێگەی پێ نەدات؟

بەڵکو شەریعەت هاتووە بۆ دیاری کردن وڕێگری لەو شتانەی کەلە ڕوانگەی ژیریشەوە ناشیرین وناپەسەندن. وەئەم هاوبەشی دانانەش لەهەموو شتەکانی تر ناشیرین ترو ناڕەوا ترە.

جا نهێنی چی یە هاوبەشی لەنێو هەموو تاوانەکاندا لێ خۆش بوونی نی یە؟ ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمێت: (إِنَّ اللّـهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء... النساء:٤٨) واتە: خوای گەورە جگە لەتاوانی هاوبەشی بۆ خوا بڕیاردان لەهەمووتاوانێکی تر دەبورێت.

جا لەم پرسیارە وردبەرەوە وبەبیرو هۆش ودڵ هەڵیسەنگێنە و بەکەمی نەزانی ، چونکە هەر ئەم پرسیارەیە کەجیاکەرەوەیە لە نێوان

یەکتاپەرستان و هاوبەش دانەرا ، خواناسان وخوانەناسان، بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکان.

لە وەلامدا دەلێین: سەرکەوتنوسەرفرازی هەر لای خوای گەورەیە ، وەداوا لەو دەکەین کە کۆمەك وڕاست ڕەویمان پێ ببەخشێت. جا هەرکەسێك بەپێی ڕێنماییەکانی هەنگاو بنێت سەرگەردان نابێت. وەهەر کەسێکیش توشی سەرگەردنی بوو جگە لەخودا ڕێنماکاری نی یە، وەهەرچی یەکیش ببەخشێت ڕێگری بۆ نی یە. وەڕێگری لەهەر شتێکیش بکات کەس بۆی نی یە بیبەخشێت.

## جۆرەکانی هاوبەشی

هاوبەشی دوو جۆرە:

هاوبەشی یەك پەیوەندی بە خودی خوای گەورەوە هەیە ، واتە بەخودو ناوو وئاکارو کردارەکانی یەوە.

وەهاوبەشی یەك کە پەیوەندی بە شێوازی پەرستن ومامەڵە کردنەوە هەیە ، هەرچەندە خاوەنەکەی باوەڕی بەتاکی خودایە لەخود وناو وئاکارو کردارەکانیدا.

### جۆری یەکەم: کە پەیوەندی بە خودی خوداوە هەیە:

ئەم جۆرەیان دابەش دەبێت بۆ دووبەش:_

١. هاوبەشی لەکارخستن"التعطیل".

٢. هاوبەشی پەرستنی چەند خودایەکە لەگەڵ خودای گەورەدا.

**یەکەم: هاوبەشی لەکارخستن (التعطیل) :**

ئەمەیان دابەش دەبێت بۆ سێ جۆر:_

أ. لـــه كارخـــستنی پەیوەنـــدی نێـــوان دروســـتكار"خـــودا" و دروستكراو"بەندەكانی".

ب. ئینكـاری كردنــی سـیفاتی كـەماڵی وتـەواوی بـۆ خـودا، ئـەویش بەكارخستنی ناوو ئاكارو كردەوەكانی خوای گەورە.

ت. لـە كارخـستنی چـۆنیەتی مامـەڵكردنی بەنـدەكان لەگـەڵ خـودای خۆیاندا لەڕووی یەكتاپەرستیەوە.

لەنمونـەی ئـەم هاوبەشـیە: هاوبەشـی پێـڕی "الوحـدة الوجـود"ە كەپێیان وایە شتێك نی یە بەناوی دروستكارو دروست كراو (بەدیهێنەر وبەدیهێنراو) بەڵكو تەنها یەك حەق وڕاستی هەیە كە كرۆكی بونەوەرە وەلە هەموو شتێكدا هەیە وهەموو شتێكیشی تێدایە.

وەهەروەها هاوبەشی ئەو بێ باوەڕانەی كە پێیان وایە كە بونەوەر هەر لەمێژەوە هەبووەو سەرەتاوكۆتایی نی یە. وەسەرچاوەی هەموو ڕووداوەكان دەگەڕێتەوە بۆ هۆكارەكان وەبە (عەقڵ ودەرونەكان) ناویان دەبەن.

هەروەها هاوبەشی ئەو كەسانەی كە ناوو ئاكارو كردەوەكانی خوای گەورە لە كار دەخەن وەك پێڕی (جهەیمەكان وقرامتەكان) كە هیچ ناوو ئاكارێكیان بۆ خودا نەسەلماندووە ، بگرە لەڕوانگەی ئەوانەوە دروست كراوەكان لەخودی خۆی پڕوپوخترو خاوەن ئاكارو كرداری جوان وتەواوترن.

**دووەم: هاوبەشی پەرستنی چەند خودایەك لەگەڵ خوای گەورەدا**

واتە ناو وئاكاری خوای گەورە لەكار ناخات ،بەڵكو هاوبەشی بۆ خودا بڕیار دەدات لە پەرستندا. وەكو هاوبەشی مەسیحیەكان ،

کەمەسیح بەخودا دەزانن لەگەڵ خوای گەورەدا. وەهەروەها ئەم جۆرە هاوبەشی وبڕیاردانە مەجوسەکان"ئاگرپەرستەکان"یش دەگرێتەوە، کەهەموو کارێکی چاکە خواز دەدەنە پاڵ ڕووناکی وهەموو کارێکی خراپیش دەدەنە پاڵ تاریکی.

هەروەها ئەم جۆرە هاوبەشی وبڕیاردانە پێڕی قەدەریەکان"القدریە"یش دەگرێتەوە کەدەڵێن: گیانلەبەر خۆی بەدیهێنەری کردارەکانێتی، وەبەبێ ویست وئیرادەی خوای گەورە ڕوودەدەن. هەربۆیە قەدەریەکان لەم بۆچوونەدا هاوشێوەی مەجوسەکانن.

ئەم جۆرە هاوبەشی وبڕیاردانە چەندین شێواز دەگرێتەوە لەوانە:_

أ. ئەو کەسەی کە ڕووبەڕووی (ابراهیمی پێغەمبەر) بووەو دەیووت:منیش مردن وژیانم بەدەستە کە خۆی کردبووە هاوبەشی خودا لەم کارەدا. کەدەوترا"ابراهیمی پێغەمبەر" ووتەکەی پوچەڵ کردەوە بەوەی کە خوای گەورە خۆر لەخۆرهەڵاتەوە دەبات بۆ خۆرئاوا ، تۆ بەپێچەوانەوە ئەنجامی بدە. (إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِـي وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِـي وَأُمِيتُ... البقرة:٢٥٨) .

ب. ئەو کەسانەی کە ئەستێرەو هەسارەکان بەئەنجام دەرو کاریگەرو هەڵسوڕێنەری کردارەکان دادەنێن. وەکو ڕێبازی (سائبەکان) و کەسانی تریش.

ت. ئەو کەسانەی کە خۆر"ڕۆژ" یان ئاگر دەپەرستن.

پ. ئەو کەسانەی کە وادەزانێت خواکەی ئەم چڵ وپۆپەی هەموو خوداکانە.گەر بیپەرستیت پشتیوانیت لێ دەکات.

ج. ئەو كەسانەی كەپێیان وایە بە پەرستنی خودایەكی بچوك نزیك دەبیتەوە لەخوای گەورە، وەبەم چەشنە ژمارەی خوداكان زیاد دەكات ، وە وەكو هۆكار و واستەیەك بەكاری دەهێنێت.

## جۆری دووەم: هاوبەشی بڕیاردان لە پەرستندا:

ئەم جۆرەیان لەهاوبەشی جیاوازە لەوی تر ،چونكە ئەنجام دەری ئەم جۆرەیان بیروباوەڕی بەتاك وتەنهایی خودای گەورە پتەوەو هیچ هێزوپەرستراوێك نی یە تەنها خوای مەزن نەبێت كەسوود وزیان گەیەنەرە وەتاك وتەنهایە، بەلام بەدڵسۆزی وئیخلاسی تەواوەوە خواپەرستی ناكات.

### هۆكارەكانی ئەم هاوبەشی بڕیاردانە:

واتە لەپەرستنی خوای تاقانەدا بەشی دەرونودونیایی تێدایە ، هەندێك جار لەپێناوی ناوبانگ دەركردندا خواپەرستی دەكاتو وەهەندێ جاریش بۆ دەست كەوتنی دونیایی وەهەندێ جاریش بۆ خواپەرستی. بەشێوازێك ئەو خواپەرستی یە بەشی خوداو دنیاو شەیتانیشی تێدایە.

بەداخەوە ئەمە حاڵی زۆرینەی خەڵكی یە، وەئەم جۆرە هاوبەشییە كە پێغەمبەری خوداﷺ دەربارەی فەرمووە، كە (ابن حبان) لە (صحیحە) دا هێناویتی كە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: **(الشرك في هذه الأمة أخفى من دبيب النمل، قالوا: كيف ننجو منه يارسول الله؟ قالﷺ: قل: اللهم إني أعوذبك ان اشرك بك وأنا اعلم، وأستغفرك لما لا أعلم.)**[1] واتە: ئەم جۆرە هاوبەشی یە لەناو قەومەكەمدا لەدەنگی

[1] -ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(احمد: ٤٠٣/٤)گێڕاویەتیەوە بە( بأسنا وضعيف)وە(بخاری)لە (الأدب المفرد:٧١٦)گێڕاویەتیەوە(الباني)بە صحیحی داوەتە قەڵەم.

پێـی مێرووڵـه شـاراوەتر ونهـێنی تـره. ووتیـان ئـەی چـۆن خۆمـانی لـێ ڕزگاربکـەین؟ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: بڵـێن: خودایـە ئێمـە پـەنا بـەتۆ دەگـرین کەهاوبەشـیت بـۆ بڕیاربـدەین کـەپێی بـزانین ، وەداوای لـێ خـۆش بوونت لیّ دەکەین کە پێی نازانین.

جـا ڕووپـەرمای (الریـاء) هـەر هـەمووی بەهاوبەشـی دادەنرێـت. خـوای گـەورە دەفـەرمێت: (قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَـيَّ أَنَّمَـا إِلَهُكُـمْ إِلَـهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُـشْرِكْ بِعِبَـادَةِ رَبِّـهِ أَحَـدًا... الكهـف:١١٠) واتـە: پێغەمبـەر پێیـان ڕابگەیەنـە کـەمن تـەنها مرۆڤێکـی هاوشـێوەی ئێـوەم خـوای گـەورە وەحـی ونیگـام بـۆ دەنێرێـت تـا پێتـان ڕابگەیـەنم کـە خـوای ئێـوە تـاك وتەنهایـە ، جـا ئـەوەی ئەیـەوێت بەدیـداری ئـەو خودایـە شـاد بێـت ئـەوا بـا کـرداری چـاکە ئـەنجام بـدات هاوبەش وهاوەڵ بۆ خودا بڕیار نەدات.

ئـەم ئایەتـە ئامـاژە بـە تـاکی خـوداو تـاکی مەبەسـتی پەرسـتن بـۆ خـودا دەکـات ، چـونکە خـودا تاکـەو وەپێویـستە بـەتاکی بپەرسـترێت و وەهـاوەڵ وهاوبەشـی بـۆ بڕیـار نـەدرێت لەپەرسـتندا وەپێناسـەی کـرداری چاکەوچـاکەخوازی ئەوەیـە کەلەسـەر ڕێبـازی سـونەتەوە مەبەسـتی پەرستن تەنها بۆ خودا ئەنجام بدرێت دوور لە ڕووپەرمایی.

هـەروەکو نـزاو پاڕانـەوەی (عومـەری کـوڕی خـەتاب) کـە هەمیـشە دەیفـەرموو: خودایـە هـەموو کردەوەکـانم بکـە بـەکردەوەی چـاکە ، وەهـەموو کـردەوە چـاکەکانم تـەنها بۆمەبەسـتی ڕەزامەنـدی تـۆ بێـت، وەبەشی هیچ کەسێکی تێدا نەبێت.

هاوبەشـی ئـەنجام دان لەپەرسـتندا دەبێتـە مایـەی لەدەسـت دانـی پاداشـتەکەی. هـەروەکو بلێـی ئـەو کـارەو پەرسـتنەت هەرئـەنجام نـەدابێت. هـەر بۆیـە دوور نـی یـە سـزا بـدرێیت لەسـەر ئـەنجام نـەدانی ئـەو پەرسـتنە، چـونکە خـوای گـەورە فـەرمانی پـێ کـردووین کەبـە دڵـسۆزو ئیخلاسـی دوور لەڕووپـەرمایی خـودا بـەتاك وتـەنها بپەرسـتین وهاوبەشـی بۆ ئەنجام نەدەین. (وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَـهُ الـدِّينَ حُنَفَـاءَ... البينة: ٥) .

جـا هەرکەسـێك بەئیخلاسـی ودڵـسۆزی پەرسـتن ئـەنجام نـەدات، ئـەوا کـاری بەفـەرمانی خـودا نـەکردووە، وەئـەو کـارە نەدروسـتەو نـەقبوڵیش دەکرێـت. خـوای گـەورە لـە فەرموودەیـەکی قودسـیدا دەفـەرمێت: (انـا اغنـى الـشركاء عـن الـشرك، فمـن عمـل عمـلاً اشـرك معـي فيـه غـيري، فهـو للـذي اشـرك بـه، وانـا منـه بـريء.) واتـە: مـن لەهـەموو کـەس زیـاتر بـێ بـاکم وبـێ هاوتـام لەهاوبـەش وهـاوەڵ. جـا هەرکەسـێك کـارێکی ئـەنجام دا وهاوبەشـی بـۆ پەیـداکردم، ئـەوا لـە قیامەتـدا ئـەو کەسـە دەنێرمـە لای هاوبەشەکە، وەمن لێی بێ بەریم ، چونکە ئەو کارە بۆ من نەبووە.

**جۆرەکانی ئەم هاوبەشە**

ئەم جۆرەی هاوبەشی وبڕیاردانە دابەش دەبێت بۆ دووجۆر:

یەکەم: خودا لەئەنجام دەرەکەی خۆش نابێت:

کە ئەمەش دەبێتە دووبەشەوە کە گەورەو گەورەترینە.

وەخـوای گـەورە لەئـەنجام دەری هـیچ کامیـان خـۆش نابێـت، لەوانـە:خۆشویـستنی کەسـێك یـان شـتێك بەئەنـدازەی خۆشویـستنی خودای گەورە کەدەفەرمێت: (وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِـذُ مِـن دُونِ اللّـهِ أَنـدَاداً

يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلّهِ... البقرة:١٦٥) واتە: لەگەڵ بوونی ئەو هەموو بەڵگە ڕوونوئاشکرایانەدا ،کەچی هەندێك لەخەڵكی دەچن شتانی تر هەڵدەبژێرن و وەکو خودا خۆشیان دەوێت ودەیپەرستن، لەکاتێکدا بڕواداران خودایان لەهەموو کەسێك وشتێك زیاتر خۆش دەوێت.

وەئەنجام دەرانی ئەم جۆرە هاوبەشیە لەدۆزەخدا دەڵێن: (تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ * إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ... الشعراء:٩٧-٩٨) واتە: سوێند بەخودا ئێمە لەوپەڕی گومڕایی وسەرلێ شێواوی دا بووین. کاتێك ئێوەمان دەبردە ڕیزی پەروەردگارو یەکسانمان دەکردن.

جا هاوبەشی کردنی ئەو شتانە لەگەڵ خودای گەورەدا تەنها لەبابەتی خۆشەویستی وگوێڕایەڵیدا بووە، نەك بەوەی کەبەخودایان بزانن. جا ئەمە لە لوتکەی نەفامی وگەوجی وستەمدا نی یە کەسێك یاخود شتانێك لەئاستی خودای گەورەدا دابنرێت؟!

جا چ گەوجیەکە دروست کراوێکی بێ هێز وبێ دەسەلآت وهەژارو ناتەواو بەراورد بکرێت بەخوڵقێنەری هەموو جیهان وسەرچاوەی هێزوتوانایی وبژێنەرو مرێنەری هەموو دروست کراوەکان ، وەسەرچاوەی دانایی وزانایی وخاوەن بەخشندەیی ومیهرەبانی ،جا ئەمە چ ستەم وناڕەوایەکە؟!

وەئەمە چ بەراوردێکە ؟ خوای گەورە دەفەرمێت: (الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِم يَعْدِلُونَ... انعام:١) واتە: سوپاس وستایشی بێ پایان بۆ بەدیهێنەری زەوی وئاسمانەکان وتاریك و ڕووناکی یە،کەچی پاش ئەم هەموو

راستیه بێ باوەڕان پەروەردگارو دروست کراوەکانی هاوتاو هاوبەش دەکەن.

جا هاوبەشکاران (مشرك) بە چ پێوەرێك خوڵقێنەری زەوی وئاسمانەکان کە خاوەن ڕووناکی وتاریکی یە بەراورد دەکەن بەرامبەر کەسانێك خاوەنی خۆشیان نین و وەهیچیان بەدەست نی یە تەنانەت مان ومردنی خۆشیان. ئەمە چ بێ عەقڵی وستەم وناڕەواییەکە؟! وەچ تاوان ونەفامیەك هەیە بگاتە ئەم بێ عەقڵی یە؟!

## هاوبەش بڕیاردان لەکردارو ووتە و نیەتەکاندا

ئەم جۆرە هاوبەشیانە لەچوارچێوەی هاوبەشی بڕیاردانە لەپەرستندا.

## هاوبەشی لەکردارەکاندا

لە هاوشێوەی ئەم هاوبەشی بڕیاردانەوەك: سوژدەبردن بۆ غەیری خودا، وەسوڕانەوە وتەواف کردنی ماڵێك یان جێگایەك جگەلە ماڵی خودا"کەعبە".وەماچ کردنی بەردو شتی تر بەمەبەستی پەرستن،جگە لەبەردەڕەشەکە"الحجر الاسود"، وەماچ کردنی گۆڕو سوژدەبردن بۆی.

پێغەمبەرﷺنەفرەت دەکات لەو کەسانەی گۆڕی پێغەمبەران وپیاوچاکان دەکاتە مزگەوت ونوێژیان لەسەر بکات، جانەخوازە کەسانێك گۆڕپەرستن وپەیکەرپەرستن. لە (صحیحین) دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (لعن الله الیهود والنصاری أتخذوا قبور أنبیائهم مساجد.) [1] واتە:خوای گەورە نەفرەتی لەگاورو جولەکەکان کرد بەوەی کەگۆڕی پێغەمبەرانیان دەکردە مزگەوت وپەرستگا.

---

[1] -ئەم فەرموودانە لە(احکام الجنائز)ی(ناصرالدین الالبانی)دا بەصحیح هاتووە.

وەلــە (صــحيح) دا هــاتووە کــە پێغەمبــەرﷺ فەرموويــەتی: (ان مــن اشـرار النـاس مـن تـدركهم الساعة وهـم احيـاء، والـذين يتخـذون القبـور مسـاجد.)[1] واتــە: خـراپترين پێـرِ ئەوانـەن کـە قيامـەتيان بەسـەردا دێـت، وەئەو کەسانەش کە گۆڕ دەکەنە پەرستگا.

وەلــە (صــحيح) دا هــاتووە کــە پێغەمبــەرﷺ فەرموويــەتی: (إن مــن كــان قــبلكم كــانوا يتخــذون القبــور مســاجد ألا فــلا تتخــذوا القبــور مســاجد ، فــإني أنهــاكم عــن ذلــك.)[2] واتــە: ئــەو گەلانــەی پێشــوو گۆڕەکانيــان دەکــردە پەرسـتگا جـا مـن فـەرمانتان پـێ دەکـەم کـەکاری وانەکەن.

وەلــە (مســند) دا (امــام احمــد) دا هــاتووە، وە (ابــن عبــاس) بــە صــحيحی هێنــاوێتی کــە پێغەمبــەرﷺ فەرموويــەتی: (لعــن الله زوارات القبــور، المتخــذين عليهــا المســاجد والســرج.)[3] واتــە: خــوای گــەورە نــەفرەتی لەوئافرەتانــە کــردووە کەدەچــنە ســەرگۆڕەکانيان وکــاری ناشــەرعی ئــەنجام ئــەدەن، وەئــەو کەســانەش کــەگۆڕەکان دەکەنــە پەرستگاو مۆميان لەسەر دادەگرسێنن.

هــەروەها پێغەمبــەرﷺ دەفــەرمێت: (اشــتد غضــب الله علــى قــوم أتخـذوا قبـور انبيـائهم مسـاجد.)[4] واتـە: خـوای گـەورە خەشـم وقينـەو غــەزەبی تونــدە دژ بەوگەلانــەی گــۆڕی پێغەمبــەرەکانيان دەکەنــە پەرستگا.

---

1 —هەمان سەرچاوەی پێشوو.
2 —هەمان سەرچاوەی پێشوو.
3 —هەمان سەرچاوەی پێشوو.
4 —هەمان سەرچاوەی پێشوو.

وەهــەروەها دەفــەرموێت: (ان مــن كــان قــبلكم كــان اذا مــات فــيهم الرجـل الصـالح بنـوا علـى قـبره مسجداً وصـوروا فيـه تلـك الصـورة، اولئـك شـرار الخلـق عنـدالله يـوم القيامـة.)[1] واتــە:گــەلانی پــێش ئێــوە ئەگــەر پیاوچــاكێكیان لــێ بمردایــە لەســەر گۆڕەكــەی پەرســتگایان دروســت دەكـردو وێنەكـەیان دەكێشـا تێـدا. ئەوانـە خـراپترین پێـڕن لـەلای خـوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا.

جا ئەمـە حـاڵی ئـەو كەسانەیە كەسـوژدە بـۆ خـودا دەبـەن لەمزگـەوتێك كەلـە سـەرگۆڕەكان دروسـت كـراوە. جـا ئـەبێ حـاڵی ئەوكەسانە چـۆن بێـت كە سوژدە بۆ گۆڕەكان دەبەن؟!

پێغەمبــەرﷺفەرموویــەتی: (اللــهم لاتجعــل قــبري وثنــا يعبــد.)[2] (واتــە: خودایـە گۆڕەكـەم نەبێتـە بـت وبپەرسـترێت.) پێغەمبــەری ئــازیز زۆر جــەختی لەســەر پاراســتنی لایــەنی یــەكتا پەرســتی كردۆتــەوە ، تەنانـەت ڕێگـری كـردووە لەئـەنجام دانـی نوێـژی سـونەت لـەكاتی هـەڵهاتنی خـۆردا تـاوەكو لێـك چـونێك ڕوونـەدات لەگـەڵ خۆرپەرسـتەكاندا، كەلـە كـاتی هــەڵهاتن وئاوابوونیـدا سـوژدەی بـۆ دەبـەن.هـەربۆ ئـەم مەبەسـتە پێغەمبـەرﷺ ڕێگـری كـردووە لەئەنجامـدانی نوێـژ لـەپاش نوێـژی عەسـر و دوای نوێژی بەیانی.

بــەڵام ســەبارەت بــە ســوژدەبردن بــۆ جگەلــە خــودا. ئــەوا پێغەمبــەرﷺدەفــەرمێت: (لاينبغـي لأحـدان يسـجد لأحـد إلا لله)[3] واتــە: بـۆ هـیچ كەسـێك نـی یـە سـوژدەبەرێت جگـە بـۆ خـودا نـەبێت. جـا

---

[1] –هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[2] –هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[3] – ئەم فەرموودەیە(حسن)ە،(احمد: ٥/٢٢٨)گێراویەتیەوە.

**ووشـەی"لاینبغي" لـە ووتـەی خـواو پێغەمبـەردا واتـای ئەوپـەڕی لـەڕێگری وقەدەغـەیی دایـە. هـەروەکو خـوای گـەورە دەفـەرمێت:** (وَمَـــا عَلَّمْنَـــاهُ الشِّـــعْرَ وَمَـــا يَنبَغِـــي لَـــهُ... يـــس:٦٩) **واتـە:ئێمـە پێغەمبـەرمان فێـری شیعربێژی نەکردووە وبەهیچ شێوەیەکیش بۆی نی یەشیعر بڵێت.**

(وَمَا تَنَزَّلَـــتْ بِـــهِ الشَّـــيَاطِينُ * وَمَـــا يَنبَغِـــي لَهُـــمْ وَمَـــا يَسْـــتَطِيعُونَ.. الشـــعراء:١١٠-١١١) **واتـە: شـەیتانەکان نـەیان توانیـوە ئـەم قورئانـە دابیەزێنن، وەبەهیچ شێوەکیش بۆیان نی یە ناتوانن کاری وابکەن.**

**وە ووتەی فریشتەکان لەقورئاندا:** (مَا كَانَ يَنبَغِـــي لَنَـــا أَن نَّتَّخِـــذَ مِـــن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَـــاء... الفرقـــان:١٨) **واتـە: بـەهیچ شـێوەیەك بۆمـان نـی یـە، جگەلە تۆ پشتیوان هەڵبژێرین.**

## هاوبەشی لە ووتەدا

**واتــە هاوبەشــی بڕیــاردان لــە ووتــەوگفتوگۆدا. وەك ســوێند خــواردن بــە جگــە لــەخودا. هــەروەکو (امــام احمــد) و (أبــوداود) دەگێڕنــەوە کــە پێغەمبــەرﷺفەرموویــەتی: (مــن حلــف بغــير الله فقــد أشــرك)[1] واتــە: هەرکەسێك سوێند بەغەیری خودا بخوات هاوبەشی بڕیاردانە.**

---

[1] –ئـــەم فەرموودەیـــە(صـــحیح)ە،(احمـــد: ٨٧,١٢٥/٢) وە(حـــاكم:١٨/١)وە (ابـــو داود:٣٢٥١)وە (ترمذي:١٥٣٥ )گێڕاویانەتەوە.

وە(امام ترمذي)دەڵێت؛ زانایـان ئـەم فەرموودەیـە بـەوە لێـك دەدەنەوەکـە ووتـەی پێغەمبـەر(فقـد كفـر– او اشـرك) لەبابـەتی(تغلـیظ)، وەبەڵگـەش لەسـەر ئەمەفـەرموودەی(عمـر)ە: ان الـنبي ﷺ، سمـع عمـر يقـول: وابـي وابـي، فقـالﷺ: الا ان الله ينهـاكم ان تحلفـوا بأبـائكم؛ واتـە: پێغەمبـەر گـوێی لـە (عمـر)بـوو ووتـی: سـوێند بـەباوکم بـەباوکم، پێغەمبـەر فـەرمووی: خـوای گەورە قەدەغەی کردووە سوێند بەباوکتان بخۆن.

وەلـە (ابـوهريرە)دەگێڕنـەوە کـە پێغەمبـەر فەرموویـەتی:(مـن قـال في حلفـه الـلات والعـزى، فيقـول: لا الـه إلا الله)واتـە: هـەر کەسـێك سـوێند بەغـەیری خـودا بخـوات بابڵێـت"لا إلـه إلا الله "وە ووشەی(الـلات والعزى)ناوی خوداکانی سەردەمی نەفامی بوون لە مەککە.

وەنمونـەی ووتنـی (ماشـاء الله وشـئت) واتـە: خـواو تـۆ ویسـتان. هـەروەکو لەپێغەمبـەرەوە دەگێڕنـەوە کـە: (قـال لـه رجـل: ماشـاء الله وشـئت، فقـالﷺ: أجعلتنـی لله نـداً؟ قـل: ماشـاء الله وحـده) [1] واتـە: پیاوێـك بـە پێغەمبـەری ووت: ئەگـەر خـوداو تـۆ ویسـتان ، پێغەمبـەر فـەرمووی: ئایا منـت کـردە هاوبەشـی خـودا؟ بـەڵکو دەبێـت بڵێیـت: ئەگـەر خودا ویستی بەتەنها.

ئەمـە لەگـەڵ ئەوەشـدا خـوای گـەورە جـەخت دەکاتـەوە لەسـەر لەسـەر ویستی مـرۆڤ کەدەفـەرمێت: (لِمَن شَاء مِـنكُمْ أَن يَسْـتَقِيمَ... التكـوير:٢٨) واتە: بۆ ئەوانەی کەدەیانەوێت ڕێبازی ڕاست ودروست بگرنە بەر.

جائەگـەر ئەمـەی باسمـان کـرد دروسـت نـەبێت ، ئـاخۆ دروسـتی ئـەم ووتانـە لەکوێـدا بێـت کـە خـەڵکی خوویـان پێـوە گرتـووە ودەڵـێن: (مـن پشـتم بـەخودا وتـۆ بەسـتووەو مـن تـەنها خـواو تـۆم هەیـە) ، (ئەمـە هـی خـواو تۆیـە. ئەمـە لەبەرەکـەتی خـوداو تۆیـە) . (مـن لـەئاسمان خـودام هەیەو لەسـەر زەویـش تـۆ) . یـاخود دەڵـێن: (سـوێند بـەخودا ژیـانی فـلان کەس ) . (من تکام لە خوداو تۆیە...هتد) .

جـا ئەگـەر بـەراوردێك بکـەین لـەنێوان ووتـەی "ئەگـەر خـوداو تـۆ ویسـتان" ئـەوا لەگـەڵ ئـەم ووتانـەی تـردا وەلـە گـەڵ وەلامـی پێغەمبـەردا بـەوەی کـە فـەرمووی (منـت کـردە هاوبەشـی خـودا...) ئەوسـاتە مەترسـی ئـەو ووشـانەمان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە کەئەگـەر پێغەمبـەری خـودا گـوی بیستی ببووایە چی دەووت؟!

---

[1] —ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(احمد: ١/٢١٤، ٢٨٣،٣٤٧)گێڕاویەتیەوە.

## ئەو پەرستنانەی کەتەنها شایستەی خودان

ئـەو پەرسـتنانەی کەتـەنها شایسـتەی خـوای گـەورەن بـریتین لـە: (سـوژدەبردن، پشـت بەسـتن،پارێزگـاری ولەخواترسـان"تقـوا"،تەوبـەکردن، نـەزرکردن، سـوێندخواردن، الله أکـبر، الحمـد لله، سـبحان الله،وأسـتغفرالله، وەسـوڕانەوەو تـەواف کـردن بـەدەوری ماڵی خودا، نزاوپاڕانەوە.)

ئـەم جـۆرە پەرستشـانە تـەنهاو تـەنها شایسـتەی خـوای گـەورەن وەدروسـت نـی یـەو ڕێ پێـدراو نـی یەبـە هـیچ شـێوەو شـێوازێك جگـە لەخودا بۆ کەسی تر ئەنجام بدرێن.نەپێغەمبەر نەفریشتە...هتد.

وەلـە (مسـندی امـام احمـد) دا هـاتووە کـە: (ان رجـلاً أتـي بـە الى الـنبيﷺ قـد أذنـب ذنبـا، فلمـا وقـف بـين يديـە. قـال: اللـهم إنـي اتـوب إليـك ولا اتـوب إلى محمـد. فقـالﷺ:عـرف الحـق لأهلـە.)[1] واتـە: کەسـێکیان هێنـا بـۆ لای پێغەمبـەر وەتـاوانێکی ئـەنجام دابـوو، کاتێـك هێنایـان بـۆلای پێغەمبـەرﷺ کـابرا ووتـی خودایـە مـن تەوبـە دەکـەم بـۆ تـۆ نـەك بۆ محمـد. پێغەمبـەرﷺفـەرمووی: حـەقی نـاس بـوو بـۆ خاوەنەکـەی ،واتـە: زانـی کەئەمە تەنها شایستەی خودایە نەك کەسی تر.

## هاوبەشی لە ویست ونیەت دا

هاوبەشـی دانـان لـە ویسـت نیـەت دا بابـەتێکی زۆر وردو پەنهانـە ،بگـرە ئـەو دەریایەیـە کـە کـەناری نـی یـە، تـەنها کەسـانێك دەربازیـان دەبێـت کـە شـارەزاییەکی زۆریـان هـەبێت. ئـەم هاوبەشـی دانانـە ئـەوە دەگرێتـەوە کـە

[1] – ئـەم فەرموودەیـە(حسـن)ە،(احمـد: ٤٣٥/٣) و(طبرانـي)لـە (الکـبير: ٢٦٣/١)و (الحـاکم: ٢٢٥/٤)گێڕایانەتـەوە. هەرچـەندە (ذهـبي)دەڵێـت لەسـەنەدەکەیدا (ابـو مصـعب) لاواز وبـێ متمانەیە، بەڵام پیاوەکانی تر جێگەی متمانەن.

هەرچی ویست ونیەتێکت هەیە لە ئەنجامدانی هەر ووتەو کردارێك مەبەستت نزیك بوونەوە دەبێت لە کەسێك یان بەدەست هێنانی بەرژەوەندیەك جگە لەخودای گەورە، ئەوا هاوبەشی بڕیارداوە.

دڵسۆزە"إخلاص": واتە هەرچی ویست ونیەت و ووتەو کارێکت هەیە بە پوختی تەنها مەبەستت خوای گەورە بێت، جا بەمە دەڵێن"الحنیفیة"واتە "پاك وپوختی وڕاستگۆیی" کە گەلی حەزرەتی ئیبراهیمی لەسەر بوو. وەخوای گەورەش فەرمانی کردووە کە بەو شێوەیە خواپەرستی ئەنجام بدەین.وەجگە لەم شێوازە هیچی تری لاپەسەند نیە کە ناو کرۆکی ڕاستی ئیسلامە (وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ...آل عمران:٨٥) واتە " ئەوەی جگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەو بکات لێ ی وەرناگیرێت لە قیامەتیشدا خەسارەتمەند دەبێت..."

جا هەرکەسێك لە سەر ئەم شارێگایە لابدات ئەوا خەسارەتمەندی دونیا و قیامەتە.

__پوختەی هاوبەشی دانان:__

پوختەی هاوبەشی دانان: بریتیە لە (چواندن بە خوای گەورە و ،چواندنی بە بەندەکان بە خوای گەورە) .

ئەمەیە کە هەرچی ئاکاری کەماڵی خوای گەورە هەیە کە خۆی و پێغەمبەرەکەی پێیان وەسف کردووە. وە بچوێنی بە دروست کراوەکانی. ئەو کەسانەی کە بینایان کوێر و ،دڵیان ڕەش،هۆشیان پوچە،کە یەکتاپەرستی دەکەنە لێکچواندن ،وە دواتر ئەم لێکچواندنە بە مەزنی و ملکەچی و خوداپەرستی لە قەڵەم دەدەن.چونکە هاوبەش

دانـەر (مشـرك) دروسـتكراوەكان لـە سـيفاتى خوايەتيـدا دەچـوێنێت بـە خواى گەورە.

وەهەرچـى سـيفاتى خوايـەتى هەيـە دەيداتـە پـاڵ ئـەو دروسـتكراوانە. لـە كاتێكـدا كـە ئـەم سـيفەتانە تـەنها و تـەنها شايسـتەى خـواى گەورەيـە كـە هـەر بـە ميهرەبـانى خـودى خـۆى بەخشـندە و ڕێگـر و زيانبەخشـە بـە هـەموو بوونـەوەر كـە لـە بەرامبـەر ئەمانـە دا پێويسـتە نـزا و پاڕانـەوە ، تـرس،و تكـا و پشـت بەسـتنى تايبـەت بكرێـت بـەخواى گـەورە. كـە هـەر خودى‌خـــۆى بەديهێنـــەرو بڕيـــاڕ دەر و مرێنـــەر و ژێنـــەرەى هـــەموو دروستكراوەكانێتى.

جاهـەركام لـە مانـە بدرێنـە پـاڵ هەرشـتێك و كەسـێكى تـر ئـەوا ئـەو شـتەى بـە خـواى گـەورە چـواندوە و هاوبەشـى بڕيـارداوە.كـە ئەمـەش گـەورەترين سـتەمە. كـە كەسـێك يـان شـتێك كـە هيچـى بـە دەسـت نـەبێت و خـودى خـۆى دروسـت كـراوى خـوداى مەزنـە بيچـوێنێت بـە مـەزنترين و گەورەترين هێز كەخوداى گەورەيە ؟!

## تايبەتمەنديەكانى خوايەتى

يەكێك لە تايبەتمەنديەكانى خوايەتى بريتى يە لە:

**١- كەماڵى ڕەها (المطلق) لە هەموو ڕوويەكەوە:**

خودايـەك هـيچ كـەم و كوڕيـەكى نىيـە لـە هـيچ ڕوويەكـەوە. كـەماڵى ڕەهـاى هەيـە لـە هـەموو ڕوو و بوارێكـەوە هەربۆيـە پێويسـتە سـەرجەم پەرستشـەكان ئاڕاسـتەى ئـەو بكـرێن بـە تـەنها چـونكە سەرچـاوەى دابـين كردنـى پێداويسـتيەكانى ژيانـە لـە هـەموو ڕويەكـەوە. جـا هەرچـى پەرسـتش هەيـە وەك (تەوبـەكردن ،پشـت بەسـتن ، بەمـەزنى ڕاگـرتن ، نـزا و پاڕانـەوە ،تكـا كـردن ،ملكـەچ كـردن ،خـۆش ويسـتن و بەندايـەتى

کردن.هتد) سەرجەم ئەمانە بە پێی پێوەری عەقڵ و ژیری و شەرع و سروشتیش تەنها بۆ خودا ئەنجام دەدرێن.

جاهەرکەسێك کام لە مانەی سەرەوە بداتە پاڵ کە کەسێکی تر یاخود بۆشتێکی تری ئەنجام بدات جگە لە خودای گەورە ئەوا هاوبەشی بڕیارداوە ئەو شتەی چواندوە بە خودایەك کە نەهاوشێوە ونە هاوتای هەیە کە ئەمە خۆی لە خۆیدا گەورەترین ستەمە. وە خوای گەورەش لە ئەنجامدەرەکەی خۆش نابێت. لە گەڵ بوونی ئەو هەموو سۆز و بەزەیەی دا.

**٢- پەرستراوێتی:**

واتە هەمیشە خودای گەورە پەرستراوە لە لایەن بەندەکانیەوە و شایستە و شایەنی ملکەچیە.

وە (پەرستن) لە سەر دوو بنەمای سەرەکی پێکهاتووە بریتیە لە (تەواوی خۆشەویستی وە تەواوی ملکەچی) بۆ خودای گەورە.

وە پلە و پایەی بەندەکان لە پەرستندا بەندە بە بەهێزی ئەو دوو پێکهێنەرەوە جاهەر کەسێك "خۆشەویستی و ملکەچی" ببەخشێت بەکەسێك ،شتێك جگە لە خودای گەورە. ئەوا مافی خودای بەخشیوە بە کەسێکی تر کە ئەمەش هاوبەش دانانە ، وە هیچ عەقڵ و ژیریەك و سروشتێکی خاوێن ، ئەمە پەسەن ناکات. تەنها لە لای کەسانێك دروستە کە شەیتان عەقڵی تێکداون و سروشتی شێواندوون.

جا هەر کەسێك لە سەر ژیری پوخت و سروشتی خاوێن مابێتەوە ئەوا لەو کەسانەیە کە خواناس و ڕێنماکراوون بە هاتنی کتێب و پێغەمبەرەکانی خودا.وە ژیر پاك و بیر ڕۆشن و سروشتی خاوێنن ، هەمیشە بڕوای یەکتا پەرستیان گەشە دەکات ( يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَن

يَشَــــاءُ... النـــور:٣٥) واتــه: خـوداى گــهوره هيدايــهت و ڕێنمـايى ئــهو كهسانه دهكات كه مهبهستێتى.

جـا پــاش زانينــى ئــهم ڕاسـتى يـه ئـيتر ههرچـىيهكى تــر لهمانــهى خــوارهوه كـه بـاس دهكـهين ، هـهر هـهموويان تـهنها و تـهنها مـافى خـودان. لهوانه:

**٣- سوژده بردن:**

ههركهسێك سـوژده بـۆ غـهيرى خـودا بـهرێت ئـهوا ئـهو شـتهى چـواندووه به خودا.

**٤- پشت بهستن (التوكل) :**

ههركهسـێك پشــت بــه غــهيرى خــودا ببهســتيت. ئــهوا ئــهو شــتهى چواندووه به خودا.

**٥- تهوبهكردن:**

ههركهسێك تهوبـه بكـات بـۆ غـهيرى خـودا ئـهوا ئـهو كهسـهى چـواندوه به خودا.

**٦- ســوێند خــواردن پێــى، يــان بــه نــاوى بهمهبهســتى گــهوره و پــيرۆز ڕاگرتن:**

جـا ههركهسێك سـوێند بـه غـهيرى خـودا بخـوات. واتـه زۆر بـه پـيرۆزو گــهورهى بزانێــت ئــهو مافــهى پێــى بــه ڕهوا ببينێــت ئــهوا ئــهو كهســهى چــواندوه بــه خـوداى گـهوره. ئهمانــهى كـه باسمـان كـرد ههرهـهمووى لـه ڕوانگهى چواندو بووه (التشبيه) .

**بەلاّم لە ڕوانگەی لێك چواندن پێی (التشبه به):**

هەركەسێك خۆی بە مەزن و گەورە و پیرۆز بزانێت ، وەبانگەشەی پیا هەڵدان بكات بۆ خۆی ، وە هەر یەكە لە مەزنی ، ملكەچی خەڵكی ،تكاكردن،ترسان ،پشتبەستن. هتد ئەمانە بە مافی خۆی بزانێت. ئەوا كێبڕكێ لە گەڵ خودا دا كردووە لە خوایەتی و پەروەردگاریێتی دا.

خوای گەورە مافی خۆیەتی ڕیسوا و سەرشۆڕی بكات و بیكاتە پەند و عیبرەتی ڕۆژگار و بەندەكانی. لە (صحیح) دا هاتوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يقول الله عز وجل:العظمة إزاري،والكبرياء ،ردائي ، فمن نازعني واحداً منهما عذبته) [1] واتە: گەورەی و مەزنی ،جل و بەرگی سەربلّند و سەربەرزی عەباوبالاّ پۆشمە. هەر كەسێك لەم دوانە كێبڕكێم لە گەڵ دا بكات تووشی ئازار و سزای دەكەم ".

جا ئەگەر پەیكەرتاشێك لە تاشینی پەیكەرێك دا بیەوێت لاسایی خودای گەورە بكاتەوە. ئەوا توندترین سزا دەدرێت. ئاخۆ كەسێك بیەوێت كێبڕكێ لە مافی خودایەتی و پەروەرگاریێتی دا بكات حاڵی لە قیامەتدا چۆن بێت ؟! پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێت: (أشد الناس عذاباً يوم القيامة المصورون ، يقال لهم أحيوا ما خلقتم) [2] واتە:"توندترین

---

[1] –ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(مسلم:١٧٩/١٦نووی)گێڕاویەتیەوە.
(امام نووی)دەڵێت: "نازعنی" واتە بەمافی خۆی بزانێت وبیكاتە سیفاتی خۆی، كەئەمەش لوتكەی خۆ بەزل زانینە(التكبر) ،وە بە كارهێنانی وشەی "إزاری" وە "راداء" لە ڕوی مەجازەوەیە هەر وەكو عەرەب دەڵێت :( فلان شعارة الزهد،و دثارة التقوى) مەبەستیا لێرە جل و بەرگ نی یە ، بەڵكو مەبەستیان سیفات و ئاكای ئەو كەسەیە. وەكو جل و بەرگ و مرۆڤەكەیان ڕازاندۆتەوە دەڵێت : ئەمەی لێرەدا بۆیە بەكارهێناوە چونكە (عیزەت و سەربەرزی) تەنها تایبەتن بە خوای گەورە دوو شتن لێی جیا نابنەوەو هەمیشەین بۆ خودا...(شرح مسلم:١٧٩/١٦).
[2] –ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(بخاری: ٧٥٨٨)وە (مسلم: ٩٢/١٤نووی)گێڕاویەتیەوە.

سزا لە قیامەتدا توشی پەیکەرتاشەکان دەبێت کە ویستویانە لاسایی خودای گەورە بکەنەوە. پێیان دەوترێت ئەو پەیکەرانەی دروستان کردووە زیندوویان بکەنەوە و ڕوح بکەنەوە بەریان ".

وە لە (صحیحین) دا هاتووە. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (**قال الله عز وجل: ومن أظلم ممن ذهب يخلق خلقاً كخلقي ، فليخلقوا ذرة ، فليخلقوا شعيرة**)[1] واتە:" خودای گەورە دەفەرموێت: کێ هەیە لەو کەسە ستەمکارتر کە شتێك دروست دەکات و خۆی دەهێنێتە ئاستی من، ئەگەر ڕاست دەکەن با گەردێك یان دەنکە جۆیەك دروست بکەن".

خوای گەورە بچوکترین دروستکراوەکانی دەست نیشان کردووە کە"گەرد و گەنمە". نەخوازە ئاسمانەکان وزەوی..هتد. کە دەیانەوێت لەخودایەتی کێ برکێ لەگەڵ خوای گەورەدا بکەن.

وە لە (صحیح) دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (**إن أخنع الاسماء عندالله رجل يسمى: بشاهان شاه، أي ملك ملوك، لاملك إلا الله.**)[2] وەلە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (**أغيظ رجل على الله رجل يسمى بملك الأملاك.**)[3] واتە: ناشیرینترین ناولای خوای گەورە ،کەسێکە ناوی بنرێت شاهان شاە.واتە پادشای پادشاکان، تەنها خودا پادشایە.

خوای گەورە تورە دەبێت کەسێك ناوی خۆی بنێت بە پادشای پادشاکان، واتە خوای گەورە ڕق وغەزەبی لەکەسێك دەگرێت

---

[1] -ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(بخاری: ٥٩٥٧) و(مسلم: ٩٤/١٤ نووی)گێڕاویانەتەوە.

[2] -ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،(بخاری: ٦٢٠٦)وە(مسلم: ١٢٨/١٤ نووی)گێڕاویانەتەوە.

[3] -ئەم فەرموودەیە(صحیح)ە،هەمان سەرچاوەی پێشوو. وەهەریەکە لە وشەکانی: (خنع، أغیظ،أخبث) بەواتایی ڕیسوایی دێت لەڕۆژی قیامەتدا.

کەلەناوەکانــدا خــۆی بــەخوای گــەورە بچــوێنێت، چــونکە تــەنها خــوای گەورە پادشایەو فەرمان ڕەواو بڕیاربەدەستە.

## گومانی خراپ بردن بەخودا، گەورەترین تاوانە

گومــانی خــراپ بــردن بــەخوای گــەورە پێچــەوانەو دژە بــە کــەماڵی خــوای گــەورە وسـیفاتە بلّنـد ونـاوە جوانـەکانێتی، چـونکە گومـانی خـراپ بـردن لـە گۆشـەنیگای کـەم وکـورتی ڕوانینەوەیـە بـۆ خـوای گـەورە. هـەر بۆیـە خـوای گەورە بەلّێن وهەڕەشـەی توندی لـێ کـردووین دەفـەرمێت: (عَلَــيْهِمْ دَائِــرَةُ السَّوْءِ وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَــدَّ لَهُــمْ جَهَــنَّمَ وَسَــاءتْ مَصِــيرًا... فــتح:٦) واتــە: ئـەو گومانـە خراپـە هـەربۆخۆیان دەگەڕێتـەوە،وەنـەفرەتی لـێ کـردو غـەزەبی لـێ گرتوونـوەدۆزەخی بـۆ ئامـادەکردوون کەسـەخترین سەرئەنجامە.

وەخـوای گـەورە دەرهـەق بەکەسـانێك کەیـەکێك لەسـیفاتە بلّنـدەکانی ڕەد دەکاتەوە.دەفـەرمێت: (وَذَلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّــذِي ظَنَنــتُم بِــرَبِّكُمْ أَرْدَاكُــمْ فَأَصْــبَحْتُم مِّــنْ الْخَاسِــرِينَ... فصــلت:٢٣) واتـە:ئـەوە سـەرئەنجامی ئـەو گومانـە ناپەسـەندە بـوو کـەئێوە بـەخوای گـەورەتان بردکـە بـووە مایـەی ئەوەی بەهەتاهەتایی بچنە ڕیزی زەرەرمەندانەوە.

وەخــوای گــەورە لەســـەر زاری حـــەزرەتی ئیبراهیمـــەوە کـــە وتەیـــەك ئاراستەی گەلەکەی دەفـەرمێت: (إِذْ قَــالَ لِأَبِيــهِ وَقَوْمِــهِ مَــاذَا تَعْبُــدُونَ * أَئِفْكًا آلِهَةً دُونَ اللَّهِ تُرِيدُونَ * فَمَا ظَنُّكُم بِــرَبِّ الْعَــالَمِينَ.. الصــافات:٨٥-٨٧) واتــە: باشــە ئــەوە ئێــوە چــی دەپەرسـتن ؟ ئایـا خواوەنـدی درۆینـەو هەڵبەســتراو دەپەرســتن جگــە لــەخوای تــاك وتــەنها، ئــەی هەڵوێســت وگومانتان چی یە بەرامبەر خوای گەورە؟

واتە ئەی گومانتان چۆنە بەخوای گەورە کەکاتێ بەدیداری دەگەن وئێوەش کەسی ترتان پەرستووە؟ ئەی گومانتان چۆنە بەناوە جوان وسیفاتە بڵندەکانی پەروەردگاریتی خودا کە دوورە لەهەموو کەم وکورتی وناتەواویەکەوە، تا بیانوو بدۆزنەوە بۆ پەرستنی کەسێکی تر جگە لەخودا.

جا ئەگەر گومانتان وابووایە کە خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە وبەهەموو شتێك ئاگادارە. وەهەموو شتێك کەم وکورتە تەنها کەماڵی خۆی نەبێت، وەهەموو شتێك بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە ، وەهەموو کەسێك وشتێك پێویستی بەسۆزی ئەو هەیە، وەدابین کاری هەموو پێداویستیەکانی ژیانە. دەوڵەمەندترین وزاناترین وبەخشندەترین هێزە. پادشای هەموو پادشاکانەو خاوەنزەوی وئاسمانەکانە. وەسۆز وبەزەیی ورەحمەتی هەموو بونەوەری داپۆشیوە. جا ئەمە سیفات وتوانای خودا بێت زۆر دوورە لەژێری وعەقڵە سروشتەکەوە کەهۆکارێك واستەیەك بۆ خۆی بڕیاربدات لەنێوان خۆی وبەندەکانیدا.

## پەرستن جگە لەخودا ،گەورەترین ستەمە

خوای گەورە خاوەن ووەبەرهێنەری زەوی وئاسمانەکانەو ئەویشی کەتێیدایە ، وەهەر خۆی شایستەو شایەنی پەرستن وملکەچی وگوێڕایەڵی یە، کەپێویستە بەمەزنی وگەورەیی تێیبڕوانین وملکەچی بکەین. چەند ستەمێکی گەورەیە کاتێك ئەو مافی خودایەتی وپەرستنە دەدرێت پاڵ کەسێکی تر جگە لەخودا. بەتایبەتی کەبزانیت ئەو کەسە پەرستراوەش لەبەندەیەکی بێ دەسەلاّت زیاتر هیچی تر نی یە.

هەروەکو دەفەرمێت: (ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِنْ أَنفُسِكُمْ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن شُرَكَاء فِي مَا رَزَقْنَاكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَاء تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ... الروم:٢٨) واتە: هەر لەخۆتان نمونەی بۆ هێناونەتەوە"کە چەندە بڕیاردانی هاوەڵ وهاوبەش بۆ خودا نادروست ونابەجێ یە" ئایا ئێوەڕازین بەندەو بەردەستەکانتان ببنە هاوبەشتان لەماڵ وسامانتاندا وەهەروەکو یەك سوودی لێ وەربگرن ودەستی تێ بخەن ووەلێیان بترسن ووحسابیان بۆ بکەن. هەروەکو چۆن ئێوە لەیەکتری سڵ دەکەنەوە.جائەگەر ئێوە مۆڵەتی ئەوە نەدەن کە کرێکارەکانتان یان کارەکەرەکانتان هاوبەشتان بێت لەماڵ وسامانداا. بەچی پێوەرێك ئێوە بەندەکان ودروست کراوەکانی من دەکەنە هاوبەشم لەکاری خوایەتی کەبەتەنها ماقی منە. جا هەرکەسێك ئەمە بیروباوەڕی بێت ئەوە ماقی خوایەتی نەداوەو وەمنی بەتاك وتەنها نەزانیوە.

وەك دەفەرمێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِن يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ * مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ...الحج:٧٣-٧٤) واتە: ئەی خەڵکینە، نمونەیەك هێنراوەتەوە چاك گوێبیستی بن، بەڕاستی ئەوانەی کەهاناو هاواریان بۆ دەبەن لەجیاتی خوا هەرگیزناتوانن تاکە مێشێك دروست بکەن، هەرچەندە بۆ ئەو کارە کۆببنەوەو یارمەتی یەکتریش بدەن، ئەگەر مێشەکە شتێکیان لێ بفڕێنێت ناتوانن لێی بسەننەوە. داواکراو وداولێ کراو هەردووکیان لاوازو بێ دەسەلاتن. ئەوانە"وەکو پێویست" قەدری خۆیان بەچاکی نەزانی، ڕێزی پەروەردگاریان بەتەواوی نەگرت، لەکاتێکدا بەڕاستی خودا زۆر بەهێز وبەتاوان وبالادەستە.

وەهەروەها دەفەرمێت: (وما قدروا الله حق قدره والأرض قبضته يوم القيامة والسموات مطويات بيمينه سبحانه وتعالى عما يشركون... الزمر: ٦٧) واتە: خوانەناسان قەدەری خۆیان وەك پێویست نەگرت ڕێزیان بۆ دانەنا ، بەمەرجێك هەرهەموو گۆی زەوی پڕ مشتێکی ئەو زاتەیە لە ڕۆژی قیامەتدا. ئاسمانەکانیش بەدەستی ڕاست ودروستی خودا پێچراون ، پاکی وبێ گەردی وبڵندی بۆ ئەو پەروەردگارە مەزنەی شایستەی ئەوە نی یەنەفامان وهاوەڵ وهاوبەشی بۆ بڕیاربدەن وقەدری نەزانن.

جا قەدرو ڕێزی پێویستی خوایان نەزانیوە کە هاوبەش وهاوەڵی بۆ بڕیاردەدەن لە کاتێکدا خوای گەورە بەهێزوبالادەستە وەجگە لە خودا هەموو بەندەکانی لاوازو بێ دەسەڵاتن.

هەروەها قەدروڕێزی خوایان نەگرتووە کەسانێك کە:

دەڵێت خودا هیچ کتێبێك وپێغەمبەرێکی ڕەوانە نەکردووە بەڵکو کاتێك بونەوەری دروست کردو ئیتر پشت گوێی خستووە و وازی لێهێناوە ، وەهیچ مەبەستێك نی یە لەدروست کردنی بونەوەردا. ئەمەش خۆی لەخۆیدا تۆمەت دانە پاڵ خوای گەورە بەپشت گوێ خستنی دروست کراوەکانی وەبێ هودەیی لە دروست کردنیدا. هەروەها ڕەد کردنەوەی وەبەڕاست نەزانینی ناوەجوان وسیفاتە بڵندەکانێتی لە چاودێری کردن ونیعمەت بەخشین بە بەندەکانی. وەهەروەها ڕەدکردنەوەی ئەوەی کەخودا زاڵ وبالادەست بێت بەسەر بونەوەردا. وەبەڕاست نەزانینی پێغەمبەرەکان وکتێبەکانی خودا کەبۆ ڕێنمایی ڕەوانەی کردوون، پەنا بەخودا دەگرین لەم بیروباوەڕە پوچانە. بڵندی وتاك وتەنهایی بۆ خودای گەورە.

هەروەها قەدروڕێزی خودایان نەگرتووە کەسانێك کە:

کە دەڵێن مرۆڤ هیچی بەدەست نی یە، هەموو کردەوەکان لەلایەن خوداوەن چ باشەوچ خراپە. جا خودا سزای بەندەکان دەدات بەکارانێك کەلە بنەڕەتدا هەر خودی خودا خۆی ئەنجام دەدرێتێ نەك مرۆڤ. لێرەدا مرۆڤ ناچارکراوە سزاش دەدرێت بەبێ ئەوەی دەستی هەبێ لەوکارەدا. ئەمەش واتای نادادپەروەری خودا دەسەلمێنێت، ئایا ئەم کارە لەکەسانێکی خاوەن ژیروعەقڵ دەوەشێتەوە.تا لەخواوە یەکێ گەورەو بەهێز کە دادپەروەرانە وبەبەزەیترین وبەڕەحمترین نی یە بەرامبەر بەبەندەکانی کاری وای لێ دەوشێتەوە؟! پاك وبێ گەردی بۆ خودای مەزن ولەگەورەیی ئەم ستەم وتاوانە.

وەهەروەها ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە:

پێیان وایە خوای گەورە لە هەموو شوێنێك وپاك وپیسدا بوونی هەیە.وەڕەدی ئەوە دەکاتەوە کەلە سەرووی عەرشی مەزن لەنگەری گرتبێ"استواء"ی کردبێ، بەڵکو پێیان وایە خودا لە هەموو مرۆڤ وئاژەڵێکدا تواوەتەوە کەئەمەش ستەم وناڕەواییە بەرامبەر بەخودای مەزن کەدەفەرمێت: (إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ...فاطر:١٠) واتە: گوتا ری چاك وجوان وبەجێ بۆلای خوای گەورە بەرزدەبێتەوە، کاروکردەوەی چاکیش گوفتاری شیرین بەرزی دەکاتەوە.

خوای گەورە لەسەرووی عەرشی مەزندایە وە فریشتەکانیش بۆ لای خودای خۆیان بلند دەبنەوە ودێنە خوارەوە: (يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ... السجدة:٥) واتە: ئەو خوایە لەسەرووی ئاسمانەوە کاروباری زەوی ڕێك دەخات وسەرپەرشتی دەکات ،وەسەرجەم کارەکان بۆلای ئەو بەرزدەبێتەوە.

وەهەروەها ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە:

باوەڕیان بەسیفاتە بڵندەکانی خوای گەورە نی یە، وەپێیان وایە خوای گەورە وتووێژی لەگەڵ موسا نەکردووە لەکەناری چیایی"طور"،وەهاتن ولەنگەرگرتنی لەسەر عەرش، وەهاتنی بۆ دادگایی کردنی بەندەکانی لە قیامەتدا، هەروەها توڕەبوون وغەزەب گرتن وڕەزامەندی وخۆشەویستی وچەندەهای تر لەسیفات وئاکارە بڵندەکانی خوای گەورە ڕەد دەکەنەوە. وەلێکدانەوەی نابەجێی بۆ دەکەن، وەپێیان وایە بەم کارە خوای گەورە ڕێزدارتر ومەزنتر ڕادەگرن.

وەهەروەها ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە:

هاوەڵ وکوڕی بۆ بڕیار دەدەن، یاخود پێیان وایە خوای گەورە تێکەڵ بووە بەهەموو دروست کراوەکانی و...هتد.

هەروەها قەدروڕێزی خوایان نەگرتووە ئەو کەسانەی:

کەدەڵێن خوای گەورە دوژمن وناحەزەکانی پێغەمبەر وخانەوادەکەی بەرز ڕاگرتووە، جێنیشینی ودەسەلآتداری وسەربەرزی بەدوژمنەکانی بەخشیوە.وەشوێن کەوتووان ودۆست وخانەوادەکەی پێغەمبەری توشی ڕیسوای نەهامەتی کردووە لەهەر جێگایەکدابن.

ئەمەش ناڕەوایەکیتەواوە بەرامبەر بەخوای گەورە دەکرێت کەووتەی"رافضە"یە. جا ئەم بۆچوونە هاوشێوەی ووتەو بۆچوونی گاورو جولەکەکانە کە دەرهەق بەخودای گەورە دەیکەن کەدەڵێن: خوای گەورە پادشایەکی ڕەوانە کرد بانگەشەی پێغەمبەرایەتی تەنهاوتەنها بۆ خۆی دەکرد ووەدرۆی بەدەم خوداوە دەکرد، دەیووت: خودا دەڵێت وفەرمانی وادەکات، وەشەریعەتی پێغەمبەرایەتی

هەڵدەوەشاندەوەو بەناوی خوداوە سەروماڵ وخوێن وئافرەتیانی حەلاڵ دەکرد بۆ خۆی. وەخوای گەورەش هەمیشە پشتیوانی لێ دەکرد وبەسەر نەیارانی دا زاڵی دەکرد ووەنیشانەی ڕاستی ئەوی دەسەلماند و وەڕۆژ بەڕۆژ سەربەرز وبالادەستی دەکردو...هتد.

بێگومان ئەمەو هاوشێوەیان گەورەترین ستەم ونارەواییە دەرهەق بەگەورەیی ودانایی وڕەحمەت وزانستی خودا دەکرێت.جا ئەگەر بەراورد لەنێوان هەردوو ووتەکەدا بکەین دەبینین وەك بڵێیت لەیەك سەرچاوەوە هاتوون.

**نادانایی وستەم دانە پاڵ خوای گەورە جۆرێکە لە کوفر وبێ باوەڕی**

**هەروەها قەدرو ڕێزی خودایان نەگرتووە کەسانێك کە:**

باوەڕیان وابێت کەدەشێت خوای گەورە سزاو ئازاری چاکخواز وملکەچەکان بدات کە هەمیشە بەندایەتییان بۆ کردووە ، وەڕاپێچی دۆزەخیان بکات. وەدەشێت یاخی بووان وتاوانکاران سەرفرازو ڕزگاریان بکات کەهیچ کاتێك خواپەرستیان نەکردووە، وەڕاپێچی بەهەشتی بەرینیان بکات ، چونکە هەردوو کارەکە بۆ خودا وەکو یەکە.

ئەم بۆچوونانە واتای نەبوونی دانایییە لەکارو بڕیارەکانی خودای گەورە وستەمکاری خودای دادپەروەردەسەلمێنێت ،کەئەمە پێچەوانەی ناوەجوان وسیفاتە بڵندەکانی خوای گەورەیە کەڕەدی ئەم جۆرە بۆچوونانەدەداتەوە دەفەرمێت: (وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلًا ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ * أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ...ص:٢٧-٢٨) واتە: ئێمە ئاسمان وزەوی ودروست

کراوەکـانی نێوانیمـان بـێ هـودەو هەڕەمـەکی دروسـت نـەکردووە، ئـەوە گومـانی ئـەو کەسـانەیە کـەبێ بـاوەڕن. ئـەی هـاوار...ئاهونالـە بـۆ ئـەو بـێ باوەڕانـە لـە سـزای ئـاگری دۆزەخ، یـاخود باوەڕیـان وایـە کـە ئێمـە ئەوکەسـانەی کـەباوەڕدارن وکـاری چـاکە ئـەنجام دەدەن، ئەوانـەی تـۆوی خراپـەیان چـاندووە لەزەویـدا وەك یـەك تەماشـابکەن؟! یـاخود ئایـا خواناس وتاوانکار وەك یەکن؟!

هەروەها دەفـەرمێت: (أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُـوا السَّـيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُـمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُم وَمَمَاتُهُمْ سَـاءَ مَـا يَحْكُمُـونَ * وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُـلُّ نَفْـسٍ بِمَـا كَسَـبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُـونَ...الجاثيـة:٢١-٢٢) واتـە:ئایـا تاوانکـاران وخراپـە خـوازان باوەڕیـان وایـە کـەمردن وژیـان وزیندووبوونـەوەیان هاوشـێوەی ئـەو کەسـانە دەبێـت کـەبڕوایان هێنـاوە وچـاکەیان ئـەنجام داوە؟! ئـای کەلێکدانەوەیـەکی خـەیاڵی یـە!...خـودا ئاسمانـەکان وزەوی لەسـەربنەمای حـەق وڕاسـتی دروسـت کـردووە بـۆ ئـەوەی سـەرئەنجام پاداشـتی هـەموو کەسـێك بـەگوێرەی کردەوەکـانی بداتـەوە وهـیچ جـۆرە ستەمێکشیان لێ ناکرێت.

هـەروەها دەفـەرمێت: (إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّـاتِ النَّعِـيمِ * أَفَنَجْعَـلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ مالكم كيـف تحكمـون...القلـم:٣٥-٣٦) واتـە:ئایا پێتـان وایـە سـەرئەنجامی موسـوڵمانان هاوشـێوەی سـەرئەنجامی تاوانکاران دەبێت؟ ئەوە چی لێکدانەوەو بڕیارێکی خەیاڵی یە؟!

هەروەها ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە:

خـوای گـەورە مـردوو زینـدوو ناکاتـەوەوەباوەڕیان بەحەشـرو لـێ پرسـینەوە نـی یـە. وەپێیـان وایـە چـاکاکاران پاداشـت نادرێنـەوەو خراپـەکارانیش سـزانادرێن ، وەسـتەم دیـدە مـافی خـۆی لەسـتەمکاران

وەرناگرێتەوە.. جا خوای گەورە لەورۆژەدا پیشانیان دەدات کەکێ ڕاستی ووتوەو وەکێش خەسارەمەندو بیر پوچ بووە.

**هەروەها ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کە:**

کەبەچاوێکی کەوە تەماشای خوای مەزنیان کردووە دڵیان لەئاستی بێ ئاگابووە، فەرمانەکانی خودایان پشت گوێ خستووە وسەرپێچییان کردووە، ڕێزی دروست کراوەکانی تریان داوە بەسەر ڕێزی خودادا، کاریان بە بەرنامەو ڕێنامی یەکانی نەکردووە ، شوێنی حەزو ئارەزووەکانیان کەوتوون شەرمیان لەخەڵکی کردووە بەلاّم شەرمیان لە خودا نەکردووە. لەخەڵکی ترساون بەلاّم لەخودا نەترساون وشەورۆژیان لەپێناو ڕەزامەندی ئارەزووبازی وبەرپرسەکانیان بەخت کردووە. فەرمان وبڕیاری خودایان بەسوك تەماشا کردووە...هتد.

ئایا قەدرو ڕێزی خودایان زانیوە کە دەچن شەیتان لەبری خودا دەپەرستن وهاوەڵی بۆ بڕیاردەدەن؟

جا خوای گەورە وبێ هاوتا مەحاڵە لەلای وقبوڵی ناکات یەکێك لە پێغەمبەران بکریت بەهاوەڵ وهاوبەشی ، نەخوازە ڕیسواترین وسەرشۆڕترین کەس کەشەیتانە بکرێتە هاوەڵی؟

تەنها شەیتان ویستێتی وەك خودا بپەرسترێت وڕێزی بگیرێت. هەر بۆیە خوای گەورە هۆشیاری بەمرۆڤ دەدات کەلەم بوارەدا نەکەونە داوی شەیتانەوە کەدەفەرمێت: (أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ * وَأَنْ اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ...يس:٦٠-٦١) واتە: ئەی ئادەمیزادەکان من پێتان ڕانەگایاندن کەشوێنی شەیتان نەکەون وگوێڕایەڵی مەکەن، چونکە ئەو

دوژمنی سەرسەختی ئێوەیە. وەهەر گوێڕایەڵی من بکەن کە ئەمەیە ڕێگەی ڕاست ودروست.

ئەو هاوبەش وبڕیاردەرانەی کەپێیان وابوو فریشتە دەپەرستن ، لەبنەڕەتدا تەنها شەیتانیان دەپەرست نەك فریشتە. وەئەم ڕاستیەش خودای مەزن ڕوونی دەکاتەوە دەفەرمێت: (وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَائِكَةِ أَهَؤُلَاء إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ * قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ...سبأ:٤٠-٤١) واتە: ڕۆژێك دێت کەخوای گەورە تێکڕای هەموویان کۆدەکاتەوەو بەفریشتەکان دەفەرمێت: ئایا ئەم پێرە ئێوەیان دەپەرست؟ فریشتەکان دەڵێن: پاکی وبێ گەردی بۆتۆی مەزن ، ئەوان خەریکی پەرستنی پەری بوون وباوەڕیشیان پێ بوو.

شەیتان بەهەمیشەیی فەرمان بەهاوبەش بڕیاردەرەکان (المشرکون) کە بیپەرستن وکڕنوشی بۆ بەرن، وەبۆ هاتنەدی ئەم مەرامە ڕێگای پیلانی جۆراوجۆر دەگرێتەبەر. جارێك خۆی دەکات بەفریشتەو خەڵکی گومرادەکات. وەتەنانەت کاتێك ڕۆژپەرستان کەلەکاتی ڕۆژهەڵاتندا کاتێ دەیانەوێت کڕنوش بۆ"ڕۆژ" خۆر بەرن، شەیتان بەشێوازێك دەوەستێت کە خۆر بکەوێتە نێوان هەردوو قۆچەکانیەوە "شاخەکانی"تاکو کڕنۆشەکە بۆ شەیتان بێت ،بەهەمان شێوەش بۆ کاتی خۆرئاوابوون.

بەهەمان شێوە کاتێ گاورەکان کڕنوش وپەرستن بۆ مەسیح ودایکی دەبەن. کەلەشێوەی بتدا دروست کراوون لەبنەڕەتدا خەریکی شەیتان پەرستنن "مەسیح ودایکی" لەم کارە پوچەڵانە بەدوورن ، وەهیچ کاتێکش کاری وایان لاپەسەند نەبووە وەفەرمانیشیان پێ نەکردووە. بەڵکو ئەوەی جگە لە خودا بپەرسترێت تەنها شەیتانە هەر بۆیە خوای گەورە دەفەرمێت: (أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ

لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ * وَأَنْ اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ...يس: ٦٠-٦١) واتە: جاكاتێ ئادەمیزاد هەركەسێكی تر بپەرستێت جگە لەخودای گەورە ئەوا شەیتانی پەرستووە. جا شەیتانەكانیش چێژ لەم پەرستنە وەردەگرن ومەرامەكانیان دێتە دی.

خوای گەورە ئەمە ڕۆشن دەكاتەوە دەفەرمێت: (ويوم يحشرهم جميعاً يامعشر الجن قد استكثرتم من الانس) واتە: خوایگەورە لە ڕۆژێك دا هەموویان كۆ دەكاتەوە بە (خشم و قینەوە) دەفەرموێت: ئەی دەستەی پەریەكان بەڕاستی ئێوە زۆر كەستان لە ئادەمیزادەكان گۆمڕاكرد.

(وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ الإِنسِ رَبَّنَا اسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَا أَجَلَنَا الَّذِيَ أَجَّلْتَ لَنَا قَالَ النَّارُ مَثْوَاكُمْ خَالِدِينَ فِيهَا إِلاَّ مَا شَاءَ اللّهُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ...الأنعام: ١٢٨) . واتە: وە ئادەمیزادە سەر لێشێواوەكان و ئەڵقە لە گوێیەكانی شەیتان دەڵێت: پەروەردگارا هەندێكمان سودمان بە هەندێمان وەرگرت (سودی ئادەمیزادەكان دوونیابازی بوو،پەریەكانیش زیادكردنی پێڕی خۆیان بوو) ئێستاش ئەوە تا گەیشتنە ئەو كات و ساتەی تۆ بۆت دیاری كردووین. خوای گەورەش فەرموویەتی: ئەم ئاگرە جێگاتانە بە هەتاهەتای بە زیندووی مەگەر خوا ویستی لە سەر بێت.

جا ئەمانەی كە خستمانە ڕوو ئاماژەیەكە بۆ ئەو مەبەستەی كە هاوبەش دانان بۆ خودای تاك و تەنها- گەورەترین و مەترسیدارترین تاوانە لە تاوانەگەورەكان. وە خاوەنەكەی شایستەی هەتا هەتاییە لە دۆزەخ دا چونكە مافی گەورەی و خوایەتی و پەروەردگاریتی.پێشێل دەكەن و دەیدەنە پاڵ لاوازترین و ڕیسواترین دروستكراوەكانی خودا وە بە جگە لە تەوبەكردن و پاشگەزبونەوە نەبێت خودا لە ئەنجامدەرەكەی خۆش نابێت وە سەرئەنجام بەهەشتی لێ قەدەغە دەكرێت وە لە ڕەحمەتی خودای بێ بەش دەبێت ، كەسێك كە بایی

تاکە گەردێك هاوبەشی بۆ خودا بڕیار بدات و تەکەبوری هەبێت مەبەست لە ناردن و ڕەوانە کردنی پێغەمبەرەکان و کتێبە پیرۆزەکان تەنها بریتی بووە لە ناسینی خودا و پەرستنی بە تاك وتەنهایی و هاوەڵ و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدرێت.

## یەکێکی تر لە تاوانە گەورەکان:

## قسە کردنە لە سەر خودا بەبێ زانیاری تەواو

قسە کردن لە سەر خودا و باس کردنی ناو وسیفات و کردارەکانی بەبێ زانیاری تەواو پوخت.مایەی کەوتنە هەڵەی گەورەوەیە بە تایبەتی ناساندنی خودا و پێناسەکردنی بە شتانێك کە خودا و پێغەمبەرەکەی ڕدیان کردووەتەوە نەیانداوەتە پاڵ خودا. کە دواتر ئەمە ناتەواوی و کەم و کورتی دەداتە پاڵ خودای گەورە.وە لە هەرەتاوانەگەورەو مەزنەکان دەژمێردرێت. چونکە ئەمە ڕاستەوخۆ پەکخستن و لەکارخستنی سیفاتە جوانەکانێتی. تەنانەت ئەم تاوانە گەلێ گەورەترەو مەترسیدارترە لە تاوانیکەسێك کەباوەڕشی بە خودا هەیە و بەلاَم لە هەندێ بواردا هاوبەشی بۆ بڕیار دەدات. چونکە هاوبەش بڕیاردەر (مشرك) دان بە خوایەتی و پەروەردگارێتی خودا دادەنێت و ڕەدیان ناکاتەوە. بەلاَم (معطل) سیفاتە جوان و پڕوپوخت و تەواوەکانی خودای گەورە ڕەد دەکاتەوە و باوەڕی پێیان نیە. وە لە کاریان دەخات.

بۆ نمونە: کەسێك دان بە پاشایەتی (پادشا) دادەنێت بەلاَم لە هەندێ کاروباردا هاوکارو هاوبەش و بۆ بڕیار دەدات. باشترە لە کەسێك کە هەرە بڕوای بە پادشایەتی ئەو (پادشایە) نیە و لە سیفاتی پادشایەتی دەخات ئەمە ڕاستیەکی سەلمێنراوە لە عەقڵی هەموو خاوەن بیرو هۆشێك. چونکە زۆر جار هاوبەش دانەرەکان وەك نزیك بوونەوەیەك لەخودا ئەو هاوبەشەیە بەکاردەهێنن و بڕیاری دەدەن نەك بەڕاست نەزانن.

جـا دەردی (التعطيـل - لـە كارخسـتنی سـيفاتەكانی خـودا ) . دەردێكـی كوشـندەی بـێ چـارەیە هەربۆیـە خـودای گـەورە بـاس لـە پێشـەنگ و پێشـەوای (معطلـة) دەكـات كـە فيرعەونـە، پێـی وا بـوو كـە خـودا لـە سـەرووی ئاسمانەكانـەوە نیـیـە. وە سـيفاتی بڵنـدی و پایەبـەرزی لە كار دەخست دەیووت: (وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ ابْـنِ لِـي صَـرْحًا لَّعَلِّـي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ * أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّـي لَأَظُنُّـهُ كَاذِبًـا وَكَذَلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوءُ عَمَلِهِ وَصُدَّ عَنِ السَّبِيلِ وَمَا كَيْدُ فِرْعَـوْنَ إِلَّـا فِـي تَبَابٍ...غـافر ٣٦-٣٧) واتـە: ئـەی (هامـان) تـاوەرو بـورجێكی بـەرزم بۆ دروسـت بكـەبۆ ئـەوەی هەنـدێ هۆكـارم دەسـت بكـەوێت... هۆكـاری بـەرز بوونـەوە بـۆ ئاسمانـەكان تـا سـەردانێكی خـودای موسـی بكـەم و ببينـم. هەرچەندە من دڵنيام كە (موسی) درۆزنە و شتی وا نی یە لەوێ.

وە (شـێخ أبـو الحسـن الاشـعری) ئـەم ئایەتـەی كردبـووە بەڵگـە لـە كتێبـەكانیدا دژی پێـڕی (معطلـة) [1].. [2] وە قسـە كـردن بـەبێ زانیـاری تەواو لە سەر خودای گەورە. لە گەڵ تاوانی هاوبەشیدا هاوڕێكن.

## یەكێكی تر لە تـاوانە گەورەكان:

## داهێنراوە"بیدعە"[3] گومڕاكەرەكانە

بیدعـە گومڕاكـەرەكان كـە ئەنجامـدەدرێن ڕێگـری و شـێواندنی ڕێگـای ڕاسـت و ڕەوانـی خـوا پەرسـتی یـە. وە هـەروەها نەزانینەوبـە

[1] -(معطلـة )پێـڕێكن سـیفاتەكانی خـودا لەكاردەخـەن، وەپێیـان وایـەخوای گـەورە ئـەو جـۆرە سیفاتەی نی یە. "وەرگێڕ"

[2] – بڕوانـە كتێبی (اجتماع الجیـوش الاسـلامیة علـی حـرب المعطلـة والجهیمیـة/ص٢٦٢)دانـەری "ابن القیم".

[3] – داهێنـراو"بیدعـە": واتـە تازەگـەری لەئاینـدا، واتـە هێنـان ودروسـت كردنـی یـاخود لابردنـی ڕوكنێك یان لقێك لەئایندا. وە بیدعە لە ئایندا دوو جۆرە:

أ. بیدعە لە بیروباوەڕ(عقیدە): كەئەمەیان خاوەنەكەی كافر دەكات.

ب. بیدعـە لەپەرسـتندا(عبـادە): ئەمـەیان گـەر نەهێشـتن ولا دانـی پەرسـتنێكی سـەرەكی بێـت وەك(حجـاب ، نوێـژ)ئـەوا لـەلای هەنـدێك لـە زانایـان خاوەنەكـەی كـافر دەبێـت ، وەئەگـەر ئـەنجام دانـی شـێوازێكی تـری پەرسـتن بێـت بەنـەزانین ئـەوا خاوەنەكـەی یـاخی"عاصـی" دەبێـت. "وەرگێڕ"

درۆخستنەوەی سیفاتە جوانەکانی خودایە کە لە (قورئان و سونەتدا) هاتووە. هەرچەندە (کفر) و بێ باوەڕی نی یە. بەلاَم لە هەرە تاوانە گەورەکانە و بەلای (ئیبلیسە) وە لە تاوانە گەورەکانەوە بە نرخترە.

هەروەکو هەندێ لە (سەلەف) دەڵێن: بیدعە بەلای ئیبلیسەوە خۆشتر و باشترە لە تاوانە گەورەکان، چونکە تاوانە گەورەکان تەوبەی لێ دەکرێت، بەلاَم بیدعە تەوبەی لێ ناکرێت. وە (ئیبلیس) دەڵێت " ئادەمیزادم بە هیلاك برد لە تاوان، ئەوانیش منیان بە هیلاك برد بە وتنی (أستغفرالله ولا إلە إلا الله) کاتێ ئەمەم بینی دەستم کرد بە بلاَوکردنەوەی ئارەزووبازی، جا ئەوان تاوان دەکەن تەوبە ناکەن پێیان وایە کاری چاکە ئەنجامدەدەن. "

لێرەدا مەبەستی لە ئارەزووبازی (بیدعە) یە. وە ڕوون و ئاشکرایە تاواکار زیانی تەنها بۆ خۆیەتی. بەلاَم بیدعەکار زیانی بۆ گشتییە. فیتنەی تاوانکار لە حەز و ئارەزووەوەیە، بەلاَم فیتنەی بیدعەکار لە بنەڕەتی ئاینداییە. جا بیدعەکار لە سەر شاڕێگای ڕاستی دا ڕێگری دەکات و سەر لە خەڵکی دەشێوێنێت و سەرگەردانیان دەکات. بەلاَم تاوان کار وا نیە، بیدعەکار ئاستەنگ و بەربەست و ڕێگرە لە سەر ڕێگای قیامەتدا. بەلاَم تاوانکار بە هێواشی هەنگاو دەنێت بەرەو قیامەت بە هۆی تاوانەکانیەوە.

## یەکێکی تر لە گەورەترین تاوانەکان:

## کوشتنە بە ستەم و نارەوایی

خوای گەورە دادپەروەرە و دادپەروەری کردۆتە بنەڕەتی دروستکردنی زەوی و ئاسمانەکان. وەئامانجی خوای گەورە لەناردنی

پێغەمبەران وکتێبە پیرۆزەکان بریتی بووە لەبەرپاکردنی دادپەروەری. جا کوشتنی مرۆڤ بەستەم وناڕەوایدژاودژە لەگەڵ دادپەروەریدا.

کوشتن بەهەموو شێوەکانی یەوە بەگەورەترین تاوانکاری دادەنرێت.وەك: کوشتنی باوك بۆ کۆرپەکەی "منداڵەکەی"لەبەرمەترسی برسێتی یاخود کوشتنی باوك ودایك لەلایەن منداڵەکانیەوە کەهۆکاری هاتنەدنیای ئەوانن لەبەر هەر هۆیەك بێت ستەم وناڕەوایی یە بەتاوانە گەورەکان دادەنرێت.

**پۆلێنکاری لە پلەی کوشتندا**

کوشتن بەپێی جۆری ناڕەواییەکەی دەگۆڕێت وجیاوازی هەیە ، گەورەترین جۆریان بریتی یەلە کوشتنی پێغەمبەرێك یان پێشەوایەك یان زاناو دانایەك کە چاکە خواز ورێنماکار بێت بۆ سەرجەم خەڵکی. خوای گەورە لەبری کوشتنی بڕوادارێك سزای هەمیشەیی دۆزەخ ونەفرەتی وخەشم وقینی بڕیارداوە.

وەسەرجەم زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی بکوژ پاش تاوانەکەی ئەگەر بەویستی خۆی بڕوا بهێنێت ئەوا ئەو سزایەی لەسەر دەکەوێت.

**ئایا تەوبەکردنی موسڵمان سزاکەی لەسەر لادەبات؟**

واتا ئایا ئەگەر کەسێکی موسوڵمان کەکەسێکی کوشتووە، تەوبە بکات وپاشەگەزبێتەوە سزای کوشتنەکەی لەسەر دەمێنێت؟

لەم بابەتەدا زانایانی پێشوو"سەلەف" وزانایانی پاشتر دوو بۆچوونیان هەیە کە "امام احمد" دەیانگێڕێتەوە:

بۆچوونی یەکەم: پێیان وایە کەتەوبە کردن سزاکەیلەسەر لانابات، چونکە مافێکی ئادەمیزادی پێشێل کردووەو لەدونیادا ستەمی لێ

کـــردووه، وەبـــە مـــافی خـــۆی نەگـــەیوە. جاپێویســـتە لەقیامەتـــدا دادپەروەرانە مافی خۆی لە بکوژەکە وەربگرێتەوە.

وەدەڵـێن: هەرچـی ئاشـتەوای وسـولّحێکیش بکرێـت بـە پارەوپێـدان بـەمیرات گرەکـانی، ئـەوا ناچـێتە چوارچـێوەی سـڕینەوەی تاوانەکـە، لەبەر دووهۆ:

١. کەسـی کـوژراو هـیچ سـودمەندێك نـەبووە لـەو پـارەو میراتانـەی کەلە تۆڵەی خوێندا دراوە بە میراتگرەکانی.

٢. ئـەو خـوێن وەرگرتنـە لـەنێو پرۆسـەیەکی ئاشـتەوایدا کـە یـان عـەفوی دەکـەن یـان خـوێنی لـێ دەسـێنن ، واتـە هـەردوو بەنـدی سوڵحەکە دەشێت یەکێکیان بەرجەستە بکرێت.

هـەر بۆیـە بکـوژ بـەم کـارە سـزای لەسـەر هـەڵناگیرێت وەئەمـە ڕاسـترین بۆچـوونە لـەم بـوارەدا کـە بۆچـوونی شـوێن کـەوتووانی ئیمـامی "شـافیعی واحمد" ە.

بۆچـوونی دووەم: پێڕێکـی تـر پێیـان وایـە کەبـە تەوبـەکردن وپاشـەگەز بوونـــەوە وخـــوێن دان بـــەمیراتگرانی ، کوژەرەکـــە ســـزاکەی لەســـەر لادەچـێت. وەبـە پرۆسـەی ئاشـتەوایی خـوێن دان بـەمیراتگرانی کـوژراو ئەوا حەدی لەسەر جێ بەجێ کراوە.

وەدەڵـێن:جـا ئەگـەر پرۆسـەی تەوبـە کـردن سـەرجەم شـوێنەوارەکانی بـێ بـاوەڕی "کفـر"و جادوگـەری وسـحر بسـڕێتەوە کـە گـەورەترین دوو تـاوانن، چـۆن ناتوانێـت شـوێنەواری کوشـتن بسـڕێتەوە. لەکاتێکـدا کـە خـوای گـەورە تەوبـەی لـە بکـوژان وپیاوچـاکان وخواناسـان پەسـەند کـردووە پاشـان بوونـە بەبانگـەواز وخواناس. وەخـوای گـەورە بانگەشـەی تاوانکـارو بکـوژانی پیاوچـاکانیش دەکـات بـۆ گەڕانەوەوتەوبـەکردن

وپاشەگەزبوونەوە کەدەفەرمێت: (قل یاعبادی الذین اسرفوا علی أنفسهم لا تقنطوا من رحمة الله إن الله یغفر الذنوب جمیعاً) واتە: بەو بەندانەم بڵێ کە زیادەڕەویان کردووە لەتاوانکاریدا ،لەڕەحمەت ولێبوردەی خودا مەویست ورەش بین وهیوابڕاو مەبن، ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاستی بکەن خودا لەهەموو تاوانێك خۆش دەبێت.

هەروەها دەڵێن کەسێك تەوبە بکات لەتاوانێك وپاشەگەزبێتەوە،چۆن دواتر سزادەدرێت؟ کە ئەمەش لەشەرعی خودادا جێگەی نابێتەوە.

وەدەڵێن: بەئەنجام دانی پرۆسەی تەوبەکردن وخۆدانە دەستەوەو تەسلیم بوونی بەکەس وکاری کوژراو، لەبری تەسلیم بوونی کوژراوەکە، هاوشێوەی تەسلیم کردنی پارەی قەرزی مردووەکەیە بەکەس وکارەکەی، کەلەبری ئەو وەری دەگرن.

**پوختەی ئەم بۆچوونانە:**

کوشتن سێ ماف وحەقی لێ دەکەوێتەوە کەئەویش: (حەقی خودا، حەقی کوژراو ، حەقی کەس وکاری کوژراو) . جا ئەگەر بکوژ تەوبەی کردو لەخودا ترساو پاشەگەز بووەوە ،مافی خودای لەسەر نامێنێت. وەبەویستی خۆی دا بەدەستەوەی کەس وکاری کوژراوەکە ،ئەوانیش بەلێ خۆش بوون یان خوێن لێ وەرگرتن پرۆسەی ئاشتەواییان ئەنجام دا لەگەڵ، ئەوا مافی کەس وکاری کوژراوەکەش لەسەری نامێنێت. تەنها حەق ومافی کوژراوەکە لەسەری دەمێنێتەوە، جا ئەگەر بکوژەکە تەوبەکارێکی چاکەکارو چاکەخواز بێت، ئەوا خودای گەورە لەقیامەتدا ئاشتیان دەکاتەوەو مافی کوژراوەکە دەداتەوە، وەتەوبەی بکوژیش قبوڵ وپەسەند دەکات.

## تەوبەکردن وپاشەگەزبوونەوە لەدزی

ئایـا بەتەوبـە کـردن وپاشـەگەزبوونەوە لـەدزی دەبێتـە مایـەی ئـەوەی سزاکەی لەسەر نەمێنێت؟

لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا ناکۆکی هەیە لەنێوان زانایاندا:

پێرێـك لـەوانایان پێیـان وایـە: ئەگـەر ئەوماڵـە یـان ئـەوبڕە پارەیـەی کـەدزێوێتی بیگەڕێنێتـەوە بـۆ مـیرات گرانـی خـاوەن ماڵەکـە، ئـەوا سـزاکەی لەسەر نامێنێت چ لەدنیاو چ لەقیامەتدا.

بـەڵام پێرێکـی تـر لـەزانایان پێیـان وایـە کـە: سـزای قیامـەتی لەسـەر ناکـەوێت،هەرچـەندە ئـەو بڕەپـارە دزراوەکـە بگەڕێنێتـەوە بـۆ مـیرات گرانـی خـاوەن ماڵەکـە، چـونکە خاوەنـە سـەرەکی یەکـەی خـۆی مـردووە ولەدرێـژای تەمـەنی سـودمەند نـەبووە لـەو بـڕە پارەیـەی کـەلێی دزراوە،بگـرە دواتـر کەسـانی تـر لێـی سـودمەند بوونـە. هـەر بۆیـە ئـەو مـاف وحەقـەی هەیـە لەسـەر کـابرای دز کەلەقیامەتـدا سـزابدرێت وحـەقی ئەومافەی لێ بسێنرێتەوە.

هـەروەها یـاوەرانی (مالـك واحمـد) پێیـان وایـە کەهەرچـەندە میراتگرەکـانی ئـەو ماڵـە دزراوە زۆر بـوو،ئـەوا هـەر هـەموویان حـەقیان بەردەکەوێت لەو ماڵە دزراوەدا کاتێك کەدەگەڕێنرێتەوە.

وە "شـیخ ابـن التیمیـە"تـوانی نـاکۆکی لـەم بـوارەدا نـەهێڵێت، کـەدەڵێت: ئەگـەر خـاوەن ماڵەکـە تـامردن نـەیتوانی ماڵـە دزراوەکـە بسێنێتەوە، ئـەوا مـافی داواکردنـی ئـەو ماڵـە دەکەوێتـە دەسـتی میراتگرانـی لـەدونیادا. جائەگـەر ئـەویش نـەیتوانی بەدەسـتی بهێنێتـەوە ، ئـەوا دەکرێـت لەقیامەتـدا داوای مـافی خۆیـان بکـەن. جائەمـە پـوختترین وباشترین ڕاوبۆچوونە لەم بوارەدا.

جا ئەو دزین وئەو زیانەی لە خاوەن ماڵەکە کەوتووە لەلایەن کەسانی ترەوە، واتا لێرەدا تەنها زیان بەخاوەن ماڵەکە کەوتووە نەك لەمیراتگرانی. جاهەر خاوەن ماڵەکە مافێتی لەقیامەتدا داوای حەق ومافی خۆی بکات، نەك میراتگرانی، بەڵام ئەگەر ئەو ماڵە دزراوە زەوی یەك بێت داگیرکراوبێت یاخود عەقارات ودوکان وشتی لەم جۆرە بێت کەدواتر وەك میرات دەمێنێتەوە وسودی بۆ میراتگران دەبێت، لەم حاڵەتەدا پاش مردنی خاوەنە سەرەکی یەکەی ، میراتگرانی بۆیان هەیە چ لەدونیاو چ لەقیامەتدا داوای مافی خۆیان بکەن.

وەئەگەر پارەی چەند شەریکێك دزرابێت ، ئەوا مافی هەموویانە پێکەوە داوای مافی خۆیان بکەن چ لەدونیاو چ لەقیامەتدا....والله أعلم.

## کوشتنی کەسێك وەك کوشتنی هەموو خەڵکی وایە

مرۆڤ مەزنترین وبەڕێزترین دروست کراوی خودای مەزنە. خوای گەورە حەرامی کردووە لەسەر خودی خۆی کە ستەم لەمرۆڤ بکات. جا چۆن مۆڵەت دەدات کەسێکی تر بەستەم مرۆڤ بکوژێت ولەناوی بەرێت.هەر بۆیە دەفەرمێت: (مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا... المائدة:٣٢) واتە: لەبەر ئەمە بڕیارمان داوە لەسەر نەوەی ئیسرائیل کە هەرکەسێك بەناحەق وبێ تاوان مرۆڤێك بکوژێت ،ئەوا وەکو هەموو مرۆڤی کوشتبێ وایە. وەهەر کەسێك مرۆڤێك لەمەرگ ڕزگاربکات ،وەکو هەموو خەڵکی ڕزگارکردبێت وایە.

جا زۆرێك لەخەڵکی لە لێکدانەوەی واتای ئەم دەقە قورئانیە بەهەڵە تێگەیشتوون، هەر بۆیە ئەم پرسیارەیان بۆدروست بووەودەڵێن: بێ

گومـــان ڕوون وئاشـــكرایه كـــه تـــاوانی كەســێك ســـەد مرۆڤـــی كوشـــتبێت زیـــاتره لـــەتاوانی كەســـێك كـــه تـــەنها مرۆڤێكـــی كوشـــتبێت؟ كەچـــی لەئایەتەكەدا هەموویانی یەكسان كردووه؟

خـــەڵكی وای بۆدەچـــن كـــەلێك چـــوونەكه لـــه ڕێـــژەی تـــاوان وســـزاكەدایه، بـــەڵام ســـیاقی ئایەتەكـــه واناڵێـــت، بگـــره ئـــەم لێـــك چـــوونه هـــەڵناگرێت، وەئـــەم لێـــك چـــوونه واتـــای ئـــەوه نـــی یـــه كەلـــه هـــەموو ڕوویەكـــەوه لەیـــەك دەچـــن وهاوشـــێوەن. ئـــەوەتا خـــوای گـــەوره لەســـەر كـــورتی تەمـــەنی دونیـــا له چاو قیامەتدا دەفـەرمێت: (كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَـــمْ يَلْبَثُـــوا إِلَّـــا عَشِـــيَّةً أَوْ ضُـــحَاهَا... النازعـــات:٤٦) واتـــه:ئـــەو ڕۆژەی كەقیامـــەت بـــەرپادەبێت ، بـــێ بـــاوەڕان وادەزانـــن كەتـــەنها ســـەرله ئێوارەیەكـــه یـــان ســـەرلەبەیانیەك درێـــژی ژیانی دونیایان بووه.

هـــەروەها لەشـــوێنێكی تـــر لەســـەر هـــەمان مەبەســـت وبابـــەت دەفـــەرمێت: (كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَـــرَوْنَ مَـــا يُوعَـــدُونَ لَـــمْ يَلْبَثُـــوا إِلَّـــا سَـــاعَةً مِّـــن نَّهَـــارٍ... الأحقـــــاف:٣٥) واتـــه:ئـــەو ڕۆژەی كەقیامـــەت بـــەرپادەبێت بـــێ بـــاوەڕان وادەزانن كەتەمەنی ژیانی دونیایان سەعاتێك بووه.

جـــا ئەمـــه ئـــەوه ناگەیـــەنێت كەڕێژەكـــه چـــەندە، بـــەڵكو كـــورتی تەمـــەنی دونیـــاین دەردەخـــات. وەكاتێـــك پێغەمبـــەرﷺ دەفـــەرمێت: (مـــن صـــلى العشـاء في جماعـة فكانمـا قـام نصـف الليـل، ومـن صـلى الفجـر في جماعـة فكأنمـا قامـة الليـل كلـه.)[1] واتـــه: هەركەســـێك نوێـــژی شـــێوان (عیشـــا) بەجەماعـــەت بكـــات وەك ئـــەوه وایـــه تـــانیوەی شـــەو شـــەونوێژی كردبێـــت، وەئـــەوەی نوێـــژی بـــەیانی بەجەماعـــەت بكـــات وەك ئـــەوه وایـــه هـــەموو شەوەكه شەونوێژی كردبێت.

[1] –ئەم فەرموودەیه (صحيح)ە، (مسلم: ١٦/٥ نووی)گێڕایەتیەوه.

یاخود لەمە ڕوونتر دەفەرمێت: (من صام رمضان واتبعه بستٍ من شوال فكأنما صام الدهر)[1] واتە: هەرکەسێك مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بێت وشەش ڕۆژی مانگی شەوالیش بەڕۆژووبێت،وەك ئەوە وایە هەمووساڵەکە بەڕۆژوو بووبێت.

هەروەها دەفەرمێت: (من قرأ "قل هو الله احد" فكانما قرأ ثلث القرأن)[2] واتە: هەر کەسێك سورەتی (إخلاص) بخوێنێت وەك ئەوە وایە سێ بەشی قورئانی خوێندبێت.

جا ڕوون وئاشکرایە کە پاداشتی کەسێك کە زۆرینەی کاتەکان بەڕۆژوو بێت زۆر گەورەترە لەوەی کەبەتەنها ڕەمەزان وشەوال بەڕۆژووبێت،هەرچەندە لێك چوون هەیە لەشێوەی پاداشتەکەدا. هەروەها بۆ یەکێ سێ بەشی قورئانی خوێندبێت پاداشتی زیاترە لەوەی کەبەتەنها (قل هوالله احد) ی خوێندبێت، هەرچەندە لێکچوون هەیە لەشێوەی پاداشتەکەدا،بەلاَم خودی کردارەکە جیاوازەو پاداشتیش لەسەر ڕێژەی ماندووبوون وهەوڵدانە. جا هیچ نیعمەتێك نی یە وەکونیعمەتی تێ گەیشتن لەقورئان وسونەت، کەئەمەش ڕێزو بەهرەیەکی خوای گەورەیە بەهەموو کەسێکی نادات.

جائەگەر پرسیاریان کرد ئایا لە چ ڕوویەکەوە لێکچوون هەیە لەنێوان بکوژی تەنها کەسێك وبکوژی سەدکەس دا؟

لە وەلاَمی ئەم پرسیارەدا ووتراوە: لەچەندین ڕووەوە لێکچوون هەیە وەك:

---

1 -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(مسلم: ٥٧/٨نووی)گێڕایەتیەوە.

2 -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە، (بخاری: ٥٠١٣-٥٠١٥)گێڕایەتیەوە.

١. هـەردووكیان سەرپێچـی ویـاخی بوونـە لەفـەرمانی خودایـان پێشـێل كــردووە، وەتوشـــی نـــەفرەت وســـزای خـــوای گـــەورە دەبـــن، وەشایسـتەی دۆزەخـن بەهەمیشـەیی، بـەڵام لـەنێو سـزای دۆزەخـدا جیاوازیــان هەیـــە لـــەجۆری ســـزاكەیان هەریەكـــەیان بـــەپێی زۆری تاوانەكــەی ، واتـــە ســـزای كەسـێك زۆر ســەختترە كــە پێغەمبــەرێك یــان خواناسـێك یــان بــانگخوازێكی كوشــتبێت بەبــەراورد لەگــەڵ كەسێكی تر كە مرۆڤێكی سادەی كوشتبێت.

٢. هەردووكیان شایستەی كوشتنن.

٣. هـــەردووكیان چـــوون یـــەكن لـــەڕووی بـــوێری وسەركەشـــیان كـــە دەسـتیان چـووتە خـوێنی مـرۆڤ كەبەناحـەق خـوێنی بڕێـژن. كەواتـە ئـەو بـوێری وئامادەییـان هەیـە كـە هـەموو مرۆڤایـەتی بكـوژن گـەر هەلیان بۆ بڕەخسێت.

٤. هــەردووكیان چــوون یــەكن لــە ناولێنانیــان بــە بكــوژ وخــوێن ڕێــژو ستەمكار.

٥. لــە ڕوویــەكیترەوە چــوون یــەكن كاتێــك پێــڕی بــڕواداران بــە یــەك جەســـتە ناودەبـــات كەئەگـــەر ئەنـــدامێكی توشـــی ئازاربێـــت ،ئـــەوا هـــەموو جەســـتەی توشـــی ئـــازارو شـــەونخونی دەبێـــت.جـــا لـــەم ڕوانگەیـەوە هەركەسـێك ئـازاری بڕوادارێـك بـدات ئـەوا ئـازاری هـەموو بڕوادارانی داوە.

وەهـــەروەها پێغەمبـــەرﷺ دەفـــەرمێت: (لاتقتــل نفــس ظلمــأ بغــیر حـق ألا كـان علـى ابـن أدم الأول كفـلٍ مـن دمـه، لأنـه أول مـن سـن القتـل.)[1] واتـــە هـــەر مرۆڤێكـــی بـــێ تـــاوان بەناحـــەق بكوژرێـــت ، ئـــەوا تـــاوانی

[1] -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ٣٣٣٥)گێڕایەتیەوە.

کوڕەکـــەی ئـــادەمی تێدایـــە وپشـــکی بەردەکـــەوێت"مەبەســـتی قابیلە"،کەیەکەم کەس بوو کوشتنی داهێنا.

ئـەوەی شـایەنی باسـە ئـەم هەڕەشـەکردنە تـەنها تایبەتـە بەیەکـەم کوشـتنەوە ، بـەهیچ شـێوەیەك بـاس لەیەکـەم تـاوانی زینـا یـان دزی ومـەی خواردنـەوە ناکـات. هەرچـەندە هاوبەشـی دانـان لـە کوشـتن گـەورەترە. هـەر بۆیـە پێغەمبـەرﷺبـینی کـە (عمـر بـن لحـي الخزاعـي) بەسـەخترین شـێواز سـزاو ئەشـکەنجە دەدرێـت ،چـونکە یەکـەم کـەس بـوو کـە ئـاینی "ابـــراهیم"ی پێغەمبـــەری گـــۆڕی بـــۆ بـــت پەرســـتی[1].خـــوای گـــەورەش دەفـەرمێت: (وَلاَ تَكُونُواْ أَوَّلَ كَـــافِرٍ بِـــهِ...البقـــرة:٤١) واتـە:ئێـوە مەبنـە یەکەم بێ باوەڕ بەئایەتەکانی خوای گەورە.

کـە دواتـر خـەڵکی شـوێنتان دەکـەون ودەبنـە پێشـەنگی خراپـە خـوازی ،هەربۆیـە هـەر کەسـێك سـتەمێك یـان تاوانێـك دابهێنێـت ،ئـەوا هـەڵگری تـاوانی سـەرجەم ئەنجامـدەرانی ئەوتاوانـە دەبێـت لـەدوای خـۆی. وەلـە (جـــامع الترمـــذی) دا هـــاتووە لـــە (ابـــن عبـــاس) کـــە پێغەمبـــەرﷺ فەرموویـەتی: **(یجـيء المقتـول بالقاتـل یـوم القیامـة ناصـیته ورأسـه بیـده، وأو داجـه تشـخب دمـأ ، یقـول:یـارب، سـل هـذا: فـیم قـتلني؟)** واتـە: لـەڕۆژی قیامەتـدا کەسـی کـوژراو وبکوژەکـەی خـۆی دەهێنـت وبەســەر ناوچــەواندا بەکێشــی دەکــات وخــوێن لــەدەمارەکانی یــەوە

---

[1] -ئـەم فەرموودەیـە (صـحیح)ە، چـونکە (عمـروا بـن لحـی الخزاعـی) یەکـەم کـەس بـوو ئـاینی پێغەمبەری ابراهیم ی گۆڕی و بـت پەرسـتی هێنـاوە بـۆ نێـو دەورگـەی عـەربی وەهـانی عەرەبـەکانی دا بت بپەرستن.
(سـیوطي)لـە "الوسـائل"دا ئەمـە بـاس دەکـات ودەیداتـە پـاڵ (ابـن جریـر) لەتەفسـیرەکەیدا لـە فـەرموودەی (ابـي هریـرة)وە سـەرەکی یەکـەی لـە (صـحیحین)دایـە. هـەروەها لەهـەمان سەرچـاوە هاتووە لـە فـەرموودەی(أبـی بـن کعـب)بـە (مرفـوعی) کـە (حـاکم) لـە (مسـتدرك)دا دەیگێڕێتـەوە (الوسائل -باب السابع)بڕوانە کتێبی(موسوعە الصحابە-باب ف‍ی الاصنام).

دەچـــۆڕێت ودەڵێـــت: خودایـــە لێـــی بپرســـە بۆچـــی ولەســـەر چـــی منـــی کوشت؟

وەلـە (ابـن عبـاس) یـان پرسـی:ئایـا تەوبـەکردن هەیـە بـۆ بکوژ؟ئـەویش ئەم ئایەتە پـیرۆزەی خوێنـدەوەوَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًـا مُّتَعَمِّـدًا فَجَـزَآؤُهُ جَهَـنَّمُ خَالِـدًا فِيهَـا ....النسـاء:٩٣) واتـە: هەرکەسـێك بـەناڕەوایی بەدەسـتی ئەنقەست بڕواداڕێك بکوژێت، ئەوا سزاکەی دۆزەخی هەتاهەتاییە.

هـەروەها ابـن عبـاس بـەردەوام دەبێـت ودەڵێـت:ئـەم ئایەتـە نەسـخ نەکراوەتـەوە جـا ئـیتر چـۆن تەوبـە دەکـات.[1] وەهـەروەها (نـافع) دەڵێـت: (نظـر عبـدالله بـن عمـر ﷺیومـا الى الكعبـة، قـال: ماأعظمـك وأعظـم حرمتـك، والمؤمنـون عنـدالله أعظـم حرمـة منـك.) [2]واتـە: ڕۆژێـك عبـدالله ی کـوڕی عومـەر تەماشـای کەعبـەی دەکـرد ووتـی: چـەند مـەزن وگەورەیـە قەدرت، بەڵام لای خوای گەورە بڕواداران لەتۆ بەڕێزترن.

وەلـە (صـحیح بخـاری) دا هـاتووە (سمـرە بـن جنـدی): (أول مـا ینـتن مـن الأنسـان بطنـه، فمـن أسـتطاع مـنكم أن لايأكـل الا طيبـاً فليفعـل، ومـن اسـتطاع أن لايحـول بينـه وبـين الجنـة مـلء كـف مـن دم أهراقـه فليفعـل) [3] واتـە: یەکـەم شـت کەلەجەسـتەی مـرۆڤ دەگـەنێت بـریتی یـە لـە سـکی ،بـا تـا بـۆی دەکرێـت خـواردنی حـەڵاڵ بخـوات، وەهـەر کەسـێك دەیـەوێت هـیچ ئاسـتەنگێك لـەنێوان خـۆی وبەهەشـتدا نـەهێڵێت ئـەوا باخۆی بپارێزێت لە چۆرێ خوێن کەبەناڕەوا بیرێژێت.

---

[1] –ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(احمد ١/٢٢٢)وە (ترمذي٣٠٢٩)گێڕایەنەتەوە.
[2] – ئەوە (حسن)ە، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[3] –ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ٧١٥٢)گێڕایەتیەوە.

وه لـــه (صـــحيح بخـــاری) دا هـــاتووه (ابـــن عمـــر) دهگێڕێتـــهوه، پێغهمبـــهرﷺ فهرموویـــهتی: (لايـــزال المـــؤمن في فسـحة مـــن دينـــه مـــالم يصـب دمـاً حرامـاً.)[1] واتـــه: بـــهردهوام بـــاوهڕداران لـــهفراوان بووندايـــه لـــه ئاینی خودا تا خوێن بهناحهق نهڕێژرێت.

هـــهروهها (بخـــاری) لـــه (ابـــن عمـــر) هوه دهگێڕێتـــهوه کـــه ووتویـــهتی: (مـــن ورطـــات الامـــور الـــتي لامخـــرج لمـــن اوقـــع نفســـه فيهـــا ســـفك الـــدم والحـــرام بغـــير حلـــه)[2] واتـــه: یـــهکێك لـــهو گێروگرفتانـــهی کـــه توشـــی مـــرۆڤ دهبێت وناتوانێت لێی دهربازبێت، بریتی یه لهخوێن ڕشتن بهناحهق.

وهلـــه (صـــحيحين) دا هـــاتووه پێغهمبـــهرﷺ دهفـــهرمێت: (ســـباب المسـلم فسـوف وقتالـه كفـر.)[3] واتـــه: جـــوێن دان بهموســـوڵمان تاوانكاریـــه، وهکوشتن کافربوونه.

هـــهروهها لههـــهمان سهرچـــاوهی پێشـــوودا هـــاتووه کـــه پێغهمبـــهرﷺ دهفـــهرمێت: (لاترجعـــوا بعـــدي كفـــاراً يضـــرب بعضـــكم رقـــاب بعـــض.) واته لهپاش مردنی من نهگهڕێنهوه سهر بێ باوهڕیی ویهکتر کوشتن.

وهلـه (صـحيح بخـاری) دا هـاتووه کـه پێغهمبـهرﷺ دهفـهرمێت: (مـن قتـل معاهـداً لم يـرح رائحـة الجنـة، وإن ريحهـا ليوجـد مـن مسيرة اربعـين عامـاً.)[4] واتـه: هەرکەسێك بـێ بـاوەڕێکی خـاوەن پـەیمان بکوژێـت ،ئـەوا بـۆنی خۆشـی بەهەشـت ناکـات. هەرچـەندە بـۆنی بەهەشـت (٤٠) سـاڵ ڕێ دەکات.

---

[1] –ئهم فهرموودهیه (صحيح)ه،ههمان سهرچاوهی پێشوو(٦٨٦٢).
[2] –ئهم فهرموودهیه (صحيح)ه، ههمان سهرچاوهی پێشوو(٦٨٦٣)
[3] –ئهم فهرموودهیه (صحيح)ه،(بخاری:٤٨)و(مسلم: ٥٧/٢نووی)گێڕایانهتهوه.
[4] –ئهم فهرموودهیه (صحيح)ه،(بخاری: ٦٩١٤)گێڕایهتیهوه.

جا ئەمە سزای کەسێکە بێ باوەڕێکی خاوەن پەیمان بکوژێت ،جا نەخوازە کوشتنی بڕوادارێك؟

جا ئەگەر ئافرەتێك بچێتە دۆزەخەوە بەهۆی سزادان وئەشکەنجەدانی پشیلەیەك تامردن. کە پێغەمبەرﷺ دیمەنی ئەو ئافرەتەی بینی بوو لەدۆزەخدا کە پشیلەکە چڕنوکی لەڕووخساری دەدا.جا ئەبێت سزای کەسێك چۆن بێت کە بڕوادارێك بەند بکات بەبێ تاوان تامردن؟!

وەلە هەندێ (سنن) دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (لزوال الدنيا أهون عندالله من قتل مؤمن بغير حق.) [1] واتە: کاول بوونی دونیا ئاسانترە لەلای خوای گەورە لەکوشتنی بڕوادارێکی بێ تاوان.

## زینا یەکێکە لەتاوانە گەورەکان

زینا یەکێکە لەتاوانە گەورەکان کە دەبێتە هۆی شێواندنی وەچەو نەوەکان ، وەئەتك کردنی داوێن پاکان و پێشێل کردنی مافە تایبەتی وگشتی یەکان. وەهەروەها بلاوبوونەوەی بێ ڕەوشتی وشەڕو ئاشوب وڕوخاندنی بنەما ڕەوشتیەکانی نێو کۆمەڵگا، چونکە ئەو کەسانەی زینایان لەگەڵ دەکرێت یان کچ یان خوشك یان دایك یان یەکێك مانن لە نێو کۆمەڵگادا ،هەربۆیە بەیەکێك لەتاوانە گەورەکان دادەنرێت لەپاش کوشتن لەقورئان وسونەتدا.

[1] -ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە،(ترمذي: ١٣٩٥)و (نسائي: ٨٢/٧)و (ابن ماجه: ٢٦١٩)بە (اسناد صحيح).

(امام احمد) دەڵێت: پێم وایە زینا لەگەورەیدا لەپاش کوشتن دێت، هەر بۆیە خوای گەورە دەفەرمێت: (وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا * يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا * إِلَّا مَن تَابَ... الفرقان:٦٨-٧٠) واتە: ئەو کەسانەی لەپەرستندا هاوەڵ بۆ خودا بڕیار نادەن وبەناحەق ونارەوایی کەس ناکوژن.کەخودا کوشتنی حەرام کردووە ، وەزینا ناکەن ، جا هەر کەسێك ئەم کردارانە ئەنجام بدات ئەوا توشی سزاو ئازارو ڕیسوایی دەبێت وەلە قیامەتدا سزاو ئازاری بۆ چەند بەرامبەر دەکرێت ، وەبەهەتاهەتایی بەوپەڕی ڕیسوایی ژیان بەرێتە سەر لەدۆزەخدا.

جا زینا بە هاوڕێکی لەگەڵ هەریەکە لە هاوبەشی دانان وکوشتن دێن، وەسزاکەشی دەست نیشان کردووە بەچەندین قات بۆ هەتاهەتایی لەدۆزەخدا بمێنێتەوە، وەبەتەنها بە تەوبەکردن وباوەڕهێنان وئەنجامدانی کرداری چاکە ڕزگاری دەبێت. وەخوای گەورە دەفەرمێت: (وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً....اسراء:٣٢) واتە: بەهیچ شێوەیەك نزیکی زینا مەکەونەوە، چونکە تاوانێکی گەورە وڕێگەیەکی ناقۆڵایە.

لێرەدا ئاماژە بەقێزەونی وناشیرینی وناشیاوی زینا دەکات کەتەنانەت گیانلەبەرانیش قێزی لێ دەکەنەوە. (بخاری) لە صحیحەکەیدا دەگێڕێتەوە کە (عمرو بن مەیمون الاودی) دەڵێت: من لەسەردەمی نەفامیدا مەیمونێکم بینی زینای کرد، گەلە مەیمونێك پێیانزانی گرتیان وبەردبارانیان کرد تا کوشتیان.[1] پاشان ئاماژە بەوە دەکات کەسەرئەنجامی ئەم بەد ڕەوشتیە لە دونیادا بریتی یە لە

[1] -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ٣٨٤٩)گێڕایەتیەوە.

تیاچـوون وڕیسـوایی ونـەداری ، وەلـە قیامەتیشـدا بـریتی یـە لـە ڕیسـوایی وسزای توندی دۆزەخ.

وەئایەتـــەکان ئامـــاژە بـــەوە دەکـــات کـــە بەتایبـــەتی خواســـتن ومـارەکردنی خێزانـی باوکتـان لـە کـارە هـەرە خراپەکانـە کەدەفـەرمێت: (إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَــاء سَــبِيلاً....النســاء:٢٢) واتـە: بەڕاسـتی ئەمـە تاوانێکی گەورەو ناپەسەند وڕێبازێکی خراپە.

هـــەروەها خـــوای گـــەورە تاکـــە ڕێگـــای ڕزگـــاری وســـەرفرازیمان بـــۆ دەخاتـە پـێش چـاو کـە بـریتی یـە لـەپاك ڕاگرتنـی داوێـن، کەدەفـەرمێت: (قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ * الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِــعُونَ * وَالَّــذِينَ هُــمْ عَــنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ * وَالَّذِينَ هُــمْ لِلزَّكَــاةِ فَــاعِلُونَ * وَالَّــذِينَ هُــمْ لِفُــرُوجِهِمْ حَافِظُونَ * إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَــانُهُمْ فَــإِنَّهُمْ غَيْــرُ مَلُــومِينَ * فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاء ذَلِــكَ فَأُوْلَئِــكَ هُــمُ الْعَــادُونَ... المؤمنــون: ١-٧) واتـە: بـــڕواداران دڵخـــۆش وســـەرفرازبوون. ئەوانـــەی لەنوێژەکانیانـــدا دڵیـــان دامـەزراوەو لـە خـوا ترسـە. ئەوانـەی لـە ووتـەو گوفتـاری نابـەجێ دوورە پـەرێزن. ئەوانـەی کـە زەکـات ومـاڵ وسـامانەکانیان بـە هـەژاران دەدەن. ئەوانـەی کـەداوێنی خۆیـان دەپـارێزن تـەنها لـە گـەڵ هاوسـەرەکانیان وکەنیزەکانیانـدا نـەبێت کەئەمـە حـەڵاڵی خۆیانـە وجێگـەی تانـەو تەشـەر نی یە. جا ئـەوەی جگـە لـەم سنوورە دیاری کراوە ڕێبـازی تـر بگرێتـە بـەر ، ئەو جۆرە کەسانە بەیاخی ولە سنوور دەرچوو دەژمێردرێن.

جـا لێـرەدا ئـەم ئایەتـە ئامـاژە بـۆ سـێ شـتی گـرنگ دەکـات ، کەئەگـەر ئەوکەسـەی داوێـنی نـەپارێزێت لـەزینا ، ئـەوا نابێتـە یـەکێك لـەڕزگار بـووان و دەچـێتە ڕیـزی لۆمـەکاران ولـە سـنوور دەرچـووان، وەشایسـتەی ئـەوە دەبێـت نـاوی لـەڕیزی دوژمنـان تۆمـار بکرێـت. جـا بـا ئـەو کەسـانە

بەراوردێك بكەن لە نێوان چێژی شەهوەت وئارەزووبازی ، وەلەنێوان ئازارو ئەشكەنجەكانی. كامیان ئاسانترە؟!

وەلە بەرامبەر ئەمەدا خوای گەورە لۆمەی ئادەمیزاد دەكات كە خۆگرو ئارامگر نی یە لەسەر خۆشی وناخۆشی یەكان. هەركاتێك خۆشی توش بێت ڕەزیل ورێگر وچروك دەبێت. وەهەر كاتێك توشی ناخۆشی بوو ئیتر ئومێد بڕاوو هیوا بڕاو دەبێت ، تەنها كەسانێك جیادەكاتەوە كەلە وەسفیاندا دەفەرمێت: (وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ * إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ * فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ... معارج:٢٩-٣١) واتە: جا خوای گەورە فەرمان بەپێغەمبەران دەكات كە باوەڕداران ئاگادار بكاتەوە لەوەی چاوو داوێنیان بپارێزن ، وەدڵنیایان بكەرەوە كەخوای گەورە بەوردی كارەكانیان دەبینێت. كە دەفەرمێت: (يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ... غافر: ١٩) واتە: خوای گەورە هەمیشە چاوە خیانەت كارو ناپاكەكان دەناسێت ودەزانێت چی لەدڵ ودەرون وسینەیاندا حەشاردراوە.

## نەزەر"تەماشاكردنی حەرام" پۆستەی زینایە

خوای گەورە لە سیاقی ئایەتەكەدا تەماشاكردنی حەراومی"نەزەر"پێش پاراستنی داوێن كردووە، چونكە سەرەتای كاری زیناكە لە بینین وتەماشاكردنی نادروستەوە سەرچاوە دەگرێت. هەروەكو چۆن ئاگر لە پێشدا لە بڵێسەوە دروست دەبێت. جا لە پێشدا تەماشایەكە ، پاشان بیرۆكەیەكە، دواتر هەنگاوێكە سەرئەنجام تاوانێكە.

وەلەبەر هەمان مەبەست ووتراوە: هەر کەسێك خۆی لەم چوار شتە بپارێزێت ،ئەوا ئاینی سەلامەت بووە کەئەویش: (چرکەکان، بیرۆکەکان، ووتەکان، هەنگاوەکان) . جا پێویستە لەسەر مرۆڤ ئەم سەنگەرانە بەتەواوی بتەنێت دەرفەت نەدات بەدوژمن زەفەری پێ بهێنن وژیانی داگیر بکەن.

## دەرگاکانی تاوانکاری

زۆر جار ئادەمیزاد لەم دەرگایانەوە توشی تاوانکاری دەبێت کە بیتین لەچوار دەرگا:

١- چرکە ساتەکان:

کە بزوێنەری حەزو ئارەزووەکانە کە تێیدا ئادەمیزاد بە چاوەکانی دەڕوانێتە جەستەو قەدەغەکراوەکان ، بەپارستنی چاو لەو ساتانەدا مایەی پاراستنی داوێنە.

وەهەر کەسێك چاوەکانی وەك گورگی برسی بەرەلاّبکات ئەوا سەرئەنجام بەرەو هەڵدێری دەبات. وەپێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (لا تتبع النظرة النظرة، فانما لك الأولى وليست لك الأخرى.)[1] واتە: تەماشا لەدوای تەماشا ئەنجام نەدەن بۆ جەستە قەدەغەکراوەکان ، چونکە یەکەم تەماشایان ماڤ خۆتە ،بەلاّم دووەمیان تاوانە.

وەلە (مسند) دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (النظر سهم مسموح من سهام إبليس:فمن غض بصره عن محاسن امرأة لله

[1] ـ ئەم فەرموودەیە(حسن)ە، (احمد: ٣٥١/٥)و (ابوداود:٢١٤٩)وە (ترمذي؛ ٢٧٧٧)گێڕایانەتەوە.

اورث الله قلبه حلاوة الى يوم يلقاه.)[1] واته: تەماشای حەرام تیرێکی ژەهراوییە لە تیرەکانی ئیبلیس ، جا هەرکەسێك چاو بپارێزێت لەشۆخ وشەنگی ئافرەتێك لە پێناوی خوادا ، ئەوا خودا چێژی خۆشی دەخاتە دڵی یەوە تا ئەو ڕۆژەی بەدیداری خوای گەورە دەگات.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (غضوا أبصاركم وأحفظو خروجكم)[2] واتە: چاوەکانتان بپارێزن و داوێنتان بپارێزن.

وە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (وإياكم الجلوس على الطرقات ، قالوا يارسول الله مجالسنا، مالنا بد منها، قالﷺ: فإن كنتم لابد فاعلين، فأعطوا الطريق حقه، قالوا: وما حقه؟ قالﷺ: غض البصر، وكف الأذنى ، ورد السلام.)[3] واتە: نەکەن لەسەر ڕێگاکاندا دابنیشن ، ووتیان شوێنی ترمان نی یە بۆ دانیشتن، فەرمووی ئەگەر هەر ناچارن دابنیشن ئەوا ماف ڕێگاکە بدەن، ووتیان ئەی پێغەمبەرﷺ ماف ڕێگا چی یە؟ فەرمووی: چاو بپارێزن، کەس ئازار نەدەن، وەڵامی سەلام بدەنەوە.

## بنەڕەتی بەڵا لە تەماشاکردنەوەیە

زۆربەی ئەو تاوانەی توشی مرۆڤ دەبن سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تەماشاکردنی نادروست، چونکە وەك زنجیرەیەکی یەك لەدوای یەك وایە بەرەو حەزو ئارەزوو و تەماشاکردن هەنگاو دەنێت، دواتر بیرۆکە دروست دەکات، بیرۆکەش دەبێتە بیرێکی تەواو ، بیریش حەزو ئارەزوو دەبزوێنێت. ئارەزوویش ئیرادە دروست دەکات، دواتر ئەو ئیرادەیە

---

[1] – ئەم فەرموودەیە(ضعيف الأسناد، وهو حسن لغيرة)، (احمد :٥/٢٦٤)وە (حاكم: ٤/٣١٣)بە (سند ضعيف) گێرایانەتەوە.
[2] – ئەم فەرموودەیە (ضعيف الأسناد)ە، (احمد: ٥/٣٢٣)بڕوانە: (المجمع : ٤/١٤٥).
[3] –ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە، (بخاري: ٢٤٦٥)وە(مسلم: ١٤/١٠٨)گێرایانەتەوە.

دەبێتــە عەزیمــەو ســووربوون لەســـەر جــێ بــەجێ کردنــی ئــەو کــارە. کەســـەرئەنجام تــاوان ڕوودەدات. وەهــیچ بەربەســتێك ورێگریــەکی دەرونــی ئاستەنگی بۆ دروست ناکات.

هەربۆیــە ووتــراوە: ئــارام گــرتن لەســـەر ئــەنجام نــەدانی تەماشــاو نــەزەری حــەرام باشــترە لــەئارام گــرتن لــە کارەســاتەکەی. شــاعیرێك دەڵێت:

| | |
|---|---|
| كل الحوادث مبدأها من المنظـر | ومعظم النار من مستصغر الشرر |
| كم نظرة بلغت من قلب صاحبها | كمبلغ السهم ين القوس والوتــر |
| والعبد مادام ذا طرف يقلبــــه | في أعين الغير موقوف على الخطر |
| يسر مقلته ماضر مهجتــــــه | لامرحبا بسرور عاد بالضـــــرر |

واتە:

زۆرێك لە سەرچاوەی ڕووداوەکان نەزەرو تەماشاکردنــــــــە
هەروەکو سەرچاوەی زۆربەی ئاگرەکان بڵێسەی بچوکـــــــە
ئای چەندین تەماشا کاریگەری گەورەی کردە سەر دڵی ئەوکەس
لە شێوەی کاریگەری تیر کەلە کەوان دەردەچێـــــــــــت
زۆر جار دڵ خۆش وشادومانە بەوەی کە بینیوێتـــــــــــی
بەڵام هیچ بەخێر نەیەت شادیەکە کەمایەی زیان بێــــــــت.

## لە بەڵاکانی تەماشاکردنی حەرام"نەزەر"

زۆر جــار نــەزەرکردنی نادروســت دەبێتــە مایــەی خــەم وپــەژارەو داخ وحەســرەت ، بەتایبــەتی کاتێــك ئــەوەی دەبینێــت بەدەســتی ناکــەوێت و

لەهەمان کاتیشدا ناتوانێت ئارامگر بێت. لێرەدا غەم وپەژارە ڕووی تێ دەکات. شاعیرێك دەڵێت:

وکنت متى أرسلت طرفك رائداً لقلبك يوماً ،أتبعتك المناضر

رأيت الذي لا كله أنت قادر عليه ،ولاعن بعضه انت صابر

واتە:

تۆ هەرکاتێك شەپۆلەکانی چاوت ئاراستە بکەیت

دڵنیابە ڕۆژێك بێت دەبێتە مایەی ماندوو بوونی دڵ

ئەوەی کەدەبینی زاڵ نیت بەسەریدا ونابێتە هی خۆت

وەلەهەمان کاتیشدا ناتوانیت ئارام لەسەری بگریت.

وەجێی سەرسوڕمانە: کاتێ ساتی تەماشاکردنەکە تیرێکە ڕاستەوخۆ لەدڵدا کاریگەری گەورە دروست دەکات، وەشعرێکم هەیە لەم بوارەدا:

يا رامياً بسهام اللحظ مجتهدا أنت القتيك بما ترمي، فلاتصب

يا باعث الطرف يرتاد الشفاء له أجس رسولك، لايأتيك بالعطب

واتە:

ئەی ئەو کەسەی تیری نەزەر ڕەوانە دەکەیت

ئاگاداربە ئەو کارە سەرئەنجامی خۆکوژی یە

ئەی ئەو کەسەی کەچاوت دەگێڕی وپێت وایە ئەمە چارەسەرە

تیرەکانی نەزەرت بەندێکە تاسەرئەنجام نەبێتە مایەی سەر لێ شێواندنی دڵت.....

ئــەوەی جێگــەی سەرســوڕمانە ئەوەیــە کەهــەر تەماشــاکردنێك برینێــك دەکاتــە نێــو دڵــەوە، تــابرین لەســەر بــرین زیاددەکــات کــەدواتر لــە هەژمــەتی ئــازاردا هــیچ ڕێگرییــەك ناکــات لــەهێنانی ئــازار وبــرینی تــر بــۆ دڵــی.وەلــەم بوارەدا ئەم پارچە شیعرە هەیە:

مازلت تتبع نظرة في نظــــــــرة    في اثر كل مليحة ومليــــــح

وتظن ذاك دواء جرحل وهو في الـ    ـتحقيق تجريح على تجريـح

لابحت طرفك بالحاظ وبالبكـــــاء    فالقلب منك ذبيح أي ذبيح

واتە:

بەبەردەوامی تەماشا لەدوای تەماشا دەکەیـــــــــــت

لەشوێنەوارياندا بین هەیە کەچی تۆ خویٚ ڕێژی دەکەیت

واگومان دەبەیت کەئەمە چارەسەری برینەکانــــــــــە

بەڵام لەڕاستیدا برینداركردن وکولانەوەی برینەکانـــــە

چا وی خۆت بەسەر بریندا بەحەسرەت وگریـــــــــــان

وەدڵت سەربڕاوە بەڵام چۆن سەربڕینێـــــــــــــــك.

وەوتــراوە: بەنــدکردنی چــاوەکان بــۆ چــەند ســاتێك باشــترە لەخــەم وپــەژارەی بــەردەوام. واتــە کاتێــك تەماشــای شــۆخێك ناکــەیت وچــاوی خــۆت دەگریــت، چــیتر بــیری لــیٚ ناکەیتــەوەو نابێتــە مایــەی خــەم وپەژارەت.

٢- بیرۆکەکان:

مەبەست لێی ئەو بیرۆکانەیە کەبەدڵ ودەرونی مرۆڤدا دێت، کەسەرچاوەی چاکەو خراپەکانە ، وەبزوێنەرو دروست کەری ویست وخواست وهەڵمەتەکانە. جا هەرکەسێك توانی زاڵ بێت بەسەر بیرۆکەکانیدا ئەوا دڵ ودەرونی شاد دەبێت وسەرئەنجامی بەختەوەری دەبێت. وەهەر کەسێك ملکەچی ئەو بیرۆکە خراپانە بوو ،ئەوا بەرشاڵاوی حەزوئارەزووەکانی دەرون دەکەوێت وسەرئەنجامی پڕدەبێت لەنەهامەتی.

جا بەربەردەوامی ئەو بیرۆکە خراپانە هێرش دەهێننە سەر دڵی مرۆڤ تا دەیکەنە مۆڵگەی ئاواتە پڕوپوچەکان. خوای گەورە دەفەرمێت: (كَسَرَاب بقيعَة يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاء حَتَّى إِذَا جَاءهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا وَوَجَدَ اللَّهَ عِندَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَاب... النور:٣٩) واتە: وەك سەراب وتەراویلکەوایە لە بیابانێکدا بریسکە دەداتەوە کەسێکی تینوو وابزانێت ئاو ە. وە بەهەڵە داوان بۆی دەچێت ،کە گەیشتە لای دەبینێت هیچ نیە ،ئەوسا بەخۆی دەزانێت ژیانی کۆتایی هاتووە و قیامەت بەرپا بووە. خوادی گەورەش ئامادەیە لە لایدا بە گوێرەی کردەوەکەی لێپرسینەوەی لە گەڵ دەکات خوای گەورە لە لێپرسینەوە دا خێرایە "

جا بێ نرخترین هەوڵ و هەڵمەت ، لەو کەسەدایە کە هەمیشە خۆی بە ئاواتە پڕوپوچەکان سەر خۆش دەکات و گوی! بۆ ڕاستیەکان ناگرێت. هەمیشە خەون بە خەیاڵی بێ سنوور و دوور لە واقیع دەبینێت. کە بە ڕاستر ئەمە مایە پوچترین کەس و خەسارەت مەندترین جۆری بازرگانیە.

ئـەم حاڵــە دەردێکــی کوشــندەیە کــە دەبێــت هــۆی دروســت بــوونی تەمــەڵی بــێ دەســەلاّتی.ڕیسـوایی و پاشـگەزی لـەو تەمەنـەی کـە بـە فـیڕۆ دوور لـە ڕاسـتی ژیـان بـە سەرچـوو. کـە هەمیشـە لـە خـەیاڵ و ئـاوات دا بـزر ببـوو. کـاتێ بــە ئاگــا هاتــەوە، لــە ژیـانێکی بـێ نـاوەڕۆك و بازنەیــەکی بەتاڵـدا دەخولایـەوە. ئەمـە هاوشـێوەی ئـەو کەسـە برسـی و تینوەیـە کـە. هەمیشــە لــە خەیاڵــدا نایــابترین جــۆری خــواردن و خواردنــەوە دەخــوات ، کەچی لە ڕاسـتی‌دا جگـە لـە ئەندێشـە و برسی هیچـی تـری لـە مایـە نـی یـە. بگــرە ئــەم ئەندێشــە و بیرۆکانــە هێــز و توانــای لێ بریـوە ، ئەمــەش واتــای داتــەپینی دەروونــی ئــەو کەســەیە. بــەلاّم مرۆڤــی ژیــر و هوشــیار ســەرجەم ئــــەو بیرۆکــــە خــــراپ و پوچــــانە وەلاوە دەنێــــت و بــــە چــــاوی ڕاســــت و دروستیەوە دەڕوانێتە ژیان.

## جۆری بیرۆکەکان

چوار جۆر بیرۆکە هەیە:

یەکــەم: ئــەو بیرۆکانــەی کــە بەرژەوەندیــەکانی دونیــات بــۆ فەراهــەم دەهێنێت.

دووەم: ئەو بیرۆکانەی کە زیانەکانی دونیات لێ دوور دەخاتەوە.

سێ یـەم: ئـەو بیرۆکانـەی کـە بەرژەوەندیـەکانی قیامـەتت بـۆ فەراهـەم دەهێنێت.

چوارەم: ئەو بیرۆکانەی کە زیانەکانی قیامەتت لێ دوور دەخاتەوە.

جـا زۆر پێویسـتە مـرۆڤ سـەرجەم هـەنگاوەکانی لـەم چـوار جـۆرەدا چـڕ بکاتــەوە وە ئەگــەر هــەر هــەموویان کەڵەکــەیان کــرد لــە ســەری. ئــەوا پێویسـتە پۆلێنکاریـان بکـات بـە پێـی (گـرنگترین بـۆ گـرنگ) .. واتـە گرنگێك کە مەترسی نەبێت لە لە دەستدانی.

دوو جۆری تر دەمێنێت کە بریتین لە:

١. گرنگێك لە دەست ناچێت.

٢. گرنگ نیە، بەڵام لە دەست دەچێت

جـا لێـرەدا دوو دڵـی ڕوو دەکاتـە ئـەو مرۆڤـە کـە کامیـان هەڵبـژێریت. لـەوەی ئەگـەر (گرنگـە) پـێش بخـات ، ئـەوا مەترسـی لـە دەسـت چـوونی ئەوانی تـری هەیـە. خـۆ ئەگـەر ئـەوە هەڵبـژێرێت کـە (گـرنگ نیـە) ئـەوا لـە ئەنجامی سەرقاڵی پێوەی مەترسی لە دەستدانی (گرنگەکە) هەیە.

جــا لــەم حاڵەتــە دا دوو شــت لــە یــەك کاتــدا کۆدەبنــەوە. بــۆ بــە دەســتهێنانی یــەکێکیان ئــەوا ئــەویتریان لــە دەســت دەدەیــت. لێــرەدا

پێویسته ژیری و زیرەکی و مەعریفە ڕۆڵی خۆیان ببینن. بەڵێ زۆر کەس لەم حاڵەتەدا سەرفراز و سەرکەوتوو بوون.وە زۆری تریش شکستیان هێناو تووشی ڕووخان هاتن. جا کەسانی بیر تیژ و خاوەن ژیری ئەم سنورە نابەزێنن.وە شەریعەت و بەرژەوەندیەکانیش لە سەر ئەم بنەمایە دامەزراوون.

## بیرۆکەکانی بڕواداری ژیر

پێویسته لەم بوارەدا کار بەپێی ئەو بنەما گەورەیە بکرێت کە شەرع و قەدەری لە سەر پێکهاتووه. وە سەرجەم خەڵك و حوکمی بۆی دەگەڕێتەوە. کە بریتی یە لە هەڵبژاردنی گەورەترین بەرژەوەندیەکان. هەرچەندە لەم پێناوەدا. بەرژەوەندی بچوکت لە دەست بچێت. وە هەڵبژاردنی بچوکترین خراپەکان بۆ خۆپاراستن لە گەورەترین زیان. جا لێرەدا بەرژەوەندیەکت لە دەست دەچێت بۆ بە دەستهێنانی بەرژەوەندیەکی گەورەتر. وە هەروەها خراپەیەك ئەنجام دەدەیت ، بۆ خۆپاراستن لە خراپەیەکی گەورەتر. جا ئەگەر بە ووردی لە یاساکانی سروشت و بونەوەر ووردبیبینەوە.بۆمان دەردەکەوێت کە هەموویان یاساکان و بەرژەوەندیەکانی دوونیا و قیامەت لە سەر ئەم بنەما سەرەکیە داڕێژراوون. هەر بۆیە بیرۆکەکانی کەسی ژیر و هوشیار لەم چوار چێوەیەدا خۆی دەبینێتەوە لێی ناترازێت.وە جوانترین بیر و بیرۆکە بریتییە لەو بیرەی کە بۆ خوای گەورە بێت وە بەرژەوەندی قیامەت لە بەر چاو بگرێت کە ئەویش چەندین جۆرە لەوانە:

١. بیر کردنەوە لە ئایەتەکانی خوای گەورە و تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی مەبەستەکانی. ئەم ئایەتە پیرۆزانە تەنها بۆ خوێندنەوە دانەبەزێنراوون وە هەندێك پێیان وایە. هەروەکو هەندێك لە

(سلف) دەڵێن: قورئان بۆ بەرجەستە کردن لە کردار دا دابەزێنراوە کە چی هەندێ لە خەڵکی تەنها خەریکی خوێندنەوەیەن ".

٢. بیر کردنەوە لە ناسینی خودای گەورە. وە ناسینی سیفاتە جوانەکان و ناوە پیرۆزەکانی. لە ڕوانگەی ئایەتە قورئانیەکانەوە. هەروەها تێگەیشتن لە حیکمەت و دانایی و بوونی خودا و گەورەیی بیر بکرێتەوە.

٣. بیر کردنەوە لە بەخشش و نیعمەتە جۆرا و جۆرەکانی وە فراوانی ڕەحمەت و بەزەیی و لێ بوردەیی خوای مەزن. جا ئەم سێ جۆرە دڵ پاك و پوخت و پاراو دەکات.لە ئاستی خودای میهرەبان و بەرجەستە بوونی خۆشەویستی و نیەت پاکی و لە خوا ترسان و تکا کردن لێی دەکاتە بەرهەمی ئەم دڵە.

٤. بیر کردنەوە لە ناسین و تێگەیشتن لە دەرونی مرۆڤ. وە هەروەها دەستنیشان کردنی کەم و کوڕیو کورتی ، وە خاڵە لاوازەکانی و جۆرەکانی دەرون. جا ئەم بەشە زۆر بەسودە بۆ تێپەڕاندوو دەربازکردنی دەرون لە جۆری دەرونی فەرمانکار بە خراپە (النفس الامارة بالسوء) بۆ جۆری دەرونی دڵنیای (المطمئنة) کە دواتر دەبێتە سەرچاوەی چاکە و چاکەخوازی – دڵ فرمانی چاکە دەکات و سەربازەکانی بەرجەستەیی دەکەن.

٥. بیر کردنەوە لە ئەرکی ئەم ساتە وەختە و خۆجۆشدان بۆ جێبەجێ کردنی. چونکە خواناس کوڕی کاتی خۆیەتی ، و دەرفەت نادات کاتەکەی بە فیڕۆ بچێت. چونکە سەرجەم بەرژەوندیەکان هەڵقوڵاوی کاتە. گەر لە دەستمان دا ئەوا گەڕانەوەی ئەستەمە. تا خزمەتی مرۆڤایەتی پێ بکەین.

(إمام شافعی) دەڵێت: چەندە هاوڕییەتی پێڕی سۆفیەکانم کرد تەنها دوو دێڕ فێر بووم:–

یەکەمیان: کاتت شمشێرە. گەر نەیبڕێت. ئەتبڕێ..

دووەمیان: گەر دەرونت سەرقاڵ نەکەیت بە حەق و ڕاستی یەوە.ئەوا سەرقاڵت دەکات بە شتی پڕو پووچەوە. جا کات بریتی‌یە لە تەمەنی مرۆڤ ، وە ماوەی ژیانی خۆشبەختی بەهەشتە و ئەشکەنجەی دۆزەخە. کات بە وێنەی هەورەکان تێ دەپەڕن و بزر دەبن. جا هەرچەندە بکەوێتە پێشبڕکێ لە گەڵیدا هێشتا هەر کەمە.وە هەر کات و ساتێ بە خواناسی و خودا پەرستی و هاوکاری خەڵکی لە چاکە و چاکە خوازیدانە بێتە سەر ئەوا بە کات و تەمەنی ڕاستی خۆتی مەزانە.چونکە جگە لەم ساتانە.چیتر بە ژیانی ئاژەڵی دەژیت و سەرئەنجام مردن لە ژیانی باشترە.

جا جگە لەم ساتە پڕ شکۆمەندیانە کە لەم چەند بیرۆکانەدا هەیە. لەمانە بترازێت هەمووی یان وەسوەسەی شەیتانەکانە. یان خود ئاواتە پڕوپوچە و خەیاڵیەکانە، کە جگە لە درۆ و خۆ خەڵەتاندن چیتری لێوە بەرهەم نایەت وەك مەستی سەرخۆشەکان کە کاتێ دێنەوە سەر هۆش و هەستی و بینی ڕاستیەك.وەك ئەم شاعیرە گوزارشتی لێ دەکات. زمانی حاڵیان دەڵێت:

إن كان منزلتي في الحشر عندكم ما قد لقيت ، فقد ضعيت أيامي

أمنية ظفرت نفسي بها زمـــناً واليوم أحسبها أضغاث أحـلام

واتە:

هەرچەندە جێگەی من لە گەڵ ئێوە دایە لە حەشردا

بەلآم من ڕۆژگارەکانی تەمەنم بە فــــــــــــیڕۆ دا

ئاواتێکم هەبووە دەرونم پێوە سەرقاڵ کرد بـــــوو

بەلآم ئەمڕۆ بۆم دەردەکەوێت کە خەیاڵ و خەوێکی پڕ و پوچ بوو.

**بیرۆکەی ڕۆیشتوو، بیرۆکەی جێگیر**

کـاتێ بیرۆکـە بـە خەیاڵـدا دێـت و تـێ دەپـەڕێت هـیچ زیـانێکی نیـە. چـونکە وەك ڕێبـواری سـەرە ڕێ وایـەدێت و تێدەپـەڕێت. بـەلآم زیـان و مەترسـی لـەوە دایـە کـە لـە گـەڵ ئـەو بیرۆکەیـەدا بکەوێتـە گفتوگـۆ. زۆر بـەلێ زانانـە بـەرەو دەریـای خـۆی کەمەنـد کێشـت دەکـات. و سـەر سـامت دەکـات. چـونکە لـە سـەر دەرونـی بـەتاڵ و بێکـار مێـوانێکی زۆر ئـازیز و ئێسـك سـوکە. بـەلآم لـە سـەر دڵ و دەرونـی پـاك و پـاراو مێـوانێکی ئیسـك قورس و چارەگرانە.

## دەرونی دڵنیای و دەرونی فەرمانکار بە خراپە"خراپەکار"

خـوای گـەورە دوو جـۆر دەرونـی لـە ئـادەمیزادا خولقانـدوە کـە بـریتین لـە دەرونـی پـاك و دڵنیـای ، وە دەرونـی خراپـەکار. جـا ئـەم دوو دەرونـە هەمیشـە دژ بـە یـەکن و نـاکۆك و لـە جەنگـدان هەمیشـە پێچـەوانەی یـەکترین. چ کارێـك و فـەرمانێك لـە سـەر ئـەویان سـوك و خـۆش بێـت. بـە پێچـەوانەوە لـە سـەر ئـەویتریان قـورس و نارەحـەت و ناخۆشـە. کـار و فـەرمانێکی چـاکە و چـاکە خـوازی لـە سـەر دەرونـی خراپـەکار قورسـە نـاخۆش و دژوارە. وە هـەموو کـار و فـەرمانێکی خراپـەکار لـە سـەر دەرونـی دڵنیـا و چـاکەکار قـورس و نـاخۆش و دژوارە. فریشـتەی هـاوەڵ هەمیشـە پشـتیوانی لـە لایـەن ڕاسـت دەکـات کـە دەرونـی چـاکەکار دڵنیـایی تێدایـە. وە لـە لایەکیشـەوە شـەیتان پشـتیوانی دەرونـی خراپـەکار

دەکات. جا ئەم جەنگ و دژایەتیە بەردەوام و بەردەوامی دەبێت تا کات و ساتی مەرگ. سەرکەوتن و دۆڕانی بەردەوامی هەیە لەم نێوەندەدا وە سەرکەوتن لە گەڵ بوونی ئارامگرتن دایە جا هەرکامیان ئارمگر و خۆڕاگر بێت و لە خودا ترسا ئەوا سەرئەنجامی دونیا و قیامەتی بردۆتەوە. خودای گەورە و دانا وەك حەکەمێك دەستە بڕیارێکی داوە کە گۆڕانی تێدا نیە کە دەفەرمێت: (إن العاقبة للمتقين....سەرئەنجام بۆ لە خوا ترسان و خواناسانە.)

جا دڵی مرۆڤ لە شێوەی تابلۆیەکی بێگەرد و خاوێن دایە. بیرۆکەکانیش پێنوس و قەڵەمن نەخشی تێدا دەکەن. وە کەسی ژیر و هۆشمەند مۆڵەت و دەرفەت نادات لەو دڵە پاکەدا نەخشی ناپەسەند و خەڵەتێنەری تێدا بکێشرێت کە دوور بێت لە حەق و ڕاستییەوە. جا لە یەك ساتدا دوو نەخشی نایاب و ناشیا و لە دڵێکدا کۆ ناکرێتەوە بەڵکو پێویستە ئەو دڵە خاڵی بکرێتەوە تا جوانی و شۆخی ئەو نەخش و تابلۆیە بە جوانی دەربکەوێت.بەڵام مەترسی لێرەدایە کە دڵ و دەرونێك تەنها بیرۆکە خراپەکان جێنشین بن و جێی خۆیان بکەنەوە. ئەوا مەترسی گەورەی لێ دەکەوێتەوە. وەك شاعیرێك دەڵێت:

أتاني هواها قبل أن أعرف الهوى

فصادف قلبنا فارغاً فتمكنا

واتە:

بیرۆکە و هەوای کەسێکم بۆ هات پێش ئەوەی بزانم هەوا و بیرۆکە چییە

دواتر توشی دڵێکی بەتاڵ بووم لەوێدا جێنشین بوو مۆڵگەی دامەزراند

ئەمە حالّی زۆربەی خەڵکیە کە دڵ و دەرونیان لە سەر بنەمای زانست زانیاری نەچنیەوە و بیرۆکەی هەوڵ و کۆشش و چاکە خوازی پەی بە دڵ و دەرونیان نەبردووە. دواتر شەیتان ئەم هەلەی قۆستوەتەوە بە دەرفەتێکی گەورەی زانیوە وە سەرجەم ئەو دلآنەی تەنیوە بە بیرۆکە خەیالآوی و ئەندێشەی خراپە خوازی و لە خشتە بردن. کە دوای بۆ ڕازاندوونەتەوە کە ئەم بیرۆکانە بنەمای ژیان و ڕاستیەکانی بوونن. سەرئەنجام گومڕایی و مەستی بوەتە پیشە و ئاکاری ئەو دلآنە.شەیتان لەم کارەدا بە ووردی مامەڵە دەکات. هەر دڵ و بە پێی بارودۆخی خاوەنەکەی کاری لە سەر دەکات. هەندێ دڵ هەیە بە ئاسانی گیرۆدەی حەز و خەیاڵی نابێت. شەیتان سەرقاڵی دەکات بە بیرۆکەی دوورە پەرێزی و دابڕان و دوورکەوتنەوە لە کۆمەڵگا و لە ژێر ناونیشانی خواناسی و زوهد و خۆپارێزی...

کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا لە خشتە بردنە. جا پێویست ە دڵ و دەرونمان بە بیرۆکەی زانست خوازی و چاکە خوازی بتەنێت کە بزوێنەری کار و هەڵمەتەکانمان بێت بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودای گەورە. جا پڕو پوختترین دڵ ئەو دڵەیە کە بیرۆکەی چاکە خوازیەکانی لە سەر دڵیدا کەڵەکە بکەن و کێبڕکێ بکەن. هەر لەم ڕوانگەیەوە دەبینین کە (عمر بن خطاب (ﷺ)) کە هەمیشە بیرۆکە چاکەکان لە سەری کەڵەکەیان دەکرد. جاری وا هەبووە لە کاتی نوێژدا سوپایەکی ئامادە وساز دەکردووە. کە بەمەش دەوترێت تێکەڵ کێش بوونی پەرستنەکان. کە ئەمەش ئاستێکی بەرزە لە خواناسی و دڵپاکی هەموو کەسێك بە ئاسانی پێی ناگات. بەخششی خودایە.بەو کەساتەی دەبەخشێت ، کە خۆی بە میهرەبانی خۆی مەبەستێتی.

## زمان...دەروازەی خراپەکاریە بۆ مرۆڤ

٣- ووتـــەکان:

مەبەست لێـی دەربڕینـی ئـەو بڕگـەو ووشـانەیە لـەزمانی ئـادەمیزادەوە ڕۆژانە دەردەچێت گوزارشتمان لێ دەکات.

پێویسـته ئـادەمیزاد هەمیشـه لەوپـەڕی وریـایی وژیـری دابێـت کەهەرچـی ووشـەو ووتەیـەك لـەزمانی یـەوە دەردەچـێت بـۆ جیهـانی بیسـتراوەکان بـریتی یـه لـەنهێنی وپـەنهانی یـەکانی دڵ ودەرونـی ئـەو کەسـە. واتـه هەرچـی لەدڵـەکان شـاراوە بێـت ، زمـان گوزارشـتی لـێ دەکـات وبەخـەڵکی دەناسـێنێت. وەپـێش دەربـڕینی هـەر ووشـەیەك پێویسـته ئاگـاداری ئـەوە بـێ کەئـەم ووشـەیە خێـر هێنـەرە یـاخود زیـان هێنـەرە، واتـه چـاکه یـان خراپـە، چـونکه هـەموو ووتـەکان لەسـەرمان دەنوسرێت ولێ پرسینەوەمان لەسەر دەکرێت.

وە (یحیـی بـن معـاض) دەڵێـت: دڵـەکان وەك قـۆری وان هەرچـی تێـدا بێـت قوڵـپ دەدات ودەکوڵێـت.وەزمـانیش لولەکەیـەتی ولـەو ڕێگایـەوە شتەکانی ناوی دەردەچێت.

جـا کاتێـك قسـەت بۆدەکـات ، هەسـت بـەتام وچـێژی دڵ ودەرونـی دەکـەیت لـه ڕێگـەی هەڵسـەنگاندنی ووتەکانیـەوە کـەئایا دڵـی پـاك وبـێ گـەردە،یـاخود ڕەش وپیسـە. هـەروەکو چـۆن کەسـێك بـەزمانی چـێژی خـواردن وخواردنـەوەکان دەکـات. وەلـه فـەرموودەی (أنـس) دا هـاتووە بـە "مرفـوع"ی کـە پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (لایستقم إیمـان عبـد حتـی یسـتقیم قلبـه، ولایسـتقیم قلبـه حتـی یسـتقیم لسـانه.)[1] واتـه:

---

[1] - ئەم فەرموودەیە(حسن)ە، (احمد:٣/١٩٨)بڕوانە (المجمع اللهثمي: ١/٥٠٣).

باوەڕی مرۆڤ سەقامگیر نابێت تاوەکو دڵی سەقامگیر نەبێت، وەدڵی سەقامگیر نابێت تا زمانی سەقامگیر نەبێت.

وەکاتێك پرسیان لە پێغەمبەرﷺ زۆرترین هۆکاری چوونە دۆزەخەوە چی یە، فەرمووی: (الفم والفرج) واتە: زمان وداوێنە. وە (معاذ) پرسیاری کرد لە پێغەمبەرﷺ دەربارەی ئەو کردارانەی بەرەو بەهەشتی دەبات و لەدۆزەخ دووری دەکاتەوە، پێغەمبەرﷺ باسی سەرو کۆڵەکە وکارەکانی بۆ کرد وپاشان فەرمووی: (الا اخبرك بملاك ذلك كله؟) واتە: ئایا خاوەن وجولێنەری هەر هەموویانت پێ بڵێم؟ معاذ ووتی:بەڵێ پێغەمبەری خودا.پاشان پێغەمبەر زمانی خۆی گرتوو پێی فەرموو: (كف عليك هذا) واتە: ئەمە بگرەو بەست بێت. معاژیس ووتی: پاشان پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (ثكلتك أمك يا معاذ وهل يكب الناس على وجوههم أو على مناخرهم إلا حصائد ألسنتهم.)[1] واتە: دایکت تۆی لەبار بچێت، ئایا خەڵکی هەموو نەهامەت وکارەساتەکانی هۆکارەکەی زمانی نی یە، کەدەبێتە مایەی ڕاکێشان بەسەر دەم وچاو لوتیاندا لەقیامەتدا.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە زۆرێك خەڵکی خۆیان دەگۆڕن ودوور دەکەونەوە لەئاستی ستەم وزیناو دزی ومەی خواردنەوە، کەچی ناتوانن زاڵبن بەسەر زمانی خۆیانداو بیپارێزن لەشتی ناڕەوا. هەر وّیە دەبینی کەسێك بەدینداری خواناسی ناسراوە لەنێو خەڵکیدا ، کەچی بەبێ پەروایی ووتەی وادەردەبڕێت دەبێتە مایەی توڕەبوونی خوای گەورە.کە سەنگی ئەو ووشەیە نازانێت چەند مەترسیدارە. تەنانەت کەسی واهەیە خۆی بەزاهیدو خواناس دەزانێت کەچی کەزمانی دێتە

---

[1] -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(احمد: ٥/٢٣١)وە (ترمذي: ٢٦١٦)گێڕایانەتەوە.

گۆ وەکو گورگی برسی مردوو وزیندو ناپارێزێت لەووتەی نابەجێ بەبێ گوێ دانە ووتەکانی.

ئەوەتا لە (صحیح مسلم) دا هاتووە لە فەرموودەی (جندب أبن عبدالله رضي الله عنه) کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: **(قال رجل: والله لايغفر الله لفلان، فقال الله عزوجل: من ذا الذي يتألى على أني لا أغفر لفلان؟ قد غفرت له وأحبطت عملك.)**[1] واتە: پیاوێك ووتی: والله ی خوای گەورە لە فلاّن کەس خۆش نابێت، خوای گەورە فەرمووی: ئەوە کێ بوو سوێندی خوارد کەلە فلاّنە کەس خۆش نابم، ئەوا لەو کەسە خۆش بووم تۆش سەرجەم کارەکانت هەڵوەشایەوە.

جا تێبینی ئەو پیاوە بکە کەچەند خواپەرست بووە، کەچی بەتەنها ووشەیەك سەرجەم کارەکانی لەدەست دەدات.

هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا (ابو هريرە) دەگێڕێتەوە بەهەمان شێوەی ئەم فەرموودەیە. دواتر"ابو هريرە"دەڵێت: تاکە ووشەیەکی درکاند دنیاو قیامەتی خۆی کاول کرد.[2]

وەلە (صحيحين) دا هاتووە لە فەرموودەی (ابی هريرە) کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: **(ان العبد يتكلم بالكلمة من رضوان الله لايلقى لها بالا يرفعه الله بها درجات ،وإن العبد ليتكلم بالكلمة من سخط الله لايلقى لها بها بالأ يهوي بها في نار جهنم.)**[3] واتە: جاری

---

[1] –ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە، تەنها(مسلم: ١٧٩/١٦نووی) گێڕایەتیەوە.
نووی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە ئاماژەیەکە بۆ لێ خۆشبوونی خوای گەورە لە تاوانەکانی بەبێ تەوبە کردن ، کەرێبازی ئەهلس سونەوجەماعە لەسەر دامەزراوە ، لەم لاشەوە پێری موعتەزیلە ئەمە بەبەڵگە دەزانن لەسەر پوچەڵ بوونەوەی کردەوەکان بەئەنجام دانی تاوانە گەورەکان ، بەلاّم ئەهلی سونەو جەماعە پێیان وایە تەنها بە"کفر"کردەوەکان پوچەڵ دەبنەوە.

[2] – ئەم فەرموودەیە(حسن)ە، (احمد :٣٧٣/٢)و (ابوداود: ٤٩٠١)گێڕایانەتەوە.

[3] –ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە، (بخاری: ٦٤٧٨)گێڕایەتیەوە.

واهەیە کەسێك ووشەیەك دەدرکێنێ لە ڕەزامەندی خوای گەورەدایە، وەهیچ هەستی پێ ناکات کەچی خوای گەورە چەندین پلە بەرزی دەکاتەوە، وەکەسی واهەیە ووشەیەك دەدرکێنی لە تووڕەبوونی خودای گەورەدایە، وەخۆی هیچ هەستی پێ ناکات ، کەچی خوای گەورە بەناخی ئاگردا دەیباتە خوارەوە.

وە لە لای "مسلم": (ان العبد ليتكلم بالكلمة ما يتبين مافيها يزل بها في النار أبعد مابين المشرق والمغرب.)[1] واتە: کەسی واهەیە ووتەیەك دەردەبڕێت نازانێت چی تێدایە، کەچی خوای گەورە بە دووری نێوان ڕۆژهەڵات ورۆژئاوا بەناخی دۆزەخدا دەیباتە خوارەوە.

وەهەروەها (ترمذي) دەگێڕێتەوە لەفەرموودەی "بيلال بن الحارث الحزني" کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (إن احدكم يتكلم بالكلمة من رضوان الله ما يظن أن تبلغ مابلغت فيكتب الله له بها رضوانه الى يوم يلقاه، وإن احدكم ليتكلم بالكلمة من سخط الله مايظن أن تبلغ ما بلغت، فيكتب الله له بها سخطه الى يوم يلقاه.)[2] واتە: جاری وا هەیە یەکێکتان ووتەیەك دەدرکێنێ لە ڕەزامەندی خوای گەورەدایە ، وەخۆی هیچ لەبارەی ووتەکەیەوە نازانێت کە چ ئاستێکی هەیە. جا خاوی گەورە ڕەزامەندی خۆی بۆ دەنوسێت تا ئەو ڕۆژەی بەدیداری خودا دەگات لە قیامەتدا. وەکەسی واتان هەیە ووتەیەك دەدرکێنێ لە تورەیی خوای گەورەدایە، وەخۆی هیچ لەبارەی ووتەکەیەوە نازانێت کەچی ئاستێکی هەیە، جا خوای گەورە تووڕەیی خۆی لەسەر دەنوسێت تا ڕۆژی قیامەت.

---

[1] -ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە، (بخاری: ٦٤٧٧)وە(مسلم: ١٨/١٠٩-١١٠نووی)گێڕایانەتەوە.

[2] -ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە،(احمد :٤٥/١)وە (ترمزی: ٢٣١٩)گێڕایانەتەوە.

وه (علقمـه) دهڵێـت: ئـای چـهندین ووتـهم هـهبوو لهترسـی ئـهم فهرموودهیهیی (بلال بن الحارث) دا نهم وێرا بیدرکێنم.

هـهروهها لـه (جـامع الترمـذي) دا هـاتووه لـه فـهرموودهی "أنـس" دهڵێـت: (تـوفي رجـل مـن الصحابة، فقـال رجـل: أبشـر بالجنـة، فقـال رسـول اللهﷺ: ومـا يـدريك؟ فلعلـه تكلـم فيمـا لايعنيـه، او بخيـل بمـا لاينقصـه... قـال حـديث حسـن)[1] واتـه: واتـه پیاوێـك لـهھاوهڵان كۆوچـی دوایـی كـرد، پیاوێـك ووتـی: مـژدهی بهههشـتت لـیٚ بێـت، پێغهمبـهرﷺفـهرمووی: چـۆن دهزانیـت، كـیٚ ناڵێـت هـهر لهخۆیـهوه ووتهیـهكی نـهدركانبێت كـه ئیشـی ئـهو نـهبووبێت ، یـاخود كـهم تهرخـهمی ورهزیلی له شتێكدا كردبێت كهخۆی كهمی نهبێت.

وهئـهم فهرموودهیـه لـه ووتهیـهكی تـردا هـاتووه: (إن غلامـأ استشـهد يـوم أحـد، فوجـد علـى بطنـه صخرة مربوطـة مـن الجـوع، فمسحت امـه الـتراب عـن وجهـه، وقالـت: هنيئـأ لـك يـابني، لـك الجنـة، فقـال الـنبيﷺ :ومـا يـدريك؟ لعلـه كـان يـتكلم فيمـا لايعنيـه، ويمنـع مـالا يضـره.) واتـه: گـهنجێك لـه جـهنگی ئوحـودا شـههيد بـوو ،بينيـان لـه برسـاندا بـهردێكی بهسـتبوو بهسـكيهوه، دايكـی خـۆڵ وتـۆزی ڕوخسـاری لاداو پێـی ووت: مـژدهت لـیٚ بێـت رۆڵـه مـژدهی بهههشـت، پێغهمبـهرﷺفـهرمووی: چـۆن دهزانیـت؟ كـیٚ دهڵێـت هـهر لهخۆیـهوه ووتهیـهكی نـهدركانبێت كـه ئیشـی ئـهو نـهبووبێت ، یـاخود ڕێگـری شـتێكی كردبێت كه زيانی پیٚ نهدهگهياندبێت.

وهھـهروهها لـه (صـحيحين) دا هـاتووه لـه فـهرموودهی (أبـی هريـره) بـه مرفـوعی، كـه پێغهمبـهرﷺ فهرموويـهتی: (مـن كـان يـؤمن بـالله واليـوم

---

[1] – ئهم فهرموودهيه (ضعيف الأسناد)ه، ههمان سهرچاوهی پێشوو(٢٣١٦).

الأخـر فليقـل خـيراً أو ليصـمت.) [1] واتــە: هــەر كەسـێك بـاوەڕی بــەخودا وڕۆژی قیامەت هەیە با ووتەی چاك بڵێت،گەر نا با بێ دەنگ بێت.

وەلــە دەقــەكانی "موسـليم"دا هــاتووە: (مــن كـان يـؤمن بـالله واليـوم الأخرفـإذا شـهد أمـراً فليـتكلم بخـير أو ليسـكت.) [2] واتــە: هــەر كەسـێك بـاوەڕی بـەخودا وڕۆژی دوایـی هەیـە وەلـە كارێكـدا بـوو ، ئـەوا بـا ووتـەی خێر بڵێت یان با بێ دەنگ بێت.

وە (ترمــذي) بــە "أســناد صــحيح"دەگێڕێتــەوە كــە پێغەمبــەرﷺ دەفــەرمێت: (مـن حسـن إسـلام المـرو تركـه مـالا يعنيـه.) واتــە: لـە چـاكی یـەكانی موسـوڵمان بـوونی كەسـێك ئەوەیـە كەدەسـت نەخاتـە كاروبارێـك كە پەیوەندی بەئەوەوە نەبێت.

وە (سـفيان بـن عبـدالله الثقفـي) دەڵێـت: (قلـت يارسـول الله: قـل لـي في الاسـلام قـولاً لا أسـال عنــه أحـد بعـدك، قـالﷺ: قلـت أمنـت بـالله ثـم اسـقم، قلـت: يارسـول الله مـا اخـوف مـا تخـاف علـى؟ فأخـذﷺ لسـن نفسـه، ثـم قـال: هـذا.) [3] واتــە: بەپێغەمبــەرم ووت: ئـەی پێغەمبـەر شـتێكم فێـر بكــە لەئیسـلامدا كــە چـیتر پرسـیار لەكــەس نەكــەم. پێغەمبــەرﷺ فــەرمووی: بڵـێ بـاوەڕم بــەخودا هێنـا، وەلەسـەر ئەمــە سـەقامگیر بــە. پاشــان پرسـیمە ئــەی پێغەمبــەرﷺ چـی شـتێك مەترسـی زیـاتر هەیــە لەسەر من؟ پێغەمبەر زمانی خۆی گرت وفەرمووی: ئەمە.

هــەروەها (أم حبيبــە) ی خێزانــی پێغەمبــەرﷺ دەگێڕێتــەوە ،كــە پێغەمبــەرﷺ فەرموویــەتی: (كـل كـلام ابـن أدم عليــە لا لــهُ، الا أمــراً

---

1 –ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە،هەمان سەرچاوەی پێشوو(١٠/٦٠نووی)

2 –ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە،(ترمذي: ٢٣١٧)وە(ابن ماجه:٣٩٧٦)گێڕایانەتەوە.

3 – ئەفەرموودەیە(حسن)ە،(مسلم: ١١/١٢نووی)گێڕایەتیەوە.

بمعـــروف، او نهيــاً عـــن منكـــر، او ذكـــراً لله عزوجـــل.) [1]واتـــه: هـــەموو ووتەيـــەكی ئـــادەمیزاد لەســـەر دەكـــەوێت، تـــەنها فـــەرمان كـــردن بەچـــاكەو ڕێگری لەخراپە ویادی خوا نەبێت.

وەلـــە فەرموودەیـــەكی تـــردا هـــاتووە: (اذا أصـــبح العبـــد فـــإن الأعضـــاء كلـــها تكفـــر اللســـان، تقـــول: أتـــق الله فینـــا فإنمـــا نحـــن بـــك ، فـــاذا أســـتقمت اســـتقمنا، وإن اعوججـــت أعوججنـــا.) [2]واتـــه: كاتێـــك مـــرۆڤ بـــەیانان ڕۆژ دەكاتـــەوە ، ســـەرجەم ئەندامـــەكانی جەســـتەی دەپاڕێنـــەوە وداوا لـــەزمان دەكـەن وپێـی دەڵـێن: لـە خـوا بترسـە وەئێمـە هـەموومان بەنـدین بـەتۆوە، جـا ئەگـەر سـەقامگیر بیـت ،ئـەوا ئێمـەش سـەقامگیر دەبـین. وەئەگـەر خواروخێچ بیت ،ئەوا هەموومان خواروخێچ دەبین.

وەپیـــاوانی ســـەلەف لـــەكاتی دركانـــدنی هـــەر ووشـــەیەكدا لـــێ پرســـینەوەیان لەگـــەڵ خۆیـــان دەكـــرد گـــەر چـــی ووشـــەكەش بـــریتی بوایـــە لە:"ئەمرۆ گەرمە، ئەمرۆ سارده".

وەدەگێڕنـــەوە كەلـــە خـــەودا بینـــراوە پرســـیاریان لـــەزۆرێك لەكەڵـــە زانایـــان كـــردووە ، كـــەحاڵتان چـــۆنە لـــەپاش مـــردن؟ یـــەكێكیان ووتویـــەتی: مـــن گـــیرم خـــواردووە بەدەســـت ووشـــەیەكەوە كـــەكاتی خـــۆی دركاندوومـــە ،كەووتومـــە: ئـــای خـــەڵكی چـــەند پێویســـتیان بەبارانـــە؟ وەپـــێم ووتـــراوە: تـــۆ چوزانیت؟ من باشتر لەبەرژەوەندی بەندەكانم شارەزاترم.

---

1 – ئـــەم فەرموودەیـــە(حســـن)ە، (ترمـــذي:٢٤١٢)وە (ابـــن ماجـــە: ٣٩٧٤)گێڕایانەتـــەوە. وە(ترمذي)دەڵێت: ئەم فەرموودەیە(حسن غریب)ە وە(الباني)بە(ضعیف)ی داناوە.

2 – ئەم فەرموودەیە(حسن)ە، (ترمذي: ٢٤٠٧)وە(احمد: ٩٦/٣)گێڕایانەتەوە.

## ئایا فریشتەکان هەموو ووشەیەك تۆمار دەکەن

سەرجەم زانایان لەم بابەتە جیاواز وناکۆکن ، کەئایا فریشتەکانی سەر شانی ئادەمیزاد تەنها ووتەی چاکەو خراپە تۆمار دەکەن، یاخود هەموو ووتەیەك؟ لەم بابەتە دوو ڕاوبۆچوون هەیە کەباشترینیان ودیاریترینیان ڕاوبۆچوونی یەکەمە ،کەپێیان وایە هەموو ووتەیەك تۆمار دەکەن.

هەندێك لە سەلەف دەڵێن: هەموو ووتەیەکی ئادەمیزاد لەسەریەتی تەنها ئەوە نەبێت کەلە پێناوی خودادا ووتراوە.

وە (أبو بكر) ﷺ زمانی خۆی دەگرت ودەیووت: ئەمە سەرچاوەی بەلاکانە.

وەهەروەها ووتەکانت دیل وبەندی تۆن، جا هەر کاتێك درکاندت ئەوا دەبیتە دیل وبەندەی ووتەکانت. خوای گەورەش دەفەرمێت: (مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ... ق:١٨) واتە: هەر ووتەو ووشەیەك لەدەم وزار بێتە دەر ،خێرا ڕاستەوخۆ چاودێرێکی ئامادە تۆماری دەکات.

## گەورەترین بەلاکانی زمان

زمان دوو بەلای گەورەی هەیە، جائەگەر لەیەکێکیان دەربازمان بێت، لەوی تر ئەستەمە ڕزگاربوونمان کە ئەم دووانەش بریتین لە بەلای "ووتن وبێ دەنگ بوون".

دوور نی یە هەریەکەیان لەشوێن وکاتی خۆیدا گەورەترین تاوان بەسەر خاوەنەکەیدا بهێنێت، چونکە بێ دەنگ بوون لە ئاستی حەق وڕاستیدا شەیتانێکی کەڕولاڵە وسەرپێچی خودای گەورەی کردووە. وە

"ووتن وقسەکردن" بەناحەق ونارەوایی و دوور لە ڕاستی ،ئەوا شەیتانێکی بەدەنگ وگۆیە ویاخی بووە لەخودای گەورە،جا زۆرێك لەخەڵکی گرفتاری بە لاکانی "ووتن وبێ دەنگین".

جا ئەو کەسانەی لەم نێوەندەدا خۆیان پاراستووە ، ئەوانە ڕێبواری شاڕێگەی ڕاست ودروستن کەهەمیشە لەکاتی خێروچاکە هاتوونەتە گفتوگۆ، وەلەکاتی خراپەخوازیدا خۆیان وزمانیان پاراستووە. ووردەکاری تەواویان بۆ ووتەکان وەبێ دەنگ بوونەکانیان کردووە بەشێوازێك کەلە بەرژەوەندی قیامەتیاندا بێت.

کەسی وا هەیە لەقیامەتدا بە ئەندازەی چیاکان کاری چاکە خوازی ئەنجام داوە ،کەچی بەتاکە ووشەیەکی نارەوا هەرەسی بەهەمووی هێناوە. وەکەسی واهەیە بە ئەندازەی چیاکان کاری خراپەکاری ئەنجام داوە ،کەچی بەتەنها ووشەیەك ویادی خودایەك ئەو چیا تاوانەی ڕوخاندووە.

٤- هەنگاوەکان:

مەبەست لێی هەنگاونانە بەرەوکارەکا چ خێربێت یان شەڕ. زۆر پێویستە پێش هەر هەنگاونانێك بە وردی لێکدانەوەی تەواوی بۆ بکەین تا بزانین سەرئەنجامی ئەم کارو هەنگاوانە خێروچاکەخوازییە یاخود شەڕوخراپەخوازییە، چونکە هەر هەنگاونانێك کەدەینێیت بۆ کاری چاکەخوازی ئەوا هەنگاوێك لە خوای گەورە نزیك دەبیتەوە. جا ساتمە کردن دوو جۆرە: (ساتمەی پێیەکان"هەنگاوەکان"، وەساتمەی زمان و"ووتەکان") .

جا هەریەکەیان تەواوکەری ئەوی تریانە، هەر بۆیە خوای گەورە دەفەرمێت: (وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا

خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا... الفرقان:٦٣) واته: بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەن کە زۆر بەهێمنی وسالاری بەسەر زەویدا تێ دەپەڕن، وەکاتێکیش نەفام ونەزانەکان بە ووتەی ناشرین ڕووبەڕوویان دەبنەوە ،ئەمان بەسلاو ووتەی جوان بەڕێیان دەخەن.

خوای گەورە باسی لەسەقامگیری ئەو پێرە خواناسە دەکات لە"هەنگاوەکان و ووتەکاندا" هەروەکو چۆن کۆکردنەوەیەکی لە نێوان"ساتەکان وبیرۆکەکاندا کردووە"کەدەفەرمێت: (يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ... غافر:١٩) واتە: ئەو خودایە بەهەمیشەیی چاوە ناپاك وخیانەتکارەکان دەناسێت، وەدەزانێت چییان لەدڵ ودەرونیاندا حەشارداوە.

## حەرام کردنی خراپەکاری و پاراستنی داوێن

هەموو ئەم باسەمان لە بابەتەکانی پێشوودا ڕوون کردۆتەوە لە قەدەغەکردن وحەرام کردنی خراپەکاری "الفواحش" وپێویستی پاراستنی داوێنوەلەم بارەیەوەش پێغەمبەرﷺدەفەرمێت: (أكثر مايدخل الناس النار:الفم والفرج.)[1] واتە: خەڵکی زۆربەیان بەهۆی خراپ بەکارهێنانی "زمان وداوێن" دەچنە دۆزەخەوە.

هەروەها لە (صحيحين) دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (لايحل دم امريء مسلم الا بأحدي ثلاث: الثيب الزاني، والنفس بالنفس، والتارك لدينه المفارق للجماعة.)[2] واتە: تەنها بەسێ شت خوێنی کەسێکی موسڵمان حەڵاڵ دەبێت: پیاوێکی خێزاندار زینا بکات، یاخود لەناحەق کەسێك بکوژێت، یاخود لەئاینەکەی هەڵگەڕێتەوە ولەپێڕی بڕواداران لابدات.

وەئەوەی لەم فەرموودەیەدا تێبینی دەکرێت کاری زیناکردنی لەگەڵ کافربوون وبێ باوەڕی و خوێن ڕشتن کۆکردۆتەوە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئاماژەیە بۆ هاوڕێك بوونی ئەو فەرموودەیە لەگەڵ ئەو ئایەتە پیرۆزەی کەلە سورەتی "فرقان"دا هاتووە ،[3] وەئەوە فەرموودەیەکە (ابن مسعود) گێڕاویەتیەوە.

جا هاوڕێك وبەدوایەکدا هاتنی تاوانەکان لەم فەرموودەیەدا ئەوە دەسەلمێنێت کە پێغەمبەرﷺ لەو تاوانانەوە دەست پێ دەکات کەزیاتر وزۆرینەی خەڵکی توشی دەبن کە ئەویش"زینا"یە. پاشان

---

[1] – ئەم فەرموودەیە(حسن)ە،(احمد: ٣٩٢/٢)وە(ابن المبارك)لە (الزهد:٣٧٩)گێڕایانەتەوە.

[2] –ئەم فەرموودەیە (صحيح)ە،(بخاری: ٩٨٧٨)وە(مسلم: ١٦٦/١١نووی)گێڕایانەتەوە.

[3] –وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا...الفرقان:٦٨.

بەپلەیەك دوای ئەو"کوشتنە" پاشتر"بێ باوەڕی وهەڵگەڕانەوە" ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە پێغەمبەرﷺ لەتاوانی گەورەوە بۆ گەورەترینەکان ڕیزبەندی بۆ کردوون.

جا خراپەو سلبیاتەکانی زینا زۆرن وپێچەوانەی چاکسازی کۆمەڵگان. کاتێك ئافرەتێك زینا دەکات ،ئەوا سنووری خودای گەورە دەشکێنێت وسەرشۆڕی وریسوایی توشی خۆی وخانەوادەکەی دەکات، ئەمە جگە ئەگەر سکی پڕبێت وئەو منداڵە لەدایك ببێت، ئەوا وەچەیەکی حەرام وبێ گانە تێکەڵ بەو بنەماڵەوخانەوادەیە دەکات وتێکەڵیان دەبێت وناو وناونیشانی ئەوان وەردەگرێت.وەلە دواڕۆژدا لە میراتی ئەو خانەوادەیە وەردەگرێت کی پێی ناشێت ودروست نی یە...هتد.

هەروەها ئەگەر ئەو منداڵە لەپێش لەدایك بوونی لەناو براو لە باربرا، ئەوا جگە لە زیناکە تاوانی کوشتنیش هاتە پاڵی ، کەواتە کۆرپەیەکی بێ تاوان دەکوژرێت. جائەگەر پیاوێك زینا بکات ،ئەوا سنووری خودا دەشکێنێت ودەست درێژی دەکاتە سەر ناموسی ئافرەتێکی داوێن پاك و وەچەو نەوەی خۆی تێکەڵ بە وەچەی خەڵکی دەکات وەڕیسوایی دەهێنێت بەسەر خانەوادەیەکدا. دوور نی یە ئەو ئافرەتەی دەست درێژی کراوەتە سەر دواتر لەلایەن کەس وکاری یەوە توشی لەناوچوون وکوشتن نەبێتەوە.

جا ئەم تاوانە گەورەیە مایەی کاول بوونی دونیاو تیاچوونی ئاخیرەتە، جگە لەوەی ماڵی ئاگرینی بۆ خۆی سازداوە لە گۆڕو قیامەتدا. جا چەندین کارەسات وئاشوبی بێ شومار دروست بووە لەنێو خەڵکی دا کە بەچەندین خوێن ڕژاوەو خانەوادەو خێزان کاولکراوە، هەرهەمووی لەسەرئەنجامی تاوانێکی وەك زیناوە وەیە.

هەروەها لەتایبەتمەندیەکانی ئەم تاوانە ئەوەیە کەو خاوەنەکەی توشی کۆمەڵێك نەهامەتی دەکات وەك: توشی دەست کورتی وتەمەن کورتی وهەژاری دەبێت ڕوخسارو دیمەن وچارەڕەش وئێسك گران دەبێت لەنێو خەڵکیدا بەکەسێکی ناشایستەو ناپەسەند ناودەبرێت کە متمانەی خەڵکی لەدەست دەدات.

دڵ دەمرێت وتوشی نەخۆشی ودەردو ترس وبیمی دەکات ، شەیتان دەکاتە هاوەڵی هەمیشەیی ووەدەبێتە دوورکەوتنەوە وهەڵهاتنی فریشتەکان لەخاوەنەکەی. دواتر مرۆڤ بەسروشتی خۆی پێی خۆشە بمرێت یاخود خێزانەکەی بکوژرێت، بەڵام نەیبیستێت کە زینای ئەنجام داوە.

(سعد بن عبادە) ﷺ دەڵێت: ئەگەر پیاوێك ببینم زینا لەگەڵ خێزانەکەم ئەنجام دەدات، بە شمشێر لەت وپەتی دەکەم. ئەم وتەیەیان گەیاندە پێغەمبەری خودا، پێغەمبەریش فەرمووی: (تعجبون من غيرة سعد؟ والله لأنا أغير منه، والله أغير مني، ومن أجل غيرة الله حرم الفواحش ماظهر منها وما بطن.)[1] واتە: ئایا سەرسوڕمانن بە غیرەت وپەرۆشی سەعد؟ سوێند بێت بەخودا من لەسعد بەغیرەت ترم ، وەخودا لەمن بە غیرەت ترە، جا لەبەر غیرەتی خودا بوو خراپەکاری وزینا بە هەموو چەشنەکانیەوە "ئاشکراو نهێنی"قەدەغەو حەرام کراوە.

وەلە (صحیحین) دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (إن الله يغار ، وإن المؤمن يغار، وغيرة الله أن يأتي العبد ما حرم عليه.)[2] واتە:

---

[1] –ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ٦٨٤٦)وە (مسلم: ١٧/٨٠نووی)گێڕایانەتەوە.
[2] –ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ٥٢٢٣)وە(مسلم: ١٧/٨٠–٨١) گێڕایانەتەوە.

خـوای گـەورە غـیرەت دەكـات ، وەبـڕوادارانیش غـیرەت دەكـەن ، غیرەتـی خــوا گەورەیــەو لــەو ســاتەدایە كەبەنــدەكانی شــتێكی حــەرام وقــەدەغ ەكراو ئەنجام بدەن.

هــەروەها لــە (صــحیحین) دا هــاتووە كــە پێغەمبــەرﷺ فەرموویــەتی: (لا أحـد أغـير مـن الله، ومـن اجـل ذلـك حـرم الفـواحش مـا ظهـر منها ومـا بطـن، ولا احـد أحـب إليـه العـذر مـن الله، ومـن أجـل ذلـك أرسـل الرسـل مبشـرين ومنـذرين، ولا احـد احـب إليـه المـدح مـن الله، ومـن أجـل ذلـك أثنـى علـى نفسـه.)[1] واتـە: هـیچ كەسێك هێنـدەی خـودا بـەغیرەت نـی یـە ، وەهــەر لەبــەر ئەمەیــە كــە خراپــەكاری نهــێنی وئاشــكرای قەدەغــەكردووە، وەهـیچ كەسـێك هێنـدەی خـودا پێـی خـۆش نـی یـە كـە بیـانووی بەنـدەكانی ببڕێــت،هەربۆیــە پێغەمبــەرانی ڕەوانــەكردووە بەمــژدەدەر وترســێنەر. وەهـیچ كەسـێك هێنـدەی خـودا پێـی خـۆش نـی یـە كـە سـوپاس گـوزاری وشـوكرانە بـژێری بكرێـت، وەهـەر لەبـەر ئەوەیـە كـە وەسـف وسـەنای خـۆی كردووە.

وەلــە (صــحیحین) دا هــاتووە لــە ووتــاری خۆرگیرانــدا"الكسـوف" كـە پێغەمبــەرﷺ فەرموویــەتی: (یـا أمـة محمـد والله إن لا أحـد أغـير مـن الله ان يزنـي عبـده أو تزنـي أمتـه، يـا أمـة محمـد والله لـو تعلمـون مـا أعلـم لضـحكتم قلـيلاً ولبكيـتم كـثيراً، ثـم رفـع يديـه وقـال: اللـهم هـل بلغـت؟)[2] واتــە: ئــەی گــەلی محمــد، ســوێندبێت بــەخودا ، كــەس هێنــدەی خــودا بـەغیرەت وپـەرۆش نییـە ، كاتێـك بەنـدەكانی دەبینێـت زینـا دەكـەن. ئـەی گـەلی محمـد، سـوێندبێت بـەخودا ئەگـەر ئـەوەی مـن دەیـزانم ئێـوە بتـان

1 -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری:٣٦٣٤)وە(مسلم:١٧/٨٠) گێڕایانەتەوە.
2 -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە، (بخاری:١٠٤٤)وە(مسلم: ٦/٢١٠نووی) گێڕایانەتەوە.

زانیایـه ، ئـەوا کـەم پـێ دەکـەنین وزۆردەگریـان. پاشـان هـەردوو دەسـتی بەرزکردەوەو فەرمووی: خودایە ئایا گەیاندم؟

جـا بـاس کردنـی ئـەم تاوانـە لـەپاش نوێـژی خـۆرگیران لـە ووتارەکەیـدا نهـێنی یـەکی گـەورەی تێدایـە بـۆ کەسـێك بـیر تیـژبێت. بڵاوبوونـەوە وسـەرهەڵدانی تـاوانی زینـا لـە مەترسـیەکانی کـاول بـوون ووێـران بـوونی دونیادایـە، هـەروەکو لـە (صـحیحین) دا هـاتووە کـە (أنـس بـن مالـك) دەڵێـت: باسـێکتان بۆ دەکـەم کە کـەس لـەپاش مـن بۆتـان ناکـات. ووتـی: گـوێم لەپێغەمبـەری خـودا بـوو دەیفـەرموو: (مـن اشـراط الساعة ان یرفـع العلـم ، ویظهـر الجهـل ، ویشـرب الخمـر ، ویظهـر الزنـی،ویقـل الرجـال، وتکثـر النسـاء، حتـی یکـون لخمسـین امـرأة القـیم الواحـد.) [1] واتـە: ئـەم ڕووداوانـە لەمەرجـەکانی هـاتنی قیامەتـە: زانسـت وزانیـاریێ کـەم دەبێـت، نـەزانین ونـەفامی بـاڵ بەسـەر ژیانـدا دەکێشـێت، مـەی دەخورێتـەوە، زینـاکردن زۆر دەبێـت، وەپیـاوان کـەم دەبنـەوە، تەنانـەت بـۆ پـەنجا ئافرەت تەنها یەك پیاو دەبێت.

سـونەتی خـوای گـەورە وایـە لـە گـەڵ بڵاوبوونـەوەی زینـاو دەرکـەوتنی وەك دیاردەیـەك لـەنێو کۆمـەڵگادا. خـوای گـەورە خەشـم وقـینی دێتـە جـۆش وسـزای گشـتی ڕەوانـەی ئـەو کۆمەڵگایـە دەکـات. (عبـدالله بـن مسـعودﷺ ) دەڵێـت: هـەرکاتێك زینـاو ڕیبـا"سـو" وەك دیـاردە لـە هـەر کۆمەڵگایەك دەرکەوتن، ئەوا خوای گەورە مۆڵەتی کاولکردنی دەدات.

جـا هەنـدێك لـەپیاوە ئایینیـەکانی جولەکـە دەگێڕنەوەکـە "حبرێـك"ی جولەکـە کوڕەکـەی خـۆی بـینی دەسـت بـازی لەگـەڵ ئافرەتێکـدا دەکـرد، ڕاسـتەوخۆ باوکەکـە هـاواری کـرد ،نەکـەی ڕۆڵـە...باوکەکـە توشـی شـەلەلی

[1] -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ٨١)وە (مسلم: ١٦/٢٢٦نووی) گێڕایانەتەوە.

جەستە بوو، خێزانەکەشی توشی بەدڕەوشتی هات. جا بەکوڕەکەی ووت: ئەمە سەرئەنجامی کارە چەپەڵەکەی تۆیە کەچی بەسەر مندا هێنا، دەك خێر لەوەچەتا نەبێت هەتا ماویت..

## توندترین سزا لە حەدی زینا دایە

خوای گەورە سزای زینای لەنێو سزاکاندا تایبەتمەند کردووە بەسێ خاڵ:_

١. کوشتن بەناشیرینترین شێواز، یاخود سزای دارکاری بۆهەموو جەستە، وەدوور خستنەوەی بۆ دوورە ولات بۆ ماوەی ساڵێك کە ئەمەش سزای دڵ ودەروونە.

٢. خوای گەورە ڕێگری کردووە لە بەزەیی هاتنەوە وسۆز دەربڕین وڕەحم کردن بە زیناکار لەکاتی سزادانیدا ، چونکە خوای گەورە لەهەموو کەسێك تەنانەت لەدایکیش زیاتر بەسۆزترو میهرەبانترە بۆ بەندەکانی. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم جۆرە سزایەی دیاری کردووە بۆ زیناکاران ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە سروشتی مرۆڤەکان وایە کە هەمیشە لەنێو جۆری تاوانباراندا ، هاوسۆزییەك هەیە بۆ زیناکاران بەبەراورد لەگەڵ تاوانەکانی دزی وکوشتن و مەی خواردنەوە. هۆکاری ئەم سۆز وبەزەییەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەئەنجام دانی زینا لە نێو هەموو چین وتوێژەکانی کۆمەڵگادا بوونی هەیە چ دەوڵەمەند وهەژارو گەورە پیاوان و...هتد. وەزیاتر ئەم کارە چەپەڵە لەڕێگەی عەشق وخۆشەویستی یەوە سەر هەڵدەدات. وەسروشتی مرۆڤیش وایە کەهەمیشە سوزی دەردەبڕێت بۆ شەیدایان وعاشقان. هەرچەندە عاشق وشەیداو خۆشەویستی ڕاستەقینە ئەم جۆرە کارو تاوانەی لێ ناوەشێتەوە. هەروەها ئەم

تاوانــه "زینــا" زۆرجــار بەڕەزامەنــدی هــەر دوولا ڕوودەدات، وەکــەمتر زۆرکــردن ودەســت درێــژی تێدایــە، وەشــەهوەت و ئــارەزوو لەهــەموو دەرونێکــدا هەیــە. ئەمانــە کۆمــەڵێك هۆکــارن بــۆ ئــەوەی خــەڵکی بــەزەییان بــەزیناکار بێتــەوە، وەپاشــەگەزببنەوە لەســزادانیان ، کەئەمانە لـەلاوازی باوەڕەوەیـە. جـا هـەر لەبـەر ئـەم مەبەستەیە خـوای گــەورە ڕێگــری کــردووە لــەدەربڕینی هاوســۆزی بــۆ زیناکــاران بەتایبەتی.

٢. خــوای گــەورە بڕیــاری داوە کــە ســزادانەکەیان لــە پــێش چــاوی خــەڵك وبــەئامادەبوونی خــەڵکێکی زۆر بێــت، تاببێتــە پەنــدو عیــبرەت بــۆ کەســانی تــر، وەســزای پیــاوی خێزانــدار بــریتی یــە لەبــەردباران کــردن کەلــە ســزای گــەلی "لــوط"ەوە هاتووەکــە نێربازیــان دەکــرد. خــوای گــەورە بــەردی بــاران بەســەریاندا ودواتــر بــەناخی زەویــدا ڕۆی کــردن. جـا خراپیـەکانی نێربـازی لـە ژمـاردن نایـەن ، هـەر بۆیـە پێکـراو"مفعـول بـە" بکوژرێـت باشـترە لـەوەی توشـی ئـەو تاوانانـە بێـت وئـەو کـارەی لەگەڵـدا بکرێـت ، چـونکە بەئەنجامـدانی ئـەم کـارە لێـی ئـیتر خێـری نامێنێـت و لەمەردایـەتی وجـوامێری دەکـەوێت وئـاوی شـەرم وحـەیای دەتکێت.[1]

---

[1] – ئـەم جـۆرە کەسـانە کـە هـۆگری ئـەم کـارە چـەپەڵەدەبن چـیتر بەکـەڵکی هیچـی تـر نایـەن، وەئامادەن لـەو پێنـاوەدا قوربـانی هـەموو شـتێك بـدەن. بۆیـە متمانـەی هـیچ شـتێکیان پـێ ناکرێـت هـەر ئـەرك وبەرپرسـیاری وکارێکیـان پـێ بسـپێررێت ناپـاکی لـێ دەکـەن. وەئەگـەر خێزانداربێت ئەوا مەترسی هەیە لەو پێناوەدا خێزانەکەشی توشی زیناو ناڕەوایی بکات. "وەرگێڕ"

## سزای ئەوکەسانەی کە کاری گەلی "لوط"[1] ئەنجام بدات ، واتە نێربازی بکات

ئایا کەسێك کاری نێربازی لەگەڵدا بکرێت ، واتە پێکراوبێت "المفعول به" دەچێتە بەهەشتەوە؟

گوێم لە (شیخ الاسلام – ابن التیمیە) بوو لەوەڵامدا ووتی: زانایان لەم بوارەدا دوو بۆچوونیان هەیە:

هەندێکیان پێیان وایە ناچێتە بەهەشتەوە بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: (لایدخل الجنة ولد زنیة)[2]واتە: کوڕی زینا ناچێتە بەهەشتەوە.

---

[1] – تێبینی: زۆر جار لەسەرجەم کتێب وسەرچاوەکاندا لە بری ووشەی "نێربازی" ووشەی"لوطي– لواطة"بەکاردەهێنرێت. تاوانی نێربازی تاوانێکە وئاشکرایە ،بەڵام وەرگرتنی ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ خودی ئەو گەلەی بەم کارە ناشیرینە ناسراون. وە پێغەمبەرێکیان لەلایەن خوداوە بۆ ڕەوانە کراوە بەناوی حەزرەتی(لوط).
لێرەدا ناوبانگ دەرکردنی ئەم تاوانە، بەناوی پێغەمبەرەکەوە گەورەترین ستەم وناڕەواییە. جا پێغەمبەرێك سەرجەم تەمنی بەگەیاندنی پەیامی یەکتاپەرستی ودژایەتی کردنی نێربازی تەرخان کردبێت، وەلە پێناویدا قوربانی زۆری دابێت. کەچی لەسەر ئەنجامدا ناوی ئەم تاوانە ببرێت بەسەر ناوی ئەو پێغەمبەرە ئازیزەدا؟ بەڕاستی ئەمە کارێکی ناڕەواو نابەجێ یە.
هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ کە فەرموودەکانمان لەم بارەیەوە دەگێڕێتەوە دەفەرمێت: (هەرکەسێکتان بینی کە کردەوەی گەلی (لوط )ی دەکرد)نافەرمێت خەریکی (لوطي - لواطي )بێت، بەڵکو دەفەرمێت کردەوەی گەلی لوط: (من وجد تموه یعمل عمل قوم لوط فاقتلوا الفاعل والمفعول به)..(لعن الله مَنَ عَمَلَ قوم لوط لعن الله من عمل عمل قوم لوط لعن الله من عمل عمل قوم لوط. ) واتە: پێغەمبەر لە فەرمودەکانی بە تاوانی گەلی لوط ناوی دەبرد نەك بەناوی خودی پێغەمبەرەکە ، وەك ئەوەی ئەمرۆ دەیبینین ولە کتێبەکاندا دەیخوێنینەوە.
هەربۆیە ئێمە لەم وەرگێڕانەدا ووشەی نێربازی بەکاردەهێنرێت، وە ووشەو ناوی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە لەم کارە بەدوور دەگرین. "وەرگێڕ"

[2] – ئەم فەرموودەیە (حسن لغیرە)ە، وە (ضعیف الاسناد )وە(منکر المتن) واتە سەنەدەکە لاوازە ودەقەکەیشی ناپەسەندە، بەڵام (البانی) بەچەند گەواهێك بە(حسن)ی داناوە ، بڕوانە: (السلسلە الصحیحە: ٦٧٣).
وە(البانی)دەڵێت: ئەم فەرموودەیە(لایدخل الجنە ولد زینە)واتاکەی بەو شێوە ڕواڵەتە نی یە، بەڵکو مەبەست لێی ئەو کەسەیە بەردەوام هەمیشە خەریکی کارێکی زیناکاریە تابەو کارەوە



١

جـا ئەگـەر ئەمـە حـاڵی کـوڕی زینـا بێـت ، کـەخۆی لەخۆیـدا هـیچ تـاوانێکی نـی یـە، تـەنها ئەوەنـدە نـەبێت لـەتوخمێکی شـیس وناپاکـە، هـەر بۆیـە چـاوەڕوانی خێـری لـێ ناکرێـت. جائەگـەر جەسـتەیەك بەحـەرام گـەورە کرابێـت شایسـتەی ئـاگر بێـت. ئـەی ئـەبێ ئەوجەسـتەی کـە بەتوخمی حەرام دروست بووبێ شایستەی چی بێت؟

جـا دەڵـێن: کەسـێ کـاری نێربـازی لەگەڵـدا کرابێـت ، زۆرخـراپترە لـەکاری زینـا ، چـونکە ئەمـەیان زیـاتر شایسـتەی سـزایەو خێربـڕاوو ڕیسـواو سەرشـۆڕترە. جائەگـەر ئەمـە پیشـەی بێـت لەمنـداڵی وپیریـدا ئـەوا خـوای گـەورە سـەرکەوتووی ناکـات لـەهیچ کـار وزانسـتێکدا، تەنانەت ڕێنمایی تەوبەکردنیش ناکات.

***پووختەی پشکنین لەم بابەتەدا:***

ئەگـەر ئـەو کەسـە تەوبـەی نصـوحی یـەکجاری بکـات وپاشـەگەزببێتەوە وەبگەڕێتـەوە سـەر کـاری چـاکەو چـاکەخوازی وخواپەرسـتی. ئـەوا خـودای گـەورە لێـی دەبورێـت وخراپەکاریـەکانی دەسـڕێتەوە و وەلێـی خـۆش دەبێـت ودەچـێتە بەهەشـتەوە، چـونکە خـوای گـەورە بـە تەوبـەکردن وپاشـەگەز بوونـەوە لـە هـەموو تاوانـەکانی خـۆش دەبێـت ، چـونکە سروشـتی تەوبـە کـردن ئەوەیـە کـە هـەموو

---

دەناسـرێتەوە، ئـەو لەقەبـەی لـێ دەنرێـت. جـا پێـی دەڵـێن کـوڕی زینـا. هـەروەکو ئەوانەشـی باوەشـیان بـەدنیا کـردووە پێیـان دەوترێـت"کـوڕی دونیـا" ،وهـەروەکو بەگـەڕۆك وگەشـتیار دەوترێـت "ابـن لالسـبیل"واتـە ڕێبـوار، بـەم چەشـنە دەوترێـت(أولاد الزینـا، ابـن الزینـا) جائەمـە مەبەستی پێغەمبەرە لەم فەرموودەیەدا.

وەئەم فەرموودەیە کـوڕی زینـا کـار ناگرێتـەوە، واتـە کەسـێك لـە جـووت بـوونێکی زینـا لـەدایك بووبێت، وەبـە واتـای زینـا ناوزەدناکرێـت، چـونکە لەبنەڕەتـدا بـێ تاوانـە. وەدەڵێـت لـەم بـوارەدا لە ووتەکانی (ابي جعفر الطحاوی)سوودم وەرگرتووە لە شەرحی ئەم فەرموودەیە.

تاوانێك بــه هاوبــەش وكوشــتنی پێغەمبــەران وجادوگــەری وبــێ بــاوەڕی و...هتد هەر هەمووی دەسڕێتەوە

وەبــەدانایی ودادپــەروەری خــودا ،تەوبــەكار وەك بــێ تــاوان وایــە.[1] وە پــەیمانی داوە كــە كــارە خراپــەكانی تەوبــەكاران بگۆڕێــت بــە چــاكە. وەئــەم یاسایە هــەموو تەوبــەكاران دەگرێتــەوە: (قـل یاعبـدي الـذین أسرفوا علی أنفسهم لاتقنطوا من رحمة الله ان الله یغفـر الـذنوب جمیعـاً إنـه هو الغفور الـرحیم... الزمـر:٥٣) واتــە: ئــەی پێغەمبــەر پێیــان بڵــێ ئــەی ئــەو بەندانــەی كــە تاوانكــارن وتاوانتــان زۆرە ، بــێ ئومێــد وهیــوا بــڕاو مــەبن لەڕەحمــەتی خــودای گــەورە. خــوای گــەورە لــە هــەموو تاوانــەكانتان دەبورێت، چونكە خوای گەورە لێ بوردەو بەخشندەیە.

بەڵام ئەمە تایبەتە بە تەوبەكارانەوە.

## كۆتا شەڕی"ئاخر شەڕی"

(حــافظ أبــو محمــد عبــدالحق الأشــبیلي) ﷺ دەڵێــت: كۆمــەڵێك هۆكــار هــەن كەدەبنــە مایــەی ئــاخر شــەڕی مــرۆڤ لەســەرەمەرگ وكۆتــایی ژیانــدا. لەوانــە: دونیابــازی و پشــت كــردن لــە قیامــەت، بــوێری چاونەترســی لــە ئــەنجام دانــی تــاوان وتاوانكــاری وسەرپێچــیدا. هــۆگری وئــاڵودەبوون بــەتاوانێكی تایبــەتی گــەورەوە كــە دواتــر ڕۆشــنایی ژیــری وجۆشــی دڵ وهۆشــیاریت لــەناو دەبــات، دڵ ودەرون پــەردەپۆش دەكــات وچــیتر ئامۆژگــاری وورریاكردنــەوەی بــێ ســوود دەبێــت. جــا لــەناكاو وكــوت وپڕێكــدا مــردن یــەخانگیری دەبێــت وســەرئەنجامی بەخراپــەكاری و عاقیبەتی شەڕی كۆتایی دێت.

---

[1] - فەرموودەیەكی (مرفوع) لەم بوارەدا هاتووە كە (ابن ماجە: ٤٢٥٠)بە (الأسناد ضعیف)دەیگێڕیتەوە،وە(ان حجر وألبانی) بە(حسن)ی دادەنێن.

هەروەها دەڵێت: دەگێڕنەوە کە یەکێك لەجەردەکانی "ناصر" لە سەرەمەرگدا دەبێت ، کوڕەکەی پێی دەڵێت بڵێ (لا إله إلا الله) ئەویش بەردەوام دەڵێت "ناصر پشت وپەنامە" چەندین جار دووبارەی دەکردەوە وئەو هەرهەمان وەڵامی هەبوو، وەبەکوڕەکەی دەووت:ئەی فلاّن کەس، ناصر تۆ بەشمشێرەکەتدا کوشت و کوشتار دەتناسێتەوە، پاشان مرد.

وە (عبدالحق) دیسانەوە دەڵێت: بە کەسێکی تریان ووت بڵێ"لا إله إلا الله".ئەو لە وەڵامدا دەیوت :لە ماڵی فلاّن کەس ئەو شتەی تێدا چاك بکەن. وە بێستانی فلاّنە کەس وای لێ بکەن . تا مرد.

وە هەروەها دەڵێت: (أبو طاهر السلفي) مۆڵەتی دام ئەم ڕووداوەی لە سەر بگێڕمەوە: کە بە کەسێکیان دەووت لە سەرە مەرگ بڵێ (لا إله إلا الله) ، ئەویش بە زمانی فارسی دەیووت: (دە بە یازدە) واتە (دە کەڕەتی یانزە) ..

وەیەکێکی تر پێیان دەووت بڵێ: لا إله إلا الله... ئەو دەیووت:ڕێگای حمامی منجاب لە کوێ یە؟

وە دەڵێت: ئەم ووتەیەچیرۆکی لە سەر هەیە. دەگێڕنەوە پیاوێك لە بەردەم ماڵەکەیاندا ،ڕاوەستابوو، دەرگای ماڵەکەیان گەورە بوو. لە دەرگای حەمام دەرچوو.لەو کاتەدا کەنیزەیەکی زۆر جوان بە وێدا تێدەپەڕێت وەلە پیاوە دەپرسێت: ڕێگای حەمامی منجاب لە کوێیە ؟ پیاوەکەش بە هەلی دەزانێت و جوانی کەنیزەکە کاریگەری تێدەکات.وە دەیخەڵەتێنێت و دەیەوێت دەست درێژی بکاتە سەری.. دەڵێت ئەمە دەرگای حەمامەکەیە. واتە ماڵی خۆیان. کەنیزەکەش (کچەکە) دەچێتە ژوورەوە. پیاوەکەش بە دوایدا دەڕواتە

ژووره‌وه.کچه‌که هه‌ست ده‌کات فێڵی لێ کراوه ئه‌مه حاڵی کابرایه‌و نیه‌تی خراپه.. به ڕووخۆشی و نازه‌وه ووتی: ئه‌ی نابێت هه‌ندێ خواردن و خواردنه‌وه‌ی خۆش کاره‌که‌مان برازێنێته‌وه. کابراش ووتی: هه‌رئێستا له یه‌ك سه‌عاتدا هه‌رچی ئاره‌زوی ده‌که‌یت بۆتی ده‌هێنم. ڕاسته‌وخۆ به بێ ئه‌وه‌ی ده‌رگاکه‌ی له سه‌ر دابخات ده‌چێت بۆ بازاڕ کرینی شته‌کان. کچه‌که‌ش به هه‌لی ده‌زانێت هه‌ڵدێت.. کاتێ کابرا دێته‌وه ، ته‌ماشا ده‌کات کچه‌که ڕۆیشتووه. و ده‌ستکاری هیچی نه‌کردووه له ماڵه‌که‌دا.ئیتر وێڵ و سه‌رگه‌ردانی ئه‌و کچه ده‌بێت و شه‌و و ڕۆژ به دوایدا ده‌گه‌ڕێت و به کوچه و کۆلانی ئه‌و شاره‌دا تێده‌په‌ڕێت و له به‌رده‌م خۆیه‌وه ئه‌م دێره دووباره ده‌کاته‌وه– به ئومێدی ئه‌وه‌ی ئه‌و کچه گوێی له‌م وته‌یه بێت بیدۆزێته‌وه ده‌ڵێت: (یا رب قائلة یوماً ، وقد تعبت: کیف طریق الی حمام منجاب) ئای ئه‌و که‌سه‌ی ڕۆژێك ووتی: ڕێگای حه‌مامی (مه‌نجاب) له کوێیه. به خوا ماندوو بوم.

ڕۆژێك له ڕۆژان له په‌نجه‌ره‌ی یه‌كێك له باڵه‌خانه‌که‌وه ده‌نگێك دێت و له وه‌ڵامی ئه‌و دێره دا ده‌ڵێ: (هلا جعلت سریعاً إذا ظفرت بها حرزاً علی الدار أو قفلاً علی الباب) واته: ئه‌گه‌ر تۆ ده‌تویست ده‌ست درێژی بکه‌یته سه‌ری با پاسه‌وانێکت له ماڵه‌که‌دا دابنایه. یان قوفلێکت له ده‌رگاکه بدایه. که گوێ بیستی ئه‌م ووته‌یه بوو ئیتر هۆشی لێبڕاو دێوانه بوو.به‌م چه‌شنه مایه‌وه هه‌تا ئه‌م دێره ووشه کۆتایه‌کانی ژیانی بوو تا مرد..

وه دهگێڕنهوه كه (سفيان الثوري) شهوێك بهیانی دهگریا. لێیانی پرسی: له ترسی تاوان دهگرێت؟ ئهویش پوشێكی له زهوی ههڵگرت و، ووتی: تاوان لهمه سوكتره.بهڵام له ترسی ئاخر شهڕی دا دهگریم.

جا ئهمه گهورهترین شارهزای و دانای یه. كه مرۆڤ لهوه بترسێت كه تاوان سهرقاڵی نهكات و دوا كاری نهبێت له كاتی مهرگ دا. و سهرئهنجام عاقیبهت شهڕی كات.

وه (إمام أحمد) دهگێڕنهوه كه له (إبي درداء) وه له كاتی سهره مهرگ له هۆش خۆی چوو، كاتێ به ئاگا هاتهوه ئهم ئایهتهی دهخوێندهوه (وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُواْ بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ....الأنعام: ١١٠) واته " ئهو كاتهی دڵ و چاوهكانیان هه‌ڵدهگێڕنهوه.ههروهكو چۆن یهكهمجار له سهرهتاوه باوهڕیان نههێناوه به گهورهیی خودا و ڕاستی پێغهمبهرﷺ. ئێمه جارێ وازیان لێ دههێنین تا له ستهم سهركهشی خۆیاندا ڕۆبچن.."

ههروهها دهڵێت: ئاخر شهڕهی ئهمه تووشی ئهو بروادارانه نابێت كه دڵ و دهروونیان پاك و ساغ و باوهڕیان دامهزراوه و ملكهچی و گوێڕایهڵی خوداو پێغهمبهرن (د.خ) وه خهریكی كاری چاكه و چاكه خوازین بهڵكو كهسانێك دهگرێتهوه. كه ئالودهی تاوانه گهورهكان و سهرپێچی كارن و سورن له سهر تاوانكاری و پشت كردن له تهوبهكاری. كه ئهمانه دهبنه نێچیری شهیتان و دارو دهستهی و عاقیبهت شهڕیان دهكهن.

## پشت كردن له ئایین له پێناوی ئافرهت

(عبدالحق) دهڵێت: دهگێڕنهوه له (مصر) دا كهسێك ههبوو بهردهوام هۆگر و بانگ بێژی مزگهوت بوو ههموو نوێژێكی له مزگهوت

و ، بە جەماعەت ئەنجام دەدا. جارێکیان چوو بۆ سەر بڵندگۆی مزگەوت (منارە) بۆ بانگ دان. لە تەنیشت مزگەوتەکەوە. ماڵێکی گاور هەبوو (مەسیحی) .لەو کاتە کچێکی شۆخی ئەو ماڵە دێتە حەوشەکە.کابراش لە سەروی منارەکەوە دەیبینێت و شێت و شەیدای دەبێت ڕاستەخۆ دادەبەزێتە خوارەوە و مزگەوتەکە بە جێ دەهێڵێت و دەچێتە ماڵی گاورەکە. کچەکە کابراکە دەبینێت کە دێتە ژوورەوە پێی دەڵێت: کابرا چیت دەوێ ؟ کابراکەش دەڵێت من تەنها تۆم دەوێت ! کچەکەش پێی دەڵێت: بۆچی یە..؟

کابراش دەڵێت: چونکە تۆ منت شێت و شەیدا کردووە و دڵمت داگیر کردوە..!

کچەکەش دەڵێت: من هەرگیز کاری ناڕەوات لە گەڵ ناکەم..

کابراش دەڵێت: من دەمەوێت بتخوازم و مارەت بکەم..

کچەکە دەڵێت: من کچێکی گاور و نەسرانیم. تۆش کەسێکی مووسڵمان. باوکم بە هیچ شێوەیەك نامدات بە موسڵمان..

کابرا دەڵێت: من دەبمە نەسرانی و گاور.بەس تۆم بدەنێ.

کچەکەش دەڵێت: گەر ببیت بە گاور ئەوا منیش ڕازی دەبم.

کابراکە بوو بە نەسرانی " گاور" وە پشتی کردلە ئیسلام.وە لەو ماڵەدا مایەوە پێش ئەوەی بیخوازێت هەر لەو ڕۆژەدا دەچێتە سەربانی خانووی ماڵەکە و دەکەوێتە خوارەوە و دەمرێت. وە دەستی ناگات بە کچەکە. و ئاینی خۆیشی لە دەستدا و قیامەتیشی دۆڕاند.

.. وە هەروەها دەڵێت: دەگێڕنەوە. کە کابرایەك هۆگری برادەرێکی دەبێت. وە زۆر تامەزرۆی دەبێت – خۆشەویستی ئەو

کەسە دڵ و دەرونی داگیر دەکات. تا وای لێهات لە تاواندا توشی نەخۆشی بوو. لە جێگە دا کەوت. وە ئەو برادەرەی سەردانی نەدەکرد و نەدەهات بۆلای. خەڵکی ئەم ڕووداوەیان بۆ باس کرد. ئەویش بەڵێنی پێدان کە سەردانی بکات. ئەم هەواڵەیان گەیاندە کابرا نەخۆشەکە. لە خۆشیدا چاك بووەوە و زۆر دڵخۆش بوو هەر باسی دەکرد و چاوەڕوانی هاتنی برادەرەکەی دەکرد.. لەم ساتانەدا بوو هەواڵیان بۆ هێنا کە ئەو پیاوە پاشگەز بووەتەوە و نەهاتوو. هەواڵدەرەکە ووتی. تا نیوەی ڕێگا هاتوو دواتر ووتی دەگەڕێمەوە. منیش زۆرم لێکرد کە نەگەڕێتەوە. ئەویش لە وەلامدا ووتی: ئەو پیاوە بە هاتنی من دڵخۆش بووە و لە لای خەڵکی باسی کردووم و ناوی زڕاندووم. منیش خۆم ناخەمە جێگەی گومانی خەڵکیەوە و نایەم. کابرا بە بیستنی ئەم هەواڵە لە پەل و پۆ کەوت و بە تەواوی شێواو لە جێگادا کەوت. ونیشانەکانی مردنی لە سەر و چاویدا بە دیار کەوت. لەبەر خۆیەوە دەیووت:

أسلم يا راحة العليـــل ويا شفا الدنف النسحيل

رضاك أشهى إلى فؤادي من رحمة الخالق الجليل

واتە:

سەلامەت بی ئەی حەوێنەرەوەی نەخـــــۆش

ئەی چارەسەری جەستەی دەردەداری تێکشکاو

دڵی من هێند تامەزرۆی ڕەزامەندیتــــــــە

زۆر زیاتر لە تامەزرۆی بۆ ڕەحمەتی خالقی جەلیل

منیش ووتم: ئەی فلان کەس لە خوا بترسە و یەکسەر بەجێم هێشت نەگەیشتمەوە دەرگای ماڵەکەیان و گوێم لە فیزاحی مەرگی

بوو. جا پەنا دەگرم بە خوای گەورە لە عاقیبەت خراپی.. و ئاخر شەڕی.

## سزای نێرباز لە دونیا و قیامەت

تاوانی نێربازی لە گەورەترین تاوانەکانە. هەر بۆیەش سزاکەی لە گەورەترین و سەخترین سزایە.چونکە ئەم تاوانە بە پێچەوانەی سروشتی مرۆڤایەتیە.

جا ئایە سزای نێربازی گەورەترین و سەخترە یان سزای زینا.؟

لەم بارەیەوە زانیان جیاوازن و ڕاوبۆچونی تایبەتیان هەیە.

ڕای یەکەم:

جا هەندێ لە هاوەڵان و زانایان پێیان وایە کە سزای نێربازی زۆر سەختر و گەورەترە لە سزای زینا و کوشتن. جا ئەنجامدەری خێزاندار بێت یان ڕەبەن. لەو هاوەڵ وزانایانەی لە سەر ئەم ڕاو بۆچونەن:

(أبوبكر الصديق و علي بن أبي طالب و خالد بن وليد و عبدالله بن زوبير و عبدالله بن عباس و جابر بن زيد وعبدالله بن معمر و الزهري و ربيعة بن أبي عبدالرحمن و مالك و أسحاق بن راهوية و امام أحمد له پوخترين بۆچونيدا وه امام الشافعي له يەكێ له بۆچونەكانيدا ) .

ڕای دووەم:

وەهەندێکی تر لەزانایان پێیان وایە سزای نێرباز هاوشێوەی سزای زینایە. لەوانە: (عطاء بن أبي رباح، حسن البصري، وسعيدبن المسيب ، ابراهيم النخعي ،وقتادة الاوزاعي، وشافعی لە ڕواڵەتی ڕێبازەکەیدا ، والأمام احمد لەیەکێکی تر لەبۆچوونەکانیدا، وأبو يوسف ومحمد.)

ڕای سێیەم:

وەئەوانـــەی کـــە پێیـــان وایـــە ســـزای نێربـــازی کـــەمترە لەســـزای زینـــا ئەوانیش بریتین لە: (حاكم وأبو حنيفه) .

وەلــە درێــژەی هێنانـــەوەی بەڵگـــە بـــۆ بووچـــوونەکانیان دەڵـــێین: ئـــەم تاوانـــە سەرپێچـــی ویـــاخی بوونـــە، خـــواو پێغەمبـــەری خـــودا هـــیچ جـــۆرە ســـزایەزکیان بـــۆ دیـــاری نـــەکردووە، تـــەنها ســـزای "التعزیـــر"نـــەبێت. هاوشـــێوەی خـــواردنی گۆشـــتی مـــردوو وخواردنـــەوەی خـــوێن گۆشـــتی بەرازە.

هـــەروەها دەڵـێن: ئـــەم تاوانـــە لـــە ئەنـدامێکی جەســتەی مرۆڤـدا ئـــەنجام دراوەکـــە زۆر ناشیاوناسروشـــتی یـــە، بـــەڵکو ئەمـــە تەنانـــەت لای ئـــاژەڵیش قێزەوونـــە ، وەحـــەدی لەســـەر نـــی یـــە وەك جـــووت بـــوون لەگـــەڵ گوێدرێـــژو شتی تردا.

هـــــەروەها لەدرێـــــژەی بەڵگـــــە هێنانـــــەوەدا دەڵـــــێن: لـــــە بنـــــەماکانی شـــــەریعەتدا هـــاتوە ئەگـــەر تاوانێـــك سروشـــتەکەی پاڵنـــەرو تەبیعـــەتێکی چەســـپاوبێت، ئـــەوا حـــەددی لەســـەر نـــی یـــە، وەئەگـــەر بەتەبیعـــەتێکی خـــوازراوەوە ئـــەنجام درابێـــت ئـــەوا حـــەددی لەســـەرە. هـــەر بۆیـــە دەبیـــنین زینـــاو دزی ومـــەی خـــواردن حـــەددیان لەســـەرە. بـــەدەر لەئـــەنجام دانـــی خـــواردنی گۆشـــتی مردارەوبـــوو وەخواردنـــەوەی خـــوێن وخـــواردنی گۆشـــتی بەراز..

وەهـــەر لـــەم ســـۆنگەیەوە ووتویانـــە: حـــەد نـــی یـــە لەســـەر جـــووت بـــوون لەگـــەڵ ئـــاژەڵ و خـــواردنی گۆشـــتی مردارەوەبـــوو ،کەچـــی لەبەرامبـــەردا خـــوای گـــەورە جـــووت بـــوونی پیـــاو بـــۆ پیـــاو"نێربـــازی" زۆر بـــەقێزەون پێنـــاس کـــردووە، وەبەهـــەمان شـــێوەش بـــۆ پیاوێـــك داوابکـــات پیـــاوانی تـــر

بێنە لای و کاری سێکسی لەگەڵدا بکەن، بە پێچەوانەی زیناوە کەهەر دوولا حەز بەو کارە دەکەن ودەیخوازن.

وەدەڵێن: جا ئەگەر یەکێك لەو دوو کەسی هاوڕەگەز چێژی لەیەکتری وەرگرت ، ئەوا حەددیان لەسەر نی یە. بۆنمونە ئەگەر دووئافرەت چێژیان لەیەکتری وەرگرت.

بەلاَم زۆرینەی هاوەلاَن وپیاوچاکان کۆکن لەسەر ڕاوبۆچوونی یەکەم وەلەم بارەیەوە دەڵێن: تاوانی نێربازی گەورەترین وقێزەونترین جۆری تاوانە مرۆڤایەتی بەخۆیەوە بینیبێت لەپاش بێ باوەڕی. تەنانەت دوور نی یە زۆر گەورەتربێت لەتاوانی کوشتنیش.

وەهەروەها دەڵێن: هیچ پێڕێك وگەلێك لە پێش گەلی "لوط"دا نەبووە بەم کارە قێزەونە گیرۆدەو سەرقاڵ بووبێتن، هەر بۆیە خوای گەورە بەسەخترین وتوندترین شێوە سزای دان. کەلە پێش وپاشی ئەمانە هیچ گەلێکی تر بەم شێوەیە سزا نەداوە کە هەموو شێوەو شێوازەکانی سزاو تیاچوونی تێدا کۆکردنەوە هەر لەسزای بەهیلاك بردن وبەردباران کردن و"واتە لەئاسمانەوە بەردی باران بەسەریاندا" وەبەناخی زەویدا نغرۆی کردن وشارو گوندەکانیان هەلاَوگێڕکردن بەناخی زەویدا بردیانیە خوارەوە کردیانە پەند وعیبرەت بۆ هەموو جیهان ، چونکە جۆرە تاوانێکیان ئەنجام ئەدا کە زەوی لەهەژمەتدا خەریك بوو لەت دەبوو، وەسەرجەم فریشتەکان بەرەو قولاَی ئاسمانەکان هەڵهاتن لەترسی ئەو دیمەنە شازە وناشیرینەی کە دەیان بینی. زەوی شکاتی حاڵی لای خوای گەورە کرد وەچیاکان خەریك بوو وردوخاش دەبوون. جا کوشتنی کەسێك باشترە لەوەی کە نێربازی لەگەڵدا بکرێت،هەتا ئەو کاتەی بەستەم دیدە دەکوژرێت شەهید

دەبێت وسوودمەندی قیامەت دەبێت. بەڵام ئەگەر ئەو کارەی پێ کرا ئەوا بەهەموو شێوازەکان کوشتوویەتی، کوشتنی کەرامەت وشکۆمەندی مەردایەتی وجوامێری. وەبەڵگە لەسەر ئەم ووتانە ئەوەیە کە سزای کوشتن واتە بکوژ دەکەوێتە سەر خزم وکەس وکاری کوژراو یان لێی خۆش دەبن یاخود دەیکوژنەوە یاخود خوێنی لێ دەسێنێت وئاشتەوایی دەکەن.

بەڵام ئەمانە هیچی نێرباز ناگرێتەوە، بەڵکو کۆدەنگییەك هەیە لە هاوەڵان وزۆرینەی زانایان کە کوشتن بەتەنها سزای نێربازییە، هەروەکو لەفەرمودەی پێغەمبەردا هاتووە. کەهەموو هاوەڵان وخەلیفە ڕاشیدینەکان کاریان پێ کردووە. وەسەلماوە کە (خالد بن الولیدﷺ) لە چواردەوری گوندنیشینەکانی عەرەب پیاوێکی دۆزیوەتەوە کە هاوشێوەی ئافرەت شوودەکاتوە پیاوان دەچنە لای. هەربۆیە لە نوسراوێك ئەم باسە ڕەوانەی خەلیفە (ابو بکری صدیقﷺ) دەکات کەچی دەربارەی ئەم حاڵەتە بکەن. خەلیفە أبو بکر ڕاوێژی بە زۆرینەی هاوەڵاکان کرد لە نێوانیاندا ڕاوبۆچوونی (علی بن أبي طالبﷺ) لەهەر هەموویان توندوتیژتر بوو ،کەدەیووت: لە هەموو جیهاندا تاکە گەلێك ئەم بەدڕەوشتیەی ئەنجام داوە لەلای هەموانیش ئاشکرایە کە خوای گەورە چی بەسەردا هێناون، جا پێم وایە ئەوکەسە بسوتێنرێت. خەلیفە "أبو بکرﷺ" لەوەڵامدا ڕاوبۆچوونەکەی "علی" پەسەند کردو بۆ "خالید"ی ناردەوە ، ئەویش بەو کا رە هەستا.

وە (عبدالله بن عباسﷺ) پێی وایە: ئەو بەد ڕەوشتیە لەسەرووی بەرزترین خانووی ئەوشارەوە بەربدرێتە خوارەوەپاشان بەردباران بکرێت. وەئەم بۆچوونەی لەو سزایەوە وەرگرتووە کە خوای گەورە

سزای گەلی "لوط"ی پێدابوو. وە "عبدالله" ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: **(من وجد تموه یعمل عمل قوم لوط فأقتلوا الفاعل والمفعول به)** [1] واتە: هەر کارێکی نێربازیتان بینی ، بکەرو پێکراوەکە بکوژن.

هەروەها دەڵێن سەلمێنراوە کە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: **(لعن الله من عَمَل عمل قوم لوط، لعن الله من یعمل عمل قوم لوط، لعن الله من عَمَل عمل قوم لوط.)** [2] واتە: خوای گەورە نەفرەتی لەو کەسانە کردووە کە کردەوەی گەلی "لوط"دەکات، خوای گەورە نەفرەتی لەو کەسانە کردووە کە کردەوەی گەلی "لوط" دەکات، خوای گەورە نەفرەتی لەو کەسانە کردووە کە کردەوەی گەلی "لوط" دەکات.

لێرەدا پێغەمبەرﷺ سێ جار لەیەك فەرموودەدا نەفرەت لەزینا کار بکات ،هەرچەندە نەفرەتی لە بڕێکی زۆری تاوانە گەورەکان کردووە ،بەلاّم تەنها لەیەك جار تێ نەپەڕیوە، کەچی سێ جار نەفرەت لە نێربازان دەکات.

جا لەڕووی سزای ئەو تاوانەوە سەرجەم هاوەلاّن کۆك وهاودەنگن لەسەر کوشتنی نێرباز، بەلاّم ناکۆك بوونە لە شێواز وچۆنیەتی کوشتنەکەی. هەرچەندە هەندێ لەخەڵکی بەهەڵە لەمە گەیشتوون وایان زانیوە جیاوازبوونە لەسەر حوکمەکەی، نەخێر لەڕاستیدا تەنها ناکۆکیان لەسەر شێوازی کوشتنەکەی بووە.

---

[1] – ئەم فەرموودەیە(حسن)ە،(ترمذي: ١٤٥٦ )و(ابوداود ٤٤٦٢ )و(ابن ماجە:٢٥٦٣)وە (ألبانی)بە (حسن)ی داناوە.

[2] –ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(احمد :٣٠٩/١) گێڕاویەتیەوە.

وەدەڵێن: گەر تێبینی ئەم ئایەتە پیرۆزە بکەین کە دەفەرمێت: (وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً... الإسراء:٣٢) واتە:هەرگیز نزیك نەکەونەوە لە زینا وهۆکارەکانی بەروزینا ڕۆیشتن، چونکە بەڕاستی ئەوە تاوانێکی گەورەیە ڕێچکەیەکی هەڵەو ناپەسەندە.

هەروەها سەبارەت بەنێربازە دەفەرمێت: (أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّن الْعَالَمِينَ... الأعراف: ٨٠) واتە:ئایا ئێوە کاری فاحیشەو خراپەکاری وئارەزووبازی ئەنجام دەدەن بە شێوەیەك کە وێنەوهاوشێوەتان نەبووە لەنێو مرۆڤ وجیهاندا.

جا تێبینی جیاوازی نێوان ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە بکە، خوای گەورە لەئایەتی یەکەمدا زینای بەیەکێك لە جۆرەکانی فاحیشە دەداتە قەڵەم، بەڵام لەئایەتی دووەمدا سەرجەم ناوی فاحیشەی لە نێربازیدا کۆکردۆتەوە.

واتە پوختەی فاحیشە بریتی یە لەم بەدکارو بەدڕەوشتیە واتە نێربازی ، چونکە ناشیرینی وقێزەونی ئەم بەدکاریە زۆر ناسراوە وەهەموو کەسێك دەیزانێت. وەئەمە هاوشێوەی ووتەی فیرعەونە کەلەم ئایەتەدا دەردەکەوێت: (وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ... الشعراء:١٩ ) واتە: ئەوەندە کارەکە دیارو ناسراوە بەخراپە، هەموو کەسێك دەیزانێت چیت کردووە.

هەروەها خوای گەورە دەربارەی ئەم بەد ڕەوشتیە دەفەرمێت: ((مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّن الْعَالَمِينَ... الأعراف: ٨٠) ) واتە: کەس لەپێش ئێوە ئەم بەدڕەوشتیەی ئەنجام نەداوە. پاشان دێتە سەر دەست نیشان کردنی ئەو بەدڕەوشتیەی کە شەرمەزارترین

وریسـوـاترین کـاره کەمرۆڤایـەتی بەخۆیـەوە بینیبـێتی کەدەفـەرمێت: (إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَـالَ... الإعـراف:٨١) واتـە: ئێـوە دەچن پیـاو لـەپیاو مارە دەکەن ودەچنە لای یەکتری.

پاشـان مەبەسـتی ئـەو کـارە چـەپەڵەیان بـۆ دەخاتـە ڕوو کـە نێربـازی یـە. وەئـەم کـارە دەبێتـە مایـەی دەسـت بـەرداربوون لـە هاوسـەرگیری وپشـت گـویّ خسـتنی هاوسـەرەکانیان کەلـەم پرۆسـەیەدا واتـە هاوسـەرگیری و جـووت بوونیـان پیرۆزتـرین وڕێزدارتـرین دروسـت کـراوی خـوای گـەورە دێتـە بـوون کەمرۆڤـە، کەچـینی پێغەمبـەران وپیـاو چـاکانی تێدایـە، جگـە لەدەسـت خسـتنی ژیـانێکی ئاسـودەیی چـێژو خۆشـی بـۆ هـەردوولا ، کەلـە تکـانی شـەرم ونـەمانی شـکۆمەندی مـرۆڤ، مەگـەر خـودا خۆی بزانێت چەند خراپەی مەترسیدار هەیە لەم بەد ڕەوشتیەدا.

جگـە لەهـەموو ئەمانـە نێربـازی پێچـەوانەی سروشـت وپـاکی و بـیّ گـەردی مرۆڤایـەتی وژیانـە کەلـە سـەری پەروەردەبوونـە ، کەسـەرجەم بوونـەوەریش لەسـەر بنـەمای نێرومـیّ دروسـت بوونـە. کـە ئـەمان بـەم کارەیـان مـرۆڤ لـەڕێزو پلەوپایـەی بـەرزی وپـاکیو شـکۆمەندی دادەگرنـە ڕیـزی کـەمتر لـەئاژەڵان. لەهـەمان کاتـدا سروشـت وفیترەتـی مرۆڤایـەتی پێچـەوانەو ئـاوەژوو دەکەنـەوە، هەربۆیـە خـوای گـەورە شـارو خانووەکانیانی سەروژێرکردو بەناخی زەویدا بردوونی.

دواتـریش خـوای گـەورە بـاس لـەوە دەکـات کەبـەم تاوانـەیان سـنووریان شـکاندووەو زیادەڕەویـان کـردووە لەتاوانـدا ، کەدەفـەرمێت: (بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ... الإعراف:٨١) .

جـا بـەراوردێك بکـە ئایەتەکـە لـەتاوانی زینـادا شـتی لـەم شـێوەیە هـاتووە؟! پاشـان خـوای گـەورە بەدەسـتە ئایـەتی پـیرۆز

ناوزەردیـــــان دەکـــــات وکـــــە هـــــیچ پێڕێـــــك وگـــــەلێك بـــــەم چەشـــــنە ســـــەرکۆنەو ناشـــــیرین نـــــەکراوە کەدەفـــــەرمێت: (وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَت تَّعْمَلُ الْخَبَائِثَ... النبيـاء:٧٤) واتـە: ئێمـە پێغەمبـەر"لـوط"مـان ڕزگـارکردن لـەو شـارەی کـە دانیشـتوانەکەی کـاری پیسـیان ئـەنجام داوە...... ( (إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمَ سَوْءٍ فَاسِقِينَ...الأنبيـاء:٧٤) ) واتـە: بەڕاسـتی ئـەوان پێڕوگـەلێکی ستەمکارو خراپەو بەدڕەوشت بوون.

(رَبِّ انصُرْنِي عَلَى الْقَوْمِ الْمُفْسِدِينَ... العنكبـوت:٣٠) واتـە: خودایـــــە ســـــەرکەوتووم کەبەســـــەر ئـــــەو گەلـــــەی کەخراپـــــەکای بلاّودەکەنـــــەوە... وەتەنانـــەت فریشـــتەکانیش بـــە ســـتەمکاران نـــاوی دەبـەن: (إِنَّا مُهْلِكُوا أَهْلِ هَذِهِ الْقَرْيَةِ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا ظَالِمِينَ... العنكبـوت:٣١) واتـە: ئێمـە هـاتووین خـەڵکی ئەوشـارە بـەهیلاك بـەرین وشارەکە کاول بکەین چونکە دانیشتوانەکەی ستەمکارن.

تەنانـەت کاتێـك حـەزرەتی ایـبراهیم"س.خ"دەیـەوێت بـەرگرییان لـێ بکـات ولەسـەر ئەوسـزایە بـدوێت ، فریشـتەکان ڕێگـری لـێ دەکـەن ودەڵـێن مۆڵـەت ودەرفـەرتی گفتوگـۆکردن لەسـەر ئـەم کـارە نـەماوە وەسزای خودا بۆیان بەڕێوەیە. (يَا إِبْرَاهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا إِنَّهُ قَدْ جَاء أَمْرُ رَبِّكَ وَإِنَّهُمْ آتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ...هود:٧٦) .

تەنانـەت پیسـی وچڵێسـی ئـەو گەلـە لـە ئاسـتێکدا بـوو کـە هـیچ کەسـێك لەدەسـتیان دەربـاز نـەدەبوو لـەم کـارەدا. وەکاتێـك هـەواڵیان بیسـت کـە چـەند پیـاوێکی ڕوخسـار جـوان میـوانی حـەزرەتی "لـوط"ن ڕاسـتەوخۆ هێرشـیان هێنایـە سـەر ماڵەکـەی و ویسـتیان دەسـت درێـژی بکەنـە سـەریان لـە دیمـەنێکی ئەوپـەڕی بـێ شـەرمیدا. بەناچـاری

حەزرەتی "لوط"لە میانەی بەرگیری کردن گفتوگۆکردنی لەگەڵ میوانە بەڕێزەکانی کەچەکانی خۆی پێدان گەر بەشێوەیەکی ڕاست ودروست مارەیان بکەن وببنە هاوسەریان، بەلاَم دەست درێژی نەکەنە سەر میوانەکانی وشەرمەزاری نەکەن. ئایا ئێوە پیاوێکی مەردو جوامێرتان تێدا نی یە؟

(يَا قَوْمِ هَـؤُلاء بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ فَاتَّقُواْ اللّهَ وَلاَ تُخْزُونِ فِي ضَيْفِي أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ...هود:٧٨) .

بەلاَم لە وەلاَمدا زۆر بێ شەرم وسەرکەشانە مەبەستی گلاَوی خۆیان دەخەنە ڕوو، کەدەڵێن ئێمە هیچ مافێك ومەبەستێکمان کچەکانت نی یە، وەتۆ باش دەزانیت کە ئێمە چیمان دەوێت وکێمان مەبەستە. (لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ...هود:٧٩) .

حەزرەتی "لوط"زۆر مەردانە تا سەر ئێسقان بەرگیری لەمیوانەکانی دەکرد لەژێر فشاری گەلەکەی وناچاری وبێ دەرفەتی بەئاخ وکەسەرێکی زۆرەوە دەڵێت: (قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ...هود:٨٠) واتە: پێیانی ووت: خۆزگە من هێزێکم دەبوو،یان لەخۆتان هاوکارێکم دەبوو یاخود پەنایەکم شك ببردایە هەتا هانام بۆ ببردایە وتۆڵەم لێتان بکردایەتەوە.

جا میوانەکانی کە نێردراوی خوای گەورە بوون لەسەر ڕوخساری پیاوان هاتبوون. ڕاستی ومەبەستی هاتنەکەیان بۆ "لوط" ئاشکراکرد وهێوریان کردەوە کە ئەوان ناتوانن دەست بگەیەننە ئێمە. (قَالُواْ يَا لُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُواْ إِلَيْكَ...هود:٨١) .

پاشتر پێیان ڕاگەیاند کە سزای خوای گەورە بەڕێوەیە بۆ ئەم گەلە ستەمکارە، وەکات وساتی ئەم سزایەیان پێ ڕاگەیاند، هەروەها لیستی ڕزگاربووەکانیان پێدا لەم سزایە. کە پێڕی باوەڕدارانە جگە لە هاوسەرەکەی کەتیاچووەکانە بەنهێنی دەبێت شار چۆڵ بکەن: (فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ وَلاَ يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلاَّ امْرَأَتَكَ إِنَّهُ مُصِيبُهَا مَا أَصَابَهُمْ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ...هود:٨١).

جا حەزرەتی "لوط"ویستی زووتر کارەساتەکە پێش بخات، بەڵام فریشتەکان پێیان ڕاگەیاند کاتی سەعاتی سفر زۆر نزیکە بۆئەو ڕووداوە. جاماوەی دەرچوونی یارانی "لوط"لەو شارەو وێران بوونی تەنها ماوەی نێوان بەری بەیان وخۆرهەڵهاتن بوو چیتر ئەو شارە بۆ یەکجاری خاپوورکراو سەرەوژێرکرایەوە.

لە پێشدا خوای گەورە فەرمانی بەحەزرەتی "جبریل"دا کە فریشتەی نزیکی خودایە ، بەوەی کەلە ڕەگ وڕیشەوە ئەو شارە هەڵکەنێت وبەروە قوڵای ئاسمانەکان بیانبات، تەنانەت فریشتەکانی ئاسمان گوێیان لە وەڕینی سەگەکان وزەڕینی دەنگی گوێدرێژەکانیان بوو، ئەوەندە بەرز کرایەوە بەسەرووژێری بەناخی زەویدا بران. (فَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ...هود:٨٢) .

پاشتر بەردمان باران بەسەریاندا ، وەکردمانە نمونەو پەندو عیبرەت بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی ، تەنانەت شوێنی کارەساتەکەشمان کردە سەرەڕێی کاروان چییان وڕێبواران تا بەبینینی شوێنەوارەکەیان پەندو عیبەرت وەربگرن. (إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ

لِّلْمُتَوَسِّمِينَ * وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ * إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّلْمُؤمِنِينَ... الحجر:٧٥-٧٧) واته: ئەم بەسەرهاتە بەڵگەو پەندوعیبرەتە بۆ کەسانێك کە پەندو ئامۆژگاری وەربگرن ،بەتایبەتی شوێنەواری ئەو رووداوە لەسەر رێگای کا روان چییانە تا هەمووان پەندی لێ وەربگرین. وەئەمە بەڵگەیە بۆ بڕواداران کە خوای بەهێزیتان چۆن تۆڵە دەسێنێت.

سەرکەشی وگومڕایی وئارەزووبازی ژێری شێواندبوون ، بینایی کوێر کردبوون، دڵ ودەرونیانی پەردەپۆش کردبوو، زۆر لەئاژەڵ ئاست نزم وکەمتر بوون تا بەو دەردە چوون. کەبەهەمیشەیی شادی نێو ژانەلاکانی دۆزەخ بوون و لەنێو ئاگرو سزاو سوتاندا بیری ئەو چێژو خۆشیەیان دەخرێتەوە کە چی بەدڕەوشتیەکیان ئەنجام داوە. (اصْلَوْهَا فَاصْبِرُوا أَوْ لَا تَصْبِرُوا سَوَاء عَلَيْكُمْ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ... الطور:١٦) واتە: ڕۆبچن لەنێو ئاگری دۆزەخدا ،جا خۆڕاگر دەبن لەنێو ئاگری دۆزەخدا یان خۆڕاگر نابن هەروەك یەك وایە ، دڵنیابن ئەمە تۆڵەی بەد ڕەوشتیەکەتانە کە ئەنجامتان داوە لەدونیادا.

پاشان خوای گەورە لەسیاقی ئایەتەکەدا ، وەپاش گێڕانەوەی وردەکاریەکانی ئەو کارەساتە ،بەشێوەیەکی هەڕەشە ئامێز رووردەکاتە ئەگەری دووبارە بوونەوەی ئەم کارەساتە گەر بێتو هاوشێوەو هاوکارانی ئەو بەدڕەوشتیە سەر هەڵبداتەوە لە نێو ئادەمیزاد دا. کەدەفەرمێت: (وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ...هود:٨٣) واتە: ئەم سزاو کارەساتە دوور نی یە دووبارە ببێتەوە،

بەدووبارەبوونەوەی خودی ئەو تاوان وکارەساتەی گەلی"لوط"لە نێو مرۆڤایەتیدا.

## گفتوگۆیەك لەسەر بەڵگەكان

گفتوگۆیەك لەسەر بەلگەی ئەوكەسانەی كەپێیان وایە سزای نێربازی كەمترە لەسزای زیناكاری.

ئەوان پێیان وایە كە: نێربازی تاوانێكەو سەرپێچی یەكە خوای گەورە هیچ سزاو حەدێكی بۆ دیاری نەكردووە.

لە وەلامدا دەڵێین: لە چەند ڕوویەوە شیكای ئەم بۆچوونە دەكەین:_

١. پێغەمبەری ئازیزﷺپەیامبەری خودایەو ڕۆشنكارو شیكاری فەرمانەكانی خوای گەورەیە، جا سزای ئەم تاوانە بەلای پێغەمبەری خوداوە بریتی یە لەكوشتن ،وەك لەچەند فەرموودەیەك ڕوونمان كردەوە. جاهەرچەندە لەقورئاندا دەقێك نەهاتووە لەسەری ،بەلام لەسونەتدا سەلمێنراوە.

٢. ئەگەر پێتان وایە لەم بابەتەدا سونەت وەرناگیرێت ،كەواتە ناكرێت بەردباران كردنی زیناكاریش بكرێت، چونكە تەنها لەسونەت وفەرموودەكاندا هاتووە. وەئەگەر ووترا بەردبارنكردنی زیناكار وەك دەق لەقورئاندا نەهاتووە،بەلام حوكمی هەر ماوە ،چونكە ئایەتەكان وەك دەق نەسخ بوونەتەوە نەك وەك حوكم. ئەوا دەڵێین: كەواتە نابێت حەد لەمەی خۆر بدرێت!!

٣. ڕەدکردنـــەوەی بەڵگەیـــەکی دیـــاری کـــراو ،واتـــای ڕەدکردنـــەوەی سـەرجەم بەڵگـەکان نـی یـە لەکاتێکدا ئـەو بەڵگەیـەی ئێـوە پشـتی پـێ دەبەستن ،ئێمە هەڵمان وەشاندەوە!....

بـــەڵام ئـــەو ووتەیـــەی کـــەدەڵێت: ئـــەم تاوانـــە بـــەکارهێنانی کـــاری سێکســی یــە لــە ئەنـدام وشـوێنێکی جەسـتەی مـرۆڤ کەلەگـەڵ سروشــتدا ناگونجێـت وخـوازراو نـی یـە، وەهاوشـێوەی لای خـوای گـەورە وەك چـوونە لای ئاژەڵ وئافرەتی مردوو وایە، کە خوای گەورە لای پەسەند نی یە.

لە وەڵامدا دەڵێین:_

أ. ئەمـــە قیاســـێکی ناڕەوایـــە ، بـــەدەقی فـــەرموودەی پێغەمبـــەر وکۆدەنگی هاوەڵان ڕەدکراوەتەوە.

ب. قیـاس کردنـی جـووت بـوون لەگـەڵ کـوڕێکی جوانکیلـە کـە فیتنـەو ئاشـوبەکەی لەسـەرووی جـووت بوونـە لەگـەڵ گوێدرێـژو ئـافرەتی مردوودا، ئەمە خراپترین قیاسە.

ج. ئـەم ووتەیـە لەگـەڵ سروشـتدا ناگونجێـت وە لای خـوای گـەورە پەسـەند نـی یـە وڕەد دەکرێتـەوە، چـونکە هـەر کارێـك خـودا پێـی پەسـەند نـەبێت لەگـەڵ خـودی سروشـتی مرۆڤـدا ناگونجێـت ومـەرج نـی یـە سـزای لەسـەر نـەبێت. ئەمـە هاوشـێوەی ئەنجامـدانی کـاری سێکسیە لەگەڵ دایك وخوشك وکچدا. کە سزاکەی کوشتنە.

جـا ئەمـە یەکێکـە لـەڕاکانی (أحمـد) وڕاوبۆچـوونی (اسـحاق بـن راهویـە) و پێڕێکـی زۆر لـە "اهـل الحـدیث"، جـا ئـەو کەسـە کوڕبێـت یـان پیاو.

وە (ابــو داود) و (ترمــذي) لـــە (بــراء بــن عــازب) دەگێڕنـــەوە کـەدەڵێت: (لقیـت عمـي ومعـه الرایـة، فقلـت الی أیـن تریـد؟ قـال: بعـثني

**رسول اللهﷺ الى رجل نكح امرأة أبيه من بعده ان أضرب عنقه واخذ ماله.)** [1]واته: براء دەڵێت: مامەم پێگەیشت دەبینم ئاڵایەکی بەدەستەوەیە ، پرسیم بۆ کوێ دەچیت؟ ووتی: پێغەمبەری خودا ناردومێتی بچم کابرایەك بکوژم وماڵەکەشی بهێنم ، چونکە لەدوای مردنی باوکی باوەژنی خۆی مارەکردۆتەوە.

وە (ترمذي) لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت: ئەم فەرموودەیە "حسن"ە، وە (جوزجان) کەدەکاتە مامی"براء"دەڵێت: ئەو پیاوە ناوی (حارث بن عمرو) ە.

وەلە (سنن ابی داود) و (ابن ماجە) دا هاتووە لە فەرموودەی "ابن عباس" کەپێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: **(من وقع على ذات محرم فأقتلوة)** [2]واتە: هەر کەسێك کاری سێکسی لەگەڵ مەحرەمێکدا ئەنجام بدات، ئەوا بیکوژن.[3]

هەروەها دەڵێن کابرایەکیان گرتبوو هێنایان بۆلای "حجاج"کە سەلمێنرابوو دەست درێژی سێکسی کردۆتە سەر خوشکەکەی، "حجاج" فەرمانی دا بەبەند کردنی وەفەرمانی دا کە بپرسێت لەهاوەڵانی پێغەمبەرﷺکە سزای ئەم تاوانبارە چۆن بدرێت. جا لە (عبدالله بن مطرف) یان پرسی کە هاوەڵی پێغەمبەرﷺ بوو، ئەویش ووتی:گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو دەیفەرموو: **(من تخطى حرم**

---

[1] – ئەم فەرموودەیە(حسن)ە،(احمد: ٤/٢٩٥)وە(ترمذي: ١٣٦٢)وە(ابو داود: ٤٤٥٧) گێڕایانەتەوە.

[2] – ئەم فەرموودەیە (ضعيف الأسناد)ە، (احمد: ١/٣٠٠)وە(ترمذي: ١٤٦٢)وە(ابن ماجە: ٢٥٦٤) گێڕایانەتەوە.بڕوانە (الارواو:٢٣٤٨-٢٣٥٢)

[3] –مەحرەم ئەمانە دەگرێتەوە:(دایك، باوەژن، خوشك وکچ، کچەزا، خوشکەزا، کوڕەزا، پورو داپیرە "نەنك" ، خوشك ودایك لەشیرەوە ،خەسوو).

المؤمنين فخطوا وسطه بالسيف.)[1] واتە: هەرکەسێك هێڵی ناموسی باوەڕدارانی شکاند ،ئەوا بە شمشێر بیکوژن و وەلە ناوەڕاستەوە دوو لەتی بکەن.

جا ئەمە باس لە جۆرێکی تری کوشتن دەکات کە تایبەتە، بەلاٚم هەرکەسێك بزانێت کەحەرامە چوونە لای کچ یان دایك، ئەوا حەدی بریتی یە لەکوشتن، واتا هاوشێوەی نێربازی یە.

***پوختەی وردبینی لە بوارەدا:***

یان دەبێت بەڵگە بهێنیتەوە لەسەر هەردوو بابەتەکە و بەقیاس کردن ڕاستی هەردوو بابەتەکە دەخاتە ڕوو.

وەسەرجەم موسڵمانان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی هەرکەسێك زینا لەگەڵ مەحرەمێکدا بکات ئەوا حەدی لەسەر دروست دەبێت، بەلاٚم لەچۆنیەتی وشێوازی حەددەکە ناکۆکن کە ئایا کوشتنە لەهەموو حاڵەتێکدا ، یاخود حەددەکەی تەنها وەکو حەددی زینایە؟

دوو پێر لەبارەیەوە دەردەکەون:_

هەریەکە لە ئیمامی"شافعی ومالك وأحمد" پێیان وایە ،حەددەکەی هاوشێوەی حەددی زینایە.

بەلاٚم "احمد" لەیەکێك لە بۆچوونەکانیدا ، وەهەروەها "اسحاق "و کۆمەڵێکی تر پێیان اویە: کە حەددەکە کوشتنە لە هەمو حاڵەتێکدا ،

---

[1] – ئەم فەرموودەیە (ضعیف الأسناد)ە،(الهیثمي في المجمع: ٢٦٩/٦ )دا هێناویتی. وەدەیداتە پاڵ (طبراني)وەدەڵێت: جگەلە(وفدة بن قضاعة )نەبێت پیاوەکانی ئەم فەرموودەیە هەموویان متمانە دارن. وە(بخاری) لەصحیحەکەیدا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر دەفەرمێت؛ (من زنی بأخته فحده حد الزاني) واتە: هەرکەسێك زینای لەگەڵ خوشکەکەی کرد، ئەوا حەدی وەك حەدی زینایە. وە(الحافظ) دەڵێت: (احمد)یش پێی وایە، بەلاٚم زۆرینەی زانایان پێیان وایە ئەمە حەرامە،بەمەرجێك زانیبێتی کە حەرامە پێشتر.

هـەروەها كـۆدەنگن كـە لـەژێر نـاوی خواسـتن ومارەكردنـدا ئـەم كـاری زینايـەی ئـەنجام دابێـت و بیـشزانێت كەحەرامـە ، ئـەوا حـەددی لـیٚ دەدرێـت، تـەنها (ابـو حنيفـە) نـەبێت ،كـەپێی وايـە لـە ژێرنـاوی مارەكردندا بێت ئەوا حەددەكەی لەسەر دەكەوێت.

بـەلاٚم ئەوانـەی تـر كـە دژی ئـەم بۆچـوونەن دەلـێن: بـە ئـەنجام دانـی ئـەم تاوانـە لـە ژێـر نـاوی مارەكردنـدا ئـەوا دووجـار تاوانەكـەی گـەورە تـر كـردووە، دووشـتی نـاڕەوای گـەورەی لەيـەك كاتـدا ئـەنجام داوە، كەئـەويش تـاوانی نـاڕەوايی گرێبەسـتی مارييەكەيـە ، وەتـاوانی نـاڕەوايی زيناكەيـە. جـا بـەچ شـێوەيەك ئـەو حـەددەی لەسـەر لادەچـێت؟ بەكۆكردنەوەی مارەكردنێكی نادروست وتاوانی زيناكاری؟!

بـەلاٚم سـەبارەت بـە جـووت بـوون لەگـەلٚ ئـافرەتێكی مـردوو، ئـەوا دووجـۆر بۆچـوون هەيـە كەلـە ڕێبـاز و مەزهـەبی "أحمـد" وكەسـانی تـر هەيـە. يەكـەم وبـەناوبانگترينيان ئەوەيـە كـە: حـەددی لەسـەر دروسـت دەبێـت ، كـە ئەمـەش وتـەی"اوزاعـی"يـە، چـونكە ئـەنجام دەری ئـەم تاوانـە دووشـتی گـەورەی كۆكردۆتـەوە كـە بـريتی يـە لـە ڕوشـاندنی شكۆمەندی مردوويەك، وەهەروەها ئەنجامدانی تاوانی زيناكاری.

## جووت بوون لەگەلٚ ئاژەلٚدا

جـووت بـوون لەگـەلٚ ئاژەلـدا يەكێكـە لەتاوانـە قێزەونـەكان ، وەزانايـان سەبارەت بەم تاوانە سیٚ ڕاوبۆچوونيان هەيە كەئەوانيش ئەمانەن:_

١. حوكمەكـەی بـريتی يـە لەتـەمیٚ كـردن و سەرزەنـشت كردنـی، وەحەدی لەسـەر نـی يـە، ئەمـە ڕاوبۆچـوونی هـەر يـەك لـە: (مالـك ، ابـو حنيفە ، شافعی لەيەكیٚ لەبۆچوونەكانيدا ، إسحاق) .

٢. حوكمی ئەم كارە وەك كاری زینا وایەدارکاری دەكرێت ئەگەر ڕەبەن بێت، وەبەردباران دەكرێت ئەگەر خێزانداربێت، ئەمە ڕاوبۆچوونی "حسن"ە.

٣. حوكمی ئەم كارە وەك كاری نێربازی وایە، ئەمە یەكێكە لەڕاوبۆچوونەكانی (أحمد) .

وەدەست نیشان كردنی جۆری سزاوحەددەكە دوو ڕاوبۆچوونی تر هەیە كە ئایا سزای كوشتنە؟ یان وەك زیناكار مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت؟

وەئەوانەی كە پێیان وایە سزاكەی بریتی یەلە"كوشتن"ئەم فەرموودەیەی "ابو داود"دەگێڕنەوە لە (ابن عباس) كە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (من أتى بهيمة فأقتلوه وأقتلوها معه.)[1] واتە: هەر كەسێك جووت بوو لەگەڵ ئاژەڵدا ،ئەوا هەردووكیان بكوژن"ئاژەڵ وكەسەكەش".

وەدەڵێن: ئەم جووت بوونە بەهیچ شێوەك دروست نی یە ، هەربۆیە سزای كوشتنە وەك نێربازی.

بەلاّم ئەوانەی كە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە دەڵێن: ئەم فەرموودەیە "صحيح"و دروست نی یە وكاری پێ ناكرێت.

وە (اسماعیل بن سعید الشانجی) دەڵێت: لەم بارەیەوە پرسیم لە"أحمد" ووتی: بێ دەنگ بوو...وە فەرموودەكەی"عمرو بن أبی عمرو" ی لا دروست وصحيح نەبوو.

[1] – ئەم فەرموودەیە(حسن)ە،(احمد: ١/٢٦٩)وە(ابوداود: ٤٤٦٤)وە(ترمذي: ١٤٥٥)وەدەڵێت لای زانایان كار بەمە دەكرێت، كە ئەمەش ووتەی(احمد وإسحاق)ە.

وە (طحاوي) دەڵێت: ئەو فەرموودەیە لاوازە "ضعیف"، وەهەروەها فەرموودەو گێڕانەوەکەی "ابن عباس"یش دروست نی یە، هەر بۆیە فەتوای دەدا بەوەی کە حەددی لەسەر نی یە. وە"ابو داود"یش دەڵێت ئەم بۆچوونە فەرموودەکە لاواز"ضعیف"دەکاتەوە.

جا قیاس کردنی جووت بوون، ئەوا زۆر لەیەکەوە دوورن وقیاسێکی تەواو ناڕەوایە...

## لە نێوان نێربازی وپانپانۆکی دا"السحاق"[1]

هەندێ جا تاوانی نێربازی قیاس دەکرێتە سەر تاوانی پانپانۆکێ"السحاق"، کە ئەم قیاسە ناڕەوایییەکی ئاشکرای تێدایە ، چونکە تاوانی نێربازی واتە دووپیاو یاخود دوو کوڕ کاری سێکسی ئەنجام دەدات بەتێپەڕکردنی ئەندامی نێرینە"چوک"بۆ نێو کۆمی ئەوی تریان، بەڵام ئەم کردارە لە پان پانۆکی"السحاق" ڕوونادات، چونکە تەنها هەردوو مێینەکە لە یەك کاتدا چێژ لەیەکتری وەردەگرن.

وەدەتوانین بڵێین: هاوشێوەی پانپانۆکێ"السحاق" لە نێرینەدا هەیە ، ئەویش چێژوەرگرتنی دووکەسی نێرینە بەبێ کرداری تێپەڕاندنی چوك بۆ نێو کۆمی ئەوی تریان. وەلە هەندێ "أثار"دا هاتووە بە "مرفوعی": (اذا أتت المرأة فهما زانیتان)[2] واتە:

---

[1] – "السحاق" لە کوردەواریدا پێی دەوترێت "پان پانۆکێ"یان لێخشاندن، واتە دووکەسی مێینە چێژی سێکسی لەیەکتری وەردەگرن بەئەنجامدانی هەندێ کرداری تایبەت لەم بوارەدا، بەبێ تێ پەڕکردنی هیچ شتێك بەنێو داوێنی یەکتریدا. "وەرگێڕ"

[2] – ئەم فەرموودەیە (ضعیف الأسناد)ە، بڕوانە(المطالب العالیة)ی(ابن حجر: ١٨٠٩)وە(مجمع الزوائد: ٦/٢٥٦)

ئەگـەر دوو ئـافرەت چـوونە لای یـەکتری و کـاری سێکـسیان لەگـەڵ یـەك ئەنجام دا ، ئەوا هەردووکیان زینایان ئەنجام داوە.

بـەلاّم لێـرەدا حـەددیان لەسـەر نـی یـە، چـونکە هـیچ شـتێکیان تێپـەڕ نـەکردووە بـۆ نێـو داوێـنی یـەکتری، وەکـاتێ نـاوی لـێ نـراوە زیناکـار ، ئـەوا لەهاوشێوەی زینای چاو ودەم وقاچە.

## چارەسەرو وەڵامی پڕوپوخت

پـــاش خســـتنەڕووی ســـەرجەم ئـــەو دەردە کوشـــندانەی کەهـــەر هـــەموویان لـــەیاخی بـــوون وسەرپێچـــی وتاوانکـــاری یەوەسەرچـــاوەدەگرێت، لێرەدا بەوپەڕی کەساسیەوە دەوترێت:

ئایا دەرمان وچارەسەرێك هەیە بۆ ئەم دەردە کوشندەیە؟!

وەڕوقتیەیەك هەیە بۆ پوچەڵ کردنەوەی ئەم جادووە بێ شومارە؟

ئایا ڕێگایەك هەیە بۆ دەربازبوون لەم بیابانە بێ کۆتایە؟

وەفریـاد ڕەسـێك هەیـە بـۆ ڕزگـارکردنی دڵـی عاشـقێك کـە شـەیدایی دێوانەی کردبێت؟... هتد.

بـــەڵێ......وەبـێ گومـان دەرد نـی یـە بـێ دەرمـان وچارەسـەر بێـت، ئەمـە کرۆکـی بابەتەکەیـە: (**مـا أنـزل الله مـن داء إلا جعـل لـه دواء علمـه مـن علمـه وجهلـه مـن جهلـه.**)[1] واتـە:خـوای گـەورە هـەر دەردو نەخۆشـی یـەکی ناردبێـت ، ئـەوا لەگەڵیـدا چارەسەرکەشـی نـاردووە، جـا ئـەوەی بیزانێت دەیزانێت وەئەوەی بێ ئاگا بێت، ئەوا نایزانێت.

جا چارەسەرکرنی ئەم دەردانەی دڵ، بەندە بەدووڕێگاوە:_

ڕێگـــای یەکـــەم: ڕێگـــری کـــردن وخۆپاراســـتن لـــە پـــێش تـــووش بوونی."خۆپاراستن باشتر لە چارەسەرکردن".

ڕێگای دووەم: چارەسەر کردن وبنەبڕکردنی لە پاش تووش بوونی.

جـا هـەر دوو ڕێگاکـە بەنـدە بەیارمـەتی خـوای گـەورە ، وەهـەر کەسێك خـوای گـەورە هاوکـاری بکـات سـەرفراز دەبێـت، وەبەپێچەوانەشـەوە ڕاستە.

[1] -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە، پێشتر باسمان کردووە.

ڕێگای یەکەم:

## خۆپاراستن باشتر لەچارەسەرکردن

بۆ ڕێگری کردن لەتووش بوونی دڵ بەم دەردە کوشندەیە ، دووکاری گرنگ پێویستە:

١. چاو پاراستن لەنەزەری حەرام ،کەپێشتر شیکاری ئەم بابەتەمان کرد.

٢. نەزەری حەرام تیرێکی ژەهراویە لە تیرەکانی ئیبلیس، جا هەرکەسێ نەزەرەکانی بخاتە گڕ حەسرەتەکانی زیاد دەکات.بۆیە چاوپاراستن سوودی زۆرە.

## سوودەکانی چاوپاراستن

### ١- بەجێ گەیاندنی فەرمانی خودایە:

ئەمە مەبەستی دروست بوونی مرۆڤە ،مایەی خۆشبەختیەتی بتوانێت فەرمانەکانی خودای گەورە جێ بەجێ بکات، وەقوربەسەرو تیاچوون بۆ کەسانێك کە پشت لەفەرمانەکانی خودا دەکەن.

### ٢- ڕێگرو قەڵغانی پاراستنە لە تیرە ژەهراویەکان:

### ٣- دڵ پەیوەست دەکات بە خوای گەورەوە:

نەزەری حەرام دڵ پەرتەوازە دەکات وەلە خوداو ڕەحمی خودا دووری دەخاتەوە، مرۆڤ هەست بەوێڵی و تەنهایی دەکات.

### ٤- دڵ شاد وبەهێز دەکات:

بە پێچەوانە گەر تەماشای نادروست بکەیت ، دڵ سست ولاواز دەکات.

## ٥- دڵ پڕدەکات لەڕۆشنایی:

بە پێچەوانەوە تەماشای نادروست دڵ سیاپۆش دەکات ، هەر بۆیە خوای گەورە لەپاش فەرمان کردن بە چاوپاراستن باس لەئایەتی "نور" دەکات کەدەفەرمێت: (قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ... النور:٣٠) واتە: فەرمان بەباوەڕداران بکە با چاو وداوێنیان بپارێزن. پاشان ڕاستەوخۆ دێتە سەر ئایەتی"النور" کەدەفەرمێت: (اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ... النور:٣٥) واتە: خوای گەورە ڕووناك كەرەوەی زەوی وئاسمانەکانە وەنمونەی ڕووناکی یەکەی وەك تاقێك وایە چرایەکی تێدابێت چراکەش لەناو شوشەیەکدابێت.

واتە: هاوشێوەی ئەم نورە لەدڵی باوڕداراندایە. کەهەرکەسێك دڵی بەنوری خودا ڕووناك بووەوە، پاشتر هەرچی خێروچاکەخوازی هەیە لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێ دەکات پەروانە ئاسا. بەڵام گەر خامۆش وسیاپۆش بوو،هەرچی شەڕو خراپەخوازی هەیە ڕووی تێ دەکەن وێڵ وگومڕاونابینا دەبێت.

## ٦- فیراسە وڕووناسی دەبەخشێت بەدڵ.کە پاك وپیس،ڕاست وناڕاست،حەق وناحەق لەیەك جیادەکاتەوە:

(شجاع الكرماني) کەخۆی خاوەن ڕووناسیەکی "فیراسە"سەرسوڕهێنەر بوو، دەڵێت: هەر کەسێك تەمەنی بڕازێنێتەوە بە شوێن کەوتنی سونەتی پێغەمبەر ناخی دابمەزرێنێت ،بەوچاودێری خودا چاوی بپارێزێت لەحەرام، وەدرەون خاڵی کات لەگومان، جەستەی تێرکات لەحەلاڵ، ئەوا فیراسەی هیچ کات هەڵە ناکات.

خـوای گـەورەش هەمیشـە چـاکەی بەنـدەکان لەڕەگـەزی کردارەکـە دەداتـەوە، واتـە کەسێك چـاوی پاراسـت لەحـەرام، خـودا ڕووناکی وبینـایی زیـاد دەکـات وڕووناسـی بـسـەهێز دەکـات. هەربۆیـە خـوای گـەورە "دژەکـەی" ئـەم ڕاستیە دەخاتـە ڕوو کـە "کـوێری و وێڵـی یـە" کـەباس لەگـەلی "لـوط"ی پێغەمبـەر دەکـات ودەفـەرمێت: (لَعَمْـرُكَ إِنَّهُـمْ لَفِـي سَـكْرَتِهِمْ يَعْمَهُـونَ... الحجـر:٧٢) واتـە: سـوێندبێت بـەتۆ ئـەی"محمد" ئـەوان لـەگومڕایی وسەرخۆشـی خۆیـان بـۆ تـاوان کـوێرو نابینـا بوونـە ودەتلێنەوە.

جـا لێـرەدا خـوای گـەورە بـە "سـکر- سەرخۆشـی" باسـیان دەکـات ،کەمەبەسـتی گومڕابـوونی ژیـری وعەقلـە" وە"کـوێری_ العمـە" کەمەبەستی نابینا بوونی چاوە.

**٧- دڵ دامەزراو وچەسپاو دەکات:**

چـاو پاراسـتن دڵ دامـەزراو دەکـات ، خـوای گـەورە هێـزی بەلگـەداری وزیرەکی وتوانایی دەبەخشێت.

وە لـە (أثـر) دا هـاتووە کـە: (الـذي خـالف هـواه يفـرق الشـيطان مـن ظلمـه) واتـە: هەرکەسـێك ملکەچـی ئارەزووەکـانی نـەبێت ،شـەیتان لەسێبەری هەڵدێت.

وەبەپێچـەوانەوە هەرکەسـێك گوێڕایـەڵی ئارەزووەکـانی بکـات ئـەوا شـەیتان دەبێتـە یـارو یـاوەری و وەخـوای گـەورەش سەرشـۆڕی دەکـات. هـەروەکو "حسـن" دەڵێـت: خـوای گـەورە یـاخی بـووان و سەرکەشـان وتاوانبـاران سەرشـۆڕو ڕیسـوا دەکـات ، هەرچـەندە دەنگـی سمـی ئەسـپەکانیان لـە دوری ئەوەنـدەوە دەنگـی بێـت وەخۆیـان بـەزاڵ وسەربەرز بزانن.

چونکه خوای گەورە عیزەت وسەربەرزی کردۆتە هاوڕێکی ملکەچی وگوێڕایەڵی بۆ خودا، کەدەفەرمێت: (وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ... المنافقون:٨) واتە: سەربەرزی وشکۆمەندی بەتەنها بۆ خوداو پێغەمبەرو بڕواداڕانە. وەهەروەها دەفەرمێت: (وَلاَ تَهِنُوا وَلاَ تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ... آل عمران:١٣٩) واتە: ئەی بڕواداران ، غەم وپەژارە مەخۆن هەر ئێوە سەربەرزن ئەگەر باوەڕداری ڕاستەقینەبن.

وەهەروەها باوەڕ ووتەو کردارە لە ناخ ونهێنی وئاشکرایدا ، خوای گەورە دەفەرمێت: (مَن كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يرفعهُ... الفاطر:١٠) واتە: ئەوەی سەربەرزی وپایەبڵندی دەوێت ، بابزانێت هەموو سەربەرزی یەك هەر بۆخودایە ، گوفتاری چاکەو بەجێ بۆلای خودا بەرزدەبێتەوە ، کاروکردەوەی چاکەش گوفتارو ووتەی شیرین بەرزدەکاتەوە.

کەواتە هەرکەسێك دەیەوێت سەربەرزو سەرفرازبێت، باملکەچی وگوێڕایەڵی خودا بکات و ووتەو کردەوەی چاکە ئەنجام بدات. وەلە نزاوپاڕانەوەی "قنوت"دا هاتووە کە (إنە لایزال من والیت، ولایعز من عادیت) [1] واتە: ئەی خودایە.. ئەوەی تۆ سەربەرزی بکەیت ، هەرگیزڕیسوا نابێت. وەئەوەی تۆ ڕیسوای بکەیت ،هەرگیز سەربەرز نابێت.

---

[1] -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(احمد: ١/١٩٩)وە(اصحاب السنین الاربعة) گێڕایانەتەوە. بڕوانە کتێبەکانی(ادعیه الصلاة)ی(رضوان جامع رضوان).

### ٨- دەرگاكانی دڵ لەسەر شەیتان دادەخات:

شەیتان لەگەڵ هەموو تەماشاكردنێكی نادروستدا دەروازەی بۆ والاّ دەبێت بە ئارەزووی خۆی دەگەیەنێتە دڵ وێنەی ئەو كەسەی لاشیرین دەكات و خەیاڵ وبیرۆكەی بۆدەچێنێت ، گڕی تێ بەردەدات وحەزو ئارەزووەكانی دەبزوێنێت ، وەتاوانكاری لائاسان دەكات كەهەر چۆنێك هەیە دەستی پێ بگەیەنێت ، بەم چەشنە چواردەوری دڵ ئاگردان دەكات لەهەر چوارلاوە ئاگر بڵێسەی بۆ دەدات وەك تەنوری گڕگرتووی لێ دێت.

هەر لەبەر هەمان مەبەست سزای تەماشاكەرانی نادروست لەژیانی گۆڕو بەرزەخدا بریتی یە لەتەنورێكی گڕگرتوو كە ڕوحیان تێیدا دەبرژێت تا هاتنی حەشر. هەروەكو پێغەمبەر لە خودا بینیوێتی.[1]

### ٩- دڵ خاوێن وساز دەكات بۆ بیرۆكەی چاكەخوازی:

چاو پاراستن دڵ ساز دەكات بۆ بیرۆكەی چاكەخوازی ودڵ خاوێن دەكاتەوە، بەلاّم بەپێچەوانەوە كاتێك چاو نەپارێزراو سەركەشانە تەماشای نادروستی ئەنجام دا، ئەوا سێ نەهامەتی ڕوودەكاتە ئەو دڵە كەبریتی یە لە بێ ئاگایی وشوێن ئارەزوو كەوتن وكەمتەرخەمی

[1] -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری:٧٠٤٧)وە(مسلم:٣٦/١٥) گێڕایانەتەوە.لە فەرموودەیەكی درێژی بخاریدا كە دوو فریشتە پێغەمبەر دەگەڕێنن بەسەر بەهەشت ودۆزەخدا، كەتێیدا هاتووە: (فأنطلقنا فأتينا على مثل التنور، فإذا فيهالغط واصوات، قال: فاطلعنا فيه، فإذا فيه رجال ونساء عراة، واذاهم يأتيهم من أسفل منهم، فإذا اتاهم ذلك الهب ضوضوا، قال: قلت لها"يعني الملكين":ما هؤلاء؟ قالا: لي انطلق،انطلق...ثم قال: واما الرجال والنساء العراة الذين في مثل بناء التنور فإنهم الزناة والزواني)واتە: ڕۆیشتین تاگەیشتینە شوێنێك لەتەنوور دەچوو كەدەنگە دەنگی لێوە دەهات، پیاوئافرەتی ڕووتی تێدابوو لە ژێری ئەو تەنوورەوە ئاگروبڵێسەیان بۆ دەهات وفیزاحیان دەكرد. منیش لێیانم پرسین ئەمانە كێن ؟ فریشتەكانیش ووتیان: بابڕۆین بابڕۆین ، دواتر ووتیان ئەو پیاو وئافرەتە ڕووتانە زیناكاربوون.

لەکاردا، وەك لەم ئایەتەدا دەردەکەویت: (وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا... الكهف:٢٨) .

**١٠- دڵ وچاو پەیوەستە بەیەکەوە:**

دڵ وچاو هەردووکیان پەیوەستن بەیەکەوە ویەکتری تەواو دەکەن. واتە هەرکاتێك چاو تێك چوو وتووشی خراپە بوو ئیتر دڵیش خراپ دەبێت ودەبێتە جێگەی زبڵدانی شتە پیسەکان، وەجێگەی خۆشویستنی خودای تێدا نابێتەوە. بەهەمان شێوەش گەر دڵ کاول وخراپ بێت ،ئیتر ڕاستەوخۆ چاویش توشی خراشی وشێواندن دەبێت وحەق وڕاستی نابینێت.

ڕێگای دووەم:

**چارەسەر کردن لەپاش تووش بوون**

ئەمیش بریتی یە لەدەربازکردنی دڵ لەو شتانەی سەرقاڵی دەکات ،بەتایبەتی دووشت دڵ سەرقاڵ دەکەن کەبریتین لە"ترسێکی ڕاڕا ،یان خۆشەویستیەکی هەراسانکەر"ئەو ساتەیەك لا دەبێتەوە ، واتە دەرونی مرۆڤ دەست بەرداری خۆشەویستیەك دەبێت بۆ خۆشەویستیەکی لەو گەورە تر. یاخود کاتێك دەست بەرداری خۆشەویستێك دەبێت لەترسی توش بوون بەکارەساتێك کەگەورە تربێت لەمەترسیەکانی لەدەست دانی ئەو خۆشەویستە.

جا خاوەنی ئەم دڵە پێویستی بەدوو بنەمای سەرەکی هەیە ،بەلەدەست دانی هەریەکەیان مەترسی لەسەر دروست دەبێت ،کەئەوبنامایانەش ئەمانەن:_

**بنەمای یەکەم:**

بنەمایـــەکی وردو دروســـت کـــەبتوانێت جیاکـــاری وپۆلێنکـــاری بکـــات لـــەنێوان ئاســـت وپلـــەکانی خۆشەویـــست ودەردەســـەریەکانیدا وەپێویـــستە بـــەرزترین وگـــەورەترین خۆشەویـــست هەڵبـــژێرێت لەنێوخۆشەویـــستەکاندا ، وەهـــەروەها کـــەمترین وبـــچوکترین دەردەســـەری هەڵبـــژێرێت لـــەنێو دەردەســـەریە گەورەکانـــدا. کەئەمـــە ســـیفات وخاســـیەتی عـــەقڵ وژیریـــە. جانەگـــەر یـــەکێك بەپێـــچەوانەی ئـــەم بنەمایـــە کـــاری کـــرد ، کەواتـــە کـــەم وکـــوڕی لـــە ژیـــری وعەقڵیدایـــە بگـــرە لەئاســـتی ئاژەڵـــەکان بگـــرە کـــەمتر دەژمێردرێت.

**بنەمای دووەم:**

هێـــزی ئـــارام گـــرتن وبڕیـــاردان کـــەبتوانێت بڕیـــاری هەڵبـــژاردنی ئـــەم ئـــارام گـــری لەدەســـت بـــەردانی ئـــەوی تـــردا بکـــات ، چـــونکە زۆرجـــار مـــرۆڤ دەتوانێـــت ڕاســـت وناڕاســـت لەیـــەك جیابکاتـــەوە، بـــەڵام دەســـت بـــەرداربوون وبڕیاردان لەسەری زۆر دژوارە وئەستەمە بەهۆی لاوازی دەرونی یەوە.

هـــەر بۆیـــە خـــوای گـــەورە ڕێگـــری دەکـــات لەکەســـێك ببێتـــە بڕیاردەســـت وپێـــشەوای خواپەرســـت ودینـــداران ، کەلایـــەنی بڕیـــاردان وهەڵبژاردنـــەوە لاواز دەبێـــت کەدەفـــەرمێت: (وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَـــا لَمَّـــا صَـــبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَـــا يُوقِنُـــونَ...الـــسجدة:٢٤) واتـــە: کاتێـــك نـــەوەی ئیـــسرائیل ئـــارامگربوون وخوانـــاس بـــوون کردمـــانن بـــە پێـــشەوایانی خـــەڵکی و وەدەسەڵاتمان پێ بەخشین وەباوەڕی پتەویان هەبوو بەئایەتەکانمان.

بـــەڵێ ئەمـــە ئـــەو کەســـەیە کـــە خـــۆی ســـوودمەندو خـــەڵکیش لێـــی ســـودمەند دەبـــن لـــەڕووناکیان، وەهەمیـــشە نـــەخۆی ســـودمەند دەبێـــت کەلـــە تـــاریکی دا هـــەنگاو دەنێـــت، وەهـــەر کەســـیش شـــوێنی کـــەوێت لـــە

تاریکستاندا ویّلّ وسەرگەردانیان دەکات. وەکەسی واشمان هەیە بەتەنها خۆی سودمەند دەبێت لەو ڕووناکی یە کەسی تر لێی سوودمەند نابێت ،کەواتە:_

١. هەم خۆی وهەم شوێنکەوتوانی سوودمەند دەبن لە ڕووناکی یەکەی.

٢. نەخۆی ونەشوێن کەوتوانی هیچیان سوودمەند نابن، چونکە ڕووناکی لەدەست داوە.

٣. بەتەنها خودی خۆی سوودمەند دەبێت، بەلاّم خەلّکی نەخێر.

## بۆ چەسپاندنی خۆشەویستی خودا، پێویستە دلّ خالّی بێت لەتاوانکاریدا

پاش خوێندنەوەی ئەم ناونیشانە بۆمان دەردەکەوێت کەناکرێت خۆشەویستی بالاّ لەگەلّ خۆشەویستی تردا لەیەك دلّدا کۆبکرێتەوە، بەلّکو پێویستە دلّ خالّی وپاك ساف ویەکلا بێت بۆ خۆشەویستی بالاّ، کەخۆشەویستی خوای گەورەیە. واتە خۆشەویستی دوو دژ لەیەك کاتدا وەلە یەك دلّدا کۆنابێتەوە ومەحالّە.

پێویستە یەکتایی خودا بپارێزیت لە خۆشەویستیدا، وەنابێت هاوەلّ وهاوبەشی بۆ بڕیاربدرێت لە خۆشەویستیدا ، بەتایبەتی کەخوای گەورە بەهەموو شێوەیەك هاوبەشی ڕەد دەکاتەوەلەپەرستن و تاکی خۆشەویستیدا.

کەواتە پێویستە دلّمان خالّی بکەینەوە بۆ سێ ئەرکی گەورە:

١. خۆشویستنی خودای تاك وتەنها.

٢. ڕقمان لەهەموو شتێك بێت کە ببێتە مایەی لەناودانی خۆشەویستی خودا.

٢. وەهەر شتێکمان خۆش ویست لەبەر ڕەزامەندی خودا خۆشمان بوێت.

خۆشویستنی غەیری خودا مایەی نەهامەتی وسزای دونیاو بەرزەخ وقیامەتە، بەلأم خۆش ویستنی خودا مایەی حەوانەوەی دڵ ودەرون وپاراستنی دونیاو بەرزەخ وقیامەتە. جا چ ڕەوای حەق وڕاستی یە لەیەك دڵدا هەر یەکە لە " خاچ وبت وپەیکەر وئافرەت وهۆز وخێڵ ودونیا...هتد." جێگەی خۆشەویستی خودا بگرێتەوە. زۆرێکن ئەوانەی لە دونیا خۆشەویستەکانەیان بوونەتە خودا ودەیان پەرستن وگوێڕایەڵیان دەکەن وەلەو پێناوەدا گوێ بەفەرمانی خودا نادەن. (أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَى عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَى بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ... الجاثية:٢٣) واتە: ئایا نابینی ئەوانەی کە حەزو ئارەزووەکانی خۆیان کردۆتە خوداو دەیان پەرستن ، خوای گەورەش بەهۆی ئەم بەد هەڵوێستەیانەوە گوێڕایەڵی کردوون کە زانوێتی شایەنی ئەمەن، وەمۆری ناوە بەسەر دەزگای بیستن ودڵ ودەرونیدا، وەپەردەپۆشی چاو ودەزگای بینینی کردوون. جا ئیتر کێ هەیە جگە لەخودا هیدایەت وڕێنمایان بکات، ئایا بیرناکەنەوە وئامۆژگاری وەرناگرن.

## جۆر وپلەکانی خۆشەویستی

خۆشەویستی جۆر وپلەی تایبەتی خۆی هەیە، لەوانە:

### خۆشەویستی پەرستن:

واتە هەندێ جۆری خۆشەویستی هەیە دەچێتە چوارچێوەی پەرستنەوە ، بەتایبەتی ئەگەر ئەم دووبنەمایەی تێدا بێت"خۆشەویستی لەگەڵ گوێڕایەڵی ، وەملکەچی کردن". واتە هەرکەسێك شتی خۆش ویست وگوێڕایەڵی کردو ملکەچی بوو وەلە

بڕیارەکانی دەرنەدەچوو، ئەوا پەرستوویەتی. پلەکانی خۆشەویستی ئەمانەن:

### ١- پەیوەندی:

وەیەکەم هەنگاوە لەم پلەیەدا پێی دەوترێت پەیوەندی، واتە پەیوەندی دڵ بەخۆشەویستی یەکەیەوە.

### ٢- شەیدایی "الصبابة":

بە دووەم پلەی خۆشەویستی دێت، واتە شەیدابوونی دڵ بۆ خۆشەویستەکەی.

### ٣- پەیوەست بوون "الغرام":

واتە پەیوەست بوونی دڵ بە خۆشەویستەکەیەوە کە هەرگیز ناتوانێت لێی دابڕێت، واتە هەمیشە دڵی لەلایەتی وەهۆگری بووە واتە ناتوانێت لێی جودا بێتەوە، هەر بۆیە خوای گەورە لەوەسفی سزای دۆزەخدا بەرامبەر بەبێ باوەڕان کە هیچ کاتێک لێیان جودا نابێتەوە دەفەرمێت: (إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا... الفرقان:٦٥).

### ٤- عاشق بوون "العشق":

واتە ڕۆچوون وزیادەڕەوی کردن لەخۆشەویستی، جا ئەم جۆرەیان بۆ خوای گەورە بەکارناهێنرێت، وەکەسیش بەکاری ناهێنێت.

### ٥- تامەزرۆبوون "الشوق":

واتە تامەزرۆبوونی دڵ بۆ خۆشەویستەکەی وەکۆچ کردن بەئاراستەی. ئەمەیان بەرامبەر خوای گەورە بەکارهاتووە، هەروەکو لە (مسند) ی امام احمد دا هاتووە ،کە (عمار بن یاسرﷺ) دەڵێت: نوێژم کرد بە کورتی تەواوم کرد، لەم بارەیەوە لێیان پرسیم، منیش

ووتم: لەم نوێژەدا نزام کرد بەهەندێ نزاو پاڕانەوە کە پێغەمبەری خوداﷺ هەمیشە پێیان دەپاڕایەوە ، دەیفەرموو: (اللهم أني أسئلك بعلمك الغيب ، وقدرتك على الخلق، احيني اذا كانت الحياة خيراً لي، وتوفني اذا كانت الوفاة خيراً لي، اللهم اني أسألك خشيتك في الغيب والشهادة وأسألك كلمة الحق في الغضب والرضى، وأسألك القصد في الفقر والغنى، وأسألك نعمياً لا ينقد، وأسألك قرة عين لا تنقطع، وأسألك برد العيش بعد الموت، وأسألك لذة النظر الى وجهك ، وأسألك الشوق الى لقائك، في غير ضراء مضرة ، ولافتنة مضلة ، اللهم زينا بزينة الايمان ،واجعلنا هداة مهتدين.)[1] واتە: خودایە من لەتۆ داوا دەکەم بە زانستی نهێنی وبالآدەستیت بەسەر بونەوەردا ،کە بمژێنە ئەگەر ژیانم خێری تێدایەو وبممرێنە ئەگەر مردنم خێری تێدایە. خودایە ترسی تۆم لەدڵدا بروێنە لە نهێنی وئاشکرادا، وە ووشەی حەق وڕاستیم پێ ببەخشە لەتوڕەیی وهێمنیدا ، لەهەژاری ودەوڵەمەندیدا. وەداوای نیعمەتێکت لێ دەکەم کۆتایی نەیێت، وەداوای نەوەو وەچەیەکی دوانەبڕاوت لێ دەکەم. وەداوای ژیانی خۆشیت لێ دەکەم لەپاش مردن، وەداوی چێژی خۆشی بینینی ڕوخسارت دەکەم. وەداوات لێ دەکەم تامەزرۆم بکەیت بۆ دیدارت بێ ئەوەی توش ببێتم بە زەرەرمەندی یان تاقی کردنەوەیەکی گومڕاکەر. خودایە بەباوەڕداریێتی بم ڕازێنەوە، وەهیدایەتمان بدە بمانکەرە هیدایەت داری خەڵکی.

[1] – ئەفەرموودەیە(حسن)ە،(احمد: ٢٦٤/٤، ١٩١/٢)وە (النسائی: ٥٤/٣)وە (حاكم: ٥٢٤/١).

وەلە (أثر) دا هاتووە: (طال شوق الأبرار الى لقائي ، وأنا الى لقائهم أشد شوقاً) واتە: تامەزرۆی خواناسان بۆ دیداری من درێژەی کێشا ، من لەوان زیاتر بۆ دیدرایان تامەزرۆترم..

وەئەمە هەر ئەو واتایەیە کەپێغەمبەر گوزارشتی لێ دەکات ودەفەرمێت: (من أحب لقاء الله احب الله لقاءه) واتە: هەرکەسێك حەز بەدیداری خودا بکات ، خوداش حەز بەدیداری ئەو دەکات.

وەهەندێك لەبیرتیژان پێیان وایە لەم ئایەتدا خوای گەورە مەبەستی لەوەدایە خوای گەورە دەزانێت تامەزرۆی خواناسان بۆ دیداری خوای خۆیان لەبەرزبوونەوەدایە ،هەربۆیە خوای گەورە ژوان ودیداری بۆ دەست نیشان کردوون تا دڵ ودەرونیان بحەوێتەوە، کەدەفەرمێت: (مَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء اللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ اللَّهِ لَآتٍ... العنكبوت:٥) واتە: ئەوەی ئاوەتە خوازە بەدیداری خودا شاد بێت،بادڵنیابێت کە کاتی دیاری کراوی خۆی وسەرەمەرگ هەردێت "تا بەدیداری شادبێت".

### ژیانی کامەرانی[1]

شادمان وخۆشترین ژیان بریتی یە لە ژیانی نێوان شەیدا وعاشقان کە سەرتاپا ژیانیان پڕە لە ئاسودەیی وکامەرانی وخۆشی، چونکە دڵیان بەختەوەرو ئاسودەیە ، وەهەر ئەم خۆشیەیە خوای گەورە بە ژیانی کامەرانی گوزارشتی لێ دەکات ، کاتێك دەفەرمێت: (مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً... النحل:٩٧) واتە: هەرکەسێك لەنێرو مێ کردەوەی چاك ئەنجام بدات و باوەڕداربێت ئەوا سوێندبێت بەخودا بە ژیانێکی ئاسودەیی وکامەرانی دەیژێنین لەم دونیایەدا.

---

[1] – بۆ ئەم بابەتە بڕوانە کتێبی: (مدرج الساكين/ منزلة الحياة)ی دانەر.

جا مەبەستی لە ژیانی نێوان بڕوادارو بیّ باوەڕ نی یە کەمەبەست ونیازەکانیان پەرش وبەلاّوبێت، بەڵکو مەبەستی ئەو دڵە شەیدایانەیە کە هەموو مەبەست ونیازێکیان بەندە لەسەر ڕەزامەندی کردنی خۆشەویستەکەیان، کەهەمیشە هۆش وبیرو دەرونیان پەیوەستە بەوەوە لە هەوڵی ڕازی کردن ودیداریدان و هەر بۆ ئەو دەژێن ، وەهەر لەپێناوی ئەویشدا دەمرن وخۆیان بەخت دەکەن. جا بیّ دەنگیان ، لە گفتوگۆکردنیان، گوێبیستیان، تەماشاکردن و وردبوونەوەیان، جوڵەو کردەوەکانیان هەر هەمووی لەپێناوی خۆشەویستەکەیاندایە کەخوای گەورە ومیهرەبانە.

هەروەکو لە (صحیح بخاری) دا هاتووە ،کە پێغەمبەر لە خوای گەورە دەیگێڕێتەوە ودەفەرێت،خوای گەورە دەفەرمێت: (ما تقرب الى عبدي بمثل ما أفترضت عليه، ولا يزال عبدي يقترب إلى بالنوافل حتى احبه، فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصربه، ويده التي يبطش وجله التي بي يمشي بها، ولئن سألني لأعطينه، ولئن أستعاذني لأعيذنه، وما ترددت في شيء أنا فاعله كترددي عن قبض نفس عبدي المؤمن ، يكره الموت وأكره مساءته ولابدَ لهُ منهُ)[1] واتە: هیچ کاتێك بەندەکانی بەئەندازەی بەجیّ گەیاندنی فەرزەکان لێم نزیك نابنەوە ، وەبەبەردەوامی بەندەکانم بە ئەنجام دانی سونەتەکان"نوافل" لێم نزیك دەبنەوە. هەتا دەگاتە ئاستێك کە ئیتر خۆشم دەوێن. وەکاتێك کەخۆشم ویستن دەبمە گوێی کەپێی دەبیستێت، وەچاوەکانی کە پێی دەبینێت ، وەدەستەکانی کەکاری پیّ دەکات ، وەپیّ یەکانی کەپێی دەچێت ودێت. واتە بەمن دەبیستێت، وەبەمن دەبینێت، وەبەمن کاردەکات، وەبەمن دێت

[1] -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ٦٥٠٢) گێڕاویەتیەوە. لەفەرموودەی (ابی هریرة).

ودەڕوات، وەوئەگەر داوام لـێ بکـات پێـی دەبەخـشم ، پـەنام پـێ بگرێـت پـەنای پـێ دەدەم. وەلــە هـیچ شـتێك دوودڵ نـابم وەك لـەگیان کێـشانی باوەڕدارێـك دا نـەبێت، کەحـەز بـەمردن ناکـات، منـیش حەزناکـەم توشـی ناڕەحەتی بکەم ،بەلاَم هەردەبێ ئەم کارە جێ بەجێ ببێت.

**شیکارکردن ولێکدانەوەی ئەم فەرموودەیە:**

لـەم فەرموودەیـەدا دووهۆکـاری گـرنگ دەردەکـەوێت بـۆ نزیـك بوونـەوە لــــەخودای گـــەورە ، کەئـــەوانیش جـــێ بـــەجێ کردنـــی "فـــەرزەکان ونەوافلەکانـە". پاشـان هەرکەسـێك خـوای گـەورە خۆشـی بوێـت ، ئـیتر ئــەو خۆشەویـستی یــە دەبێتــە هــاوڕێ وهــاوەڵی هەمیــشەیی و لێــی جیانابێتـــەوە ، دڵ ودەرون وگیـــانی ســـەراپا دەگرێتـــەوە ، وەهـــەموو مەبەسـت وکـاو ووتەیـەکی بـریتی یـە لـەڕازی کردنـی خـوای گـەورە. جـا هــەرکاتێك کاربکــات ، بــڕوات ،ببێنێــت، ببیــستێت، لەهــەموو ئەمانــەدا خـوای گـەورەی لەبـەر چـاوەو خـودای لەگـەڵ دایـە، خۆشەویـستی خـودا بزوێنەری هەموو کارەکانێتی.

جـا ئەگـەر خۆشەویـستی دوو مـرۆڤ بۆیـەکتری ئـەم هەڵبەسـتەی لـێ بکەوێتەوە کەدەڵێت:

خيالك في عيني، وذكرك في فمي ومثواك في قلبي، فأين تغيب؟

واتە: خەیاڵی تۆ لەچاوانم دایە ، یادت لەسەر لێوانم.

لانەت لەدڵدایە ، جا ئیتر چۆن لێم وون دەبیت؟

جا ئەبێ شەیدایی وتامەزرۆی بەندەکان بۆ خودای خۆیان چۆن بێت؟!

**لەم فەرموودەیەدا باس لە گوێ وچاو دەست وپێ کراوە:**

جـا ئـەم ئەندامانـەی دەزگـای هەسـت وکـارن، گـوێ وچـاو شـتەکان دەگوێزنـەوە بۆنێـو دڵ ویـست وئـیرادەی پـێ دەبەخـشن و دەبنـە مایـەی

خۆشویستن وڕق لێ بوونەوە بۆ شتەکان. وەبۆ ئەنجام دانی ئەم خۆشویستن وڕق لێ بوونەوەیە دەستەکان وپێ کان بەگڕدەخات.

جا ئەگەر لەهەموو ووتەو بیستن وهەست کردنێکدا خودای لەیاد بێت ، ئیتر ئەو خۆشەویستی یەبەدیار دەکەوێت لە دەزگاکانی جێ بەجێ کردندا لەدەست وپێ یەکاندا، لەڕۆیشتن وهاتن وکارکردندا. جا لێرەدا خوای گەورە لەگەڵ ئەو بەندەدایە لەهەموو کارو نیەت و وتەیەکی دا. هەروەکو لەم فەرموودەیەدا هاتووە کە دەفەرمێت: (أنا مع عبدي ما ذكرني وتحركت بي شفتاهُ) [1]واتە: من لەگەڵ بەندەکەمدا تا یادم بکات ولێوەکانی بەیادی من بجولێتەوە.

وەئەمە ئەو لەگەڵ بوونەدایە کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی لێوە دەکات: (لاتحـــزن ان الله معنـــا...التوبـــة:٤٠) .وەهەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (ما ظنك باثنين الله ثالثهما) [2]واتە: ئەی أبو بکر دەبێت گومانت چی بێت دووکەس کە خوای گەورە سێ یەمیانە. وەخوای گەورە دەفەرمێت: (وَإِنَّ اللَّـــهَ لَمَـــعَ الْمُحْسِـــنِينَ... العنکبـــوت:٦٩) واتە:خوای گەورە لەگەڵ چاکەکاراندایە. (إِنَّ اللَّـــهَ مَـــعَ الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِـنُونَ... العنکبـوت:١٢٨) واتە: خوای گەورە لەگەڵ پارێزەران کەخەریکی چاکەکاربن.

(وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ...الأنفـــال:٤٦) ... (كَلَّـــا إِنَّ مَعِـــيَ رَبِّـــي سَيَهْدِينِ... الشعراء:٦٢) واتە: خوای گەورە بە موسا وهارون دەڵێت من لەگەڵتاندام دەبیستم ودەبینم. (إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى...طه:٤٦) .

---

[1] –ئەم فەرموودەیە (صـحیح)ە،(احمـد: ٢/٥٤٠)وە(ابـن ماجـە:٣٧٩٢)وە(حـاکم: ١/٤٩٦)وە (البانی) بەصحیحی داناوە.

[2] –ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ٣٦٥٣)وە(مسلم: ١٥/١٥٦نووی) گێڕایانەتەوە.

جا لەم ئایەتانەدا باس لەیاوەری ودۆستی خودا دەکات لەگەڵ ئەو باوەڕدارانەدا، چونکە دۆست بوونی خودا دەبێتە مایەی ڕەوینەوەی خەم وپەژارەو ناڕەحەتیەکان، وەدڵی وەك ماسی لێ دێت لەدووری ئاو کە بەبێ یادو زیکری خودا ناژێت. دواتر پاش دروست بوونی ئەو تامەزرۆی وخۆشەویستیە بۆخودا ، خوای گەورەش خۆشەویستی خۆی بەسەریدا دەڕژێنێت وپێویستی یەکانی بۆ دابین دەکات کەدەفەرمێت: (ولئن سألني لأعطينه * ولئن استعاذني لأعيذنه) واتە: ئەو چۆن بەدەم داواکاریەکانی فەرمانەکانی منەوە هاتووە ومنی لەهەموو کەس خۆشتر ویستوە ،بۆیە هەرچی داوایەکی هەبێت بەوپەڕی خۆشیەوە بۆی دێنمە ئاکام.

هەر بۆیە خۆشەویست حەز بەوە ناکات خۆشەویستەکەی ئازار بچێژێت، لەبەر هەمان مەبەستە خوای گەورە لەگیان کێشان ومەرگی خۆشەویستەکانی دوو دڵە. هەرچەندە خێروچاکە لەوەدایە کە بمرێت وبگەڕێتەوە بۆ لای خۆشەویستەکەی خۆی، چونکە هەر لەبنەڕەتدا لەپشتی باوکە گەورەیدا لەبەهەشتدا بووە، ئێستاش دەبێت بگەڕێتەوە بۆ بەهەشت بە جوانترین شێواز، چونکە ئەو ساتە لەخوای گەورە بەباوکتانی ووتوە "أخرج منها"دەرچۆ لەبەهەشت، مەبەستی لەوە بووە کەبەسەربەرزی بۆ بگەڕێتەوە.[1] جا ئەمە واتای ڕاست ودروستی خۆشەویستی یە کەهەموو جەستەی بەندەکانی پۆشیوە.

---

[1] – هەروەها دانەر لەم بابەتەدا ئەمانەش دەڵێت:
- ئەی ئادەم دڵگران مەبە بە پێ ووتنی "أخرج منها" دەرچۆ لەبەهەشتدا، چونکە ئەمە لەبەرژەوەندی خۆت ونەوەکەتدایە.
- ئەی "ئادەم"دڵگران مەبە بەنۆش کردنی شەربەتی دەربەدەریو ئاوەرەیی، چونکە بەو هۆیەوە بوو ڕزگارت بوولەدەردی کوشندەی لووت بەرزی وزوو سەرسام بوون بۆ خۆت"عجب" ، وەلەو میانەیوە بوو بەرگی بەندایەتیت پۆشی (وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ...البقرة:٢١٦ ).

### ٦- بەندایەتی "التتیم":

شەشەمین پلەی خۆشەویستی یە ، کەپێی دەوترێت پەرستن وبەندایەتی ، واتە ڕێژەو ئاستی خۆشەویستەکەی دەگاتە ئەندازەیەك کە چی تر خۆشەویستەکەی دەپەرستێت ودەبێتە بەندەی. وەتەواوی ملکەچی وگوێڕایەڵی بۆ دەردەبڕێت، وەئامادەی هەموو جۆرە قوربانیەکە لەپێناویدا.

**پوختەی پەرستن وبەندایەتی:**

پوختەی پەرستن وبەندایەتی بریتی یە لەتەواوی ملکەچی بوون بۆ خۆشەویستەکەت، کاتێك دەوترێت"طریق معبد"واتە ڕێگایەك ساز وزەلیلە بۆ ڕۆیشتن. جا بەندە خۆشەویستەکەی زەلیل وملکەچی کردووە بۆ خۆشەویستەکەی ، هەربۆیە بەندایەتی بەرزترین و شانازیترین پلەوپایەیەمرۆڤ پێی گەیشتبێت بەرامبەر بەخوای گەورە.

### پلەوپایەی بەندایەتی

خوای گەورە باس لە بەڕێزترین دروست کراوی دەکات ، کەپێغەمبەر محمدﷺ لە پێگەی بەندایەتی یەوە گوزارشتی لێ دەکات، پێگەی پێغەمبەرایەتی وبڵندبوونەوەیە بۆ ئاسمانەکان ، کەلە

---

• ئەی "ئادەم" واللّٰه ی ئەو کاتەی سەرپێچیت کرد وپاخی بووی لەخودا ، هیچ کام لەمانە سوودی نەبوو بۆت ، نەسەربەرزیت بە سوژدەی فریشتەکان(أسجدوا). وەنەپلەو پایەی(علم ادم) وەتایبەتمەندیت لەشێوازی دروستکردندا (لما خلقت بیدی)وە شانازیت بە (ونفخت فیه من روحی)هیچ لەمانە سودی نەبوو بۆت، تەنها ئەو زەلیلە نواندنەت نەبێت کەوەك بەندەیەکی ستەمکاری ناچار دانت نا بەخۆتدا ووتت: (رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا...الأعراف:٢٢٣).

• وەکاتێکیش زرێ پۆشی یەکتاپەرستیت پۆشیە سەر جەستەی سوپاس گوزاریتدا، چیتر تیرە ژەهرەویەکانی دوژمن نەیانتوانی بت کوژن وسەرجەم برینەکانیشت سارێژبوون.

بۆ زیاتر ئاشنا بون لەم بابەتە ، بڕوانە کتێبی"کنز الفوائد"ی نووسەر.

چەندین ساتی جۆراوجۆردا بە بەندە ناوی دەبات کە دەفەرمێت: (وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا... الجن:١٩) واتە:کاتێك پێغەمبەر"محمد"بانگەوازی بۆ یەکتاپەرستی دەکرد دەستە دەستە پەری وئادەمیزادەکان دەیانەویست لەناوی بەرن.

وەدەفەرمێت: (وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ...البقرة:٢٣) واتە: ئەگەر ئێوە بەگومانن بەرامبەر بە ئەو قورئانەی ناردوومانەتە خوارەوە بۆ بەندەکەمان"محمد"، جا بائێوە بتوانن یەك سورەتی هاوشێوەی بهێنن. وەدەفەرمێت: (سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى...الإسراء:١) واتە: پاکی وبێ گردی وستایش بۆ ئەو خودایەی کە شەورەوی لەبەشی یەکەمی شەودا بەبەندەی خۆی"محمد" کرد لە مزگەوتی کەعبەوە بۆ مزگەوتی ئەقسا.

وەلە فەرموودەی (الشفاعة) دا هاتووە: (اذهبوا الى محمد عبدٌ غفرالله له ماتقدم من ذنبه وما تاخر.) [1] واتە: بچن بۆلای محمد، بەندەیەکە کە خودا لە تاوانی پاش وپێشی خۆش بووە.

کەواتە پێغەمبەری ئازیزﷺ بەپلەی تەواوی بەندایەتی یەوە پێگەی شەفاعەتی مەزنی بەدەست هێناوە. وەخوای گەورە سەرجەم بونەوەری دروست کردووە تاوەکو بەیەکتایی بیپەرستن و وەهاوەڵی بۆ بڕیارنەدەن، کەئەمەش تەواوی خۆشەویستی وملکەچی یە، کەهەر ئەمەیە کرۆکی ڕاستەقینەی ئیسلام و میلەتی ئیبراهیم کەهەر کەسێکی لێ بترازێت سەری لێ دەشێوێت.

---

[1] -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە، (بخاری: ٤٤٧٦)وە(مسلم: ٣/٥٠نووی) گێڕایانەتەوە.

(وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلاَّ مَن سَفِهَ نَفْسَهُ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ * إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ * وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلاَ تَمُوتُنَّ إَلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ * أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاء إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِن بَعْدِي قَالُواْ نَعْبُدُ إِلَـهَكَ وَإِلَـهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ إِلَـهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ... البقرة: ١٣٠-١٣٣) واتـه: هەركەسێك پشت لـەئاینی ئیبراهیم بكات ئـەوا گێلـەو توشـی سەرلێشێوان دەبێت ، وەئێمـە ئیبراهیم مـان هەڵبژاردووە لـەدونیاداو كردوومانـە بـە پێشەنگ وپێشەوا. وەلـە قیامەتـدا لـە ڕیـزی پیاوچـاكاندایە ، وەكاتێـك خـودا بـەئیبراهیمی فـەرموو ملكـەچ بـە، خێـرا ووتـی: ملكـەچ وگوێڕایـەڵی پـەروەردگاری جیهـان بـووم. وەئیبراهیم ویـەعقوب وەسێتیان بـۆ نـەوەكانیان كـرد كـە خـودا ئـەم ئایینـەی بـۆ هەڵبـژاردوون ئێـوەش بەموسـڵمانێتی نـەبێت نـەمرن. وەتـا دواهەناسـەتان پـەیڕەوی یەكتاپەرسـتی بكـەن. ئایـا ئێـوە "جولەكـەو گاورەكـان" ئامـادەی سـەرەمەرگی یـەعقوب بـوون؟ ئـەو كاتـە بـەكوڕەكانی ووت: دوای مردنـی مـن چـی دەپەرسـتن؟ هـەموویان ووتیـان: خـوای تـۆو باوباپیرانـت دەپەرسـتین، كەخودایـەتی تـاك وتەنهایـە وەئێمـە هـەموو تەسلیم وفەرمانبەرداری ئەوین.

هـەر بۆیـە گـەورەترین تـاوان لـەلای خـودا بـریتی یـە لەهاوبەشـی پەیداكردن بۆ خودای تاك وتەنها.

## بنەڕەتی هاوبەشی دانان بۆ خودا

بنـەڕەتی هاوبەشـی دانـان بـۆ خـودا بـریتی یـە لەهاوبەشـی لەخۆشەویستیدا، هەروەكو خـودا دەفـەرمێت: (وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا

لّلّهِ...البقـــرة:١٦٥) واتــه: هەندێك هــەن لەخــەڵكی دەچـن لەغـەیری خـودای گــەورە هاوبــەش وهــاوەڵی بـۆ بڕیـاردەدەن وبەئەنـدازەی خـودا ئـەوانیان خـۆش دەوێــت وگوێڕایــەڵی دەبــن.بــەلاّم بــڕواداران تــەنها وبەیــەکتایی خودایان خۆش دەوێت وەلە خۆشویستندا هاوبەشی بڕیارنادەن.

جـا لێـرەدا خـودای گـەورە ئامـاژە بـەوە دەکـات کـە هەنـدێك کـەس لەخۆشەویـــستیدا هاوبـــەش بـــۆ خـــودا بڕیـــاردەدەن. ســـەبارەت بەلێکدانـەوەی ئـەم ئایەتـە ووتـراوە: مەبەسـت لـەوەی " أَشَـــدُّ حُبًّـــا لِّلّـــهِ "ئەوەیــە لەپێـشدا هــەردوو لاخودایــان خــۆش ویــستووە، بــەلاّم دواتــر پێڕێــك هاوبەشــیان بــۆ بڕیــارداوە لەخۆشەویــستیدا ، بــەلاّم بــڕواداران لەسەر یەکتایی خودایان خۆش ویستووە.

جـا خـوای گـەورە سـەرجەم بونـەوەری بـۆ ئـەوە دروسـت کـردووە کـە بــەتاك وتــەنهایی خودایــان خــۆش بوێــت وهاوبەشــی بــۆ بڕیارنــەدەن، هــەر لەبـــەر ئـــەم مەبەســـتەیە زۆر بەتونـــدی ڕەدی ئەوکەســـانەدەداتەوە کـــە دەچــن جگــە لــەخودا پەناوپــشت وتکاکــار هەڵدەبــژێرن ، کەدەفــەرمێت: (إِنَّ رَبَّكُمُ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُـــمَّ اسْـتَوَى عَلَـى الْعَرْشِ يُدَبِّرُ الأَمْرَ مَا مِن شَفِيعٍ إِلاَّ مِن بَعْدِ إِذْنِهِ ذَلِكُـــمُ اللّـــهُ رَبُّكُـــمْ فَاعْبُـــدُوهُ أَفَلاَ تَـــذَكَّرُونَ...یـــونس:٣) واتــە: پــەروەردگاری ئێــوە "الله"یــە کەلــە شــەش ڕۆژ زەوی وئاسمـــانی هێناوەتـــە بـــوون، دواتـــر لەســـەر عەرشـــی مـــەزت لەنگـــەری گرتـــووە ، وەهـــەر خۆیـــشی پـــلان وبڕیـــاری هـــەموو شـــتێك دەردەکـــات. وەهـــیچ کـــەس نـــی یـــە تکاکـــارو شـــەفاعەت خوازبێـــت بـــەبێ مۆڵـەتی ئـەو ، جـا ئـەوە پەروەردگارتانـە کـەوابوو بـەتاکی بیپەرستن، ئایـا بیر ناکەنەوە.

هــەروەها دەفــەرمێت: (وَأَنذِرْ بِهِ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْـــشَرُواْ إِلَـــى رَبِّهِـــمْ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِـــهِ وَلِـــيٌّ وَلاَ شَـــفِيعٌ لَّعَلَّهُـــمْ يَتَّقُـــونَ...الأنعـام:٥١) واتــە:

کەواتــە بــەقورئان ئەوانــە ئاگــادار بکــەرەوە کــە دەترســن کۆبکرێنــەوە بــۆلای پــەروەردگاریان ، ئەوکاتــە کــەس نــی یــە جگــە لــەو پــەروەردگارە پــشتیوانیان لــێ بکــات وکەسیش نــی یــە تکاکاریــان بێــت، ئایــا ئــیتر خۆتــان لە سنووری خودا ناپارێزن.

پاشــان جــەخت لەســەر هەریەکــەیان دەکاتــەوە بەتــەنها دەفــەرمێت: (ام اتخذوا من دون الله شفعا قل الو كانوا لايملكون شــيئا ولايعقلــون * قــل لله الشفاعة جميعــاً...زمــر:٤٣-٤٤) واتــە:ئایــا جگــە لــەخودای گــەورە تکاکــارو شــەفاعەت خــوازی تریــان هەڵبــژاردووە ، جــا پێیــان بڵــێ ئایــا ئەگــەر تکاکارەکانتــان هیــچیان بەدەســت نــەبوو.ئایــا عاقــڵ نــابن؟ پێیــان بڵــێ هەموو تکاکار وشەفاعەت خوازەیەکان تەنها بۆ خودای گەورەیە.

وەدەفــەرمێت: (مِن وَرَائِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِي عَنْهُم مَّا كَــسَبُوا شَــيْئًا وَلَــا مَا اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاء وَلَهُــمْ عَــذَابٌ عَظِــيمٌ... الجاثيــة:١٠) واتــە: لەقیامەتــدا دۆزەخ بەدوایانەوەیــەو لێــی قوتــار نــابن ،هەرچــی یــەکیان کردبــوو فریایــان ناکــەوێت، وەهــەموو ئەوانەیــشی کــە لــەبری خــودا کردبوویــانن بــە پــاڵ پــشتی خۆیــان ، ســزایەکی زۆرگــەورە وســامناك بۆیــان ئامادەیە.

جــا ئەگــەر بەنــدەکان تــەنها پــشت بــەخودا ببەســتن ، ئــەوا خــودای گــەورە دەبێتــە پــشت وپــەنایان ، بەپێچەوانەی تــر کــە جگــە لــەخودا پــشت وپــەنا بەکــەس وشــتی تــر دەبەســتن. بــەڵێ خــاڵی وەرچــەرخان وهێڵــی ســووری نێــوان یەکتاپەرســتان وهاوبــەش دانــەران لێرەدایــە کــە تــەنها وتــەنها خــودا پــشت وپــەنا وشــەفاعەت خــواز وتکاکــاری ڕاســتەقینەی بەندەکانە.

پوختەی مەبەست:

پوختـەی بەندایـەتی لەوەدایـە کـەنابێت لـە خۆشەویسـتیدا هاوبەشـی وهـاوەڵ بـۆ خـودا بڕیـار بـدرێت. وەپاشـان پێویسـتە خۆشەویسـتیمان بـۆ پێغەمبـەری خودابێـت لـە پـێش خۆمـان ومـاڵ وخێـڵ وخانـەوادەو..هتـد. چـــونکە خۆشویســـتنی پێغەمبـــەر لەتـــەواوکاری خۆشەویســـتی خودادایـە.پاشـان هـەموو.خۆشەویسـتیەکمان بـە پێـوەری (بـۆ خـوداو لەپێناوی خودا) دا بپێوین.

هـەروەکو لـە (صـحیحین) دا هـاتووە کـە پێغەرمبـەرﷺ فەرموویـەتی: (ثـلاث مـن کـن فیـه وجـد بهـن حـلاوة الایمـان) .[1] هـەروەها لـە ووتەیـەکی (صـحیحین) دا هـاتووە بـەم شـێوەیە: (لا یجـد حـلاوة إلایمـان الا مـن کـان فیـه ثـلاث خصـال: ان یکـون الله ورسـوله احـب إلیـه ممـا سـواهما، وان یجـب المـرء لایحبـه إلا لله. وان یکـره ان یرجـع في الکفـر بعـد اذا انقـذه الله منـه کمـا یکـره ان یلقـی في النـار.) [2]واتـە: سـێ شـت"خەسـڵەت" لەهـەر کەسـێکدا بێـت ، ئـەوا چـێژی شـیرینی بـاوەڕ دەچـێژێت.... وەهـەروەها هـاتووە بـەم چەشـنەش: هـیچ کەسـێك چـێژی شـیرینی بـاوەڕ ناچـێژێت گـەر ئـەم سـێ خەسـڵەتەی تێـدا نـەبێت"دەبێـت خـوداو پاشـان پێغەمبـەری خـودای لەهـەموو کەسـێك وشـتێکی تـر خۆشـتر بوێـت ، وەزۆری پـێ نـاخۆش بێـت ، وەهرەکەسـێکی خۆشویسـت تـەنها لەبـەر خـودا خۆشـی بوێـت. وەزۆری پـێ نـاخۆش بێـت کاتێـك دەبـینێ کەسـێك وادەگەڕێتـەوە سـەر بـێ بـاوەڕی کەپێشـتر خـودا ڕزگـاری کردبـوو لێـی، ئەوەنـدەی پـێ ناخۆش بێت وەك بڵێی خۆی فڕێ دەدرێتە نێو ئاگرەوە."

---

1 –ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ١٦)و(مسلم: ٤٣ – الایمان) گێڕایانەتەوە.
2 –ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

وەلە (سنن) دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (من أحب لله ، وأبغض لله، وأعطى لله، ومنع لله، فقد أستكمل الإيمان.)[1] واتە: هەر کەسێك تەنها لەبەر خودا خەڵکی خۆش بوێت ، وەبەتەنها لەبەر خودا رقی لەخەڵکی بێت، وەتەنها لەبەر خودا شت ببەخشێت، وەتەنها لەبەر خودا ڕێگر بێت، ئەوا بەڕاستی بیروباوەڕی تەواو پوختە.

هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: (ما تحاب رجلان في الله الا كان أفضلها اشدهما حبأ لصاحبه.) واتە: ئەگەر دوو کەس لەپێناوی خودا یەکتریان خۆش ویست ، ئەوا باشترین کەسیان ئەوەیانە کەزیاتر برادەرەکەی خۆشتر بوێت.

جا ئەم خۆش ویستنانە لە پێویستی وتەواوکاریەکانی خۆشەویستی خودان.

## جۆرەکانی خۆشەویستی بۆ خودا

جۆرەکانی خۆشەویستی بۆ خودا دابەش دەبێت بۆ چوارجۆری سەرەکی، کە پێویستە جیابکرێنەوە لەخۆشەویستیەکانی تر، کەئەوانیش ئەمانەن:_

**١- خۆش ویستنی خودا:**

واتە خوای گەورەت لە هەموو شت وکەسێکی تر زیاتر خۆش بوێت کە هاوتای نەبێت. جا بەتەنها ئەمە مایەی ڕزگاربوونە لەدۆزەخ وبەدەست هێنانی بەهەشت نی یە، چونکە هەریەکە لەجولەکەکان و

---

[1] - ئەم فەرموودەیە(حسن)ە،(ترمذي: ٢٥٢١)وە(احمد: ٤٣٨/٣)وە(حاكم: ١٦٤/٢) گێڕایانەتەوە.وە (الباني)بە صحیحی داوە لەقەڵەم. وە(حافظ وذهبي)لێی بێ دەنگ بوونە.

خاج پەرستەکانیش خودایان خۆش دەوێت ، بەلأم کەچی توشی سزای دۆزەخ دەبن و لەبەهەشت بێ بەش دەبن.

٢- خۆش ویستنی ئەوەی کە خودای خۆش دەوێت:

واتە ئەو شتانەی کە خودا خۆشیانی دەوێن ، تۆش لەقولأی دڵ ودەرونتەوە خۆشت بوێن. جا ئەمە بنەمای سەرەکی چوونە نێو ئیسلامەوە وە دەرچوونە لەنێو بێ باوەڕی. وەخۆشەویسترین کەس لای خودا ، بەهێزترینیانە لەم جۆرە خۆشەویستی یەدا.

٣- خۆش ویستن بۆ خودا لەپێناو خودا:

واتە هەرکەس وشتێکمان خۆش بوێت تەنها لەبەر خوداو لە پێناوی ڕەزامەندی خودای گەورەدا بێت و دوور بێت لەنیازو مەبەستی تر. وەئەمەیان لە پێویستی وتەواوکاریەکانی خۆشویستنی خودایە.

٤- خۆش ویستن لەگەڵ خودا:

ئەم جۆرەیان پێی دەوترێت"هاوبەشی دانان بۆ خودا لە خۆشەویستیدا"، واتە گەر بێتو لەگەڵ خودای گەورەدا هاوبەشمان بۆ دانا لەخۆشەویستیدا ، وەلە پێناوخودا نەبوو ئەو خۆشەویستی یە، ئەوا هاوبەش وهاوتاتان بۆ خودا بڕیارداوە لە خۆشەویستیدا. وەبەمەش دەوترێت (المحبة الشركية- خۆشەویستی هاوبەشی) .

٥- خۆشەویستی سروشت:

کەئەم جۆرەیان زۆرمەبەستمان نی یە لێرەدا باسی بکەین، ئەمەش بەکورتی: حەزو ئارەزووی مرۆڤ بۆ ئەو کەس وشتانەی کەلە گەڵ سروشت وفیترەتی خۆیدا دەگونجێت ، وەك خۆشویستنی خێزان، باوك دایك منداڵ، ئاو خواردن...هتد.

کەئـەم جۆرەیـان ئاسـاییە لـەدڵ ودەرونـی مرۆڤـدا هەیـە ،بەمـەرجێك تەشـەنە نـەكات ونەگاتـە ئاسـتی خۆشەویـستی خـودای گـەورە دەفـەرمێت: (يَا أَيُّهَا الَّـذِينَ آمَنُـوا لَـا تُلْهِكُـمْ أَمْـوَالُكُمْ وَلَـا أَوْلَـادُكُمْ عَـن ذِكْـرِ اللَّـهِ...المنـافقون:٩) واتـە: ئـەی بـاوەڕداران هـەوڵ بـدەن كـەماڵ وسـامان ورۆڵـەكانتان نەبنـە هـۆی ئـەوەی كەلـە یـادی خـودا سـەرقاڵتان بكـەن وكـەم تەرخەمی بنوێنن وبێ ئاگاتان كەن.

وەدەفـەرمێت: (رِجَـالٌ لَّـا تُلْهِـيهِمْ تِجَـارَةٌ وَلَـا بَيْـعٌ عَـن ذِكْـرِ اللَّـهِ...النـور:٣١) واتـە: پیاوانێك كـە ستایـشی خـودا دەكـەن ، كـەهیچ كاتێـك بازرگـانی كـڕین وفرۆشـتن سـەرقاڵیان ناكـات وبـێ ئاگایـان ناكـات لەیادی خودا.

## ٧- تەواوی خۆشەویستی "الخُلة":

ئەمـە حەوتـەمین دوایـەمین پلـەی خۆشەویـستی یـە لەپلـەكانی خۆشەویستی كە پێی دەوترێت"تەواو كۆتایی خۆشەویستی".

واتـە چـیتر لەدڵـدا جگەیـەكی تـر نابێتـەوە بـۆ خـۆش ویـستنی هـیچ كـەس وشـتێكی تـر، جگـە لەخۆشویـستراوی سـەرەكی نـەبێت. وەبـەهیچ شـێوەیەكیش ئـەو دڵـە جێگـەی هاوبـەش وهاوتـا ناكاتـەوە لەخۆشەویـستیدا. ئـەم پێگەیـە تایبەتـە بەدۆسـتانی خـودا كەهـەر یەكـە لەپێغەمبـەران (ابـراهیم ومحمـد) سـڵاو ودرودی خودایـان لەسـەر بێـت. هـەروەكو پێغەمبـەرﷺ دەفـەرمێت: (إن الله اتخـذني خلـيلاً كمـا اتخـذ ابـراهيم خلـيلا) [1] واتـە: خـوای گـەورە منـی كردۆتـە خـەلیلی خـۆی ،هەروەكو پێشتر ابراهیمی كردۆتە خەلیلی خۆی.

---

[1] – ئەم فەرموودەیە (ضعيف الأسناد)ە،بڕوانە(السلسلة الضعيفة)ی (الباني:٣٠٣٤).

هـــەروەها لـــە (صـــحيح) دا هـــاتووە كـــە پێغەمبـــەرﷺ فەرموويـــەتى: (لوكنــت متخــذاً مــن اهـل الأرض خلــيلاً لاتخــذت أبــابكر خلــيلاً، ولكــن صــاحبكم خليــل الله) [1]واتـــە: ئەگـــەر مـــن لەخـــەڵكى ســـەر زەوى دۆســـت وخەليلێكم هەڵبژاردايە ،ئەوا"ابو بكر"دەبوو، بەلاّم من خەليلى خودام.

وەلـە فەرموودەيـەكى تـردا دەفـەرمێت: (إنــي أبـرأ الى كـال خليـل مـن خلتــهُ) [2]واتــە: مــن خــۆم بــەرى ئەكــەم لەهــەر خــەليلێك كەبەئەنــدازەى خەليلى خۆشم ويستبێت.

وەكاتێــك كــە پێغەمبــەر"ابــراهيم (س.خ) " حــەزى بــەكوڕێك كــرد ، خــواى گــەورە پێــى بەخــشى ، جــا خۆشەويــستى ئــەو كــوڕە بەشــێك لــەدڵى "ابراهيمــى"داگــير كــرد، وەخــواى گــەورەش ئــەم كــارەى پــێ خــۆش نــەبوو كەلـە دڵـى ابراهيمـدا خۆشەويـستێكى تـر هـەبێت جگـە لـەخواد. هـەر بۆيـە لەخـەودا فـەرمانى بـە ابـراهيم كـرد كـە ئـەو منداڵـە سـەرببڕەو بيكـرە قۆچـى قوربــانى بــۆ خــودا. كەئەمـــەش گــەورەترين تــاقى كردنــەوەبوو بــۆ دڵـــى ئيـــبراهيم (س.خ) . مەبەســت لێــرەدا ســەربڕينى كوڕەكــە نــەبوو ، بــەڵكو ســەربڕينى خۆشەويــستى ئــەو كوڕەبــوو لــە دڵــى حــەزرەتى ئيبراهيمــدا. هــەر بۆيــە كاتێــك كــە ئيــبراهيم ويــستى كوڕەكــەى ســەرببڕێت. خــواى گــەورە بڕيـارى دا بـە لـە بـرى كوڕەكـەى مـەڕێك سـەرببڕێت و كوڕەكـە دەربازبێـت. وەئەمەش بووە سونەتێكى بەردەوام...

هـــەروەكو هەميـــشە خـــواى گـــەورە هـــەر بڕيـــارێكى هەڵوەشـــاندبێتەوە بەشـێكى كـەمى لـێ هێڵاوەتـەوە. وەكـو "هێـشتنەوەى پێـنج نوێـژى فـەرز

---

[1] –ئەم فەرموودەيە (صحيح)ە،(بخارى: ٣٦٥٦)وە(مسلم: ١٦٥/١٥نووى).

[2] –ئەم فەرموودەيە (صحيح)ە، هەمان سەرچاوەى پێشوو.

لەبری پەنجا نوێژی فەرز"[1]، وەك هێشتنەوەی خێرو صەدەقە لەكاتێ ویسترا قسە لەگەڵ پێغەمبەردا بكرێت.

## لە نێوان خۆشەویستی وخەلیل دا

هەندێك كەس پێیان وایە "خۆشەویست"پوختتر وفراوانترە لە"خلیل"، وەهەروەها دەڵێن حەزرەتی ابراهیم"خلیل الله"یە ،بەڵام محمدﷺ خۆشەویستی خودایە"حبیب الله"یە.

بەڵام لەڕاستیدا بەم شێوەیە نی یە، چونكە"خۆشەویستی" گشتی یە، بەڵام "خلیل"تایبەتی یە، وە خلیل كۆتاو تەواوی خۆشەویستی یە. هەروەكو پێغەمبەرﷺ ڕایگەیاندووە كە خوای گەورە لەگەڵ ئیبراهیم دا هەڵی بژاردوون بە خەلیلی خۆی. وەهەروەها ڕەدی ئەوەی كردۆتەوە كە لەسەر زەویدا خەلیلی هەبێت جگە لەخودا، لەگەڵ ئەوەشدا خۆشەویستی دەربڕیوە بۆ هەریەكە لە (خاتوو عائیشە و ابوبكر وعمر) ﷺ.

هەروەها خوای گەورە خۆشەویستی خۆی بۆ چەندین وچین وتوێژ دەربڕیوە ، لەوانە: تەوبەكاران، چاكەخوازان، ئارامگران...: (یُحِبُّ التَّوَّابِینَ وَیُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِینَ...البقرة:٢٢٢) .

هەروەها گەنجی تەوبەكار خۆشەویستی خودایە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا خوای گەورە خەلیلی خۆی بۆ دووان دەربڕیوە كە (محمد وأبراهیم) ە سلاو ودرودی خودایان لەسەر بێت.

---

[1] – ئەمە كاتی خۆی بەپێی دەقی ئەم ئایەتە فەرز بووە كەدەفەرمێت: (یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا إِذَا نَاجَیْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَیْنَ یَدَیْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً ذَلِكَ خَیْرٌ لَكُمْ وَأَطْهَرُ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِیمٌ...المجادلة:١٢ )واتە: ئەی باوەڕداران كاتێك ویستان قسەیەك لەگەڵ پێغەمبەردا بكەن ، ئەوا خێروصەدەقەیەك ئەنجام بدەن كەبۆخۆتان باشتر وپاكترە، وەخوای گەورە لێ بووردەو بەخشندەیە.

## جیاوازی لەنێوان خۆشەویست وخۆشەویسترین

وەکو پێشتر ووتمان هەمیشە مرۆڤ دەست بەرداری خۆشەویستێکی بچوك دەبێت لە پێناو خۆشەویستێکی گەورەدا، وەهەروەها لەپێناو بەدەست هێنانی خۆشەویستێکی گەورەدا ئامادەیە خۆی توشی ناخۆشی ومەینەتی بچوك بکات، کەوا سروشتی ژیری وعەقڵی وایە کە گەورەترین خۆشەویست هەڵبژێرێت لە بچوکترینیان ، وەکەمترین وبچوکترین نارەحەتی هەڵبژێرێت لە گەورەترین وزۆرترینیان. وەئەم کارە پێویستی بە دووبنەمای گەورە هەیە:ـ

(هێزی هەست کردن وزانین ، ئازایەتی دڵ) . واتە پێویستە مرۆڤ هەست بەباشترین وگەورەترین خۆشەویستەکانی بکات ، بوێروئازابێت بتوانێت هەڵبژاردن ئەنجام بدات لەم بوارەدا.بەلاَم ئەگەر بە پێچەوانەی ئەمەوە کرا ، ئەوا لاوازیان لەبواری هەست کردن وزانینە، یاخود دڵی ئازاو بوێر نی یە ناتوانێت لەژێر کاریگەری دەرون دەربچێت.

زۆرێك لەخەڵکی گیرۆدەی ئەم دەردە بوونە و حەزوئارەزووەکانی زاڵە بەسەر ژیرو باوەڕیاندا ،باشەو خراپەیان لەم ڕوانگەیەوە دەپێون، تەنانەت هەندێك جار پزیشکەکان ئاگاداری هەندێ کاری دەکەنەوەکە زیان بەخشە، کەچی نەخۆشە خۆی ناگرێت ودەرونی زاڵەو ئەنجامی دەدات. زۆرێك لەوکەسانەی دڵیان نەخۆشە ،گوێ بەسەلامەتی دڵیان نادەن وهەمیشە حەزوئارەزووەکانیان تێردەکەن وهەرچەندە زیان بەخش بێت بۆیان.

### پوختەی شەڕ وچاکە:

پوختەی شەڕ لەلاوازی وبێ هێزی هەست وئیدراك ودەرون نزمی دایە.وەپوختەی چاکەش لە بەهێزی هەست وئیدراك و شکۆمەندی دەرون دایە.

کەواتــە خۆشەویــستی وئــیرادە بنــەڕەت و بزوێنــەری هــەموو کــارێکن. هــەروەها ڕق وکینــەو ناحــەزی بنــەڕەت ودەســت بــەرداری هــەموو کــارێکن. جــا ئــەم دووهێــزە مەزنــە لەدڵــدان ، وەسەرچــاوەی چەرمەســری وبەختــەوەری دڵــن. وەپاڵنــەری هــەموو کــارێکی ئارەزوومەندانــە بــریتی یــە لــە خۆشەویــستی وئــیرادە. وەئــەنجام دانەکەشــی دەگەڕێتــەوە بــۆ لاوازی لەیــەکێ لــەو دووپاڵنــەرە ســەرەکی یــە، کەهەنــدێ جار ڕق وکینــە وناحــەزی دەگرێتــەوە. جائەمــە بنــەڕەتی فــەرمان کــردن وڕێگرتنــە، پاداشــت وسزایە.

جا لێـرەدا وەلامــی ئــەو پرسـیارە ڕوون دەبێتــەوە کــە "ئایــا دەســت بەردار بوون لەکارێك" فەرمانێکی وجودی یە؟یاخود عەدەمی یە؟

<u>پوختەکەی:</u> لێرەدا دووبەشە:

دەســت بــەرداربوونێك دەگەڕێتــەوە بــۆ نــەبوونی هۆکــاری کارەکــە لە"ئیرادەو خۆشەویستی"کە بەمەیان دەوترێت"عەدەمی-نەبوونی".

وەدەســت بــەرداربوونێك دەگەڕێتــەوە بــۆ بــوونی ڕێگرییــەك لــە"ڕق وکینەو ناحەزی"کەبەمەیان دەوترێت"وجودی- بوونی".

## هەوڵی خەڵکی بــۆ بەدەســت هێنــانی بەرژەوەنــدی ودوورکەوتنــەوە لە زەرەرمەندی یە

بــێ گومــان مــرۆڤ هەمیــشە لــە هــەموو ووتــەوکردار ئــەنجام دانێکــدا، تەنانــەت لەدوورکەوتنــەوە ودەســت بــەرداربوونی هەرکارێکــدا، مەبەســتی ســەرەکی بەدەســت هێنــانی بەرژەوەنــدی ودوورکەوتنــەوە لەزەرەرمەنــدی یە.

ئەمــە پێــوەری هــەموو خــاوەن ژیــری یەکــە لەژیانــدا، بــەلام مــەخابن زۆرێــك لەخــەڵکی لــەم پێــوەرەدا توشــی شــێوان ولــێ تێکــچوون هــاتوون.

کاتێـك کـە ئامـادەن لـەپێناوی بەدەسـت هێنـانی بەرژەوەنـدی یـەکی کـەم وچـێژێکی کـاتی خۆیـان توشـی چەرمەسـەری وسزاونەشـکەنجەیەکی زۆرە نـەبڕاو دەکـەن وە تووشـی زیـانی هەمیـشەیی دەبـن. هەربۆیـە دەبیـنین کەسـانێکی زۆر لەبـەر چـێژ وخۆشـیە کـاتی یـەکانی ئـەم دونیایـە ژیـانی هەتاهـەتایی قیامـەت دەدۆڕێـنن و لـە دوارۆژدا سـزایەکی بـێ شـومار چاوەڕوانیان دەکات.

هەنـدێك لـەزانایان دەڵـێن: زۆر وردبوومـەوە لـەحاڵی ژیرمەنـدان وهۆشـیاران ،دەبیـنم هەرهـەموویان لەهـەوڵی دوورخـستنەوەی ناڕەحـەتی وغـەم وپـەژارەن لەسـەر دەرون. جـا هەریەکـەو بەڕێگەیـەك، هەیـە لەڕێگـەی خـوا ردن وخواردنـەوە، یـان بازرگـانی،یـان بـە پـڕۆژەی هاوسـەرگیری، یـاخود بـەگوێ گـرتن لـەگۆرانی خـۆش یـان بـەکات بەسـەر بردن بەیاری یەوە...

منـیش ووتم: ڕاسـتە ئەمـە تاکـە مەبەسـتی سـەرەکی ژیـرو هۆشـیارانە ، بـەلاّم هـەموو ڕێگایـەك لـەو ڕێگایانـە نامـان گەیەنێتـە جێـی مەبەسـت، بگـرە هەنـدێکیان تـەواو پێـچەوانە ودژی ئـەو مەبەسـتەیە ، وەبـەلای منـەوە تاکـە ڕێگایـەك بـۆ بەدەسـت هێنـانی ئـەو مەبەسـتە ، تـەنها ڕووکردنـە خـوای گەورەیـە وبەدەسـت هێنـانی ڕەزامەنـدی ئـەوە، جـا هـەر کەسـێك ئـەم ڕێگایـە بگرێتـە بـەر ئـەوا دڵنیـا بێـت سـەرفرازی دونیـاو قیامەت بەدەست دەهێنێت.

## بەشەکانی خۆشویستراو "المحبوب"

خۆشویستراو "المحبوب": دەبێتە دووجۆرەوە:

١- خۆشویستراو بۆ خودی خۆی.

٢- خۆشویستراو بەهۆی کەسی ترەوە.

١- خۆشویستراو بۆ خودی خۆی:

واتە خۆش ویستنی کەسێك تەنها لەبەر خودی خۆی کە شایەن وشایەستەی خۆشەویستی یە. کەئەمەش بەتەنها خوای گەورە دەگرێتەوەکە دوورە لەهەموو کەم وکوڕی وکورتیەك، کەماڵ وتەواوە لەهەموو رووییەکەوە.

٢- خۆشویستراو بەهۆی کەسێکەوە:

واتە خۆش ویستنی کەسێك یان شتێك لەبەر خودی خۆی نا ، بەڵکو لەبەر هۆکاری تر خۆشویسترابێت ، وەجگە لەخۆش ویستنی خوای گەورە سەرجەم خۆشویستراوەکانی تر بەهۆی خوداوە خۆشویستراون ، وەهەر لەئەوەوە خۆشویستراوەکەیان سەرچاوە دەگرێت. وەك خۆشویستنی پێغەمبەران، فریشتەکان..هتد.

کەواتە لێرەدا جگە لەخودا هەموو خۆشویستراوەکانی تر شایەنی خۆش ویستن ورق لێ بوونەوەن لەیەك کاتدا. بۆ نمونە گەر کەسێك رقی لەو شتانە بوو کە خودا خۆشی دەوێن، بۆمان دەردەکەوێت کەتا چ ئەندازەیەك خۆشویستراوەکانی تری لاپەسەندە ودژایەتی خودا دەکات، وەبەپێچەوانەوە کەسێك کە خودا هەرشتێکی خۆش بوێت ،ئەویش هەمان شتی خۆش دەوێت وەبۆمان دەردەکەوێت کەچەند پشتیوانی لەخودای گەورە دەکات.

جا پێویستە دەست بەم پێوەرەوە بگرین ، تابزانین چەند ئێمە موالات وپشتیوانیمان هەیە بۆ خوای گەورە، چونکە ولایەت واتە خۆش ویستنی ئەو شتانەی کەخودا خۆشی دەوێن ، وەهەروەها ڕق لێ بوونەوە لەو شتانەی کە خودا ڕقی لێ دەبێتەوە. جا ئەمە پەیوەندی بە زۆری نوێژ وڕۆژووەوە نی یەو ئەمە تایبەتە بەدڵ.

**جۆرەکانی خۆشەویستی بەهۆی کەسانی ترەوە:_**

یەکەم: هەرلەگەڵ بەدەست خستنیدا هەست بەچێژو خۆشی دەکرێت.

دووەم: ئەو جۆرەیە کەئازارو زیان بەخشە ، بەلام خۆی دەگرێت تا دەیگەیەنێتە خۆشویستراوەکەی.

**هەروەکو خوای گەورە** دەفەرمێت: (كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ...البقرة:٢١٧) **واتە: خوای گەورە** کوشتاری لەسەر پێویست کردن هەرچەندە لەسەر دڵتان ناخۆشە، بەلام دوور نی یەشتێکتان پێ ناخۆش بێت، بەلام لەڕاستیدا خێری تێدایە بۆتان. وەدوور نی یە شتێکتان پێ خۆش بێت،بەلام لەڕاستی خراپە بێت بۆتان ، وەتەنها خوای گەورە زاناو دانایەو ئێوە نایزانن.

جا لێرەدا کوشتاریان پێ ناخۆشە ،بەلام باشترە بۆیان چونکە دەیان گەیەنێتە ڕەزامەندی خۆشەویست. هەروەها دەرونی مرۆڤ ئارەزووی پشوو وخۆشگوزەرانی وئارەزووبازی دەکات،ئەمە خۆی خۆشە بەلام زۆرخراپە، چونکە دەبێتە مایەی لەدەست دانی ڕەزامەندی خۆشەویست.

جا کەسی ژیرو هۆشیار دووربینانە لەشتەکان دەکۆڵێتەوە هیچ کاتێك خۆشی یەکی هەمیشەیی ناکاتە قوربانی خۆشیەکی کاتی.

جا حاڵەتەکان چوار جۆرن:_

**١- خۆشویستراوێک بمان گەیەنێتە بەخۆشەویستراو.**

**٢- ناخۆشی یەک دەمان گەیەنێت بە ناخۆشی.**

**٣- ناخۆشی یەک دەمان گەیەنێت بەخۆشەویستراو.**

**٤- وەخۆشویستراوێک دەمانگەیەنێت بەناخۆشی.**

**١- خۆشویستراوێک بمانگەیەنێت بە خۆشویستراو:**

ئەم جۆرەیان لەهەردوولاوە خێرو چاکەیە و پێویستی بەئەنجام دان هەیە.

**٢- ناخۆشی یەک دەمان گەیەنێت بە ناخۆشی.**

ئەم جۆرەیان لەهەردوولاوە خراپە و پێویستە دەستی لێ هەڵبگرین ولێی دووربکەوینەوە.

پاشان دووبەشەکەی تر ماوە کە بریتین لە:_

**٣- ناخۆشی یەک دەمان گەیەنێتە خۆشەویستراو:**

**٤- خۆشویستراوێک دەمان گەیەنێت بەناخۆشی:**

جا مرۆڤ لەدونیادا هەمیشە لەنێوان ئەم دووانەیاندا کێشمەکێش دەکات، جارێك بەم لاو جارێك بەولا دەکەوێت ، مرۆڤی هۆشیارو ژیر و باوەڕدار بەلای ئەوایاندا دەڕوات کە لەکۆتایدا دەگات بە خۆشەویستراوەکە و خێروچاکەی هەمیشەیی دەست گیر دەبێت ، بەلام مرۆڤێك حەزو ئارەزوو و دەروون پێشەوایەتی بکات ئەوا بەلای خۆشیە کاتیەکەدا دەچێت وسەرئەنجام وزەرەرمەند دەبێت.

## خۆشەویستی بنەڕەتی خواپەرستی یە

جـا ئەگـەر خۆشەویـستی بنـەڕەتی هـەموو کـارێکی حـەق وڕاسـتی بێـت ، ئـەوا خۆشەویـستی خـوداو پێغەمبەرەکـەی بنەغـەو بەنـەمای هـەموو کـارێکی ئـاینی یـە، جـا بنـەمای هـەموو کـارێکی ئـاینی بـریتی یـە لـە خۆشویـستنی خـوداو پێغەمبـەری خـودا. وەبنـەمای هـەموو ووتەیـەکی ئایینی بریتی یە لە بەڕاست ودروست زانینی خوادو پێغەمبەری خودا.

جـا هـەر ویـست وئیرادەیـەك ڕێگـری کـرد لـەدەربڕینی تـەواوی خۆشەویـستی بـۆ خـودا ، وەهـەروەها هـەر گومانێـك ڕێگـری کـرد لەبەڕاسـت زانـینی خـودا، ئـەوا زەرەرمەنـدە بـە بنـەڕەتی بـاوەڕ لاوازی دەکـات. جـا ئەگـەر لـەو حاڵەتـەوە تەشـەنەی کـرد وگەیـشتە ئاسـتی خـۆش نەویـستنی خـودا و بەڕاسـت نـەزانینی پێغەمبەرەکـەی ، ئەوادەبێتـە کـافرو گومڕاو هاوبەش بڕیاردەر.

لە پێداویستیەکانی خۆش ویستنی خودا:

### دۆستایەتی ودژایەتی کردن

واتـە پێداویـستیەکانی خـۆش ویـستنی خـودا بـریتی یەلـە دۆسـتایەتی وپـشتیوانی کردنـی خۆشەویـستانی خـودا، دژایـەتی کردنـی ناحـەزان ودوژمنـانی خـودا. وەئـەم دووکـارە دژاودژی یـەکترن، واتـە دۆسـتایەتی خۆشەویـستانی خـودا ناکرێـت هـەتاکو دژایـەتی ناحـەزانی خـودا نەکـەیت. هـەروەکو خـوای گـەورە سـەبارەت بەپێـشەوای خۆشەویـستمان بـاس دەکات، ابراهیم کە ڕوودەکاتە گەلەکەی دەڵێت: (قَـالَ أَفَـرَأَيْتُم مَّـا كُنـتُمْ تَعْبُــدُونَ * أَنـتُمْ وَآبَـاؤُكُمُ الْأَقْــدَمُونَ * فَــإِنَّهُمْ عَــدُوٌّ لِّــي إِلَّـا رَبَّ الْعَـالَمِينَ...الـشعراء:٧٥-٧٧) واتـە: ابـراهیم پێتـان دەڵێـت: ئایـا ئێـوە نـابینن چـی دەپەرسـتن؟ "کـەی ئـەم شـتانە شـایەنی پەرسـتنن" بەڕاسـتی

ئێـوەو باوباپیرانتـا بەهەڵـەدا چـوون.ئەوانـەی ئێـوە دەیـان پەرسـتن بەدڵنیاییـەوەدوژمنی مـنن و وەبـەدوژمنی خۆمیـان دەزانم ، جگـە لەپەروەردگاری جیهان نەبێت کەبە تەنها شەیانی پەرستنە.

جـا ئـەم دژایـەتی کردنـەی ابـراهیم (س.خ) زۆر پێویسـتە بـۆ بـەجێ گەیانـدنی دۆسـتایەتی بـۆ خـودا. هـەر ئـەم هەڵوێسـتە جوانانـە بـوو کـە خـوای گـەورە دەیـان کاتـە پێشـەنگ وداوامـان لـێ دەکـات کـە شـوێنیان بکەوین کـە دەفـەرمێت: (قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِـي إِبْـرَاهِيمَ وَالَّـذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَاء مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّـهِ كَفَرْنَـا بِكُـمْ وَبَـدَا بَيْنَنَـا وَبَيْـنَكُمُ الْعَـدَاوَةُ وَالْبَغْضَـاء أَبَـدًا حَتَّـى تُؤْمِنُـوا بِاللَّـهِ وَحْـدَهُ...الممتحنـة:٤) واتـە: بەڕاسـتی ئێـوە لـە"ابـراهیم وشـوێن کـەوتووانی" باشـترین پێشـەنگتان هەیـە، کـەکاتێ ڕوویـان کـردە گەلەکـەیان ووتیـان: ئێمـە بـەرین لـەئێوە ولەوشـتانەش کەلـەجیاتی خـودا دەیـان پەرسـتن ، ئێمـە باوەڕمـان بـەو ئاینـەی ئێـوە نـی یـە. ئـیتر دوژمنایـەتی ورقەبەرایـەتی لـەنێوانمان بـەرپابوو تـا ئەوکاتـەی دەگەڕێنەوەو باوەڕ بەخودای تاك وتەنها دەهێنین.

هەروەها دەفـەرمێت: (وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيـهِ وَقَوْمِـهِ إِنَّنِـي بَـرَاء مِّمَّـا تَعْبُدُونَ * إِلَّا الَّـذِي فَطَرَنِـي فَإِنَّـهُ سَـيَهْدِينِ...الزخـرف:٢٦-٢٧) واتـە: ابـراهیم ڕووی کـردە گەلەکـەی وبـاوکی پێـی ووتـن: مـن بـەریم لەوشـتانەی کەدەیپەرسـتن ، تـەنها خـوای گـەورە نـەبێت کـەمنی بـەدیهێناوە وڕێنمـایم دەکـات ، دواتـر ئـەو ووشـەیەی "یەکتاپەرسـتیەی" هێشـتەوە بـۆ هـۆز وگەلانی دوای خۆی بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە سەر ڕێگەی ڕاست.

**لا إلــه إلا الله....ئــەو ووشــەیە بــوو کــە ئیــبراهیم بــۆ هۆزەکــەی بــەجیّ هیٚشت**

واتــە ئیــبراهیم جگــە لەپەرســتنی خــودای تاقانــە دژایــەتی ســەرجەم پەرســتراوەکانی دەکــرد، وەســیەت وپــەیمانێك بــۆ هــۆز وگەلەکــەی وســەرجەم پێغەمبــەرانی پــاش خــۆی بــە جێهێشــت کــە درێــژە بــە کــاروانی یــەکتا پەرســتی بــدەن ، کەئــەو وەســیەت و ووشــەیە بــریتی یەلــە "لا إلــە إلا الله".

ئەمــە ووشــەیەکە ســەرجەم بونــەوەری لەســەر دامــەزراوە ، وەژیــانی پــیّ هاتووەتــە کایــەوە، وەقیبلــەی لەســەر دروســت کــراوە ، وەئــەو ووشــەیەی کــە خــوێن ومــاڵ وگیــانی پــیّ دەپارێزرێــت، بەختــەوەری وسەرشــۆڕی ســەرجەم مرۆڤایــەتی لەســەر بەنــدە، بەهەشــت وخۆشــیەکان ودۆزەخ وناخۆشــیەکانی لەســەر بنیــات نــراوە، کەمایــەی خــۆش گــوزەرانی هەتاهــەتای بەندەکانــە ،کۆڵەکــەی ســەرجەم ئــاین وخواناســانە. (مــن کــان آخــر کلامــە لاالــە الا الله دخــل الجنــة) [1] واتــە: هەرکەســێك دوا ووشــەی "لا إله إلا الله" بێت دەچێتە بەهەشتەوە.

**ڕوح ونهێنی ئەم ووشەیە**

واتــە بــەتاك زانــینی پــەروەردگارو بــە پــیرۆز ڕاگرتنــی نــاو وناکــارە جوانــەکانێتی، بــەرزڕاگرتنی پەیامەکەیــەتی وتــرس وتکــاکردن لیّــی، واتــە پشــت پــیّ بەســتن وڕووتــیّ کــردن وگەڕانــەوە بــۆ لای ئەوزاتــە، وەخــۆش ویســتن ودژایــەتی کردنــی غــەیری ئــەوە. بەتــەنها ترســان لەئــەو وگــویّ نــەدان بەســەرجەم کەســانی تــر، ســوژدەبردن وقوربــانی دان وملکەچــی کــردن وبەڕاســت زانــین وهانــاو هــاوار بــۆ کــردن وپــەناپیّ گــرتن و تــەنهاو تەنها بۆ ئەوزاتە پیرۆزە.

---

[1] -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(احمد: ٥/٢٣٣- ٢٤٧)وە(حاکم:١/٣٥١) گێڕایانەتەوە.

کە هەرهەمووی لە پوختەی یەك ووشەدا كۆدەبێتەوە ، کە ئەویش هیچ پەرستراوێك نی یە بەڕاستی شایەنی پەرستن و خوایەتی بێت، تەنها "الله" نەبێت.

هەر لەبەر گرنگی وپڕوپوختی و واتا جوانەکانێتی ، ئەوکەسەی ئەم گەواهیە وشایەتی یەبدات وکاری پێ بکات ، جەستەی قەدەغەکراوە لەوەی کەئاگر بیسوتێنێت. هەروەها خوای گەورە دەفەرمێت: (وَالَّـذِينَ هُـم بِـشَهَادَاتِهِمْ قَـائِمُونَ...المعـارج:٣٣) واتە: کار بەناوەڕۆکی ئەم شایەتیە بکەن بەنهێنی وئاشکرا لە جەستەو دڵ ودەروندا.

جا خەڵکانێکی زۆر هەیە شایەتیەکەیان مردو وبێ گیانە، وەهەیە شایەتیەکەی نوستووە ،ئەگەر بەئاگابێتەوە وەیان نا، وەهەیانە شایەتیەکەی ڕاکشاوە، وەهەمانیشە شایەتیەکەی ئامادەو ڕاوەستاوە هەمیشە لەسەر پێی یە، نمونەی ئەم شایەتیە هاوشێوەی گیانە بۆ جەستە. کەسی وامان هەیە ڕوحی مردووە ، وەهەیە ڕوحی نەخۆشە ونزیکە لە مردنەوە ، وەڕوحی وامان هەیە خەریکە بەئاگادێتەوە، بەڵام ڕوحی واشمان هەیە دروست وپوختە بزوێنەری جەستەیەو کاری خۆی دەکات.

وەلە فەرموودەی (صحیح) دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إني لأعلم كلمة لايقولها عبد عند الموت إلا وجدت روحه لها روحا)[1] واتە: من ووشەیەك دەزانم گەر مرۆڤ لەسەرەمەرگیشدا بیڵێت ، ئەوا ڕوحی زیندوو دەبێتەوە.

---

[1] - ئەم فەرموودەیە(حسن)ە،(احمد: ٣٧/١)وە(ابن ماجە:٣٧٩٥)وە(البانی)لە (صحیح جامع)دا هێناویەتی.

واتە ژیانی ڕوح بەندە بەو ووشە سەرسوڕێنەرەوە ، هەروەکو چۆن ژیانی جەستە بەندە بەڕوحەوە.

## ژیانی بەختەوەی لەدونیاو قیامەتدا

هەر کەسێك لەم ژیانەدا بۆ ئەم ووشە پرشنگدارە بژێت و وەتێ بکۆشێت وبمرێت ، ئەوا ژیانی بەختەوەری هەمیشەیی لەقیامەتدا بەدەست دەهێنێت.: (وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى * فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى...النارعات:٤٠-٤١) واتە: هەرکەسێ لەخوای خۆی بترسێت وبەڕاستی ملکەچی بکات، وەڕێگری لەسەرکەشی دەرون بکات ، ئەوا لەقیامەتدا پاداشتی بەهەشتی بەرینە بە بەختەوەری تێیدا دەژێت.

وەلە ژیانی ئەم دونیایەدا لەبەهەشتی گەڕان وپشکنین ودۆزینەوەی ڕاستی وحەق ودادپەروەریدا ژیاوە ، بەهەشتی تامەزرۆی بۆ دیداری ڕاستەقینەی خوای گەورە ژیان لە ژێر سایەی ڕەزامەندیدا. ئەمە سروشتی سەرەتای هەموو خۆشی یەکە لەژیاندا، کە پێشەکی یەکەی بەهەوڵ وماندووبوون وشەونخونیوئارامگرتن دەست پێ دەکات وەلە کۆتایدا بەختەوەری بەدەست دەهێنێت.

هەرچەندە خوانەناسان لەخۆشیەکانی ژیاندابن ،بەلاّم ژیانیان بێ ئامانج وبێ ئاکام وبێ مەبەستە. (مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً...النحل:٩٧) واتە: هەرکەسێك کاری چاکەخوازی بکات وبڕواداربێت ئەوا ژیانێکی پڕبەختەوەری پێ دەبەخشین.

وەبەختەوەری ژیان بریتی یەلەبەهەشتی دونیا: (فَمَن يُرِدِ اللّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا

حَرَجًا...النعام:١٢٥) واتە: هەر کەسێك خوای گەورە بیەوێت هیدایەتی بدات ، ئەوا سینەی ساف وپاك وئامادە دەكات بۆ ئیسلام، ئەو کەسەش خوای گەورە بیەوێت گومڕای بکات ، ئەوا دڵی دەگوشێت وسنگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەبێت، هەروەکو بڵێیت بۆ ئاسمان بەرز بکرێتەوە.

مرۆڤی بڕوادار هەمیشە دەرونی ئارام ودڵ ودەرونی پاك وبیرتیژ وگەش بینە وەچاکە خواز ودڵنیایە ، ئەمەش هۆکارەکانی بەختەوەری ئەم دونیایە ، کەپەیوەندی هەمیشەیی بەخوداوە هەیە وساتێکیش لێی بێ ئاگانابێت، جا پێغەمبەرﷺ دەفەرمێت: **(اذا مررتم بریاض الجنة فارتعوا ، قالوا: وما ریاض الجنة؟ قالﷺ: حلق الذكر)**[1] واتە: ئەگەر گەیشتن بەباخچەکانی بەهەشت بەشی خۆتان بەرن، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خودا کامە باخچەکانی بەهەشتە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کۆڕەکانی یادی خودایە.

هەروەها دەفەرمێت: **(ما بين بيتي ومنبري روضة من رياض الجنة)**[2] واتە: لەنێوان ماڵەکەم بڵندگۆی مزگەوتەکەمدا ،باخچەیەکە لەباخچەکانی بەهەشت. هەروەها کاتێك لێیان پرسی کەبۆچی هەمیشە بەردەوام دەبیت لە ڕۆژووگرتن و نان وئاونەخواردن. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **(إني لست كهيئتكم ، إني اظل عند ربي يعطمني ويسقيني)**[3] واتە: من وەك ئێوە نیم ، من لای خوای خۆم دەمێنمەوە، ئەو خواردن وخواردنەوەم پێ دەبەخشێت.

---

[1] – ئەم فەرموودەیە (ضعیف الأسناد)ە،(ترمذي:٣٥٠٩)و(احمد: ٣/١٥٠)وەبڕوانە(السلسلة الضعیفة)ی(البانی: ١١٥٠).

[2] –ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ١١٩٥)وە(مسلم: ١٣٩١) گێڕایانەتەوە.

[3] –ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ١٩٦٤)و(مسلم: ٧/٢١١نووی) گێڕایانەتەوە.

لێــرەدا پێغەمبــەرﷺ مەبەســتی ئەوەیــە مانــەوەی لــەیادو زیکــری خــودای خــۆی برســێتی وتــونێتی نامێڵێــت ، وئــەم کــارە تــەنها تایبەتــە بــە پێغەمبەری خودا، وەك خۆی فەرمووی ،بۆ کەسیتر نی یە.

## ژیانی ڕاستەقینە، ژیانە لەگەڵ خودا

ئــەم ژیانــە نهــێنی یــەکی گەورەیــە ، بەختــەوەری تێیــدا ئــەو نێــچیرە ڕاونەکراوەیــــە کەســــەرجەم مرۆڤایــــەتی بەدوایــــدا وێڵــــن. بەختــــەوەری هەمیــشەیی لەناســین ودۆزینــەوەی حــەق وڕاســتی دایــە ، کەبــەو پــێ یــە لەســــەرجەم نهــــێنی یــــەکانی ژیــــان دەگــــەیت. ناســــین وژیــــان لەگــــەڵ بەدیهێنــــــەری ئــــــەم بونــــــەوەرو ڕێکخــــــەری ســــــەرجەم بڕیارەکــــانی ، گەورەترین دەستکەوت وئامانجە مرۆڤ پێی بگات.

هــەر شــتێك لــەم ژیانــەدا گــرنگ وجێــی بایــەخ بێــت ،لەدەســت دانــی زەحمــەت دەبێــت.وەهــیچ شــتێك نــی یــە جێــی بایــەخ وگــرنگ بێــت بــۆ مــــرۆڤ جگــــە لــــەژیان لــــەژێر ســــایەی ڕەحمــــەت ومیهرەبــــانی خــــودای گەورەدا ، کەبەدیهێنەری هەموو بونەوەرو ژیانە.

ئەمــە بەختــەوەری ڕاســتەقینەیە ، بەلەدەســت دانــی ئــەم ڕاســتی یــە مــرۆڤ ســەرگەردان وبــێ هــودەو بــێ ئامــانج دەبێــت و وەهــیچ واتایــەك بــۆ ژیــــان وبەختــــەوەری نامێنێتــــەوە وبەهاوشــــێوەی سەرخۆشــــێکی بــــێ چــارەی لــێ دێــت، کەهەمیــشە بــێ ئاگایــە لەڕاســتی یــەکانی ژیــان ، کاتێــك کــەهۆش دەکاتــەوە قیامــەتی بەســەردا هــاتووە و ڕاســتیەکان دەردەکــەون، ئەوســاتە توشــی ســزاو ئەشــکەنجەی هەتاهــەتای دەبێــت. ئــازاری دەرونــی ولەدەســت چــوون وبەفیڕۆچــوونی ژیــانی شــاڵاوی بــۆ دەهێنێــت وەلــە پــەل وپــۆی دەخــەن. کــە ســەرقاڵی دونیایــەکی بــێ

ئـەنجام بـووە ، قیامـەت وخواناسـی لەدەسـت داوە. جـالێرەدا پێویسـتە مـرۆڤ پـێش گەیشـتنی بـەم دیمەنـە جـەرگ بڕانـە زوو بێتـەوە ئاگـاو فریـای ژیـانی خـۆی بکـەوێت ، گـەورەترین حـەق وڕاسـتی بناسـێت لـە ژێر سایەیدا بەکامەرانی بژێت.

وەلـە (أثـر) ێکـی خـوایی هـاتووە: (أبـن آدم خلقتـك لعبـادتي فـلا تلعـب، وتكفلـت برزقـك فـلا تتعـب، أبـن آدم، اطلـبني تجـدني، فـإن وجـدتني وجـدت كـل شـيء ، وإن فاتـك فاتـك كـل شـيء ، وانـا أحـب إليـك مـن كـل شـيء) واتـە: ئـەی ئـادەمیزاد. مـن تـۆم بۆخـودا پەرسـتی دروسـت کـردووە ، یـاری مەکـە. ڕزق وڕۆزیـم بـۆدابین کـردووی، بەشـوێنی دا مانـدوو مەبـە. ئـەی ئـادەمیزاد ئەگـەر بەشـوێنمدا بگـەڕێیت دەمدۆزیتـەوە، ئەوسـاتە هـەموو شـتێك دەدۆزیتـەوە، وەئەگـەر دۆزینـەوەی منـت لەدەسـت چـوو ، ئـەوا هـەموو شـتێکت لەدەسـت دەچێت ، وەباش بزانە من لەهەموو شتێك باشترم بۆتۆ.

## لە بنەڕەتدا خۆشەویستی تەنها شایەنی خودای گەورەیە

وەك پێشـتر باسمـان کردخۆشەویسـتی نـاوێکی گشـتگیرە وچـەندین جـۆر نـاوی لـەژێردا کۆدەبێتـەوە. جـا جـۆرە بـە نـرخ وبـەهاکانی خۆشەویسـتی تـەنها شایسـتە وشـایەنی خـودای گەورەیـە و بۆکـەس وشـتی تـر دەسـت نـادات، وەك پەرسـتن وگەڕانـەوەو...هتـد. تـەنها بـۆ خـۆی بـەکاردەهێنرێت ، کەدەفـەرمێت: (فَسَـوْفَ يَـأْتِي اللّـهُ بِقَـوْمٍ يُحِـبُّهُمْ وَيُحِبُّونَـهُ... المائـدة:٥٣) واتـە: خـوای گـەورە پێرێکـی تـر دەهێنێتـە سـەر شـانۆی ژیـان، کەبەتـەنها خـوای گـەورەیان زۆر خـۆش دەوێت، وەخوایش ئەوانی خۆش دەوێت.

وەهەروەها دەفەرمێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبّاً لِّلّهِ...البقرة:١٦٥﴾ واتە: هەندێ کەس دەچن هاوشێوەو هاوەڵ بۆ خودا بڕیاردەدەن وبەئەندازەی خودا خۆشیان دەوێت ، بەڵام باوەڕداران خودایان لەهەموو کەس زیاتر خۆش دەوێت بەئەندازەیەکی یەکجار زۆر.

**ناپەسەندترین جۆری خۆشەویستی:**

ئەو جۆرە خۆشەویستی یە کە کەسێکی تر بەئەندازەی خودای گەورە خۆش بوێت، واتە یەکسانی ئەنجام بدەیت لە خۆشویستنیاندا.

**پەسەندترین جۆری خۆشەویستی:**

ئەو خۆشەویستی یەیە کە بەتاك وتەنها خوای گەورەت خۆش بوێت ، وەئەو شتانەشت خۆش بوێت کە خودا خۆشی دەوێت. ئەمە بنەمای هەموو خۆش گوزەرانیەکە لەهەردوو دونیادا، وەتاکە هۆکاری ڕزگاربوونە. بەپێچەوانەوە خۆشەویستی هاوبەشی مایەی سەرگەردانی وتیاچوونە.

**قورئان فەرمان بەم خۆشەویستی یە دەکات:**

قورئانی پیرۆز زۆر بەوردی باس لەهەردوو جۆرەکەی خۆشەویستی دەکات و نمونەو چیرۆکی لەسەر دەهێنێتەوە ، هەروەها سیفات وئاکاری هەردووکیان دەخاتە ڕوو، پاشەڕۆژی هەریەکەیان دەست نیشان دەکات لەدونیاو قیامەت وبەرزەخدا.وەسەرجەم بڕیارو فەرمانەکانی هانی خۆشویستنی پاك وپوخت دەدات تەنها بۆ خوای گەورە و بەدوور گرتن لەهاوبەشی بڕیاردان بۆی.

**خۆشەویستی بنەڕەتی بانگەوازی سەرجەم پێغەمبەرانە:**

سـەرجەم بانگـەوازیان بـۆ یکتاپەرسـتی خـودای گـەورە کـردووە کـە بــریتی یــە (لــە تــەواوی ملکەچــی) بــۆ خــودا. وەخۆپاراســتن لــە سنوورەکانی گوێڕایەڵی کردنێتی.

وەلــە (صــحیحین) دا هــاتووە لــە فــەرموودەی"أنــس ﷺ" کــە پێغەمبــەرﷺ فەرموویــەتی: (والــذي نفــسي بيــده لايــؤمن أحــدكم حتــى اكــون أحــب إليــه مــن ولــده ، و والــده والنــاس أجمعــين) [1] واتــە: ســوێندبێت بەوکەســەی گیــانی منــی بەدەســتە ،هــیچ کــام لــەئێوە باوەڕتــان تــەواو دامــەزراو نــی یــە، گــەر مــن تــان لــەخۆتان ومنــداڵ ودایــك وباوکتان وسەرجەم خەڵکی خۆشتر نەوێت.

وەلــە (صــحيح البخــاری) دا هــاتووە کــە عومــەری کــوڕی خــەتاب دەڵێــت: والله ی پێغەمبــەر مــن تــۆم لەهــەموو کــەس زیــاتر خــۆش دەوێــت ، تــەنها لــەخۆم نــەبێت. پێغەمبــەرﷺ دەفــەرمێت: (لا یــا عمــر حتــى اکــون أحــب إليــك مــن نفــسك) واتــە: نــابێ ئــەی عومــەر دەبێــت منــت لــەخۆت زیــاتر خــۆش بوێــت. عومــەری کــوڕی خــەتاب دەڵێــت: ســوێند بەوکەســەی کــەتۆی بەحــەق وڕاســتی ڕەوانــە کــردووە مــن تــۆم لــە خۆیــشم زیــاتر خــۆش دەوێــت. پێغەمبــەرﷺ دەفــەرمێت: (الآن یــاعمر) واتە: ئێستا باوەڕت تەواوە ئەی عومەر.[2]

جــا ئەمــە پلــەو پایــەی پێغەمبــەری خــەودا بێــت کــە پێویــست کــات لــەخۆت ومــاڵ ومنــداڵ وســەرجەم کــەس وکــار زیــاتر خۆشــت بوێــت، ئــەی دەبێــت خــۆش ویــستنی خــودا چــۆن بێــت؟ بــەڵکو خۆشویــستنی خــودا پێویــستە لەســەرووی هــەموو خۆشەویــستەکانەوە بێــت ،بــەبێ هاوبەشــی

1 -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،(بخاری: ١٥٠)و(مسلم: ١٨/٢نووی) گێڕایانەتەوە.
2 -ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە، پێشتر باسمان کردووە.

وهـــاوەڵ بڕيـــاردان بـــۆى، وەبەتـــەواوى خۆشەويـــستى وگوێڕايـــەڵى بـــۆى ،كەنابێت هەچ كەس وشتێك هاوبەشى بكات.

## خۆشەويستى بنەماو بزوێنەرى هەموو كارو جوڵەيە لە جيهاندا

ســــــەرجەم جوڵـــــە كارەكانىجيهـــــان وبوونـــــەوەر ،بنــــــەڕەتى دەگەڕێتـــەوە بـــۆ خۆشەويـــستى، چـــونكە ســـەرجەم جوڵـــەكانى بوونـــەوەر بەگشتى سىٚ جۆرە:_

1. **جوڵە خۆويستنيەكان**"الإختيارية والأرادية".
2. **جوڵە خۆنەويستيەكان** "القسرية".
3. **جوڵە سروشتيەكان**"الطبيعية".

**١- جوڵە سروشتيەكان**"الطبيعية".

بنـــەڕەتى جوڵـــەى مـــرۆڤ وبونـــەوەر بەگـــشتى بـــريتى يـــە لـــە ســـەقامگيرى وچـــەق بەســـتووى ڕاوەســـتان ونـــەجولاَن. وەكاتێـــك لەچـــەقى ڕاوەســـتاوى سروشتى خۆى دەترازێت ئەوا پێى دەوترێت"جوڵە".

جـا هــەر بــەهۆى ئــەو جوڵەيــەوە دەبێــت كاتێــك دەيــەوێت بگەڕێتــەوە بــۆ دۆخــى سروشــتى چــەق بەســتووى خــۆى. بەمــە دەوترێــت"جوڵــە سروشتى يەكان".

**٢- جوڵە خۆويستنيەكان**"الإختيارية والأرادية".

بـــريتى يـــە لەجوڵـــەوكارێك كـــە خۆويـــستانەو مەبەســـت دارانـــە بـــە ويست وئيرادەى خۆت ئەنجامى دەدەيت.

٣- **جوڵە خۆنەویستیەکان** "القسرية".

بـریتی یـە لەوجوڵەوکارانـەی کـە بـەبێ ویـستی خـۆت ،لـەژێر فـشارو پاڵنەری تردا ئەنجامی دەدیت.

## پوختەی بابەتەکە:

هــەرکارو جوڵەیــەك هەسـت پـێ کـرد ،پێـی دەوترێـت خۆویـستی. وەهـەر کـارو جوڵەیـەکیش هەسـت پـێ نـەکرد ، ئـەوا گـەر گەڕانـەوە بێـت بـۆ دۆخـی پێـشتر پێـی دەوترێـت"سروشـتی"، وەئەگـەر هەسـت پـێ نەکردن وگەڕانەوەش نەبوو ئەوا پێی دەوترێت"خۆنەویستی".

جا پاش سەلماندنی ئەم ڕاستیان ماوەتەوە بڵێن:

ســـەرجەم جوڵـــەوکاری بونـــەوەر وپێکهاتـــەکانی ،وردو درشـــت لـــە ئاسمانـــەکان وهەســـارەو ئەســـتێرە...هتـــد. هـــەروەها باڵنـــدەو ڕووەك و،دابـارین و...هتـد. هـەموو ئـەم جوڵەوکارانـە لـە لایـەن فریـشتەکانی خوداوە ئەنجام دەدرێن،کەتایبەت کراون بۆ ئەم مەبەستە.

وەدەقـی زۆری قورئـان وفـەرموودەمان هەیـە لەسـەر ڕاسـتی ئـەم بابەتـە ، وەباوەڕهێنـان بـەم ڕاسـتیە لـە پێداویـستیەکانی بـاوەڕی ڕاسـت ودروسـتە. جادابـەش بـوونی فریـشتەکان بەسـەر کـارو جوڵـەی بونـەوەر ڕوون وبەڵگـە دارە. کـەخوای گـەورە بـۆ ڕزق وڕۆزی، گیـان کێـشان، گیـان بەخـشین، بـاران، بـا، هـەور...هتـد. پاراسـتنی مـرۆڤ وتۆمـارکردنی چـاکەو خراپـەکانی...هتـد. تەنانـەت کاروبـاری بـەرزەخ وبەهەشـت ودۆزەخ، هـەر هـەمووی سـپێردراوە بـە فریـشتەکان لەلایـەن خوای گەورەوە ،هـەروەکو دەفـەرمێت: (وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا...مريم:٦٤) واتـە: ئـەی محمـد: ئێمـە بەتـەنها فـەرمانی

پەروەردگارت نەبێت دانابەزێن ، هەرچی داهاتوو ورابردوومان و ئەوانەیشی لەنێوانیاندا هەیە، هەر هەمووی بۆ پەروەردگارە، وەئایا پەروەردگاری تۆ هیچ شتێك فەرامۆش بكات؟... (وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاء وَيَرْضَى... النجم:٢٦) واتە: چەندین فریشتەی بەرێزو پایەدار هەیە لەئاسمانەكاندا ، كەهیچیان ناتوانن تكاو شەفاعەت خوازی بكەن ، تەنها بەمۆڵەتی خودای گەورەو فەرمانی ئەو نەبێت.

وەخوای گەورە سوێند بەفریشتەكان دەخوات كەكاروباری بونەوەریان پێ سپێردراوە: (وَالصَّافَّاتِ صَفًّا * فَالزَّاجِرَاتِ زَجْرًا * فَالتَّالِيَاتِ ذِكْرًا... الصافات:١-٣) واتە: سوێندبێت بەفریشتە ڕیزبووەكان. وەبەو فریشتانەش كەتورە دەبن بەسەر ستەمكاراندا"لەسەرەمەرگ وبەرزەخ وقیامەتدا". وەسوێند بەو فریشتانەش كە پەیام دەگەیەنن بەپێغەمبەران و بەسەریاندا دەیخوێننەوە.

(وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا * فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفًا * وَالنَّاشِرَاتِ نَشْرًا * فَالْفَارِقَاتِ فَرْقًا * فَالْمُلْقِيَاتِ ذِكْرًا * عُذْرًا أَوْ نُذْرًا.. المرسلات:١-٦) واتە: سوێند بەو فریشتانەی كەبەكاری چاك ودروست هەڵ دەستن ، كەبەگورج وگۆڵی فەرمانەكانی خودا دەگەیەنن. كە شارو گوندی ستەمكاران خاپوور دەكەن. كە هەور بڵاو دەكەنەوە ویاخود هەموو شتێكی كوت وپڕ دەكەن. كە حەق وناحەق لەیەك جیادەكەنەوە. كەپەیامی خودا دەگەیەنن. كە باوەڕداران بەڵگەدار وبێ باوەڕان وریا دەكەنەوە.

(وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا * وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا * وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا * فَالسَّابِقَاتِ سَبْقًا * فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا... النازعات:١-٥) واتە:سوێند

بـەو فریـشتانەی کـە گیـانی خـەڵکی دەکێـشن. وەبـەو فریـشتانەی کـەگیانی باوەڕشـداران دەکێـشن وهەمیـشە بـێ وچـان دەسـوڕێنەوەو کـەس فـەرامۆش ناکـەن. سـوێن بـەو فریـشتانەی کەبـەخێرایی فـەرمانی خـودا جـێ بـەجێ دەکـەن. وەسـوێند بەوفریـشتانەی کـە گیـانی بـاوەڕداران بـە بەهەشـت شـاد دەکـەن. وەبـەو فریـشتانەی بـە ویـستی خودا کار دەبەنە ڕێوە.

جـا کـەوا بـوو سـەرجەم ئـەم کارانـە لـەوردو درشـتی ، گـەورەو بـچوکی هەرهـەمووی بەشـێوازی پەرسـتن وملکەچـی وگوێڕایـەڵی ئـەنجام دەدەن، چـونکە سـەرجەم ئـەم هـەموو جوڵەوکارانـە چ سروشـتی بێـت یـاخود خۆویـستانە یـان خۆنەویـستانە هەرهـەمووی بـەهۆکاری خۆشەویستی بۆ خودا بەم شێوە دەچن ودەبزوێنرێن.

جا پـاك وبـێ گـەردی بـۆ ئـەو خودایـەی کـە: (تُـسَبِّحُ لَـهُ الـسَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَـيْءٍ إِلاَّ يُـسَبِّحُ بِحَمْـدَهِ وَلَــكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّـهُ كَـانَ حَلِيمًـا غَفُـورًا...الإسـراء:٤٤) واتـە:هـەر حـەوت ئاسمانـەکان وزەوی هـەموو ئەوانـەی کـە تێیـدان ، تەسـبیحات وسـتایش وسـوپاس گـوزاری خـودای تـاك وتـەنها دەکـەن، هـیچ شـتێك نـی یە لـەم بوونـەوەرەدا کـە سوپاسـو ستایـشی ئـەم زاتـە نـەکات، خـوای گەورە هەرخۆی بەگەورەیی خۆی نەرم ونیان ولێ بوردەیە.

## خۆشەویستی و ئیرادە لە پەیوەستیەکانی هەموو مرۆڤێکە

ئەگـەر ئـەو ڕاسـتی یـەمان زانی،هـەموو بونـەوەرێك لەژیانـدا ویـست و خۆشەویـستی هەیـە،وەبگرە سەرچـاوەی هـەموو جوڵـەوکارێکن لـەم ژیانـەدا.جـا چاکـسازی و بەرژەوەنـدی سـەرجەم بوونـەوەر لەوەدایـە کەمەبەسـت و ئامـانجی وئـیرادەی لەهـەموو کـارو جوڵەیـەك دا تـەنها

خۆشەویستی بێت بۆ خوای گەورە. بەتاك و تەنها و بێ هاوەڵ دروست کردن.هەربۆیە خوای گەورە دەفەرمێت: (لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا... الانبياء٢٢:) واتە: ئەگەر بێت و لەژیاندا دوو خوا هەبوایە تەواوی ژیان تێك دەچوو وە دەشێوا.

جا خوای گەورە لێرەدا ئاماژە بەوەدەکات بابەتی بوونی دوو خودای دەبێتە مایەی تێکچون و تیاچوونی ژیان بەگشتی. چونکە لەو ساتانەدا.هەر خوادایەك بۆخۆی هەوڵی بەزاندن و زاڵبوونی دەدا بەسەر ئەوی تردایاخود هەریەکەیان بەجیا بڕیارو دروست کراوی بۆ خۆی بڕیار دەدا.کە ئەمەش مایەی وێران بوونی ژیانە.جاکەوابوو.هاوەڵێتی و هاوبەشێتی بۆ خودا.مایەی کەم و کوڕی و کورتی خودایە.ناشێت و ناگونجێت لەگەڵ کەمال و تەواوێتی خوای گەورەدا.کە هاوبەشی هەبێت هەروەکو چۆن بونی دوو پادشا لە ولاتێك دا مایەی وێران بوون و کاولکاریەتی.وەبوونی دوو ژن لە یەك ماڵ و بۆ یەك پیاومایەی شێوانی ئەو ماڵەیە.وەبوونی دوو هەوێنی لەشیرێکدا مایەی تێکچوونی ئەو ماستە.

## ناکۆکی پادشاکان، بناغەی خراپەکاریەکانی جیهانە

جیاوازی و ناکۆکی و دژایەتی نێوان پادشاو سەرکردەکان سەرچاوەی وێران بوون و کاولکاری وولاتانە.وەهیچ کاتێك ناحەزو دوژمنانی ئیسلام. تەماحیان نەکردۆتە وولات و ژیانمان بەئەندازەی ئەوسەر دەمانەی کە وولات پارچەپارچەدەبێت و هەر پاشاوکاربەدەستێك خۆی لەوی تر بەباشتر دەزانێت و بەرامبەر دەسڕێتەوە.جا ئەگەر بەوردی لەیاسای ژیان و بونەوەر بکۆڵینەوە

بۆمـان دەر دەكـەوێت.كەسـەقام گـیر بـوونی ژیـان لەسـەر یـەك ڕەوت و یاسـا.كەلەلایـەن خودایـەكی تـاك و تـەنهاوە بـەڕێوە دەچـێت. گـەورەترین بەڵگەیـە لەسـەر یـەكتا پەرسـتی و بـێ هـاوەڵی خـودا لـە هـەموو ڕوویەكـەوە...كەتـەنها خـۆی دروسـتكەرو مرێنـەرو ژێنـەرو بڕیـار دەری سـەرجەم بوونـەوەرە. (مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَـا كَـانَ مَعَـهُ مِـنْ إِلَهٍ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَـى بَعْـضٍ سُـبْحَانَ اللَّـهِ عَمَّا يَصِفُونَ * عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَتَعَـالَى عَمَّـا يُـشْرِكُونَ المؤمنـون: ٩١-٩٢) واتـە: هـەرگیز خـوای گـەورە كەسـی نـەكردوە بەڕۆڵـەی خـۆی وە هـیچ خوایـەكی لەگەڵـدا نـی یـە. چـونكە ئەوكاتـە هـەر خوایـەك دەچـوون بـەلای دروسـتكراوەكانی خۆیەوە،وەهەنـدێكی خـۆی بڵنـد دەكرد بەسەر هەندێكی تردا (ئەوسا بوونەوەر تیك دەچوو) .

پـاك و بێگـەردی بـۆ ئـەو خودایـە لـە بەرامبـەر ئـەو شـتانەی كـە (خـوا نەناسـان) دەیلێن،هـەروەها دەفـەرمێت: (أَمِ اتَّخَـذُوا آلِهَـةً مِّـنَ الْـأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ * لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّـا اللَّـهُ لَفَـسَدَتَا فَـسُبْحَانَ اللَّـهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ * لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُـمْ يُـسْأَلُونَ... الأنبيـاء:٢١-٢٢) واتـە: ئایـە خـەڵكی نالـەبار پەرسـتراوی سـاختەیان بڕیـارداوە لـە زەویـدا ئایـە ئەوانـە دەتـوانن ژیـان ببەخـشن.ئەگـەر لەژیانـدا چـەند خودایـەك هەبوایـە جگـە لـە (الله) ئـەوا ژیـان كـاول و وێـران دەبـوو بەسـەر یـەك دا.پـاكی وبێگـەردی بـۆ ئـەو خودایـەی دەڵـێن. پرسـیار ناكرێـت لـەوەی كـە خـودا دەیكـات. لەكاتێكـدا ئـەوان لێپرسـینەوەیان لەگەڵدا دەكرێت.

وە دەفەرمێت: (قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُ آلِهَةٌ كَمَـا يَقُولُـونَ إِذًا لاَّبْتَغَـوْاْ إِلَـى ذِي الْعَـرْشِ سَـبِيلاً...الاسـراء:٤٢) واتـە: ئـەی پێغەمبـەر (د.خ) پێـان بڵـێ: ئەگـەر خوایـەكی تـر هەبوایـە جگـە لـە (الله) وەك ئـەوان دەیڵـێن:

ئەوكاتــە هــەموويان كــێ بڕكــێ و هــەوڵی ئــەوەيان دەدابــۆ ئــەوەی دەســەلاّت لــە پــەروەردگار خــاوەن عــەرش و تــەختی فــەرمان ڕەوايــەتی ببەن و لێی زەوت بكەن.

.ســەبارەت بەبڕگــەی (لاتغبــوا) واتــە هــەر يەكــە هــەوڵی زاڵبــوون دەدات بەســەر ئــەوی تــردا بــەزۆر و زەبەنــد هــەروەكو هاوشــێوەی پادشــاكانی ســەر زەوی وە بەڵگــەش لەســەر ئــەم بۆچــوونە ئــەم ئايەتەيە كە دەفــەرمێت: (وَلَعَلَا بَعْضُــهُمْ عَلَــى بَعْــضٍ المؤمنــون....: ٩١) واتە: هەندێك خۆيی بلّند دەكرد بەسەر هەندێكی تردا.

وەشــيخ الاســلام (ابــن التميــە) دەڵێــت:واتــای (لا تبغــوا إليــە ســبيلا) واتــە بــەنزيك بوونــەوە لێــی و ملكەچــی كردنــی.جــا چــۆن جگــە لــە خــودا ئــەوان دەيپەرســتن؟هەروەها ئەگــەر ئــەوان خــودا بــن وەك خۆيــان دەڵێن ئــەوا دەبوونــە بەنــدەيان.وە بەڵگــەش لەســەر ئــەم باســە لــە چــەند ڕوويەكەوە:.

يەكەم:خــوای گــەورە دەفــەرمێت: (أُولَـــئِكَ الَّـــذِينَ يَـــدْعُونَ يَبْتَغُـــونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُـــمْ أَقْـــرَبُ وَيَرْجُـــونَ رَحْمَتَـــهُ وَيَخَـــافُونَ عَذَابَـــهُ إِنَّ عَذَابَ رَبِّـــكَ كَـــانَ مَحْـــذُورًا....الاســـراء:٥٧) واتــە: ئەوانــەی كــە ئێــوە دەيــان پەرســتن و بــە خودايــان دەزانــن. لەبنەڕەتــدا ئــەوانيش هــەر بەنــدەی مــنن وەكــو ئێــوە لــەمن دەترســن بــە ئومێــدی ڕەحــم و بــەزەيی منن.جائيتر بۆچی دەيان پەرستن؟!

دووەم:خــوای گــەورە لــەم ئايەتــەدا نافــەرمێت: (لابتغــوا عليــە ســبيلا) بــەڵكو دەفــەرمووێت (لابتغــوا إليــە ســبيلا) واتــە:ئــەم ووشــەيە بــۆ نزيــك بوونەوەيــە. هــەروەكو دەفــەرمێت: (اتَّقُـــواْ اللّـــهَ وَابْتَغُـــواْ إِلَيـــهِ الْوَسِـــيلَةَ...مائـــدة:٣٥) واتــە: لــەخوا بترســن و خۆتــان بپــارێزن لەڕێگــەی

هەموو هۆکارو کردەوەیەکی چاکە وە هەوڵبدەن ڕەزامەندی خودا بەدەست بێنن.

بەلاَم بۆزاڵ بوون ئەوا (على) بەکار دەهێنێت.وەك دەفەرمێت: (فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً...النساء:٣٤) واتە: ئەگەر ئافرەتەکانتان گوێڕایەڵتان بوون چی تر ڕێگەی تر مەگرنە بەر بۆ ئازار دانیان و چەوسانەوەیان وزاڵ بوون بەسەریاندا.

سێیەم:ئەوان بەم ووتانەیان ئەیان ووتوە: کە خوداکانیان داوای بڵندی لە خوای گەورە دەکەن.بەڵکەو ئەوان دەڵێن:خواکانی ئێمە دەیانەوێت لە خوای مەزن نزیك ببنەوەو ئێمەش نزیك بکەنەوە بەلاَم خوای گەورە دەفەرمێت: (قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُ آلِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ...الاسراء:٤٢) واتە: پێیان بڵێ:وابێ وەك دەڵێن:ئەو خوایانە بەندەی خوای مەزنن.باشە بۆچی بەندەی خوا دەپەرستن ؟ بۆ ڕاستەوخۆ خودی خودا خۆی نا پەرستن؟

## پەیوەستی یەکانی خۆشەویستی

خۆشەویستی بە هەردوو بەشەکەیەوە بە (چاك و خراپ) وە شوێنەوارو کاریگەری یاسایی خۆیی هەیە.لە:شادی و ئارەزوو،چێژو،تامەزرۆیی و،گونجاندن و،ژووان و، دابڕان و،خۆشی و ناخۆشی فرمێسك و خەندەو...هتد لەنەریتەکانی.

## خۆشەویستی باش و خۆشەویستی خراپ

خۆشەویستی باش:ئەو خۆشەویستی یە بەرژەوەندی دونیاو قیامەتی تێدایە،وەبەو خۆشەویستی یە دەوترێت خۆشەویستی بەختەوەری.

خۆشەویستی خراپ:ئەو خۆشەویستی یە کەزەرەرمەندی دونیاو قیامەتی تێدایە،بەسەر گەردانی ناسراوە.جا هەر مرۆڤێك ڕەچاوی بەرژەوەندیەکانی بکات ئەوا مرۆڤێکی وشیارو ژیرە.وەبە پێچەوانەوە هەر مرۆڤێك کار لەسەر زەرمەندیەکانی بکات ئەوا نەفام و گێل و ساویلکەیەو ستەم کارە.چونکە دەرونی مرۆڤ هەمیشە ئەو شتە هەڵدەبژێرێت کە لە زەرەر مەندێتی.ئەمەش ستەمی مرۆڤ لەخۆیی دەیکات.بەڵام ئەگەر لەو هەڵبژاردنەدا بێ ئاکام بوو لەوەی کە ئەم کارە خۆشەویستی یە زەرەرێتی ئەوا ئەو کەسە گێل و گەوجەیە.وبەندەی ئارەزوەکانێتی. بەڵام ئەگەر زانیاری تەواوی هەبوو لەژیان زەرەرمەندی ئەو کارە خۆشەویستی یە.بەڵام هەر شوێنی کەوت و بەگوێی دەرونی خۆیی دەکرد ئەوا ستەم کارە. ئەو ساتە پێکهێنەرەکانی ئەو خۆشەویستی یە دوو بنەمای سەرەکین (بیرو بۆچونێکی خراپ و ئارەزوویەکی ناپەسەند) کە لێرەدا (گومان و حەز) یەکدەگرن و هاوکاری یەکتری دەکەن، جوانکاری بۆ کارە ناپەسەندەکان دەکەن و ناشرین و ناپەسەندن-جوان پەسەندار دەکەن. (حەز) داوای مافی خۆیی دەکات وە (گومان) کار ئاسانی بۆ دەکات.واتە سوپای (حەز و ئارەزەوو) هێرش دەکەنە سەر سوپای (ژیر و باوەڕ) و جەنگ بەر پا دەبێت.وە سەر کەوتن بۆ بەهێزترینیانە.جا کاریگەری و شوێنەواری هەر یەکە لەو جۆرە خۆشەویستی یە نەریت و یاسای خۆیی.بەپێی ئەو یاسایە شوێنەواری خۆیی لەسەر کەسەکە دیاری دەکات. جاخۆشەویستی چاك:کەمایەیی بەختەوەری سەر فرازی خاوەنەکەیەتی.شوێنەوارو کاریگەریەکانی هەر هەموو سوود بەخشن چ بگیرێت-پێ بکەنێت- دڵ تەنگ بێت...هتدبگرە لە پلەکانی ئەم خۆشەویستی یەدا سەر دەکەوێت و سودمەند دەبێت.

بەڵام خۆشەویستی خراپ:کە مایەی چەرمەسەری یە شوێنەوارو کاریگەریەکانی هەر هەمووی زیان بەخشن. دەبێتە مایەی دوری لە پەروەردگاریەوە. هەمیشە لە خەسارەت مەندیدایە.ئەمە سروشتی هەموو کارێکە کە سەرچاوەی لە ملکەچی و سەر پێچی یەوە وەر گرتبێت.ئەوەی لە ملکەچیەوە سەرچاوەی وەرگرتبێت هەمیشە هێزو ووزە بەخشە و ڕێزە بۆ خاوەنەکەی وە ئەوەی کەسەرچاوەی لە سەر پێچیەوە وەرگرتبێت ئەوا هەمیشە خەسارەت مەندو زیان بەخشە بۆ خاوەنەکەی. خوای گەورە دەفەرمێت: (ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ لاَ يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلاَ نَصَبٌ وَلاَ مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَطَؤُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلاَ يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلاً إِلاَّ كُتِبَ لَهُم بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ إِنَّ اللّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ * وَلاَ يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلاَ كَبِيرَةً وَلاَ يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلاَّ كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ اللّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ....التوبة: ١٢٠ ـ ١٢١) واتە: بەڕاستی هیچ تینویەتی و ماندوبوون و برستیە کیان تووش نەدەهات لەپێناوی خودا بەزایە بچێت، وەنەدەچوونە هیچ شوێنێك و پێیان نەدەخستە هیچ جێگەیەك بیێ باوەڕان پێی سەغڵەت بن و دەستیان لەهیچ دوژمنێك نەدەوەشاند کە نەبێتە هۆی ئەوەی بەکارو کردەوەیەکی چاك بۆیان تۆمار نەکرێت بەڕاستی خودا پاداشتی چاکەکاران چەند قات دەکات.هەروەها هیچ بەخشیشێکیان پێشکەش نەدەکردبچووك یان گەورە،وە بەهیچ دۆڵ وشوێنێکدا تێنەدەپەڕین بەچاکە بۆیان تۆمار نەکرێت، تاخوا بەچاکترین شێوە پاداشتی ئەوکردەوانەیان بداتەوە دەیان کرد.

جالێرەدا خوای گەورە لە ئایەتی یەکەمدا ئاماژە بۆئەوە دەکات هەرچی کارێك سەرچاوەکەی لە ملکەچی یەوەبێت بەکردەوەی چاکە

بۆیـان دەنوسـرێت. وەلـە ئایـەتی دووەمـدا. ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەكـات ئـەو كـردوە چـاكانەی كـە ئـەنجامیان داوە هـەموویانیان بەگرانبـەهاترین بـۆ دەنوسرێت.

جیـاوازی نێوانیـان: لـە ئایـەتی یەكەمـدا كردەوەكـان هـێن خۆیـان نـی یـە بـەڵكو سەرچـاوەی لـە ملكەچـی یەوەیـە بـەلاَم لەئایـەتی دووەمـدا. كارەكە كاری خۆیانە هەر بەچاكە بۆیان نووسیووە.

**واتایی ئایین**

پوختــەی هــەموو ئاینێــك بــەبێ ڕەچــاوكردنی ڕاســتی و دروســتی بریتـی یـە لـە خۆشەویـستی و ئـیرادە چـونكە ئـاین پێكـدێت لـە كـردەوە نــاخی و ڕواڵــەتی یــەكان كەئەمــەش ڕاســتەوخۆ پەیوەنــدی بــە خۆشەویـستی و ئـیرادەوە هەیـە.كەواتــە ئـاین:ملكەچــی و پەرســتن و ڕەوشـتە.ئـەو ملكەچـی یـە كـە دواتـر دەبێتـە خورەوشـت و نـەریت.هـەر بۆیـە هەنـدێك ڕەوشـت بـەرزی بـە ئـاین لێكدەدەنـەوە.كـە دەفـەرمێت: (وانك لعلــى خلــق العظـيم...القلــم:٤) واتـە: بەڕاسـتی ئـەی محمـد تـۆ لەسەر ڕەوشت بەرزیت.

(امــام احمــد) لــە (ابــن عینــە) دەیگێڕێتــەوە. كـە (ابــن عبــاس) لەســەر ئـەم ئایەتــە وتویـەتی واتــە: (ئــەی محمـد تـۆ لەسـەر مـەزنترین ئـاینی) وەكـاتێ لـە (خـاتو عایـشە) یـان پرسـی سـەبارەت بەڕەوشـتی پێغەمبــەر (د.خ) ئــەویش لــە وەلاَمــدا دەڵێــت: (كــان خلقــە القــران[1]) واتــە:ڕەوشـتی پێغەمبـەر (ﷺ) قورئـان بـوو.هـەروەها "ئـاین" چـەندین واتــای تــر لــەخۆ دەگرێــت لەوانــە ناچــاركردن و كەســاس كــردن

---

[1] -ئەم فەرموودەیە(صحیح) ە ،(مسلم ٦/٣٠-٣١- نووی) گێراویەتیەوە.

وەکەساسی و گوێڕایەڵی و ملکەچی.جاکەسی دیندار لەناخەوە پێویستی بەخۆشەویستی و ملکەچی یە وەك پەرستن.بەپێچەوانەی دینداری ڕواڵەتی کە هەر چەندە گوێڕایەڵی و کەساسی پێوە دیارە. بەلاّم مەرج نی یە خۆشەویستی لەگەڵ دا بێت.هەر بۆیە خوای گەورە بەڕۆژی قیامەت دەڵێت (یوم الدین) واتە لەو ڕۆژەدا خەڵکی لەسەر بنەمای کردەوەکانی نا چار دەکرێن و پاداشتی کردەوەکانیان دەدرێنەوە. هەر بۆیە بە (یوم الدین) دەوترێت: ڕۆژی سزاو پاداشت. وە خوای گەورە دەفەرمێت (فَلَوْلَا إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ...الواقعة:٨٦) واتە: جا ئەگەر ئێوە سزاو پاداشت نەدرێنەوەوەناچارو کەساس نەکرێن بۆ چی هەوڵنادەن ئەو ڕوحە بگێڕێتەوە.

واتای ئەم ئایەتە پیرۆزە بەم چەشنەیە: دیارە بێ باوەڕان و گومڕایان بڕوایان بەخوایەکی بەهێز و توانا نی یە کەدەیان مرێنێت و زیندوویان دەکاتەوە و سزاو پاداشتیان دەداتەوە لە سەر کارو کردەوەکانیان.جا ئەگەر ئەمە بیرو باوەڕیانە دەی بتوانن هەوڵ ئەوە بدەن مردن و مەرگ لە خۆیان دووربخەنەوە و نەمرن یاخود دەبێت ملکەچ بکەن و دانبنێن بە خوادا کەناچاریان دەکات و زیندویان دەکاتەوە.

(ئاین) دوو جۆرە:

١- فەرمایشتی "امری":

٢-خەلاّتی "جزائی":

وە هەردوو جۆرەکەی بەتەنها بۆ خودایە.وەبنەمای هەردوو جۆرەکەشی بریتی یە لە خۆشەویستی لەلایەن هەر یاساو بڕیارێکی

خـــودایی کـــه فـــەرمانی پـــێ کـــردووین.ئـــەوا لـــەلای خـــوای گـــەورە خۆشەویســـت و پەســـەندە.وەهـــەر کـــارێکی ناســـاغ و قەدەغـــەت کردبێـــت. واتـــی لای خـــوای گـــەورە ناپەســـەندە و پێچـــەوانەی پەســـەندکراو خۆشەویســـتیەکانێنتی.وەکـــاتێ خـــوای گـــەورە دینـــداری لـــە کەســـێك پەســـەنددەکات کەلـــە ســـەر بنـــەمای خۆشەویســـتی و پەســـەندێتی دامـــەزرابێت.ئـــەوەتا پێغەمبـــەری خـــودا (ﷺ) دەفـــەرمێت. (ذاق طعـم الایمـان مـن رضـی بـالله ربـأ و بالاسـلام دينـا وبمحمـد صـلی الله عليـه وسـلم رسـولا[1]) واتـــە: هـــەر کەســـێك ڕازی بێـــت بـــەوەی لـــە (الله) پـــەروەردگاری بێـــت وئیســـلام ئـــاین بەرنامـــەی بێت،وەپێغەمبـــەر (ﷺ) پێشەواو ڕابەری بێت.ئەوا شیرینی باوەڕ دەچێژێت.

کەواتـــە ئـــەم ئاینـــە بەنـــدە بەخۆشەویســـتی یـــەوە،وە دامـــەزراوە لـــە سەر بناغەی خۆشەویستی وەلەسەر خۆشەویستی ڕەوانە کراوە.

وە هـــەروەها ئـــاینی خـــەڵاتیش (جزائـــی):- پێکـــدێت لەســـەر خـــەڵات کردنـــی بەنـــدەکان لەســـەر کردەوەکانیـــان. بـــاش بەباشـــە،وەخراپە بەخراپـــە.وەهـــەردوو کارەکـــە لای خـــوای گـــەورە پەســـەندو خۆشەویســـتن. کـــە (دادپـــەروەری و بەخشـــینی خـــودا) بـــەر جەســـتە دەکـــەن. کـــە هـــەردووکیان دووســـیفەت و ئاکـــاری جـــوانی خـــودان. وەخـــودا خۆشـــی دەوێت وەئەوکەسانەشی خۆش دەوێت کەخۆشی دەوێن.

جـــا هـــەردوو جۆرەکـــەی ئـــاین شـــاڕێگای ڕاســـتی (صـــراط المســـتقیم) پێـــك دەهێـــنن کـــەخودای گـــەورە لەســـەری کـــارو فـــەرمان پاداشـــت و ســـزا ئـــــەنجام دەدات.کەلەســـــەر زاری (هـــــود) ی پێغەمبـــــەرەوە (س.خ) دەفـەرمێت: (إِنِّي أُشْهِدُ اللّهِ وَاشْهَدُواْ أَنِّي بَـرِيءٌ مِّمَّـا تُشْـرِكُونَ * مِـن

[1] - ئەم فەرموودەیە (صحیح)ە،و پێشتر باسمان کردووە.

دُونِهِ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لاَ تُنظِرُونِ* إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ: هود-٥٤-٥٦) واته (من خودا دەكەم بەشايەت،وەئێوەش شايەت بن كەمن بەريم لەهاوبەش وهاوەڵ پەيداكرنى ئێوە بۆ خواى گەورە جا بەخۆتان خواكانتانەوە پيلانم دژبكەن و مۆڵەتيشم مەدەن.من بێ باكم،چونكە من پشتم بەخوداى گەورەى خۆم و ئێوە بەستوە.كەهيچ گيان لەبەرێكيش نى يە جلەوى بەدەستى خوداى گەورە نەبێت وە بەدڵنياييەوە خواى گەورە لەسەر شارێگاى ڕاستى يە) .بەڵێ كاتێ (هود) دڵنابوو لەوەى كە خواى گەورە لەسەر شارێگاى ڕستى يە لە هەموو فەرمان و كارو بارو بڕيار و سزاو خەڵات و بەخشين و تۆڵە و بەلاَ و هيدايەت و سۆزو دادپەروەرێتيدا.

وەهەموو شتێك و بڕيارێك لەشوێنى شياوى و بەجێى خۆيدا دەدات.هەر بۆيە بەدەنگێكى زووڵاڵ و لەپێش چاو و كوڕى سەرجەم دەم سپيانى هۆزەكەى هاوارى كردو ووتى: (إِنِّي أُشْهِدُ اللّهِ وَاشْهَدُواْ أَنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ * مِن دُونِهِ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لاَ تُنظِرُونِ* إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ.... هود: ٥٤-٥٦)

پاشان ئاماژە بەوە دەكات كەدەسەلآتى خواى گەورە بەسەر هەموو شتێك زاڵە و هەموو بەشێك لەم بوونەوەرە ناچار و ملكەچى دەكات. (مامن مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ) واتە: ئەگەر جلەوى هەمووى گيان لە بەرێك و زيندەوەرێك بەدەستى خواى گەورە بێت ئيتر بۆچى من لە هەڕەشەو پلانى ئێوە بترسم كە ئێوە خۆشيشتان هيچتان بەدەست نيە.

دواتــریش ئــەوە ڕوون دەكاتــەوە كــەخوای گــەورە لەســەر شــارێگای حــەق و ڕاســتی و دادپــەروەری فــەرمان دەكــات لەوپــەری لوتكــەی دانــای و بەزەیــدا بڕیــار دەدات.هەربۆیــە پێغەمبــەر (د.خ) لەفــەرموو دەیەكــدا دەفــەرمێت: (مـا اصـاب عبـدا قـط هـم ولاحـزن فقـال:اللـهم انـي عبـدك ابـن عبـدك،ابن امتـك، ماصـيتي بيـدك مـاض في حكمك،عـدل في قضـاؤك أسـألك اللـهم بكـل اسـم هولك،سميـت بـه نفسـك او نزلتـه في كتابـك اوعلمتـه أحـدا مـن خلقـك او اسـتأثربه في علـم الغيـب عنـدك ان تجعـل القـران العظـيم ربيـع قلـبي ونـور صـدرى و جـلاء حزنـى و ذهـاب همـى وغمـي الا اذهـب الله همـه وغمـه وابـدل مكانـه فرجـا قـالوا:يارسـول الله: الا نـتعلمهن، قـال:بلـى ينبعـي لمـن سمعهـن ان يتعلمـنهن) [1] واتــە: (هــەر كەســێ توشــی خــەم و پــەژارە بــوو ئــەوا بڵێــت:پــەروەردگار:مــن بەنــدەو وەچــەی دوو بەنــدەی تــۆم ســەراپای ژیــنم بەدەســتی تۆیــە فەرمانــدەری تــۆم داهــاتووم بەدەســتی تۆیــە بڕیارەكانــت لەلوتكــەی دادپەروەریــدا بۆم،وەدەپاڕێمــەوە بــە هــەموو نــاوە جوانــەكان كەلــەخۆت نــاوە یــان لــە تێنوســی مەزنــدا ئامــەژەت پێــداوە یــان فێــری یــەكێك لــە بەنــدەكانت كــردوە یــاخود لــەجیانی پــەنهاونهێنی دا هــەڵت گرتــووەلای خــۆت. داوا كــارم لــە قورئــانی مــەزن بگێــڕە بــەنووروو پــاكی ســینەم،ڕەوێنەری خــەم و پــەژارەكانم جــا هــەر كــات بەنــــدە ئــــەم نزایــــەی كــــرد خــــوای گــــەورە ناخۆشــــیەكانی دەڕەوێنێتــەوە خۆشــی دێتــە ئــاراوە) جــا هــاوەڵانی پێغەمبــەر (د.خ) وتیــان ئایــە پێغەمبــەر (د.خ) خــودا فێــری نەبین؟پێغەمبــەر (ﷺ) فــەرمووی: (پێویســتە هەركەسێك گوێبیســتی بــێ فێــری و بڵێــت) ئەمــە پوختەی فەرمان و داوو بڕیاری خوای مەزن.

---

[1] ئەم فەموودەیە (صحیح) ە امد (٤٥٢,٣٩١,١) گێڕایەتیەوە.

## کۆتایی وەڵام

لێــرەدا دێینــە ســەر بابەبــەتێکی تایبــەت لــەکۆتای وەڵــامی ئــەو کەســانەی توشــی داوی عەشــق و خراپــەکانی بوونــە.کەڕاســتەو خــۆ کاریگــەری دەکاتــە ســەر دڵ و لاوازی دەکــات پاشــان ڕەنگدانــەوەی دەبێـت لـە (مەبەست و وتـەو کردارەکانـدا) کەسـەر ئـەنجام درز دەکاتـە کۆشکی یەکتاپەرستی.

خـوای گـەورە بـاس لـەم نەخۆشـیە دەکـات کـە مەبەسـتی دوو پێـڕە لــە خــەڵکی کــەبریتین لــە: (نێــر بــازان لــەپیاوان) وە (نێربــازان لــەئافرەتان) کەحــەزیان لەپیاوانــە.بــۆ نموونــە:خــوای گــەورە باســی ڕوداوی ژنــی (عزیــز و پادشــای) وڵاتــی میــسر دەکــات کەچــۆن شــەیداو عاشـقی (یوسـف) ی پێغەمبـەر بـووە و چـی بەسـەر هێنـاوە لـەو پێنـاوە دا خــۆگری ئــارامی و لــەخوا ترســی (یوســف-س.خ) لــەم تــاقی کردنـــــەوە گەورەیـــــەدا کەشـــــێوازی زۆر دەگمەنـــــە کەســـــەرجەم هۆکارەکـانی ئـەنجام دانـی ئـەوکارە چـەپەڵە سـازو لـەبار بـووە.لەچـەند ڕوویەکەوە:

١. بـوونی ئـەو حـەزو ئـارەزووەی کـە خـوادا لـەدڵی پیاوانـد چـاندوویەتی بەرامبــەر بــەئافرەتان (وە ئــافرەتیش بەرامبــەر بــە پیــاو) بگــرە لەحــەزی تینووبــۆ ئــاو زیــاتر ئەمــەش شــتێکی درووســتە زۆر باشــە گــەربێتوو بەحــەڵاڵی و دروســتی جــێ بــەجێ بکرێــت.هــەروەکو لــەکتێبی (الزهــد) ی (امــام احمــد) دا هــاتووە فەرموویــەتی (یوســف بــن العطیــة) کــەگوێی لــە (انــس) بــووە ووتویــەتی کــە پێغەمبــــەر فەرموویــــەتی: (حبـــب الی مـــن دینـــاکم النـــساء

والطيب،اصبر على الطعام والشراب ولااصبر عنهن) [1] واتە: (لە دونیاکەتاندا ئافرەت و بۆنی خۆشم لاخۆشەویست کراوە وەمن ئارام گرم لەسەر خواردن خواردنەوە بەلأم ئارام گر نیم لە ئافرەتاندا) .

٢. (یوسف) ی پێغەمبەر لە لوتکەی لاوێتیدا بووە بێگومان لەو تەمەنەدا حەزو ئارەزوی سێکسی لەو پەڕی بەهێزی دایە.

٣. هەروەها (یوسف) ی پێغەمبەر ڕبەن بووە واتە خێزاندار نەبووە تاوەکو لەڕێگە شەرعیەوە ئارەزوی سێکسی دابمرکێنێتەوە.

٤. : (یوسف) دەربەدەری وولأتانی غەریب بووە دوور بوە لە هۆزو گەل و شاری خۆیەوە کە ئەمەیان هۆکارێکی تری بەهێزە کەڕێگەی کەمترە بۆ ئەنجام دانی کاری سێکسی و کەسیش نایناسێت و مەترسیەکانی کەمترە.

٥. : هەروەها ئەو ئافرەتە خاوەنی شۆخ و شەنگی و جوانیەکی بێ سنور بووە لە هەمان کاتدا خاوەن دەسەلأت و پلەو پایەکی زۆر بووە کەلەلوتکەی دەسەلأت و خانمی یەکەمی وولأت بووە کە ئەمە دوو هۆکارە گەورەترین پاڵنەرن بۆ جێبەبەجێکردنی ئەو کارە ناشرینە.

٦. لەهەمووی گرنگتر ئەوەبوو کە ئافرە تەکە خۆی یەخەی بە (یوسف–س.خ) ی پێغەمبەر گرتووەو خۆی بەتەواوی ئارەزوی خۆی بێ زۆر لێکردن. زۆرێك هەن لەخەڵکی،کاتێ ئافرەت ڕێگری دەکات و خۆی نادات بەدەستەوە بۆ کاری سێکسی چیتر ئەو پیاوە ئەو حەزەی نامێنێت.جاسروشت و حەزەکانی مرۆڤ

[1] ئەم فەموودەیە پێشتر باسمان کردووە.

جیـــــاوازن، هەیـــــە بـــــەرێگری ئافرەتـــــان لەخۆدانـــــە بەدەســـتەوەیان.زیـــاتر دەجۆشـــێنێت و حـــەزی زیـــاد دەكـــات بـــۆ ئـــەنجام دانـــی كـــاری سێكـسی.وەهەیـــشە بەپێـــچەوانەوە كـــەرێگری كرا چی تر حەزی بەو كارە نامێنێت.

٧. ئافرەتەكـــە داواكـــاری كـــاری سێكـــسی كـــرد.وەجـــەختی لەســـەری كـــردەوە هـــەوڵی بـــۆدا.كـــە (یوســـف) رێگـــری كـــرد تـــاوای لێهـــات ڕاوی نـــا و پـــەلاماری دا.كەچـــی (یوســـف) هەڵـــدەهات و ڕای دەكـــرد لـــە دەستی.

٨. ئـــەم ڕوداوە لـــەماڵ و كۆشـــكی ئافرەتەكـــەدا بـــووە.لـــەژێر فـــشارو دەســـەڵاتی خـــانمی یەكـــەمی وولاتـــدا بـــووە.كـــەهیچ كـــەس نەیـــدەتوانی لەفـــەرمانی دەربـــچێت.لێـــرەدا دوو هۆكـــاری گـــرنگ كۆبوونەتـــەوە لەسەر (یوسف–س.خ) هۆكاری (ترس و حەز) .

٩. ئافرەتەكـــە هۆكـــاری ئـــەم پلانـــەی ســـازدابوو بەداخـــستنی دەرگـــاو پەنجەرە كەلەژووری نوستنی خۆیدایە.و دوور لە چاودێریدایە.

١٠. لەگـــەڵ هـــەموو ئەمانەشـــدا كـــە ئافرەتەكـــە خـــانمی وولاتـــە (یوســـف–س.خ) تـــــەنها بەندەیـــــەك و خزمـــــەت كـــــارێكی ســـــادەیە و لـــــەژێر دەســـــەڵات و بڕیـــــاری ئـــــەو ئافرەتەدایـــــە.لەهەرجێگـــــەو شـــــوێنێك دا لەگـــــەڵی دەربكـــــەوێت جێگـــــەی گومـــــان و تـــــوانج و چـــــاودێری نـــــی یـــە.واتـــە زۆربـــەی كـــات (یوســـف–س.خ) لەگـــەڵ ئـــەو ئافرەتـــەدا بـــووە وەك خزمــــەت كارێـــــك.وەك دەڵـــــێن:لـــــەئافرەتێكی خانـــــەوادەی عــــەرەبیان پرســــیووە چـــــی وات لـــــێ كردیـــــت كـــــەزینا ئـــــەنجام بدەیت؟لەوەلامـــدا ووتـــی:نزیكـــی پیـــاوان لێمەوە،وەمانـــەوەم زۆربـــەی كات بەتەنهای.

١١. ئـەو ئافرەتـە هـەر تـەنها بەوەنەوەسـتا،بەڵکو هانـای بـۆ چـەندین خـانمی تـری کۆشـك بـرد و لـەخێزانی دەسـەڵات دارانـی کۆشـك،تاهاوکاری بکـەنو (یوسـف-س.خ) لەخـشتە بـەرن بەبـەکارهێنانی نـازو فێـڵ و حـەزو...هتـد.بـەلاّم لەبەرامبـەر (یوسـف-س.خ) هانـای بـۆ خـوای گـەورە بـرد لـە پلانـی ئـەوان (وَإِلاَّ تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَـيْهِنَّ وَأَكُـن مِّـنَ الْجَـاهِلِينَ...یوسف: ٣٣) واتـە: خودایـە فریـاد ڕەسـم نەکـەیت و دەربـازم نەکـەیت لەفێڵ و مەکریان ئەوا توش دەبم و دەچمە ڕیزی نەفامانەوە.

١٢. دواتـر کەئافرەتەکـە زانـی بەورژانـدنی حـەزو ئـارەزوو خـۆڕووت کردنـەوە و پـەلاماردانی بـێ سـودە وەبـێ ئاکامـە.دەسـتی دایـە هەڕەشـەکردن بەبەنـدکردنی وبەئەشـکەنجەدانی. کـەلێرەدا (تـرس لەبەنـد کـردن و ئەشـکەنجە،حەزو ئـارەزوش لـەو لاوە بوەسـتێت) هەر هەمووی فشاربوو بۆسەر (یوسف-س.خ) .

١٣. ئـەو ئافرەتـە لەتـەواوی سـەر کەشـی و بـێ هـودەیی و بـێ منەتیـەوە.بـەم کـارە هـەڵ دەسـتاو بـاکی لەکـەس نـەبوو چـونکە بێغرەتـی بـاڵی کێـشا بـوو بەسـەر وولاّتـدا.بەتایبـەتی کـار بەدەسـتان.هـەر بۆیـە پیـاوی یەکـەمی وولاّت لەگـەڵ ڕاوێـژکارێکی دا دێنـە سـەر ئـەم دیمەنـە بـێ ئـابروی یـە.جگـە لەووشـەی (اعـرض عـن هذا) واتە (یوسف پشت لەکار بکەوفەرامۆشی بکە) .

چـی تـری نـەوت دڵنیـاش بـوو کەئەمـەپیلانی خێزانەکەیەتی،کەچـی ڕوو دەکاتـە خێزانەکـەیی و دەڵێـت: (يُوسُـفُ أَعْـرِضْ عَـنْ هَـذَا وَاسْتَغْفِرِي لِـذَنبِكِ إِنَّـكِ كُنـتِ مِـنَ الْخَـاطِئِينَ....یوسف:٢٩) واتـە: (تـۆش داوای لێخـۆش بـوون بکـە بـۆ هەڵەکـەت چـونکە بەڕاسـتی تـۆ لـە هەڵەکارو تاوانبارانیت) .

جاغیرەتی پیاو زۆر ڕێگری تەواوە لەوەی ئافرەتەکەی جڵەو شل نەکات بۆ کاری زینا...کەچی لێرەدابەدی نەکرا؟لەگەڵ بوونی ئەم هەموو هۆکارو فشارانەی سەر (یوسف-س.خ) ی پێغەمبەر هێشتا ڕەزامەندی و خۆشەویستی خوای لەدڵدا لەهەموو شتێکی تر بەلاوە گرنگترە.هەر بۆیە بەندیخانەو ئەشکەنجەی پێ باشترە لەوەی پشت لەخۆشەویست خودا بکات و توشی داوی زیناکاری ببێت. (قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ:٣٣یوسف) هەروەها (یوسف-س.خ) دەیزانی کەتەنها وەك سروشتی خۆی ناتوانێت ڕزگاری ببێت هەر بۆیە هانای بۆ خودای گەورە هێنا تا دەربازی بێ لەپێڕی نەفامان و گەوجەکان ئەم ڕووداوە پەندو ئامۆژگاری زۆر لەخۆ دەگرێت کەسودی زۆرە بۆ کەسانی هۆشیار.

## عەشقی نێربازی

پێڕی دووەم:کەخوای گەورە باسی (عەشق) یان دەکات بریتی یە لە (نێر بازی) جا لەسیاقی ئایەتەکاندا ئەو تامەزرۆی و پەرۆشیەی هۆزەکەی (لوگ) هەیان بووە بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە.بەڵگەی عەشق بوونیان بەم کارە چەپەڵە (نێر باز) ی.ئەوەتا خوای گەورە باسی دەکات و دەفەرمێت (وَجَاءَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ * قَالَ إِنَّ هَؤُلاَءِ ضَيْفِي فَلاَ تَفْضَحُونِ * وَاتَّقُوا اللّهَ وَلاَ تُخْزُونِ * قَالُوا أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ الْعَالَمِينَ * قَالَ هَؤُلاءِ بَنَاتِي إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ * لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ...الحجر:٦٧-٧٢) واتە: ئەوساتە خەڵکی بێڕەوشتی ئەو شارە بە میوانە بەڕێزەکانیان زانی و بەوپەڕی شەیدای و تامەزرۆیی یەوە مژدەی مژدەی ناڕەوایان بەیەکتر دەدا*پێغەمبەر لوگ پێی ووتن ئەوانە میوانی

بەڕێزی منن شەرمەزارم مەکەن و ئابرووم مەبەن لە خوا بترسن و شەرم کەن و ڕیسوام نەکەن.

شەڕواڵ پیسەکان ووتیان:ئایە ڕێگری ئەوەمان لێ نەکردیت بەرگری لەکەس نەکەیت؟!لوط پێغەمبەر پێی ووتن:ئەمانە کچی منن وەرن با حەلاڵی لێتانی مارەکەم و ئارەزووی خۆتان بەدروستی بەجێ بگەیەنن وە دەست بەرداری ئەم بێ ڕەوشتی یەبن ئەگەر ئامادەن.

سوێند بێ ئەی پێغەمبەر ئەوانەی لەسەر خۆشی خۆیاندا سەرگەردان بوونەو دەتلێنەوە) .ئەم پێڕە شەیدای و عەشقی چ بەدڕەوشتیەك ببوون.جابەڕاستی ئەمە دەردێکی یەکجار کوشندەو شەرمەزاریە.کەچارەسەرکردنی دژوارە و لەهەرکۆمەڵگایەکدا سەر هەڵبدات و تەشەنەبکات زەنگی تیاچوونی و هەڵوەشەندنەوەیەتی.ئەم بەدڕەوشتیە بەهەردوو جۆرەکەیەوە حەزی ئافرەتان بێت بۆ پیاوان چ حەزی پیاوان بێت بۆنێر بازی. وەدەربازبوونیان لەخەشم و قاری خودا زەحمەتە. چونکە لەچەندین لاوە ترازاون لەلایەکەوە پەیوەست بون و خۆشەویستی یان بۆ ئەم کارەدەیانگەیەنێتە ئاستی هاوەڵ و (نید) بڕیار دان بۆ خوای گەورە کەبەندازەی خودا زیاتر خۆشیانت دەوێت.ئەمەش یەکێکە لەهەرە پڕ مەترسیەکانی ئەم عیشقە.کەتەنها بەتەوبەیەکی گەورەی یەك لاکەرەوە لەو تاوانە ببورێت. (وەڕەزامەندی ومافی و حەق خودا پێشێل دەکەن لەپێناو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی عاشقەکەیان) جائەگەر وەك هەڵسەنگاندنێك حاڵی زۆربەی عاشقەکان لێبدەینەوە بەبەراود کردن لەنێوان باوەڕەو عەشقەکەیاندادەبینیت ئەوەندە هەوڵ و کۆشش بۆ عەشقەکەی دەدات بۆخوا نایدات ئەو ساتانەی کە

بەدیداری عاشقەکەی دەگات زۆر لای بەرێزترو پیرۆزترە لەبەجێ گەیاندنی فەرمانەکانی خوای گەورە.هێندە لەبیریاندایە نیو ئەوەندە خودایان لەبیر نی یە...هتد.تەنانەت کاریگەری کردۆتەئاستێك کەهەندێ لەو گومڕایانە ناوویادی عاشقەکەیان زۆر لاپیرۆزترە لەناوویادی خوای گەورە.وەك ئەم شاعیرە گومڕایە دەڵێت:

یترشفت من فمی رشفات          هن احلی فیەمن التوحید

واتە:ئەو پرشانەی لەدەمیان دەپرژێتەناو دەمی

من لام شیرینترە لەشیرینی یەکتا پەرستی.[1]

جا بێگومان ئەم جۆرە عیشقە-لەگەورەترین جۆرەکانی هاوبەشی بڕیاردانە بۆخوای گەورەو تاك و تەنها. تەنانەت هەیانە دەڵێت.چیتر شوێنێك نەماوە لەدڵمدا جێگەی خۆشەویستی کەسی تری تیا ببێتەوە جگە لە عاشقەکەم ! بەم چەشنە تەواوی ملکەچی و گوێڕایەڵی و خۆشەویستی بۆ ئەم عەشقەی دەردەبڕێت کەئەمە واتای پەرستنە.لێرەدا جیاکاریەك هەیە لەنێوان ئەنجام دانی تاوانی داوێن پیسی "زینا" وەلەنێوان ئەم جۆرە عیشقەی باسمان کرد.چونکەئەنجامدەری ئەم تاوانە سزای تایبەتی خۆی هەیە و تاوانێکی گەورەیە.جودایە لەکەسێك توشی ئەم عیشقە هاوبەشە بووە.تەنانەت هەندێ لەخواناسەکان دەڵێن: توشی زینا بم لام باشترە وەك شەیدای ئەو جۆرە عیشقەبم ببمە بەندەی بەندەکان...هتد.[2]

---

[1] - خاوەنی ئەم شیعرە(المحسنی)یە. هەرچەندە ئەوترێت مەبەستی لەبڕگەی (التوحید)لەم شیعرەداجۆرێکە لەشیرنی خورما.

[2] - نموونەو هاوشێوەی ئەم شیعرانە لەئەدەبیاتی کوردیدا هەیە وەکو:

١. دڵدارو جوان پەرستم          کەیل و خومارو مەستم

## چارەسەری نێربازی

چارەسەری ئەم دەردە کوشندەیە.لەوەدایە کەپێویستە پێشەکی ئەو کەسە بزانێت کەئەم دەردە دژوارو پێچەوانەی یەکتاپەرستی یە.وەلەئەنجامی بێ ئاگای و گێل و گەوجیدا توشی هاتوە. و دڵ و دەرونی داگیر کردوە. هەربۆیە ئەم مەبەستە پێویستە لەپێشدا خۆی گۆش بکات بەبیرو باوەڕی یەکتا پەرستی و خوا ناسین، وەزیندوکردنەوەی خەسڵەتەکانی جوامێری ومەردایەتی و پیاوەتی و مرۆڤ دۆستی لەخودی ئەو کەسەدا وەژیرو عەقڵ شوێنی ئارەزوەکانی بگرێتەوە باشتر پێویستەدڵ و دەرونی پاك و بێگەرد بکات تەنها دڵسۆزی و ئەمەکداری بۆ خوا هەبێت.

ئەم دڵسۆزیەی کەخوا چارەسەری ئەم کارە لەقورئاندا ئاماژەی پێ دەکات کەدەفەرمێت (كَذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ: یوسف٢٤) جارزۆر گرنگە کەسی ژیرو هۆشیار ڕاستیەك هەیە بیزانێت ئەویش ئەوەیە:عەقڵ و ژیری و شەرعی خودا، جەخت لەسەر تەواوی بەدەستهێنانی تەواوی بەرژەوەندیەکان دەکەنەوە،وەڕێگری لەتوشبوونی تەواوی زەرەرمەندیەکان دەکەنەوە.

جاهەرکاتێ کارێك ڕووبەڕوی ژیرو عەقڵ بوویەوە کەلەیەك کاتدا بەرژەوەندی و زەرەرمەندیشی تێدابێت ئەوا دوو کار دەکەوێتە ئەستۆیان (کارێکی زانست و تیۆری،وەکارێکی پراکتیزە) ی.

---

٢. ئاوێنەی جوانی یارە بیروباوەڕو هەستم "وەرگێڕ"

یەکـــەم:کـــارێکی زانـــستی و تیـــۆری:کـــەبریتی یـــە لـــە دەســـت نیـشانکردن و دیـاری کردنـی بـالاَترین و زۆرتـرین و کارگـەرترین یـان لـە (بەرژەوەندی و زەرەرمەندی) واتە:کامیان لەم کارەدا بالاَیەو زۆرە.

دووەم:کـارێکی کـرداری پراکتیـزەی (عملـی) :کـە ئـەویش لـەپاش زانینـی رێـژەو ڕاوەی بەرژەوەنـدی و زەرەرمەنـدی لـەوکارەدا.ئەوسـاتە پێویستە ئەوەیان هەڵبژێرێت کەباشترینەو سودمەند ترینە بۆمان.

**خراپەکانی ئەم جۆرە عیشقە**

لای هـەمووان ڕوون ئاشـکرایە کـەتوش بـوون بـەم دەردە کوشـندەیە و پەیوەسـت بـوون بـەو جـۆرە عیـشقانەوە مایـەی لەدەسـت دانـی بەرژەوەندیـە تایبـەت و گـشتی یـەکانی ئـەو کەسـەیە. چ بەرژەوەنـدی دونیـا و چ بەرژەوەنـدی ئـاینی بێـت،بگرە دەبێتـە مایـەی چەرمەسـەری و هیلاك بوونی لەژیاندا لەچەند ڕووەکەوە:

**١- سـەرقاڵ بـوون بەخۆشەویـستنی دروسـتکراوەکان و پـشت گـوێ خستنی خوای گەورە:**

لەیـەك دڵـدا خۆشەویـستی خـوداو دروسـتکراوەکانی لەیـەك ئاسـتدا نابێت بەڵکو پێویستە یەکێکیان ئەوی تریان کزولاوازو سست بکات.

**٢- بەو هۆیەوە توشی سزاو ئازار دەبێت:**

جاهەرکەسـێك جگـە لـەخودا شـتێك یـان کەسـێك بەئەنـدازەی خـودا خـۆش وویـست، ئـەوا خـوای گـەورە هەربـەو شـتە ئـازارو چەرمەسـەری و سـزای تـوش دەکـات. بـەبیر لـێ کردنـەوە، بەدەسـت نەخـستنی، بەلەدەسـت دانـی، بەتیاچـونی...هتـد. بێگومـان ئـازاری دڵـی عاشـق لەهەموو ئازارەکان کوشندەترە.

٣ دڵ و دەروونی دەبێتە کۆیلەی کەسانی تر:

بەهۆی سەرخۆشی بوون و مەست بونی بەو عیشقە وە ئاگاداری نی یە کەتوشی چە هاتووە،دڵی بەدەست کەسانی ترەوەیە وەك منداڵ یاری پێ دەکرێت و دیل و کۆیلەی دەستی کەسانی ترە.

٤- بەپێچەوانەی بەرژەوەندیەکانیەوە کاردەکات:

واتە هەنگاو بەپێچەوانەی بەرژەوەندی یەوە دەنێت،بەرژەوەندی ئاینی:هەمیشە دڵ و دەرونی سەرقاڵی غەیری خودایە خوداش لەبیری دەکات.

بەرژەوەندیە دونیاییەکان:کێ هەیە لەم ڕاستەیە بێ ئاگا بێت کەی عاشقەکان ماڵ و حاڵ و ژیانیان دەکەنەقوربانی لەوپێناوەدا.

٥ بەلاَو ئاشوبی دونیاو قیامەت ڕوویا تێ دەکات:

هەرکاتێ دڵ شەیدای غەیری خودا بوو ئەوا شەیتان دەبێتە دۆست و یاوەری لەم ساتانەشدا دەبێ حاڵی مێگەلە مەڕ چۆن بێت کەگەلەگورگ شوانیان بێت؟!

٦ دڵ ودەرون بیرو هۆش دەشێوێنێت:

کاتێ دڵ و دەروون گیرۆدەی ئەم دەردە بوو چی تر تەشەنەدەکات و بیرو هۆشیش دەگرێتەوە و هەمیشە دڵە ڕاوکێ و خەمۆکی و مەستی دەبێتە میوانی هەمیشەی ئەو کەسە،بەرەو شێتی هەنگاو دەنێت...نموونەش لەم بابەتە لەگەلاندا زۆرە.

٧-پێوەرو هەستەکان دەشێوێنێت:

هەرکاتێ دڵ و دەروون بەم دەردەوە تلایەوە،چیتر پێوەرو هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەکانی ئەو کەسە دەشێوێنێت. هەریەکە

لـــەدەزگاکانی بیـــنین و بیـــستن و لێکدانـــەوە کـــاری تـــەواوی خۆیـــان لەدەســـــت دەدەن بـــــەوەی شـــــتی ناشـــــرین بـــــەجوان دەبیـــــنن وەبەپێـچەوانەوە جـاری واهەیـە جـوانی کەسـێك لـەلای ئـەم بـێ عـەیب و کـەم و کـورِی یـەبێ وێنەیە،واتـە ئـەوەی چـاو بینـی کەسـێکی ئاسـایی درکـــی پـــێ دەکات،ئـــەم درکـــی پێناکـــات.چـــونکە ئاوێتـــە بـــووە (تواوەتـــەوە لەونێوەنـــدەدا) بـــەلاَم کەسـێکی تـــر لـــەدەرەوە و نـــاوەوە ژیابێـت باشـتر کـەم و کـورتی و ڕاسـتی و دروسـتی شـتەکان دەزانێـت لـە (مـسند) دا فەرمودەیـەك دەدرێتـە پـاڵ پێغەمبـەر (ﷺ) بـە (مرفوعـا) (حبـك الـشيء يعمـى ويـصم) [1] واتـە: (خۆشویـستن بۆشـتێ لەئاسـتی کـەم و کورِیـەکانی کـەرِو کـوێرت دەکـات) . هـەر لـەم ڕووانگەیـەوە-ئـەو هاوەلاَنـەی پێغەمبـەر (ﷺ) کەپێـشتر لەنـەفامی دا ژیـابوون وەدواتـر هاتنـە نـاو ئـاینی ئیـسلامەوە باشـتر و وریـاترو لێهـاتوو تربـوون، لەوانـەی کەتـەنها لەسـەردەمی ئیـسلامدا ژیـان و نـەفامیان نـەبینیوە. (عمـر بـن الخطـاب) دەڵێـت: (کۆلەکـەی ئیـسلام پارچـە پارچـەدەبێت-کـاتێ کەسـانێ سـەر هـەڵ بـدەن کەتـەنها ئیـسلام بناسـن نـەفامی و نەزانیان نەدیبێت) .

وەدەگێڕنـــەوە لاوێکـــی زۆر لاوازی نـــەخۆش دەهێننـــە خزمـــەت (عبداللـەبن عبـاس) لـە (عرفـە) ئـەویش دەپرسـێت:دەردی ئـەم لاوە چـی یە؟ئـەوانیش دەڵـێن توشـی داوی عیـشق بـووە بۆیـە بـەم دەردەچـووە (عبداللـە) ش لـەو ڕۆژەدا هـەر هـاوار دەکـات و پەنابـە بەخودا دەگرێت لەهەموو جۆرەکانی عیشق.

---

[1] - ئـەم فەرموودەیـە (ضـعيف الاسـتاد)ە، (احمـد -٦-٤٥٠)وە ابـو داود(١٥٣٠) بڕوانـە (السلسلة الضعيفة -١٨٦٨)

٨- عیشق- زیاده ڕۆیکردنه له خۆشەویستیدا:

پێشتر لەسەر ئەم بابەتە دوایـن کەزیاده ڕۆی کردن لەخۆشەویستیدا،دەبێته مایەی داگیر کردنی دڵ و دەروون وه مەبەست کردنی بیرو هۆش،لەکار خستنی دەزگاکان بێ هێز کردنی توانای جەسته،سەر قاڵ بوون و سەرکەش بوون لەدونیای خەیاڵ و ئەندێشەدا.ئەو کەسە لە مرۆڤێکی ئاساییەوه دەگۆڕێت بۆ کەسێکی نامۆ...

عیشقیش بنەماکانی سادەو ساکاره لەسەرەتادا.وه دواتر لەناوەندیدا توشی سەرقاڵی مەستی دەبێت پاشان سەرئەنجامی شێتی و تیاچوون دەبێت کە بەم پێیە ستەم لەخودی خۆیی و بەرامبەر و چواردەوریشی دەکات.

**ڕێگری کردن له عیشق**

عاشقی ڕاسته قینەبەسێ قۆناغی سەرەکیدا تێ دەپەڕێت:

(قۆناغی سەرەتای،ناوەندی،کۆتایی)

(قۆناغی سەرەتایی) : هەرکاتێ مرۆڤ هەستی کرد لە سەرەتای تووش بوونێتی بەداوی عیشق. وەبەتایبەت کاتێ بۆی دەرکەوت کەگەیشتنی بەدۆست و یاره کەی لەڕێگەی شەرع و یاساو عورفەوه. زۆر دژوارەو ئەستەمە. پێویسته زۆر بەوریایی ڕێگری بکات لەم عیشقه بێ ئەنجامە و خۆی دەربازبێکات لەلافاوی ئەم دەریا بێ ئاکامە. هەروەها پێویسته بە هیچ شێوەیەك ناوی یارو دۆستەی نەدرکێنێ و پارێزگاری لە ئابرۆو کەسایەتی بکات. چونکه بازاڕی قسه هێنان و داستان دروست کردن ئابروشکاندنی عاشقان زۆر گەرمەو بەجۆشە. بەتەنها گومانێك،وتەیەك تەماشایەك ئیتر ناویان

دەزرێنیێنن وفیتنەو ئاشوب دروست دەکەن و مەگەر خودا بزانیێت چەندە قوربانی لیێ دەکەوێتەوە. خۆ ئەگەر کەسی عاشق دەستی هەبێت لە ناو زڕاندنی ئەو کچەدا. ئەوە دوو تاوانی گەورە ئەنجام دەدات تاوانی هاوبەشی،وەتاوانی ستەم کردن لەوکچە.

خەڵکی بەبێ پەروا بەبێ بەڵگە هەر لەخۆوە بوختان و قسە بۆ خەڵکی لەم بارەیەوەهەڵدەبەستن، تەنانەت بێ شەرمانە تانەیان دا لەخانەوادەی پێغەمبەر (د.خ) لەڕووداوی (عایشە) و (صفوان) دا کەخوای گەورە لەسەروی حەوت ئاسمانەوە پاکی و بێ گەردیانی سەلماند.ئایە دەبێ دوای پێغەمبەر (ﷺ) کێ لەم حاڵەتە پارێزراو بێت؟!باشتر وایە-کەسی عاشق هەر لەسەرەتاوەخۆی بپارێزێت ونەبێتەنیێچری ئەم گورگ و ڕێوییانە. بەتایبەتی کاتێ کە زانی ئەم کارە سەر ئەنجامی نابێت وە هەرکەسێکیش هاوکاریان بکات لەم نێوەندەدابەتایبەتی ئەو کەسە سور بزانێت کە ئەم عیشقە دوورە سەر ئەنجامی باش نابێت وە بەیەك گەیشتنیان لەژێر سایەی شەریعەتدا دژوارە. ئەوا تاوانبار دەبێت گەر کۆمەکیان بکات هاوشێوەی ئەو کەسە یە هاوکاری گەیاندنی بەرتیل خۆر وبەرتیل دەر دەکات. کەپێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لە هەر کەسێکیان کردووە.وە هەندێ جار ئەم عیشقە هەنگاوی پڕ مەترسی دەنێت کاتێ کە کەسێك عەشقی ئافرەتێکی خێزاندار دەبێت کەمێردی هەیە.وە هەرکەسێك هاوکاریان بکات ئەوا لە گەورەترین تاوانەکان ئەنجام دەدات بگرە کوشتنی ئەو کەسە زۆر ئاسانترە لەو جۆرە ناپاکی کردنە لیێ.کە ئەمەیان بەتەوبەکردنیش پاك نابێتەوە چونکە مافی مرۆڤی تری تێدایە.هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێت (لەقیامەتدا لەچاکەو باشەی دەبات لەتۆڵەدا) .

(خـــذ مـــن حســـنانة ماشـــئت)[1] وەدواتـــر پێغەمبـــەر (ﷺ) دەفـەرمێت (فمـا ظـنكم)[2] ئایـە پێتـان وایـە هیچـی بـۆ دەهێڵێتـەوە؟! جـــا ئەگـــەر ئـــەو ســـتمەت لێكـــراوە خـــزم بێـــت یـــان دراوســـێ...؟! كەچـەندین فەرموودەیـە هەیـە بـاس لـە قەدەغـەكردنی بەهەشت دەكات لەكەسانێك دراوسێكەی لەشەڕی پارێزراونە بێت.

پوختەی مەبەست:

هاوكـاری كـردن لـەم بـوارەدا هاوكاریكردنـە لـە سـەر شـەڕو دوژمنایـەتی و تاوانكـاری (ولاتعـاونوا علـى الاثـم والعـدوان) زۆرێـك بـەهۆی عیشـقی ئافرەتێكـەوە توشـی سـەر گـەردانی و پاشـگەز بوونـەوە هـاتوە لـەئاینی ئیسـلام وەك ئـەو ڕووداوەی (عبـدالحق) لـەكتێبی (العاقبـة) دا هێنـاوێتی كـەبانگ بێـژێك لـەكاتی بانگـدا لەسـەربانی مزگەوتەكـە چـاوی بەكچـێكی شـۆخ وشـەنگی گـاور دەبێـت و خـۆی ناگرێـت و ڕووی تـێ دەكـات بیخوازێـت ئـەویش دەڵێـت مـن گـاورم كـاتێ شـوت پـێ دەكـەم بێیتەسـەر ئـاینی مەسـیحی. ئـەویش ڕازی دەبێـت و پاشـگەز دەبێتـەوە لەئیسـلام بـەڵام پـێش ئـەوەی بیخوازێـت لەسـەربانی ئەو ماڵەوە دەكەوێتە خوارەوەو دەمرێت.

كـاتی خـۆی لـە جەنگەكانـدا گـەر مەسـیحیەكان بیـان وویسـتایە دیلێكـی موسـڵمان بكەنـە مەسـیحی دەچـوون جـوانترین ئـافرەتی مەسـیحیان پـێ نیشـان دەدا تـا بەهۆیـەوە بێتەسـەر ئـاینی مەسـیحی جـالێرەدا: (يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللّهُ مَا يَشَاءُ: ابراهیم٢٧) واتـە: خـوای گـەورە بـــاوڕداران لەســـەر ووتـــەی ڕاســـت و ڕەوان دەچەســـپێنێت و

---

[1] - فەرموودەكی (صحیح) پێشتر باسمان كردووە لە(صحیح المسلم) داهاتووە

[2] - فەرموودەكی (صحیح) پێشتر باسمان كردووە لە(صحیح المسلم) داهاتووە

سەقامگیریان دەکات لەدونیاو قیامەتدا.وەخوای گەورە ستەم کاران گومرا دەکات وەهەر چی یە کی بیەوێ ئەنجامی دەدات.

وە هەندێ لەعاشقان هەیە دەبێتە مایەی فیتنە بۆ ئەوی تریان،ئەویش بەخۆڕازاندنەوەدەرخستنی جوانی جەستەی لەبەرامبەردا کەسەکەکەی تریش توشی نەهامەتی دەبێت و خۆی پێناگیرێ.چەندین کەسمان بینی کەدەوڵەمەندبوو لەو پێناوەدا هەزار کەوت و پلەو پایەی لەدەست دا وەچەندین ئافرەت هەبووە کەزانوێتی مێردەکەی ناپاکی لەگەڵ دەکات ئەویش لە تۆڵەسەندنەوەدا دەستی داوەتە ئەوکارە نابەجێیە لێرەداپیاو تیا ماوە لەنێوان دەست بەرداربوونی لەوکارە یاخودجیابوونەوەو کاولکردنی خانەوادەکەی.جا کەوا باشتر وایە مرۆڤ خۆی توشی داوی ئەم جۆرە عیشقانە نەکات ماڵ کاولی لەدوایە جا هەرکەسێك لەدوای زانینی ئەم هەموو کاریگەریە خراپانە هەر سور بوو لەسەر ئەو جۆرە عیشقە ئەوا تەنها لۆمەی خۆی بکات و گلەی لە کەس نەکات. بەبەردەوامی تەماشاکردنی ڕوخساری عاشقەکەت تۆی گەیاندە ئەم حاڵە.گەر هاتوو هەربەو تەماشا کردنەوە،وەستاو کاریگەری تری نەبوو ئەوا دەربازی بوو لەوداوە بەڵام لەدوای تەماشا کردنەکە حەزو ئارەزووی قسەکردن و دانیشتن و بەیەکگەیشتنی لادروست بوو. ئەو ساتە خەیاڵ و ئەندێشەو بیری ئەو کەسە داگیر دەکات وەبەتەواوەتی ئاوێتەی ژیانی دەبێت دەربازبوونی لەم حاڵەتە زۆر دژوارە. لێرەدا پێویستە مرۆڤی ژیر ڕەچاوی بەراودی ئەم هەموو کاریگەریە خراپانە بکات.لەهەمان کاتدا توڕبون و یاخی بوون و سەرپێچی کردنی خوای گەورە لەپێش چاوبگرێت کەسەر ئەنجامەکەی ناپاکی و سزای دۆزەخ و سوتانە

لەنێو ئاگردا.یاخود مەترسی لەکاریگەریە خراپەکانی بێت لەدونیادابەلەدەستدانی کەسایەتی و ڕوشاندی شکۆمەندی و ناوزڕاندن...هتد.کەتوشی مرۆڤ دێت لەم پێناوە دا.

## باشیەکانی عیشق گومان و وەڵام

هەندێ کەس دەڵێن:سەبارەت بەخراپەکانی عیشق زۆرت باس کرد. بەڵام لەولاشەوە عیشقی باشی و چاکی زۆر هەیەلەوانە:پاککردنەوەی دەروون،ئێسك سوکی،هەست ناسکی،جوامێری و مەردایەتی...هتد.وەبە (يحيى بن معاذ الرازي) دەڵێن:کوڕەکەت عیشقی فلان کچ بووە وەهەندێکی تر دەڵێت، دەردی دڵ شکۆ مەندەکانە وەکەسێکی تر دەڵێت:عیشق دەبێتە مایەی ئازاکردنی ترسنۆك و ووشیار کردنەوەی گێل و سەغی کردنی ڕەزیل. سەربەرزی پادشاکان ئارام کردنی هەڵچوونە ڕەوشتیەکان...وەهاوڕێی ڕێبوارانەو دۆستی بێ دارانە. وەهەروەها دەڵێن: هاندەر و بزوێنەری ڕەوشتە بەرزەکانە.

وەهەندێ لەدانایان دەڵێن: (عیشق دەروون پاك دەکاتەوەو ڕەوشت پالا فتەدەکات...

وەکەسێکی تر دەڵێت: (هەرکەسێك ڕوخسارجوان و دیمەنی شۆخ و قەشەنگ و دەنگی خۆش نەیهروژێنێت ئەواسروشتی تەواوی نییە) .پێویستی بەچارە سەرە وە

هەندێ لەعاشیقە پاك داوێنەکان دەڵێن: (پاك داوێن بن سەربەرزبن،عاشق بن ژیرو قەشەنگ دەبن) .وەلەیەکێ لەعاشقەکانیان پرسی: ئەگەر تۆ هەلت بۆ ڕێکەوت و بەتەنها خۆشەویستەکەت بینی چی دەکەیت؟ ئەویش ووتی:چێژ لەبینی ڕوخساری وەدەگرم،وەدڵم بەیادو قسەکردنیەوە

ده حەوێنمەوەئـــەو شـــتانەی کەپێـــشی خـــۆش نـــی یـــە لێـــی دەشـــارمەوە وەلەکرداره ناشرینەکانی خۆم دەپارێزم تامنی لەبەرچاو نەکەوێت.

وه (ابـو اسـحاق بـن ابـراهیم) دەڵێـت:ڕوحـی عاشـقان بـۆن خـۆش و ناسـکە وەئێـسکیان سـوکە هەمیـشە دڵ گەشـن ووتـەکانیان خـەم لـەدڵ لا دەبـات وەژێـری بـەهێز دەکـات جانەگـەر عیـشق و خۆشەویـستی نـەبێ سـەرجەم نیعمەتەکانی دونیا تیا دەچێت) .

وەیـەکێکی تـر دەڵێـت:عیـشق بـۆ ڕووح وەك و خـۆراك وایـە بـۆ جەسـتە،جا ئەگـەر دەسـت بـەرداری بێـت زیانـت پـێ دەگەیـەنێت وە ئەگـەر ڕۆچـوی دەتکوژێت.

*وه (الخرائطـي ) دەگێڕێتـەوزه لـە (ابـی غـسان) وتوویـەتی:. (ابـو بکـری الـصدیق) بـەلای کەنیزەیـەك تـێ تەپـەڕی گـوێی لـە کەنیزەکەیـە دەڵێـت:بەپارچـە شـیعرێك هەسـتی خۆشەویـستی خـۆی بـۆ کەسـێکی نادیـار دەردەبڕێـت. (ابـو بکـر) لێـی دەپرسـێت. تـۆ کـەنیزەیت یـان خاتونیـت ئـەویش دەڵێـت:کـەنیزە. (ابـو بکـر ) پێـی دەڵێـت عیـشقی کـێ بویـت؟ کەنیزەکـە بـێ دەنـگ بـوو بـەلاّم (ابـو بکـر ) سـوێندی لـێ خواردکـەنیزە کـە بـەم پارچـە شـیعره دەری خست. کە عیشقی (محمد بن القاسم ) بووه.

وانا التي لعب الهوى بفؤادها          قتلت بحب محمد بن القاسم

واته:من کەخۆشەویستی یاری بەدڵم کردوه

کوشتەی خۆشەویستی محمد کوڕی قاسمم

پاشـان (ابـو بکـر ) ئـەم کەنیزەیـە لـە خاوەنەکـەی دەکڕێـت ڕوانـەی لای (محمـد بـن القاسـم بـن جعفـر بـن ابـی طالـب) دەکـات وەدەڵێـت بەڕاسـتی ئـەم

ئافرەتانە مایەی فیتنەی پیاوانن ئای چەندین پیاوی ڕێزداربەمردن چوو وەچەندین لەش ساغ پیان دەردەدار بوو.[1]

جا (کەنیزەیەك) هاتەلای (عثمان بن العفان) و شکاتی لەپیاوێکی ئەنساری کرد، حەزرەتی (عوسمان) پێی ووت بەسەرهاتی تۆ چی یە ؟ کەنیزەکە ووتی من تەرخان کراوم بۆ برازای ئەم پیاوە. کەچی ئەم پیاوە وازم لێ ناهێنێت و کۆڵ نادات. حەزرەتی (عوسمان ) بەپیاوەکەی ووت:یان ئەوە دەبێت بۆبرازاکەت بێ. یان من بەپارەی خۆم نرخی دەدەم پیاوەکە ووتی:ڕاستیەکە پێشەوای بڕواداران ئەم کەنیزەیە هین برازەکەمە. ئێمە لێرەدا مەبەستمان لەو عیشقە خراپانە نی یەکە دەبێتە مایەی کاری نارەوا و خراپەکاری. بەڵکو ئێمە باس لەعیشقێکی پاکی بێگەردی خاوێن دەکەین. خاوەنەکانی لەخودای گەورە بترسن و سنور نەبەزێنت ئەمەش عیشقی (سلف) ی بەڕێزەکان و پێشەوایانی ئەم گەلەن ئەوەتا (عبدالله بن عبدالله بن عتیە بن مسعود) کەیەکێك بووە لە حەوت زاناو پسپۆڕانی بواری فیقە–کەعاشق بووە عیشقەکەشی زۆر ئاشکراو دیار بوو لەنێو خەڵکیدا وەکەسیش لۆمەی نەکردوە وبەستەم کاریش ناو زەرد نەکرا.

هەروەها تا عاشق بوونی (عمر بن العزیز) شتێکی زۆر ئاشکرا بووە لەنێو خەڵکیدا کەعاشقی کەنیزەیەکی (فاطمة بنت عبدالملك) کە ئەو کەنیزەیە لەجوانی شۆخ و شەنگیدا بەناو بانگ بووە وەزۆر جار (عمر بن العزین) داوای لەخێزانەکەی کردووە کە ئەو کەنیزەیەی بۆ ڕێك بخات. بەڵام خێزانەکەی ڕازی نەبووە.دواتر کاتێ (عمر بن العزیز) بووە بەخەلیفەی

---

[1] – ئەم ڕووداوە زۆر باس دەکرێت.بەلام لەڕاستی دا گومان لەم ڕوداوە هەیە چونکە عەقڵ نایبڕێت کە(محمد بن القاسم بن جعفربن ابی گالب)گەیشتبێت (ابو بکرالصدیق)چونکە ماوەی نێوانیان زۆری کەواتە پێی دەچێت ئەو (ابو بکرالصدیق ) ە کەسێکی تربێت وە وشەی (الصدیق ) لەخۆیەوە دانرابێت وەهەروەها (خرائگی )لەلای زۆر کەس لەزانایان جێگەی متمانە نی یە.

موسڵمانان خێزانەکەی پێی ووت:تۆ زۆر عاشقی ئەم کەنیزەیەم بووی ئەوە من ڕێگریم دەکرد،ئێستاش پێشکەشی دەکەم من ڕازیم. یەکسەر دەموو چاوی (عمر بن العزيز) لەخۆشیاندا گەشایەوە داوای کرد خێرا بۆی بهێنێن کاتێ هێنایان زیاتر پێی سەرسام بوو. (وتی هەندێ لەجوانیەکەتم بۆ دەربخە،کەبینی ئیتر بەتەواوی شەیدای بوو. (عمر بن العزيز) بە کەنیزەکەی ووت وەرە لەسەر خۆت باسی ڕوداوی خۆتم بۆ بکە لەپێشدا لەکوێ بووی، وەچۆن گەیشتیتە ئێرە...

کەنیزەکە ووتی (حجاج) والی (کوفە) منی بەپارەیەکی زۆر لەیەکێ لەکرێکارەکانی ئەو شارە کڕی و ڕەوانی کردم بۆ (عبدالملك) ئەویش منی داوە بە (فاتمە) . (عمر بن العزيز) ووتی:ئەی چی بەسەر کرێکارە هات لەپاش تۆ؟ کەنیزە کە ووتی:لەپاش من بەهیلاك چوو- (عمربن العزيز) ووتی:هیچ منداڵی لەپاش جێ ماوە.کەنیزەکە ووتی:بەڵێ کوڕێکی بەجێ ماوە.ووتی ئەی حاڵی چۆنە؟ ووتی: زۆر خراپە.یەکسەر (عمر بن العزيز ) ووتی خۆت پۆشتە بکەرەوە. یەکسەر بەوالی (عێراقی) دا ناردی بەشوێن ئەو کوڕەدا کاتێ کوڕەکە هات (عمربن العزيز) پێی ووت:ڕۆڵە (حجاج) چی زیان و زەرەری لەباوکت داوە. هەر هەموویم پێ بڵێ:کوڕەکەش هەرچییەکی زانی هەمووی بۆ باس کرد. (عمر بن العزيز) یش هەر هەموو زیانەکانی بۆ بژرادەوە و قەرەبووی کردەوە. پاشان بەکەنیزەکەی ووت:هەستە بکەوە تەنیشتی وە ڕووی کردە کوڕەکە ووتی ئەم کەنیزەیە بەرەوە دیارە باوکت بەهۆیەوە چەرمەسەری زۆری چەشتووە.کوڕکە ووتی:ئەمە ئێستا موڵکی تۆیە (عمر بن العزيز) ووتی: من هیچ پێوستی یەکم پێی نی یە وە لێمی دور بخەرەوە،کاتێ کەوتینە ڕێ وبڕۆین کەنیزەکە بە (عمر) ی ووت ئەی کوا شەیداکەت بۆمن چی بەسەر هات؟ (عمر) ووتی: وەك جاران وایە بگرە زیاترە. جا ئەگەر من دەست بەردارت

نـــەبم نابمـــە یـــەکێك لـــەو کەســـانەی کەبەپێـــچەوانەی حـــەزو دەرونـــی خۆیـــەوە مامەڵـــەی کردبێـــت) .جـــا شـــەیدای (عمـــر) بـــۆ ئـــەم کەنیزەیـــە هـــەر بـــەردەوام بووە تاوەفاتی کردو مرد.

وە هـــەروەها (ابـــو بکـــر محمـــد بـــن داود الظـــاهری) زانـــای بـــەناو بـــانگ لـــە زانـــــستەکانی (فیقـــــە و تەفـــــسیرو فـــــەرموودە ئـــــەدەب) وە بەیـــــەکێك لەگـــەورەترین زانایـــان دەژمێردرێـــت وەعاشـــق بوونـــشی زۆر ئاشـــکرا بـــووە لـــەنێو خەڵکیـــدا. (نفطویـــة) دەڵێـــت: (لـــە ســـەرە مەرگیـــدا چـــوومە دیـــداری لـــێم پرســـی:حاڵـــت چـــۆنە ؟لەوەلاّمدا ووتـــی:خۆشەویـــستی ئـــەو کەســـەی کـــەدەیزانێت ئەمـــەی بەســـەرمدا هێنـــاوە. منـــیش ووتم:ئـــەی باشـــە بۆچـــی ناچیتە پێشەوە لێـی چێژ وەربگریت لەکاتێکدا تۆ بەسەریدا زاڵیت؟

ئـــەویش ووتـــی:چـــێژ وەرگـــرتن دوو جـــۆرە:تەماشـــاکردنی دروست،وەچـــێژی قەدەغەکراو.

تەماشاکردنی دروست: منی بەم حاڵە گەیاندە کەئێستا دەیبینی.

بـــەلاّم چـــێژ وەرگرتنـــی قەدەغـــەکراو: ئـــەوەی ڕێگـــری لێکـــردووم لێـــی ئـــەو فـــەرموودەو ووتەیـــەی (بـــن العبـــاس) ە کەلەلایـــەن باکمـــەوە ئـــەویش لـــە (ســـوید بـــن ســـعید) دەگێڕێتـــەوە ئـــەویش لـــە (علـــی بـــن مـــسهر) ئـــەویش لـــە (ابـــی یحیـــی القتـــان) ئـــەویش لـــە (مجاهـــد) وە دەگێڕێتـــەوە کەلـــە (بـــن العبـــاس) دراوەتـــە پـــاڵ پێغەمبـــەر (د.خ) کـــە (مـــن عـــشق وکـــتم وعـــف وصـــبر غفـــرالله لـــە دخلـــة الجنـــة) واتـــە: هەرکەســـێك تووشـــی عیـــشق بێـــت وەبتوانێـــت بـــشارێتەوە خـــۆگرو داوێـــن پاك بێت ئەوە خودای گەورە لێی خۆش دەبێت و بەبەهەشتی شاد دەکات.

پاشـــان چـــەند دێـــڕێ شـــعری ووت.منـــیش پێـــی ووت: چـــی یـــە ئـــەوە بـــاوەڕت بـــە (قیـــاس) نـــی یـــە لـــەبواری فیقهـــدا. کەچـــی لـــە شـــیعردا دەیـــسەلمێنیت. ئـــەویش ووتـــی:شـــەیدا دڵ و دەروونم بانگەشـــەی بـــۆ کـــردم.پاشـــان لـــە دوای ئـــەو

شـەوەوە کۆچـی دوای کـرد. وە ئـەوەی شـایەنی باسـە بـەهۆی ئـەو شـەیدای و عیشقەیەوە کتێبی (الزهدە) ی داناوە.

هــەروەها لەوتەیــەکی تــردا دەڵێــت:هــەر کەســێك نائومێــد بــوو لەخۆشەویستەکەی وەبەهۆیـەوە نەمرد،ئـەوا توشـی دڵ نـەوای دەبێت چـونکە ئـەوا یەکـەم شـەیداکانی نائومێدی یـە و دڵ ئامـادە نـەبووە بـۆی بـەڵام بۆجـاری دووەم توشـی نائومێـدی دەبێـت ئـیتر کاریگـەری یەکجاریـشی لەسـەر دەر دەکەوێت وکاول دەبێت.

وە (عبـدالله معمـر القیـسی) دەڵێـت: (سـاڵێکیان لەمەراسـیمی ئـەنجام دانـی حەجکرنـدا بـووم. لەشـەوێکدا لـە مزگـەوتی پێغەمبـەر خـودا وەلـەنێوان گـۆڕی پێغەمبـەری خـودا وبڵنـد گۆکەیـدا دانیـشتبوم لـەپڕگوێم لـەدەنگێك بـوو چـەند دێـڕە شـعرێکی ووت بەکاریگـەری و لـەپڕدا بـێ دەنـگ بـوو نـەم زانـی لـەکوێوە ئـەم دەنگـەهات پاشـان ماوەیـەکی تـر هـەمان دەنـگ کەوتـەوە ووتنـی چـەند دێـڕە شـعرێکی تـر و دەسـتی کـرد بـەگریان. منـیش یەکـسەر هەسـتام و بـەرەو ئاراسـتەی دەنگەکـە ڕۆیـشتم لەتەنیـشتی دانـشتم و هەسـتی پـێ نـەکردم بینـیم لاوێکـی خـوێن گـەرمی جـوان بـوو فرمێـسك گۆناکـانی تـەڕ کردبـوو. کـەبینی سـلاوم لێکـرد وەلامـی دایـەوە. ووتـی دانیـشە تـۆ کێیـت؟ منـیش خـۆم پـێ ناسـان ووتـی هـیچ کارێکـت هەیـە ؟ووتم بـەڵێ مـن لـە حەوشـی مزگەوتەکـەدا بووم دەنگـی تـۆ سـەرنجی ڕاکێشام هەرچـی یـە کـت پێوسـتە مـن لـە خزمەتتـدام چیت دەوێـت مـن ئامـادەم؟ ووتـی مـن (عتبـة بـن الحبـاب بْـن المنـذر بـت الجمـوح الانـصاری) م ڕۆژێکیـان بـەرەو مزگـەوتی (احـزاب) ڕۆیـشتم پـاش نوێـژ کـردن لـەدەرەوەی مزگەوتەکـەدابووم.هـەر کـاتێ هەسـتم کـرد پێـڕێ لـە ئافرەتـان بەلامـدا تێپـەڕین کەنیزەیـەکی زۆر شـۆخ و شـەنگیان لەگـەڵ دا بـوو ڕووی تـێ کـردم و پێـی ووتم:ئـەی (عوتـب) ە تـۆ چـی بـە کەسـێك دەڵێـت.شـەیدای تـۆ بێـت ؟ پاشـان بـەجێی هێـشتم و ڕۆی ئـیتر لـەو ڕۆژەوە مـن سـەرگەردان و

شـەیدای بـووم.هـەموو شـوێنێکی بـە دوودا دەگـەڕام هـیچ سـۆراغێکی نـازانم. پاشـان گریـاو لـە هەژمـەدا بووڕایـەوە و لـەخۆ چـوو. پـاش ماوەیـەك ئاگاهاتـەوە ڕوخساری زەرد هەڵ گەڕابووچەند دێڕە شعرێکی شەیدای چڕی...

منـیش پـێم ووت:بـڕام تەوبـە بکـەو داوای لـێ خـۆش بـوون لـە خودابکـە سـەفەرێکی پـڕ مەترسـیت لەپێـشە ئـەویش ووتـی:مـن کـۆڵ نـادەم و بـاش نـابم هـەتا ئـەو کـچە نەگەڕێتـەوە.پاشـان تـا دەمـەو بـەیان لەگەڵیـدا مـاوەوە دواتـر ووتم بابـچین بـۆ مزگـەوت (احـزاب) بـەڵکو خـوای گـەورە دەرگـای خێـرت لێبکاتـەوە.ئـەویش ووتـی تکـام وایـە بـەڵکو بـەهۆی خواناسـی تـۆ وە خـودا ڕەحـم بـەمنیش بکـات.ڕۆیـشتین گەیـشتینە مزگەوتەکـە-چـەند دێـڕە شـعرێکی تـڕی چـڕی پاشـان لـەوێ مایـەوە تانوێـژی نیـوەڕۆ پـاش نوێـژ چـەند ئافرەتێـك هـاتن بـۆ مزگەوتەکـە بـەلام ئـەو کەنیزەیـەی تیـا نـەبوو.ڕویـان کردەئێمـەو بـە (عتبـە) یـان ووت هـا (عتبـە) دەڵێـی چـی بەسـەربارەت بەوکەسـەی شـەیدات بـوو. تـۆی سـەر قـاڵ کـردووە؟ (عتبـە) ش ووتـی: بۆچـی بەسـەر هـاتووە.ووتیـان بـاوکی بردویەتێـوە بـۆ شـاری (سمـاوە) لـەعێراق. منـیش پرسیم ئـەو کەنیزەیـە کـێ بـوو؟ ووتیـان:نـاوی (ریا بنة الغطریف السلمي) یە. لێـرەدا (عتبـە) خـۆی پـێ نـەگیرا و چـەند دێـڕە شـعرێکی تـری چـڕی. پاشـان ڕووم کـردە (عتبـە) و پـێم ووت: (عتبـە) مـن سـوپاس بـۆ خـودا کۆمـەڵ پارەیـەکی باشـم هەیـە دەمـەوێت لـەپێناوی ئـەو کەسـەدا سـەرفی بکـەم کەدەیانـەوێت هاوسـەر پێکـەوە نـەن. بـەڵێن بێـت هـەر هـەمووی دەکەمـە قوربانـت تـا بەمەبەسـتی خـۆت دەگـەیت ، هەسـتە بابـچینە مزگـەوتی (الانـصار) کـە گەیـشتینە مزگەوتەکـە کۆمـەڵێك پیـاوی زۆری لـێ بـوو پـاش سـلاو کـردن ڕووم تـێ کـردن و ووتم: ئـەی خەڵکینـە چ دەڵـێن لەسـەر (عتبـە) و بـاوکی؟ ووتیـان لـەپیاو چـاکەکانی عـەرەبن. منـیش ووتم ئـەوەتا (عتبـە) توشـی داوی عیـشق بـووە وەمـن تـەنها هاوکـاری ئێـوەم دەوێـت پێکـەوە بـچینە

(سمـــاوه) ئـــەوانیش ووتیـــان بەســـەر چـــاو ئێمـــە ئامـــادەین. هـــەر هـــەمووومان بەسواری بـەڕێ کـەوتین تاگەیـشتینە نزیـك ئـاوای (بـنی سـلیم) (غطریـف) ی بـاوکی کـچە بـەهاتنمانی زانـی پێـشوازیەکی زۆر لـێ کـردین ئـاژەڵی سـەر بـڕی وخـوادن ئامـادەکرا لـەکاتی نـان خواردنـدا پێمـان ڕاگەیانـد کـە ئێمـە نانـت نـاخۆین تاداواکاریەکـەمان بـۆ جـێ بـەجێ نەکـەن ووتـی بڵـێن بـزانم ووتمـان هـاتوین داوای کـچە خانمەکـەت دەکـەین بـۆ (عتبـە بـن الحبـاب بـن المنـذر) ئـەویش ووتـی کـچەکەم بڕیـاری بەدەسـت خۆیـەتی بـالێی بپرسـم. بەتوڕییـەوە چـووە ژورەوە بـۆلای. کـچەکەی پێـی ووت بۆچـی تـوڕە دیاریـت ئـەویش ووتـی (ئەنـسارەکان) هـاتوون بتخـوازن. کـچەکەش ووتـی پیـاوانی نـاودارو خانـەدانن وەپێغەمبـەریش (د.خ) ڕێـزی گرتـوون و داواکـاری لێخـۆش بـوونی بـۆ کـردوون لـەخودا. بـۆکێ منیـان دەوێـت، باوکیـشی ووتـی (عتبـە بـن الحبـاب)، کـچەکە ووتـــی والله زۆرم لەســـەر (عتبـــە) بیـــستوە کەکەســـێکی بەئەمـــەك و وەفادارە،مەبەسـتی خـۆی دەزانێـت بـاوکی ووتـی مـن پێـشتر سـوێندم خـــواردووە نەتدەمـــەوە (ئەنـــساریەکان) ؟ کـچەکەش ووتـی کەواتـە بەباشـی وەلامیـــان بـــدەرەوە...باوکەکـــەووتی چـــۆن چـــۆنی –کـــچەکە ووتـــی مارەییەکـەیان لەسـەر گـران بکـە ناچـار دەڕۆن و نایەنـە دواوە... بـاوکی ووتـی دەم خـۆش ئەمەقـسەیەکی باشـە بـاوکی کـچەکە هاتـەدەرەوە ڕووی تـێ کـردین و ووتـی: کـچی ئاوایەکـە وەلامـی دایـەوە بـەلام مارەیـەکی زۆرمـان دەوێـت.جـا کـێ بـەم کـارە هـەڵ دەستی؟ (عبدالله بـن معمـر) دەڵێـت منـیش هەسـتام ووتم چیت دەوێـت سـەر پـشك بە.ووتـی: هـەزار مـسقاڵ ئـاڵتوون جـل وبـەرگی نایـاب و پێـنج پارچـە قوماشـی عەنبـەر.ئـەویش ووتـی:بەسـەر چـاو هـەموویت بـۆ ئامادەدەکـــەین.چـــەندپیاوێکم نـــارد بـــۆ شـــاری مەدینـــە بۆهێنـــانی داواکاریەکانی،پاشـان خوادنمـان خـواردو زەماوەنـدمان گێـڕا چـەند ڕۆژێکمـان پـێ چـوو.دواتـر بـەڕێ کـەوتین بـەرەو شـاری مەدینـە بەسـێ بـار لەپێداویـستی و شـتی نایـاب.گەیـشتینە نزیـك شـاری مەدینـە لـەناکاودا پێـڕێ چـەتە بەسـوارەوە

هێرشـیان بـۆ هێنـاین پـێم وابـوو لـە ئـاوایی (سـلیم) وەبـوون. (عتبـە) ڕووبـەڕویان بـووە چـەند پیـاوێکی لـێ کوشـتن وە هەنـدێکی لـێ برینـدار کـردن. دواتـر هاتـەوەدیار بـوو برینـدار کرابـوو وەخـوێنێکی زۆری لـێ دەڕۆیـشت. کەوتەسـەر زەوی و منـیش ڕوخـساریم سـڕی (عتبـە) گیـانی سـپاردلێرەدا گریـان و هـاوار کـردن ئـەی هـاوار بـۆ (عتبـە) کـاتێ کەنیزەکـە گـوێی لـەدەنگمان بـوو خـۆی لەسـەر حوشـترەکەوە فڕێدایـە خـوارەوە باوەشـی بـە (عتبـە) کـردم بـەدەم گریانـەوە چـەند دێڕەشـعرێکی خـەمناکی چـڕی وئـەویش بەسـەر لاشـەی (عتبـە) دا گیـانی سـپارد ئێمـەش لـەو شـوێنەدا هـەردووکیانمان لەیـەك گـۆڕدا بـەخاك سـپارد.دواتـر پـاش حـەوت سـاڵ-سـەرمدا لەناوچـەی حیجازویـستم سـەردانی مەدینـە بکـەم-ووتم واللە دەبـێ بـچمە سـەردانی گـۆری (عتبـە) کەچـومە سـەرگۆڕیان بینـیم وادارێکـی لەسـەر ڕوواوە گوڵـە لاولاوی سورو زەردی گرتـووەمنیش لـەو خەڵکـەی ئـەو نـاوەم پرسـی ئـەم دارە چـی پـێ دەڵـێن؟ ئـەوانیش ووتیـا ن: پیـان دەڵـێن داری بـاوك و زاوەکـە...هـەروەها فەرموودەیـەك هەیـە بـەم شێوەیە گێڕراوەتەوەلـە (سـوید بـن سـعید بـن علـی بـن مـسهر ) لەباوکییـەوە (ابـی یحیـی القتـان) لـە (مجاهـد) ئـەویش لـە (ابـن العبـاس.ڕ.خ) داوێتـە پـاڵ پێغەمبـەر (.د.خ) (مـن عـشق وعـف وکـتم فمـات فهـو شـهید) واتـە: (هەرکەسـێك تووشـی عەشـق بێـت بتوانێـت بیـشارێتەوە وەخۆگرو داوێن پاك بێت ئەگەر بمرێت ئەوا شەهیدە.

وەهـەروەها لەڕێگەیـەکی تریـشەوە ئـەم فـەرموودە لەوانـە: لەڕێگـەی (سـوید) لـە (ابـن مـسهر ) لـە (هیـشام بـن عـروە) لەباوکیـەوە ئـەویش لـە (لـەخاتو عایـشە) وە بـە (مرفـوع) ی هـەروەها لـە (الخطیـب) لـە (الزهـری) ئـەویش لـە (معـافی بـن زکریـا ) ئـەویش لـە (ابـن الفـضل) لـە (احمـد بـن مـسروق) [1]. هـەروەها (زبـیر بـن بکـار) دەگێڕێتـەوە لـە (عبـدالعزیز الماجـشون) ئـەویش لـە (عبـدالعزیز بـن ابـی حـازم) لـە (ابـن ابـی نجـیح )

ئەویش لە (مجاهد) ئەمیش لە (ابن عباس.ر.خ) پاشان ئەوەتا پێغەمبەر ی ئازیز رابەرو سەروەری هەموان کاتێ چاوی بە شۆخ و شەنگی (زینب بن جحش) دەکەوێت یەکسەر دەفەرمێت (سبحان قعلب القوب) واتە: پاك وبێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە دلآن دەگۆرێت لەو کاتەدا (زینب) خێزان و هاوسەری (زید بن حارث) بووە کەخزمەتکاری پێغەمبەر بووە.کاتێ (زید) ویستی لە (زینب) جیابێتەوە وەتەلآقی بدات پێغەمبەری خودا (ﷺ) رێگری کردوپێی فەرموو (اتق الله واسمك عين زوجك) واتە: لەخوابترسەو دەست بەهاوسەرەکەتەوە بگرە.

دواتر (زید) تەلآقی داو لێی جیا بووە. خوای گەورە لەسەروی حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە (زینب) ی مارە کرد لەپێغەمبەری خودا (ﷺ) وەگرێبەستنی مارە برینەکەی لەسەروی عەرشی مەزنەوە برپاری لەسەر درا. (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ: الأحزاب–٣٧) واتە:ئەی پێغەمبەر جانسی ئەوە بکە کاتێك کە خودا نیعمەتی ئیمانی بەسەردا رشتووە تۆش ئازادی نیعمەتی پەروەردەکردنت پێ بەخشیوە لەخزمانی خۆت ژنت بۆ هێنا کەکاتێ ئەو کەسە (زید) ویستی لە (زینب) ی خێزانی جیا بێتەوە و نەدەگونجان تۆپێت ووت:لەخوا بترسەو دەستبەرداری هاوسەری خۆت نەبیت.بەلآم ئەوەی لەدلّی خۆتدایە دەیشاریتەوە و ناتەوێ کەس بیزانێت ئەوە هەر خودا خۆی ئاشکرای دەکات پێویستە لەخوا بترسیت نە لە قسەی خەلّکی...

ئـــەوەتا پێغەمبــەر داود (س.خ) لەگـــەڵ نـــەوەی نـــەوەت و نـــۆ ژنـــی هـــەبوو[1] کاتێــك خێزانـــی یــەکێك لەســـەربازەکانی بینـــی یەکـــسەرعەشقی بـــووە دواتر خواستی بوە ژنی سەدەمینی.[2]

وە (الزهـــر) ی دەڵێـــت:یەکـــەم خۆشەویـــستی لەئیـــسلامدا خۆشەویـــستی پێغەمبـــەر بـــووە.بۆخـــاتوو (عائیـــشه) وە (مـــسروق) هەمیـــشە بـــەناوی خۆشەویـــستەکەی پێغەمبـــەر (ﷺ) نـــاوی دەبـــرد (ابـــو قـــیس) غـــولامی (عبـدالله بـن عمـرو) دەڵێـت (عبـدالله بـن عمـرو) منـی نـارد بـۆ لای خـاتوو (ام سـلمه) تـا پرسـیاری لێ بکـەم:ئایـە پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) کـاتێ کەبـە ڕۆژوو بـوو خێزانـەکانی مـاچ دەکـرد ؟ (ام سـلمه) دەڵێـت:نـەخێر جـا (أبـو قـیس) پێـــی ووتم خـــاتوو عائیـــشه دەڵێـــت: (کـــە ئەگـــەر پێغەمبـــەری خـــودا خـــاتوو عائیشەی ببینیایە،خۆی پێ نەدەگیرا و ماچی دەکرد) "

وە (ســـعید بـــن ابـــراهیم) لـــە (عـــامر بـــن ســـعد) ئـــەویش لەباوکیـــەوە دەگێڕێتـــەوە کـــە:پێغەمبـــەر (ابـــراهیم –س.خ) هەمیـــشە ڕۆژانـــە بەســـواری (بـۆراق) لـە وولاتـی شـامەوە سـەردانی خـاتوو (هاجـەرە) ی دەکـرد. هێنـدە خۆشی دەویست و دڵی لای بوو.

وە هـــەروەها (الخرائطـــی) دەگێڕێتـــەوە کـــە (عبـــدالله بـــن عمـــر:ڕ.خ) کەنیزەیـــەکی ڕۆمـــی کـــڕی وە زۆری خۆشدەویـــست.وە دەڵێـــت:جارێکیـــان ئـــەو کەنیزەیـــە لەســـەر پـــشتی هێـــسترێکەوە (قاترێـــك) کەوتـــە خـــوارەوە.یەکـــسەر (عبـدالله) پـڕی دایـەو هـەڵی سـاندەوە و دەم و چـاوی سـڕی وماچـی دەکـرد.

---

[1] - ئـەم چـیرۆکە (داود–پێغەمبـەر)ەلەگـەڵ یـەکێك لـەسـەرکردەکانی سـوپاکەیدا کـەناوی (ئۆریـا) یــە لـەکتێبــەکانی ئینجیــل و تــەورات داهــاتووە بــەفراوانی.بــەلام بڕوانــە وەلامەکــەی ئێمــە لەسەری لەبابەتەکانی داهاتوو لەم کتێبەی بەردەستدا.

[2] - ئەم چـیرۆکە (ضـعیف) وە (ابـن القـیم) تـەنها وەك بەڵگـەی بەرامبـەرەکان هێناویەتـەوە دواتـر هەر خۆی ڕەتی دەکاتەوە و هەڵی دەوەشێنێتەوە

وه ئـەو كەنيزەيـە هەميـشە بـە زمـانى ڕۆمـانى دەيـوت: (يـا بطـرون أنـت قـالون ) واتە:ئەی بەڕێزم تۆ زۆر باشی لەگەڵ مندا.

وه دەڵێـت:جارێكيـان ئـەو كەنيزەيـە هـەڵ دێـت و ڕادەكـات. (عبـدالله ) ش زۆر دلگران و پیّ ی ناخۆش بوو.تەنانەت ئەم دێڕە شعرەی چڕی:

قد كنت أحسبني قالون فانصرفت فاليوم اعلم أني غير قالون

واتــە: (تــۆ هەميــشە بــەمنت دەوت زۆر زۆر باشــيت،بەڵام كەچــی ئێــستا هەڵهاتيت.وه زانيم ئێستا زۆر باشنيم) .

وه هـەروەها (ابـو محمـد بـن حـزم ) دەڵێـت:زۆرێـك لـە خەليفـە ڕاشـدينەكان و پێــشەوايان خۆشەويــستيان ئــەنجام داوە.تەنانــەت ڕۆژێكيــان پياوێــك بــە (عمـر بـن خطـاب ) دەڵێـت ئـەی پێـشەوای بـڕواداران مـن ئـافرەتێكم بينـی و بەتـەواوی عەشـقی بـووم.خەليفـە عمـر دەڵێـت: (ئەمـە لـەو شـتانەيە كـە مـرۆڤ بـە دەستی خۆی نی يە) .

ئەمانــەی باسمــان كـرد.ووتــە وبەڵگــەی ئــەو كەسـانە بـوو كـە پێيـان وايـە عاشــقی وعەشــق بــازی حــەلاڵی وقەدەغــەكراوی نــی يــە ) .پاشــان دێينــە سەرشــيكار كــردن و لێكدانــەوەی بەڵگــەو بــۆ چــوونەكانيان. (وەڵام دانــەوەی ئەم گومانانە) .

جـا قـسە كـردن لەسـەر ئـەم بابەتـە پێويـستی بـە جياكـاری هەيـە لـە نێـوان پەســەندی و ناپەسەندی،باشــی وخراپــی، وەنابێــت ڕاســتەو خــۆ ســـەرجەم بابەتەكـە بـە خراپـە يـاخود بـە باشـە بدەينـە قەڵـەم.بـەڵكو بـۆ دەرخـستنی ڕاسـتی ودروسـتی و باشـی و خراپـەكانی لێكدانـەوە بكـەين چـونكە عيـشق نـە باشــەو نــە خراپــە.بــەڵكو بەنــدە لەســەر چــۆنيەتی بــەكارهێنان و شــوێنەواری لەســـەر ژيانمـــان.وه جياكـــاری كـــردن لـــە نێـــوان خۆشەويـــستی حـــەلاڵ و خۆشەويستی حەرام باش و خراپی پێويستە.

*سەرەتا ئەوە بزانین کە باشترین و پەسەند ترین وسودمەندترین خۆشەویستی بەشێوەیەکی ڕەها،خۆشەویستی بەدیهێنەری دڵەکان وهۆشداری خۆشەویستەکانە کە بەدیهێنەری هەست وسۆزو نەست و جوانیەکانە.کە لەسەر ئەو خۆشەویستی یە بناغەی زەوی و ئاسمانەکان دامەزراووە سروشتی خەڵکەکە بینا کراوە کە ئەویش نهێنی ( (لا الـه الا الله ) ) یە ،بەڵێ تاکە خودایەك کە شایەنی پەرستن و شایستەی خۆشەویستی بێت.چونکە پەرستن واتای تەواوی خۆشەویستی و تەواوی ملکەچی یە.وەهاوبەش بڕیاردان لە خۆشەویستی خودا وە لە گەورەترین تاوانەکانە لە جیهانەدا.وە خوای گەورە سەرچاوەی خۆشەویستی یە .وەسەرجەم کتێبەکانی وەڕاستی و دروستی پێغەمبەرەکانی هەرهەمووی ئاماژەو گەواهی خۆشەویستی خودی گەورە دەدەن.چونکە بەتەنها بەدیهێنەر و دروستکەر و نیعمەت دەر ی هەموانە (وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ: النحل ٥٣ ) واتە: هەرچی نیعمەت بەسەرت دا ڕژاوە هەر هەمووی لەلایەن خوای گەورەوە یە وە کاتێ ناخۆشیەکتان هاتە پێش - ڕاستەوخۆ هانا و پەنا بۆ ئەو دەبەن.

## خواستەکانی خۆشەویستی

خۆشەویستی دوو خواستی هەیە: (جوانی و گەورەیی و شکۆمەندی )

خوای گەورە لە هەر دوو ڕوەکەوە تەواوێتی و کەمالی ڕەهایی هەیە جوانە جوانیشی خۆش دەوێت،مەزن و بەڕێز و گەورە و شکۆمەندە وێنەی نی یە.هەر بۆیە لە هەموو ڕویەکەوە شایستەو شایەنی تەواوی خۆشەویستی یە: (قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ: ال عمران ٣١) واتە: ئەی پێغەمبەر -پێیان بڵێ:ئەگەر ئەوان ڕاست دەکەن و خودایان خۆش دەوێت ئەوا شوێن من بکەون خوداش خۆشتانی دەوێت.

وەهەروەها دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ * إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ * وَمَن يَتَوَلَّ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ فَإِنَّ حِزْبَ اللّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ: المائده –٥٤–٥٦ ) واتە: (ئەی پێڕی بڕواداران.هەر کەسێك لە ئاینی خودا پاشگەز بێتەوە ئەوا خوای گەورە لە ئایندەدا کەسانێك دەهێنێتەکایەوە.کەخودا زۆری خۆش دەوێن و ئەوانیش خودایان زۆر خۆش دەوێت.کە زۆر بەسۆزو بەزەی بەرامبەر بە بڕواداران.وە سەربڵندو دەرون بەرزن بەرامبەر بەبێ باوەڕان،لەپێناوی ڕێبازی خودادا تێدەکۆشن،لە لۆمەی لۆمەکەران ناترسن ئەم (خۆشەویستی و هەڵبژاردن و سۆز و تێکۆشانە ) فەزڵ و ڕێزی تابیەتی خودایە کە دەیبەخشێت بەهەر کەسێك بیەوێت وە خوای گەورە فراوانگیر و زانایە بە هەموو شتەکان بە ڕاستی تەنە خۆشەویست و پشتیوانی ئێوە هەر خودا و پێغەمبەر و باوەڕدارانە کە بە هەمیشەیی نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و هەمیشە دیاردەی کڕنۆش بردنیان بۆ پەروەردگار پێوە دیارە.جا ئەوەی خواو پێغەمبەلر و بڕواداران بە پشتیوانی خۆی قبوڵ بکات ئەوا بادڵنیابێت کە واهەر تاقم و پێڕو حزبی خوا زاڵ و سەرکەوتوون ) .

جابناغەی پشتیوانی و دۆستایەتی –بریتی یە لە خۆشەویستی هەر وەکو چۆن بناغەی دژایەتی – بریتی یە لە ڕق و کینە وە خوایی گەورە پشتیوان و دۆستی باوەڕدارانە باوەڕدارانیش بە هەمان شێوە.بەخۆشەویستی پشتگیری و پشتیوانی دەکەن.جا خوای گەورە بە ئەندازەی خۆشەویستی بەندەکەی پشتیوانی لیٰ دەکات.هەر لەبەر ئەم هۆیەیە خوای گەورە زۆر بەتوند ڕەدی ئەو کەسانە دەداتەوە کە جگە لە خوا پشتیوان و دۆست بۆ خۆیان بڕیار دەدەن.هەروەها دژی ئەو کەسانە دەوەستێتەوە کە دەیانەوێت یەکسانی لەنێوان خودا و کەسانی تر دروست

بکەن لە خۆشەویستی دا وە ئاماژەی بەوە داوە کە هەرکەسێك ئەم کارە بکات ئەوا هاوبەشی بۆ خوا بڕیار داوە کەدەفەرموێت (وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ: البقره ١٦٥) واتە:هەندێ لە خەڵکی هەن دەچن جگە لە خودا کەسانی تر هەڵدەبژێرن و بەئەندازەی خودا خۆشیان دەوێت.بەڵام باوەڕداران تەنها خودایان خۆش دەوێت.

هەروەها هەواڵی ئەوەشمان دەداتێ کە پاشەڕۆژی ئەو کەسانەی هاوبەشی بۆ خودا بڕیار دەدەن لە خۆشەویستی دا لە دۆزەخدا بە هاوبەشەکان دەڵێن (تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ * إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ: شعراء ٩٧– ٩٨ ) واتە: بەڕاستی ئێمە لەو لوتکەی گومڕایی و سەر لێشێواو یدا بووین کە دەچوین ئێوەمان دەکردە هاوبەشی خودای گەورە لە خۆشەویستی دا "بەم یەکتای یەو هاوتای یە لە خۆشەویستی دا.

خوای گەورە سەرجەم پێغەمبەرانی ڕەوانە کردوە کتێبەکانی ناردووە.وە زەوی و ئاسمانەکانی بەدیهێناوە و بەهەشت و دۆزەخی سازداوە بەهەشت بۆ خۆشەویستانی،دۆزەخیش بۆ هاوبەش بڕیاردەرانی .

*وە پێغەمبەر (ﷺ) سوێند دەخوات کە: (لایؤمن عبدُ حتی یکون هو احب الیه من ولدهِ و والده والناس اجمعین ) [1]واتە: (هیچ کەس باوەڕی نی یە گەر بێتوو منی لە منداڵ و باوك و دایك و سەرجەم خەڵکی خۆشترنەوێت ) .

جا باوەڕدارێتی بەبێ خۆشویستنی پێغەمبەر دانامەزرێت ... ئەی دەبێ بۆ خۆشویستنی خودا چیی بێت ؟! وەلە فەرموودەیەکی تردا بە (عمر بن الخطاب ) دەڵێت: لاحتی اکون احب الیك من نفسك) [2]واتە: (نەخێر ئەی

---

[1] – ئەم فەرموودەیە (صحیح) پێشتر باسمان کردووە.
[2] – ئەمە بەشێکە لەفەرموودەیەکی (صحیح) کەپێشتر باسمان کردووە.

عمر ئەبێ منت خۆشت خۆشتر بوێت) . (جابۆ ئەوەی باوەڕمان دامەزراوبێت پێویستە پێغەمبەرمان لە هەموو کەس خۆشتر بوێت) . بەلام خوای گەورەو ئاکارە جوانەکانی دەبێت لەلوتکەی خۆشەویستیەکانماندا بێت. وەپێویستە دەست بگرین بەوکارو ووتانەی کە خۆشەویستی خودامان پێ زیاد دەکات وە دەست بەرداری ئەو کارانە بێت کە دژی خۆشەویستی خودایە.

وە هەرشتێك لە خوداوە بێت لە ڕەحم و بەزەیی خوداوە بۆمان. جەند جار لە لوتکەی تاوانباریدا بووینە کەچی خوای گەورە بەلوتف وسۆزی خۆیی پۆشیمانێتی.ئابووری نەبوردین و کار ئاسانی بۆ کردووین.وە تۆلەی لێ نەسەندووین.ئەمانە هەر هەمووی هاندەرمانن بۆ زیاتر گەڕانەوە و پاشگەز بوونەوە و لەتاوانکاری و خۆ فرێدانە نێوو خۆشەویستی خوداوە.هەرکەسێك کەتۆی خۆش بووێت،مەبەستێکی تایبەتی خۆی پێتە تەنانەت دایکیش بەلام تەنها خوای گەورە خۆشەویستیەکی تایبەتە خودی خۆت وبەبێ هیچ مەبەستێك.هەر وەکو لە (اثر) یك داهاتووە:

(عبدي كل يريدك لنفسه وانا اريدك لك) . واتە: (ئەی بەندەکەم هەموویان تۆیان بۆمەستی تایبەتی خۆیان دەوێت بەتەنها من تۆم بۆ خۆت دەوێت) .جا جۆرە مرۆڤێك شەرمەزار ئەبێت کاتێ هەست دەکات پەروەردگاری بەو ئاستە بەرزە مامەلەی لەگەڵ دەکات کەچی هێشتا سەر قالی خۆشەویستی ترە خوای پشت گوێ خستوە...؟!هەرکەسێك لەم ژیانەدا مامەلەت لەگەڵ بکات بەشێوەیەك لەشێوازەکان قازانجی خۆی مەبەستە.تەنها خوای گەورە نەبێت،کەهیچ مەبەست و قازانجێکی پێت نییە تەنها قانجی خۆت ئەبێت کەگەورەترین و مەزنترین قازانج دەکەبیت.هەردینارێك بە دەهێندە تا حەوت سەدسەت هێندە بگرە زیاترو

زیاتر دەکات. بەڵام هەر تاوانێك بەیەك تاوان دەژمێردرێت.وەئەگەری سڕینەوەی هەیە لە هەر کاتێك لەکاتەکاندا.هەر وەها خوای گەورە سەرجەم بوونەوەری لەپێناو تۆدا دروست کردوە جا ئایە کێ شایەنی تەواوی خۆشەویستییە...؟ئەو شتانەی نێو بوونەوەرەکە لەبەر تۆ دروست کراون؟یان ئەو کەسەی بوونەوەری لەپێناو تۆدا دروستکردووە؟هەروەها داواکاریەکانی سەر جەم دروستکراوەکانی دابین دەکات و دەوڵەمەنترین و بەخشندەترین هێزە پێش ئەوەی بەندەکانی داوای لێ بکەن ئەو نیعمەت لەسەر نیعمەت پێی بەخشیوون. وەپێش ئەوەی سوپاس گوزاری بکەن ئەو زیادی دەخاتە کارە کانیانەوە.هەموو ئەوانەی کەلەزەوی و لەئاسمانەکاندان هەموو ڕۆژێك لەیەك کات و ساتدا دەپاڕێنەوە لێی.بەگەورەیی خۆیی گوێبیستی هەموو نزاکان دەبێت.زیاتر پێی خۆشە لەنزا کاراندا ڕۆبچین وسوربین لەسەری. بەڵام تورە دەبێت لە یەکێك لێی نەپاڕێتەوە و نزانەکات.شەرمی لە بەندەکانی دەکات کەچی بەندەکانی شەرمی لێ ناکەن،لە کاتی تاوان کاریدا دەیان پۆشێت،ڕەحم و بەزەیی بە بەندەکاندا دێتەوە کەچی خۆیان بەزەیی بەخۆیاندا نایاتەوە. پەیتا پەیتا پێغەمبەرانی ڕەوانە کردوون تەنانەت خۆی بەمیهروگەورەی خۆی لە گەڵیاندا پەیامەکانی بۆ ناردوون، تەنانەت پێیان دەڵێت (من يسألني فاعطيه؟ من يستغفرني فاعفرله) [1] واتە: (کێ داوا کاری هەیە تا بۆی جێ بە جێ بکەم،کێ دەیەوێت لێی خۆش دەبم) .جا چۆن دڵانێك ئەو زاتەیان خۆش نەوێت لە هەڵکان دەبورێت. چاکەکەمان قوبڵ دەکات،ئابرۆ کان دەپۆشێت وەدەیان پارێزێت فریای لێ قەوماوان دەکەوێت. پێویستیە کان

---

[1] - ئەمە بەشێکە لەفەرموودەیەکی (صحیح) بخاری (٦٣٢١ و مسلم ٤١/٦ - ٤٢ - نووی).

دابین دەکات،...هتد.هەر خۆیی ئەو زاتە شایستەی یادو زیکرە شایستەی وەبیر هێنانەوەیە و خۆشەویستیە،شایستەی ملکەچی گوێڕایەڵی یە.تاك و بێ هاوڵ و بێ وێنەیە. زۆر زیاتر ڕزگار بوونی ڕێبوارێکی بێ نەوا لەبیابانێکی بێ سنوور دڵخۆشترە بەپاشگەز بوونەوە و تەوبەکردنی بەندەیەکی. زۆر زیاتر لەسۆزو میهرەبانی دایکێك بۆ کورە بزبوەکەی بەسۆز ترە بۆ بەندەکانی. سۆزو ڕەحم و میهرە بانی خودا بێ وێنەیە زاناو داناو بیسەرو لێ بوردەیە. نورو ڕوناکی پاکی ڕوخساری هەموو تارك ستانی جیهانی ڕووناك کردۆتەوە.

گەر پەردەی ڕوناکی لەسەر ڕوخساری لا بەرێت هەموو جیان لە تاواندا گڕ دەگرێت. هەروەکە چۆن (موسا) لە حەیبەتدا بێ هۆش کەوت. بەڕاستی هەر خۆیی شلیستەی یادو خۆشەویستی و گوێڕایەڵی و ملکەچی یە.

**لوتکەی چێژو پەیوەستە بەکەمالی و خۆشەویستیەوە**

لێرە دا کارێکی گرنگ هەیە پێویستە کەسی ژیر گرنگی تەواوی پێبدات. ئەویش بریتە لەوەی کە:چێژی تەواوی خۆشی و شادی و کامەرانی دڵ و دەروون بەندە لە سەر دوو بنەمای سەرەکی:.

یەکەم:خۆشەویستەکەت لەوپەڕی لوتکەی جوانی و بێ کەم کوڕی و تەواوی پڕو پوختی دابێت.کەشایەنی هەموو قوربانی و خۆشەویستك بێت.

دووەم:بەهێزی و بێ پایانی و بێ وینەی ئەو خۆشەویستی یە کە لە نێوانیاندایە.واتە هەرچەندە ئەندازەو ڕیژەی ئەو خۆشەویستی یە بەرزو زۆر بێت ئەوەندە زیاتر هەست بەتام و چێژی خۆشی شادی و کامەرانی دەکەیت.جا پاش زانینی ئەم دوو بناغە سەرەکییە ئەوە ماوەتەوە بلێین

کەهـەموو کەسـێکی ژیـرو هۆشـیار هەمیـشە لـە هـەوڵی بـە دەسـت خـستنی گـەورەترین و مـەزنترین شـادی و خۆشەویـستی یـە وە ئامادەیـە قوربـانی بـەزۆر شـتی لاوەکـی و سـادەبدات لـەپێناوی بەدەسـت هێنـانی ئـەو خۆشـیەدا. جاچـۆن ڕەوای حەقـە ئێمـەی مـرۆڤ لـەپێناو خۆشـی یـەکی کـەم و کـورت و سنوردار خۆشی یـەکانی قیامـەتی هـەتایمان لـە دەسـت دەربچێت. (بَـلْ تُـؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الـدُّنْيَا* وَالْـآخِرَةُ خَيْـرٌ وَأَبْقَـى: الأعلى ١٦-١٧) واتـە: بـەلأم ئێـوە هـەر ژیـانی دونیاتـان بەدەسـتەو هەڵدەبژێرن،بـەلأم ژیـانی قیامـەت نـەبڕاو خێـرو پـڕ بەرەکەت ترە.

و هەمیـشەئەمە ڕاسـتیەکە جـادوو گـەرانی فـیر عـەوون لەسـاتە چـرکەکانی تەمەنیانـدا هەسـتیان پـێ کـردوە ئامـادە بـوون لـەم پێنـاوەدا هـەموو شـتێ بـەخت بکـەن تەنانـەت گیـان و جەسـتەیان کـە بـەو پـەڕی ژیروبوێرانـە بـە فـیر عەونیان ووت:چیت لە دەست دێت بێ منەت بە... (فَاقْضِ مَـا أَنـتَ قَـاضٍ إِنَّمَـا تَقْضِي هَذِهِ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا * إِنَّا آمَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَايَانَـا وَمَـا أَكْرَهْتَنَـا عَلَيْـهِ مِـنَ الـسِّحْرِ وَاللَّـهُ خَيْـرٌ وَأَبْقَـى: طـە ٧٢-٧٣) واتـە: ئـەی فیرعـەون هەرچیت لـە دەسـت دێـت قـسور مەکـە تـۆ هـەر ئەوەنـدەت لـە دەسـت دێـت لـەناومان بـەریت ولـەم ژیانـە وە دەرمانـەیت. جـا بـەراودی ئـەو دونیـا (قیامـەت) لەگـەڵ ئـەم دونیـای کـاتی ناکرێـت.چـونکە ئێمـە باوەڕمـان بـەخودای بەڕاسـتەقینەی خۆمـان هێناوە،بە ئومێدین لەتاوانەکانمان ببورێت.

بـەلێ هـیچ کاتێـك نیعەتـەکانی بەهەشـت بـەراودناکرێت لەگـەڵ دونیـادا.هـەر بۆیـە مامۆسـتای ئامۆژگـاری کـاران ڕوو دەکاتـە گـەل و هۆزەکـەی و پێـان دەلێـت: (يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ * يَا قَـوْمِ إِنَّمَـا هَـذِهِ الْحَيَـاةُ الـدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْـآخِرَةَ هِـيَ دَارُ الْقَـرَارِ : غـافر٣٨-٣٩) واتـە: ئـەی گـەل هۆزەکـەم شـوێنم کـەون بەووتـەی مـن بکـەن ڕێنمایتـان دەکـەم بـۆ ڕێبـازی سـەر فـرازی وچـاکە*ئـەی گـەل و هۆزەکـەم بـێ گومـان ژیـانی ئـەم دوونیایـەبریتی یـە لـە

ڕابردوویەکی کەم وە ژیانی ئەو دونیا (قیامەت) ژیانی دانەبڕاوە جێی ئومێدو حەوانەویە.وەپێی ڕاگەیاندنە کەخۆشی دونیا کاتی بەسەر چوە سنور دارە بەڵام بەهەشت هەتا هەتای و بێ کۆتایی یە.

دواترگەر لەشەیدایان و عاشقان بپرسین:خۆشترین نیعمەت چی یە؟بێ گومان دەڵێت دیداری خۆشەویستەکەمە.بەڵێ زۆر ڕاستە هەر بۆیە گەورەترین و بەنرخترین نیعمەت لەنیعمەتەکانی بەهەشت و قیامەت بریتی یە لە شادو شوکر و بەهرەمەندبوون بەدیداری لوتکەی خۆشەویستەکانە کەبینینی خوتی گەورەیە.هەروەکو لە فەرموودەیەکی (صحیح) دا هاتووە کەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمێت: **(فو الله ما اعطاهم شيئنا احب إليهم من النظر اليه)** [1]واتە: (سویند بێت بەخوا هیچ نیعمەتێ بەئەندازەی بەبینی تەماشاکردنی خودا لایان خۆشتر نییە) .وەلەفەرمودەیەکی تردا هاتووە. **(انه اذا تجلى لهم ورأوه نسوا ما هم فيه من النعيم)** [2] واتە: (کاتێ خوای گەورە زاتی خۆی نیشان بەهەشتیەکان دەدات ئیتر خۆیان لەبیر دەکەن کەچین و لە کوێدان)..

وەلە (نسائي) و (مسند) دا هاتووە عمار بن یاسر کە پێغەمبەر (د.خ) لەکاتی نزاو پاڕانەوەدا فەرموویەتی **(الشوق الى لقائك)** [3] واتە: وەداوای چێژی خۆشیەکانی بینینی دەکەم وەتامەزرۆین بۆ دیدارت.وەلە (کتاب الحسنه) دا هاتوە کە (عبدالله بن امام احمد) بە (مرفوعی) **(كان الناس يوم القيامة لم يسمعوا القران إذا سمعوه من الرحمن فكانهم لم يسمعوه قبل ذالك)** [4]واتە: (وەك بڵێی خەڵکی پێشتر قورئانیان

---

[1] - ئەم فەرموودەیە(صحیح) ە (مسلم-الايمان-١٨١) گێڕاوێتیەوە.
[2] - ئەم فەرموودەیە (حسن) ە (ابن ماجه - ١٨٤) گێڕایەتیەوە.
[3] - ئەم فەرموودەیە (حسن) ە (ابن ماجه ) گێڕایەتیەوە.
[4] - ئەم فەرموودەیە (حسن) ە (ابن ماجه - ١٨٤) گێڕایەتیەوە

نەبیستووە.خەڵکی کاتێ گوێیان لە قورئان دەبێت لەلایەن خوای گەورەوە وا دەزانن یەکەم جارە دەیبستن) .

کەواتە باشترین هۆکاری گەیشتن بەچێژو خۆشی یەکانی بەهەشت بریتی یە لە ناسین و خۆش وویستنی خوای گەورەیە ئەو بەهەشتەی کە هەر لەبنەڕەتدا نیشتمانی سەرەکی گیان و جەستەی ئێمەبووە.واتە: خۆشترین و شیرنترین شت لەم دوونیادا بریتی یە لە ناسینی خودا خۆشەویستنی. وەخۆشترین و شیرینترین شت لە بەهەشتدابریتی یە لە تەماشاکردن و گەیشتن بەدیداری خوای گەورە.چ نیعمەت هەیە لەژیاندا بگاتە نیعمەتێك خۆسازادان کە بەوپەڕی تامەزرۆییەوە بۆ گەیشتن بەژوان و دیداری گەورەترین خۆشەویست،کەسەرجەم دڵ و دەروونی داگیرکردبێت.تەنانەت هەندێ لەخۆشەویستان دەڵێن:هەندێ کاتمان بەسەردا تێ دەپەڕێت ئەوەندە هەست بەخۆشی و دڵنیایی دەکەین.دەڵێن:ئەگەر بەهەشتی یەکان لەو جۆرە ژیانەی ئێمەدا بن ئەوە ژیانیان خۆشە.

هەروەها دەڵێت:ئەگەر پادشاکان و دارو دەستەکانیان بەخۆشی و شیرینی ژیانی ئێمەیان بزانیایە.ئەوە شەڕیان لەسەری دەکرد.خۆشەویستی چارەسەرو خۆراکی ڕووحە هەرکاتێك دڵ لەم خۆراکە بڕا چیتر توشی نەهامەتی دەبێت،بگرە زۆر ئەستمەترە لەناخۆشی یەکانی لەدەست دانی ڕووناکی بۆ چاوەکان یاخود لەدەست دانی هەستی بیستن یان بۆنکردن. دڵی مرۆڤ ژوانگەی خۆشەویستی خوای تاك و تەنهایە-بەبێ ئەم ووزەیە دڵ توشی گەورەترین دەردو نەهامەتی دەبێت چیتر لەجەستەیەکی ئاژەڵی بەولاوە هیچی تر نامێنێتەوە کەئامادەیە وەك درندەیەك هەموو شتێك لەپێناوی ئارەزووەکانیدا تێك بشکێنێت.

## چێژەکانی دوونیا هۆکارن بۆ گەیشتن بەچێژەکانی قیامەت

واتــە:مــەزنترین خۆشــی و چــێژەکانی دوونیــا هۆکــارن بــۆ گەیــشتن بەخۆشیەکانی قیامەت.

چێژوخۆشیەکانی دونیا سێ جۆرن:.

گــەورەترین و مــەزنترینیان:ئەوەیانــە کەدەبێتەمایــەی گەیــشتنمان بەخۆشــی و چــێژەکانی قیامــەت.هەربۆیــە مــرۆڤ کــاتێ لەســەرجەم کــارو بارەکانیــدا گــەر بەمەبەســت و نیعمــەتی خــوای گــەورە بێت،ئــەوە پاداشــتی هەیــە لەســەر خــواردن و خواردنــەوە بــەرگ پۆشینین،هاوســەر گیری و...هتد.کە چێژو شیرینی باوەڕوناسینی خودا.خۆش ویستنی و تامەزرۆیی بۆدیداری گەورەترین خۆشیە لەبەشتی بەریندا.

جــۆری دووەم:.ئــەو چــێژو خۆشــیانەی کەدەبنــە مایــەی ڕێگــری و بەربەســت لــە گەیــشتن بەبەختەوەریــەکانی قیامــەت.کــەهۆکاری ســەرقاڵ بــوون و بــچوک بونــەوەی شــکۆمەندی مرۆڤیــە.خزانــە نێــو دەربــارەی دونیــا بــازی،وەك خــۆش ویــستنی کــەس و شــتی تــر لــەبری خــوای گــەورە،وە هاوبــەش بڕیــاردان بــۆی وەك چــێژ وەرگــرتن لەیــەکتری هــەروەکو لەقیامەتدا دان بەم ڕاستیە دەنێنـدەڵێن (رَبَّنَــا اسْــتَمْتَعَ بَعْــضُنَا بِــبَعْضٍ وَبَلَغْنَا أَجَلَنَا الَّذِيَ أَجَّلْتَ لَنَا قَالَ النَّارُ مَثْوَاكُمْ خَالِدِينَ فِيهَــا إِلاَّ مَــا شَــاء اللّهُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَليمٌ * وَكَذَلِكَ نُــوَلِّي بَعْــضَ الظَّــالِمِينَ بَعْــضًا بِمَــا كَــانُواْ يَكْــسِبُونَ: الانعــام١٢٨) واتــە:ئــەی پــەروەردگار هەنــدێکمان سودمان لــەوانی تــر وەرگــرت ئێــستاش گەیشتونەتە ئــەو کــات و ساتەی تــۆ بــۆت دیاری کــردوین.خــوای گــەورەش فــەرمووی:ئــەم ئاگرە جێگاتانــە بــە هەتاهــەتایی.مەگــەر خــوا وویــستی لەســەربێت (کەبەســزایەکی تــر

سزان بدات) بەڕاستی پەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ ) داناو زانایە.وەچێژی لووت بەرزی و خراپەکاری ستەم کاران لەسەر زەویدا.

لەڕاستی دا ئەم چێژو خۆشیانەکاتی و کەمەند کێشکردنەو پێشەکییە بۆ کەوتنە نێو ژانە بێ کۆتاکانەوە کەدەبێتە ڕێگری و مەبەست لەبەدەست هێنانی بەختەوەرییە هەمیشەییەکان.نموونەی ئەم چێژو خۆشیانە،هاوشێوەی ژەهر تێکەڵ کردنەبە هەنگوینەوە تا سەر ئەنجام تیا چونی لەدوایە: (سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لاَ يَعْلَمُونَ * وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ: الأعراف١٨٢ ) واتە: (لەئاینەدا وردە وردە بەرەو تیاچوون دەیان بەین لەکات وشوێنێکدا کەئەوان هەستی پێ ناکەن و نایزانن وەمۆڵەتیشیان دەدەم بەڵام کەتۆڵەم لێ سەندن بەڕاستی نەخشەو پلانی من توندو بەهێزە) .

وەهەروەها پێرێك لە (سلن) لە لێدانەوەی ئەم ئایەتەدا دەڵێن:هەرکاتێ تاوانێك ئەنجام دەن ئێمە نیعمەتێکیان بۆ زیاد دەکەین (حَتَّى إِذَا فَرِحُواْ بِمَا أُوتُواْ أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ * فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُواْ وَالْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ: الانعام-٤٤-٤٥) واتە: (هەتا کاتێ دڵخۆش و شادومان بوون بەوەی کەپێیان دراوە.ئیتر لەناکاو گرتمانن و هەموویانمان سەرگەردان و ڕیسوا کرد وەبە غەم و پەژارەیەکی زۆرەوە تیاچوون ئەو گەلە ستەم کارە بنبڕکران وەسەرجەم بوونەوەر دەڵێت:سەپاس بۆ پەروەردگاری جیهان) .

وەخوای گەورە سەبارەت بەم پێرە دەفەرمێت: (أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ * نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ بَل لَّا يَشْعُرُونَ: المؤمنون ٥٥-٥٦) واتە: (ئایە ئەوان وادەزانن کەئێمە ماڵ و سامان

و نــەوەیان پــێ دەبەخشــین *نــەخێر وانــی یــە بــەڵکو مەبەســتمان بــە پەلەنازو نیعمەت بەهرەیان بکەین!بەڵکو ئەوانە هەستی پێناکەن) .

وەهەروەها دەفەرمێت: (فَلاَ تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَلاَ أَوْلاَدُهُــمْ إِنَّمَــا يُرِيــدُ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُــمْ كَــافِرُونَ: التوبـة-٥٥) واتــە: (ئــەی پێغەمبەر،نــەماڵ و ســامان و نــەوەیان ســەر سـامت نــەکات وەبەباشـیان نــەزانیت.چــونکە خــودا دەیــەوێت لــەژیانی دونیــادا توشــی ســزاو بــەلاّیان بکــات لــەرێگای مــاڵ و ســامان و نەوەکانیانــەوە گیانیــان دەربکــات.لەکاتێکــدا کەئــەوان بــێ بــاوەڕن.جائــەم چــێژو خۆشــیانە کــاتین لەناچــونیان زۆر نزیکــە وەگــەورەترین بەربەســت لەدەسـت خسـتنی بەختــەوەری هەمیشـەیی ومایــەی ســزاو ئەشـکەنجەو چەرمەسەری یە لەقیامەتدا) .

## چێژی درووست:

جــۆر ســێیەم: .هەنــدێك چــێژو خۆشــی هەیــە کەنابێتــە ڕێگــر لەخۆشــــیەکانی قیامەت،وەلەهــــەمان کاتــــدا ڕێ پێــــدراوە ومایــــەی قەدەغــەکاری نــی یــە کەتــەنها بــۆ حەوانــەوەی دەروونــە.بــەلاّم پێویســتە زیــادەڕۆیی تیانــەکرێت. وگرنگــی زیــاتر بەدەســتهێنانی بەختــەوەری هەمیــەیی بــدرێت.وە هــەر ئەمەیــە مەبەســتی پێغەمبــەر (د.خ) لــەم فــەرموو دەیــەدا باســی دەکــات کــە دەفــەرموێت: (کل لهو یلهو بـه الرجـل فهــو باطــل الارمیــة بقوســه، وتادیبــه فرســه، و ملاعتبــه امــــراته فــان نهــن مــن الحــق)[1] واتــە:(هــەموو گاڵتــەو گەمــەو یارییــەك کــەمرۆڤ دەیکـات

---

[1] - ئــەم فەرموودەیــە (حســـن) ە (ترمــزی ١٦٣٧) و (ابــوداود-٢٥١٣) و (احمـــد/٤/١٤٤) گێڕاوییەتیەوە.

هـەر هـەمووی پـڕو پوچـە کەتـەنها تـیرو کـەوان وەشـاندن وڕاهێنـانی وسـوار چـاکی دەسـت بـازی کـردن لەگـەڵ خێزانەکەیدا.کەئەمانـە ڕاسـت و دروستن) .

واتـە هـەرکارێك چـێژی لـەم بابەتـەی تیـا بـوو دروسـتە جاکەواتـە ئـەم خۆشـییە خـراپ و ناشـیاو نادروسـت نـی یـە بـەڵکو باشـترین جـۆری خۆشەویسـتی یـە وەهـەروەها خـۆش ویسـتنی خـوداو پێغەمبـەری خـودا کـە لـە دڵـی هـەموو موسـڵمانێك دا هەیـە وەبـە بـیّ ئـەو خۆشویسـتی یـە بـاوەڕ دانامـەزرێت.لەکەسـێکەوە بـۆ کەسـێکی تـر ڕێـژە و ئەنـدازەی دەگۆڕێت.هـەر ئـەم خـۆش ویسـتی یـە هۆکـارو پاڵنـەرو ئاسـانکاری زۆرێـك لـەکارە ئـاڵۆزو زەحمەتـەکان وەسـەغی و دەسـت بـڵاو کـاری قیرچـۆکەکانە وە ئازاکـاری ترسـنۆکەکانەهەروەها پاڵفتـەوخاوێن کـاری دەونـەو ڕیاکـاری بیروهۆشـە.خۆشـکاری ژیانـە.وەهـەروەها هـەر خۆشویسـتی خـودا و پێغەمبەرەکەیـەتی کەڕۆشـنکاری ڕوخسـارەکان و فراواکـاری سـنگەکان و زیندوکـەری دڵەکانـە.وەخۆشەویسـتی وتـەی خـوای گـەورە کەنیشـانەی تـەواوی خۆشویسـتی یـە بـۆ خـودا.کـیّ هەیـە حـەزو ئـارەزوی بیسـتنی وتـەو دەنگـی خۆشەویستەکەی نـەبێت.قورئـان و گوێبیسـتی خوێندنـەوەی بەڵگـەی خۆشویسـتنی خودایـە.بەپێچـەوانی ئەوانـەی هەمیشـەلەنێو بـاڕو مەلهەکانـدا گوێبیسـتی شـتی ناشـرین وەتەماشـایی نادروسـت و شـتی خراپـەکاری دەبـن.جاگـەر خۆشەوویسـت ڕاسـت بکـات هەمیشـە ئـارەزوی بیسـتنی وتـەی خۆشەویسـت ڕاسـت بکات.وەك شاعیرێك دەڵێت:

ان كنت تزعـم حبي فـــلم هجرت كتابي

اما تأملــت مافيهِ من لذيذ خـــاطبي

واتە:گەرتۆ منت خۆش دەوێت بۆپشتت لە کتێبەکەی من کردوە.

ئایەنایەنەتخوێندۆتـــــەوە کەچـــــی تێدایـــــە.لەچـــــێژو خۆشـــــی گوتارەکـانم.وە (عوسمـان کـوڕی عـەفان) دەڵێـت: (ئەگـەر دڵـەکانمان پـاك و خـاوێن ببوایـە. ئـەوا هـەرگیز تێـری لەگوتـەکانی خـوای گـەورە نـەدەخوارد) .جـا ئـەم زۆر کـردن و ئـارەزوکردنی، خۆشەویسـیت بـۆ وتـەی خۆشەویسـتەکەی شـتێکی بەڵگەنەویسـتە ؟ هـەر بۆیەپێغەمبـەر (ﷺ) ڕۆژێکیـان ڕویکـردە (عبـدالله بـن مسـعود) و پێـی دەڵێـت: اقـرا علي فقال:اقـرا عليك،وعليـك انـزل ؟فقـالﷺ :انـي احـب ان اسمعـه مـن غـيري (فاستفتح فقـرا سـورة النسـاء حتـى اذا بلـغ قولـه: (فَكَيْـــفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَـى هَــــؤُلاءِ شَـهِيدًا:النسـاء ٤١ ) . قـالﷺ حسبك فرفـع رأسـه فـاذا عينـا رسـول الله صـلى الله عليـه وسـلم تـذرفات مــن البكـاء)[1] واتــە: یەپێغەمبــەری فــەرموو قورئــانم بەســەردا بخوێنــەرەوە عبـدالله ووتـی قورئـان بەسـەرتۆدا بخوێنمـەوە لەکاتێکـدا بـۆ تـۆ دابـەزیووە ؟ پێغەمبـەر فـەرمووی: مـن پـێم خۆشـە لەکەسـی تـرەوە بیبیسـتم عبـدالله ش لەسـورەتی (نسـاء) وە دەسـتی پێکـرد بـەقورئان خوێندن تاگەیشتەئایتی (فكَيفَ ادا جِئْنَا مِـن كُـلِّ أمَّـةٍ بِشَـهِيدٍ وَجِئْنَـا بِـكَ عَلَـى هَـــؤُلاءِ شَـهِيدًا). واتـە: (ئەگـەر لـە هـەموو نەتـەو گـەلێك پێغەمبـەرێك بكەینەشـایەت لەسـەریان وەتـۆش بكەینـە شـایەت لەسـەر هـەر هـەموویان) لێـرەدا پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی بەسـە ڕاوەسـتە کـاتێ عبـدالله سـەری بـەرز کـردەوە بینـی پێغەمبـەر (ﷺ) هـەردوو چـاوی پڕبـوو لـە فرمێسـك.وە هاوەڵـەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) کـاتێ کۆبوونـەوە

[1] ئەم فەرموودەیە(صحيح) ە (بخاری-٤٥٨٢) ڤێراویەتیەوە.

ئەگەر (ابو موسى) يان تێدا بوایە داوایان لێ دەکرد کە بە قورئان خوێندن خودایان بیربهێنێتەوە ئەویش دەستی دەکرد بە قورئان خوێندن و ئەوانیش لەچواردەوری دادەنیشتن و گوێ بیستی دەبوون. لەلای شەیدایانی قورئان. قورئانی پیرۆز شیرینی و تام و چێژ و خۆشیەکی تایبەتی هەیە. کەزۆر خۆش ترە لەشەیدایانی شەیتان. شەیدایانی شەیتان ئەو پێرانەن کەدڵیان لەئاستی قورئانی پیرۆز ڕەق ومردو بێ گیانە.هەروەکو شاعیرێك دەڵێت:

تقرا عليك الختمة وانت جامد كالحجر وبين من الشعر نيشد تميل كالسران.

واتە: خەتمەیەك قورئان بۆ دەخوێندرێتەوە -کەچی تۆ وەك بەردی بێ گیانی و کاریگەریت تێناکات.

بەلام دوو دێڕ شعر بخوێندرێتەوە وەك سەر خۆشت لێ دەکات.جا ئەم حاڵەتە بەڵگەی تەواوە لەخاڵی بوونی دڵی ئەو کەسە لەخۆش ویستنی خوداو ووتەکانی خودا. وپێغەمبەر ەکەی.کە ئەو دڵە وەك کەلاوە وایە. چونکە دڵ تەنها بەخۆش ویستنی خودا و قورئان و پێغەمبەرەکەی هەمیشە زیندو ئارامە.

## خۆش ویستنی دروست

خۆش ویستنی خوداو پێغەمبەرەکەی سەرچاوەو چڵە پۆپەی سەرچەم خۆشەویستەکانن لەژیاندا. لەپاش ئەمانە سەرجەم جۆرەکانی تری خۆشەویستی سەرچاوە لەوەوە وەردەگرن و دابەش دەبن. نموونەخۆشەویستی هاوسەرەکان (خێزان) خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمێت: (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ

أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ: روم-٢١) واته: (هاوسەری بۆ دروست کردون بۆئەوەی ئارام بگرن لە دیدارو خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی لەنێوانتاندا فەراهەم هێناوە ئەمە بەڵگەیە بۆ کەسانێك تێبگەن.

کەواتە خوای گەورە خۆشەویستی هاوسەرەکانی بەبەڵگەی گەورەی خۆیی باس دەکات.وەهەروەها لەجێگایکی تردا -لەپاش باس کردنی ئەو ئافرەو کچانەی کە دروستن بیان خوازن - دەفەرمێت: (يُرِيدُ اللّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ * وَاللّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَن تَمِيلُواْ مَيْلاً عَظِيمًا * يُرِيدُ اللّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ وَخُلِقَ الإِنسَانُ ضَعِيفًا : النساء ٢٦-٢٨) واته: (بێگومان خوای گەورە دەیەوێت بەم شێوەیە هەموو شتێکتان بۆ ڕوون دەکاتەوە.وە ڕێنمویتان بکات بۆ یاساو بەرنامەکانی پێش خۆتان. (کەپێغەمبەران هێناویانە... وە تەوبەو پەشیمانیتان لێ وەربگرێت خودا زاناو دانایەوەخوای گەورە دەیەوێت لێتان خۆش بێت لێیان ببورێت بەلاّم ئەوانەی شوێن کەوتوی ئارەزوەکانیانن،دەیانەوێت توشی ئاشوبوو لادانتان بکەن بەلاّم خوای گەورە دەیەوێت بەم بەرنامە بارتان سوك وکارتان ئاسان بکات. چونکە ئادەمیزاد بەلاوازی دروست کراوە (لەبەرامبەر بەئارەزوەکانی وە خۆڕاگر نی یە.

وە (سفیان الثوري) لە (تەفسیرەکەیدا لە (ابن طاوس) ئەویش لە (باوکی) یەوە دەگێڕێتەوە: ئەگەر تەماشای ئافرەتی بکردایە خۆیی پێ ڕانەدەگیرا.وەلەفەرمودەیەکی (صحیح) دا هاتووە لە (جابر) ەوە (ﷺ) دەڵێت: (أنه رأي امراة فأتى زينب- رضي

الله عنهـا فقضى حاجتـة منهـا، وقـال (ان المـراة تقبـل في صـورة شـيطان،وتدبر في صـورة شـيطان،فاذا راى احـدكم امـراة فاعجبتـه فليات اهلـه، فـان ذلـك يـرد مـافي نفسـه)[1] واتـه: (پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) ئـافرەتێکی بینـی دواتـر چـوو بـۆلای زینـەبی خێزانـی و جـووت بـوو دواتـر پێغەمبـەری خـودا فـەرمووی:.ئـافرەت هەنـدێ جـار وەکوشـەیتان دێـت و دەچـێت (مەبـە سـتی خۆنمـایش کـردن) .جاهەریـەکێك لـەئێوە ئـافرەتێکی بینـی و سـەرنجی ڕاکێشـا بابچـێتە لای خێزانـی خـۆیی و کـاری جـووت بـوون ئـەنجام بـدات. چـونکە بەمەچـی لەدەرونیـدابێت دایدەمرکێنێتەوە.

سوودەکانی ئەم فەرموو دەیە:.

یەکـەم:پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) ڕێنمایمـان دەکـات کـە هـەروەکو چۆن خـواردن –جێـی خـواردن پڕدەکاتـەوە. وەجـل و بـەرگ جێـی جـل و بـەرگ ی تـر پـڕ دەکاتـەوە. بەهـەمان شـێوەش –کـاری سێکسـی جێگـەی کـاری سێکسـی پڕدەکاتـەوە. واتـە کـاتێ ئـارەزوی سێکسـیت بـەبینینی ئافرەتێـك هـوروژا–کەچـویتەلای هاوسـەرەکەت. چـیتر لـەو کـارە دەربازت دەبێت.

دووەم:چارەسـەرکردنی کاریگـەری ئافرەتـان بەسـەر پیاوانـەوە یـاخود پیـاوان بەسـەر ئافرەتانـەوە.دەشـێت هەریەکـەیان لـەپیاوان و ئافرەتـان بـەبینینی ڕەگـەزی بەرامبـەر حـەزو ئـارەزوی سێکسـیان بجولێـت.جـا بـۆ چارەسـەرکردنی ئـەم حاڵەتـە باشـترین چارەسـەر ئەنجامـدانی کـاری سێکسـی یـە لەگـەڵ هاوسـەرەکانیاندا.لەهـەمان کاتـدا

[1] -ئەم فەرموودەیە (صحیح) ە (مسلم ٩/ ١٧٧ - نووی)

ئاماژەیەکە بۆلاوان وخۆشەویستان هەروەکو لە (سند) ی (ابن ماجە) دا هاتووە بە (مرفوع) ی (لم یر للمتحابین مثل النکاح) واتە: (مەن جگە لەپرۆسەی هاوسەرگیری هیچ چارەسەرێکی ترم نی یە بۆ دوو خۆشەویست) .کەواتە:هاوسەرگیری باشترین چارەسەرە بۆ دوو خۆشەویست و دوو عاشق لەڕوانگەی شەرعەوەوەحەززرەتی (داود- علیە سلام) هەربەهەمان شێوەچارەسەری دەردی عەشقی کردوە بەوەی کەدەستی نەچۆتە تاوانکاری. کاتێ کەئافرەتەکەی چۆتەدڵەوە یەکسەر خواستویەتی و فرە ژنی بەکارهێناوە.١- لەمەزیاتر ئێمە بۆمان نی یە لەسەر ئەم ڕووداوە بنوسین.[1]

پووچەڵ کردنەوەی ڕووداوی (زینب بن جحش)، ڕووداوی خاتو زەینەب بەم چەشنە بوو (زید بن حارثة) خزمەتکاری پێغەمبەری خودابوو (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) (زید) ی لەکۆیلەی و بەندەی دەرباز کردو سەربەستی کرد.دواتر بە (زید) یان ووت کوڕی پێغەمبەر. پاشان پێغەمبەر (ﷺ) (زینب بن جحش) ی بۆ خواست کەدەکاتە پوورزای پێغەمبەر (ﷺ) بەلام دیار بوو بەیەکەوە نەدەگونجاو تەبا نەبوون.چەند جارێك (زید) وویستی لێی جیابێتەوەو تەلاقی بدات.بەلام پێغەمبەر (ﷺ) نەی دەهێلا. دواتر پێغەمبەر (ﷺ) دڵنیا بوو کە (زید) هەرلێی جیادەبیتەوە وویستی لەپاش جیابوونەوەیان بیخوازێت. بەلام لەترسی دەم و قسەی خەڵکی دەری نەبڕی. لێرەدا خوای گەورە بەدانایی خۆیی وویستی لەشکاندن

---

[1] - تەواوی ئەم چیرۆکە لەکتێبەکانی تەورات دا( العهد القدیم) هاتووە بەلام بەشێوێندراوی و دەستکاریەوە. هەرچەندە گومان هەیە لەڕاست و دروستی ئەم چیرۆکە. بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە شیکارمان بۆ ئەم چیرۆکە لەکتێبی (تلبیس ابلیس/ص٩٨)ضاثی یەکەم /ضاثی (المکتب الثقافي في القاهرة)

یاسـا و عـورفێکی ئـەو سـەردەمە بـوو. کـەبریتی بـوو لـە (بنونیـەت) واتـە:کەسـێك بەتەبـەنی کەسـێکی تـر دەکـات بـەکوڕی خـۆی و چـیتر مـیرات وهـەموو مـافێکی ترهـەبووە.وەك کـوڕێکی سروشـتی.جـاخوای گـەورە بـەم کـارە. واتـە بـەمارە کردنـی (زینـب) لەپێغەمبـەر (ﷺ) ئـەو یاسـایە هـەڵ دەوەشـێنێتەوە.کـەدواتر خـەڵکی دەڵێـت پێغەمبـەر (ﷺ) بـۆ خـۆیی مـارەی کردۆتـەوە ئـەوە ئایەتـەکان ئامـاژە بـەم ڕاسـتی یـە دەکـەن (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْـتَ عَلَيْـهِ أَمْـسِكْ عَلَيْـكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيـهِ وَتَخْـشَى النَّـاسَ وَاللَّـهُ أَحَـقُّ أَن تَخْـشَاهُ: الأحـزاب-٣٧) پاشـان دوایـی کـە (زیـد) جیـا بـووە وەعیـدەی بەسـەر چـوو خـوای گـەورە فـەرمانی بەپێغەمبـەر (ﷺ) کـرد کەدەبێت بیخوازێت و لەووتەی خەڵکی نەترسێت.

هـەر بۆیـە پێغەمبـەر (ﷺ) زیـدی نـارد تـاداوای (زینـب) ی بۆبکـات. (زیـد) ڕۆیـی بـۆلایی و پێـی ڕاگەیانـد کەپێغەمبـەر (ﷺ) دەیـەوێت بیخوازێـت (زینـب) یـش ووتـی (مـن لـە گـەڵ فـەرمانی خـوداو پێغەمبـەری خـودا هـیچ وەلامێکـیٚ م پـیٚ نیـە) . پاشـان ڕۆی دوو ڕکـات نوێـژی کـرد. خـوای گـەورە لەسـەروی ئاسمانـەوەو عەرشـی مەزننـەوە (زەینبـی ) مـارە بـڕی لـە پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوە (فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِّنْهَـا وَطَـرًا زَوَّجْنَاكَهَـا: الأعـزاب-٣٧) واتـە: (کـاتیٚ زەیـد لێـی جیـابوەو عیـدەی تـیٚ پـەڕیی ئێمـە (زینـب) مـان لـیٚ مـارە کـردی) هـەر بۆیـە خـاتوو زەینـب شـانازی بەسـەر هاوسـەرەکانی تـری پێغەمبـەردا (ﷺ) دەرکـردو پێـی دەوتـن: ئێـوە هـەر هـەمووتان خـزم کەسـەکانتان مارەیـان بـڕین لـە پێغەمبـەر (ﷺ) بـەلام مـن خـوای گـەورە خـۆیی مـارەی بـڕی لەپێغەمبـەر (ﷺ) لەسـەروی عەرشـی

مەزننـــــەوە.[1]ئـــەوەی شـــایەنی باســـە پێغەمبـــەری خـــودا (ﷺ) هاوســـەرەکانی خـــۆی زۆر خـــۆش ویســـتووە. هـــەروەکو لـــە (صـــحیح) داهـــاتووە لـــە (انـــس) ە دەگێڕێتـــەوە کەپێغەمبـــەری خـــودا (ﷺ) فەرموویـــەتی (حبـــب الی مـــن دنیـــاکم النســـاء والطیب،وجعلـــت قـــرة عینـــی في الصـــلاة ) [2] واتـــە: (مـــن لەدنیاکەتانـــدا ئـــافرەت و بـــۆنی خۆشـــم لاخۆشەویستە وە نوێژم لا وەك بلبیلەی چاوەکانمە) .

جـا لـەم فـەرموو دەیـەدا ئـەم بڕگەیـەیی بۆزیـادکراوە.حبـب الی دنیـاکم ثـلاث واتـە (سـیّ شـت لەدونیاکەتانـدا لای مـن خۆشەویسـت کـراوە) .وە هـەروەها (امـام احمـد) لـەکتێبی (الزهـد) ئـەم بڕگەیـەیی بـۆ ئـەم فـەرموو دەیـە زیـاد کـردوە.اصبرعلی الطعـام والشـراب ولااصـبر عـنهن. واتـە: دەتـوانم ئـارام بگـرم لەسـەر خـواردن و خواردنـەوە بـەلاّ نـاتوانم لەســەر ئافرەتــان ئــارام بگــرم.وە جولەکــە سەرســەختەکانی دوژمنــی حەســودیانی پــیّ دەبــرد وە دەیــان ووت هــەر لەخــەمی مــارە کردنــی ئافرەتدایــە. وەخــوای گــەورە ڕەدیــان دەکاتــەوە دەفــەرمێت: (أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَى مَا آتَاهُمُ اللَّـهُ مِـن فَضْـلِهِ فَقَـدْ آتَيْنَـا آلَ إِبْـرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًـا عَظِيمًـا: النسـاء -٥٤) واتـە: یـان هـەر ئەوەیـە حەسـادەت و بـەخیلی بەخـەڵکی بـاوەڕدار مەبـەن لەسـەر ئـەوەی خــوا لــە فــەزڵ و بەخشیشــی خــۆیی بەشــی داون (پێغەمبــەری (ﷺ) لەنێویانــدا هەڵبــژێردراوە) خــۆ بێگومــان ئێمــە بەنــەوەی ابــراهیم کتێبمــان بەخشــیوە (موســا تــەورات و عیســی ئینجیــل و بەمحمــدیش (ﷺ) قورئان).

---

[1] - بۆزیاتر بڕوانە کتێبی (الطیب النووي/بابەتی -علاج العشق).
[2] - ئەم فەرموودەیە (حسن) ە (نسائی - ٧/ ٦١ - ٦٢) و (احمد ٣ - ١٢٨) گێڕایانەتەوە.

هەروەها لەجۆرەها دانایی بەهرە دەرمان کردوونەوە هەندێکیان وەك یوسف داود و سلیمان دەسەلاّت و پادشایەکی گەورەمان پێ بەخشیون.[1] ئەوەتا ابراهیم (س.خ) لەگەلّ ئەوەی کە خاتوو سارا کەشاجوانی ئافرەتانی جیهان خێزانی بووە (خاتو هاجرە) شی خۆش ویستووە و دلّشادبووە پێی.وە هەروەها ئەوە (داود) ی پێغەمبەر (س.خ) کە نەوەت و نۆ هاوسەری هەبووە ئافرەتێکی تری خۆش ویست ڕاستەو خۆ ئەویشی خواست و کردی یە سەد هاوسەر.وەئەوەتا (سلێمان) ی پێغەمبەر (س.خ) شەوانە دەچووە لای نەوەت هاوسەری. وەپرسیارین لەپێغەمبەر (د.خ) کە خۆشەویسترین مرۆڤ لات کێیە ؟ ئەویش فەرمووی (عائیشە)[2] واتە خاتوو عایشە یە،وەسەبارەت بەخاتوو (خەدیجە) دەفەرمێت (انی رزقت حبها) واتە من خۆشەویستی خاتو خەدیجەم پێبەخشرا..

خۆش ویستنی ئافرەتان لەتەواوکاری مرۆڤایەتیە (ابن عباس ڕ-خ) دەلّێت خێرو چاکەی ئەم گەلە لەزۆری ئافرەتدایە،وە (امام احمد) دەگێڕێتەوە کە لەکاتی دابەش کردنی غەنیمەکان لە جەنگی (جەلولا) کەتێیدا فارسەکان شکان کەنیزەیەکی زۆر جوان درا بە

---

[1] - (حافظ بن حجر ) دەلّێت ئەم بڕگەیە بەناو بانگە زیادە(ثلاث).هەریەکە لە ( امام ابو بکر بن قورك) لە( جزو مفرد) دا وە (امام غزالی ) لە( احیا)دا شەرحیان کردوە وە(حافظ) دەلّێت : لەهیچ کام لەمانە بڕگەی (ثلاث)مان نەبینیووە

[2] - ئەم فەرموودەیە (صحیح) ەپێشتر باسمان کردوە،وەهەروەها لەفەرموودەیەکدا هاتوە.لەپێغەمبەر(ﷺ) یان پرسی ئەی لەپیاوان کێت خۆش دەوێت،پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی (اباها) واتە باوکی خاتوو عایشە.٣-ئەم فەرموو دەیە(صحیح)ە (مسلم ٢٠٩/١٥-نووی)گێڕاوێتیەوە

(عبـدالله بـن عمـر ) . وه (عبـدالله) دهڵێـت كـهبينيم خـۆم پـێ نـهگیرا لهبهر چاو ههموو خهڵكی ماچم كرد.

## تكاكردن لهنێوان دوو عاشق بۆ بهیهك گهیشتنیان بهدروستی

پێغهمبـهری خـودا (ﷺ) سـهرسـام بـوو بـهڕوداوی دوو عاشـق وهكهوتۆتـه نێوانیانـهوه و هـهوڵی داوه بهحـهلاڵی و دروسـتی بهیـهكیان بگهیـهنێت بـهڵام سـهرئهنجامی ههوڵهكـهی سـهركهوتو نـهبوو بـه هـۆی ڕازی نـهبوونی ئافرهتهكـهوه ئهمـهش لـهڕووداوی چـیرۆكی (موغیـث وبـورهیره) دایـه كـهكاتێ پێغهمبـهر (ﷺ) ههسـتی بهشـهیدای و پهرێشـانی (موغیـث) كـرد كـهوهك دێوانـه دهگریـا بـۆ (بـوریره) و لهههمووشـوێنێك داشـوێنی دهكـهوت. پێغهمبـهر (ﷺ) بـه (بوریره) ی فـهرموو: (لوراجعتـه؟) واتـه ئهگـهر بكرێـت ئـهو پیاوه بگهڕێنیتـهوه لای خـۆت وهك جـاران ببنـهوه بههاوسـهری یـهكتری ؟ بـهڵام بـورهیره پێـی ووت:فقـال (أتـامرني يارسـول الله؟) ئایـه فـهرمانم پـێ دهكـهیت ئـهی پێغهمبـهری خـودا (ﷺ) ؟ پێغهمبـهریش (ﷺ) فـهرمووی: (لا انمـا اشـفع) .واتـه: نـهخێر مـن تـهنها تكاكـارم بورهیره ووتـی: (لاحاجـة لـي بـه)، واتـه: مـن هـیچ پێویسـتم پێـی نـی یـه.دواتـر پێغهمبـهر بـه (عبـاس) ی مـامی دهفـهرمێت: (ياعبـاس الاتعجـب مـن مغيـث بريـرة ومـن بغضـها لـه؟) . واتـه: ئـهی عباس تـۆ سـهرت سـوڕماوه لهخۆشهویسـتی شـهیدای مـوغیس بۆبـورهیره وهلـهڕقی بـورهیره بـۆ موغیـث؟ لهگـهڵ ئهوهشـدا كهپێغهمبـهر (ﷺ)

تکاکاریش بوو بۆی هەروەها ڕێگری لە (موغیث) نەکردوەو نەیفەرمووە نەکەی ئەمە حەرام و قەدەغەیە؟![1]

وە پێغەمبەر (ﷺ) بەیەکسانی هاوسەرەکانی خۆش دەویست وە دەیفەرموو: (**اللهم هذا قسمي فيما املك،فلا تلمني فيما لا املك**) .واتە: (خودایە ئەمە دابەش کردنی منە لەوەی دەسەلاتمە وەگلەیم لێ مەکە لەوەی لەدەرەوەی دەسەلاتی منە لەخۆشەویستی دا) .

وەخوای گەورە دەفەرمێت: (وَلَن تَسْتَطِيعُواْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ النِّسَاء وَلَوْ حَرَصْتُمْ: النساء-١٢٩) . واتە:هەرگیز ئێوە ناتوانن لەنێوان هاوسەرەکانتاندا دادپەروەرانە ڕەفتار بکەن،هەرچەندە سوریش بن لەسەری..

واتە ئێوە لەخۆشەویستی وچونەلایاندا ناتوانن دادپەروەر بن-بەبەردەوامی خەلیفەکانی ڕاشدین و خەڵکانی بەڕەحم و بەبەزەیی هەمیشە تکاکاربوونە و هەوڵی بەیەکگەیاندنی عاشقانیان داوە بەشێوەیەکی دروست و ڕەوا.هەروەکو پێشتریش باسمان کرد لەوانە (ابو بکر وە عوسمان) تەنانەت (علی کوڕی ابی طالب) یش ڕۆژێکیان لاوێکیان هێنا بۆلای کەلەماڵی یەکێکدا گرتبویان.بەدز تۆمەت باریان کردبوو (علی) لێی پرسی:بەسەرهاتی تۆ چی یە؟ ئەویش لەوەلامدا ووتی: (والله ی من بەهیچ شێوەیەك دزو جەردەنیم ڕاستەکەیت پێ دەڵێم ئەی

---

[1] - ئەم فەرموو دەیە(حسن) (ابو داود-٢٢٣١) وە( ابن حاجه-٢٠٧٥) گێڕاویانەتەوە.

پێشەوای بڕواداران) لێرەدا بەپارچە شعرێك ئەوەی ڕاگەیاندکە: عەشقی کچە شۆخێکی ئەو بنەماڵەیەی (الرباح) بووە.خۆیی پێنەگیراوە وویستویەتی بچێت بۆ بینینی.کاتێ کەچۆتە ماڵەوە بۆ ئەم مەبەستەخۆیی حەشارداوە. دواتر پێیان زانیوەو گرتوویانەووتویانە ئەم دزە بۆ دزی هاتووە.کاتێ خەلیفە (علی) گوێی لەم شعرە بوو یەکسەر تێگەیشت و بەزەی پێدا هاتەوە ڕوویی کردە (مهللب بن رباح) وپێی ووت: ئەو کچە ببەخشە بەولاوە.ئەویش ووتی:ئەی پێشەوای بڕواداران لێی بپرسە ئەم کوڕە کێیە تابیناسم؟ لاوەکەش ووتی:من (نهاس بن عیینە) م. (مهللب) ووتی ئەوکچەت پێشکەش بێت وەرە بیخوازە.

جارێکیان (معاویە) کەنیزەیەکی کڕی. کەزۆر شۆخ و شەنگ بوو. (معاویە) زۆر پێی سەرسام بوو. ڕۆژێکیان گوێی لەو کەنیزەیە بوو چەند دێڕە شعرێکی چڕی،کەتێیدا دەرکەوت ئەو کەنیزەیە عاشقەو حەزی بەپیاوێکی ترە.یەکسەر (معاویە) بانگی کردو لێی پرسی کە بەسەرهاتی چی یە؟ کەنیزەکەش پێی ڕاگەیاند،کەحەزی بەخاوەنەکەی پێشوتریێتی و عاشقی ئەوە. (معاویە) ڕاستەوخۆ کەنیزەکەی ناردەوە بۆلای خاوەنەکەی هەرچەندە لەدڵیدا زۆر شیرین بوو.

وە (زمخشری) لەکتێبی (الربیع) دا دەگێڕێتەوەکە (خاتو زبیدە) کاتێ لەڕێگادا بەرەو شاری (مەکە) دەچوو لەسەر دیوارێك دا. دێڕە شعرێکی پێش چاو کەوت کەتێیدا نوسرابوو:

ئـەرێ لـە بەنـدەکانی خـودا- پیـاوێکی جـوامێر نـی یـە یـاخود خـاتونێکی بەبـەزەیی کەچارەی دەردی دوو عاشـق بکـات کـەوا عـەقڵ لەدەسـت دەدەن...هەرلـەوێ (خـاتوو زبیـدە) بـەڵێنی دا و نـەزری کـرد کەهـەرکات خـاوەنی ئـەو دێـڕە شـعرە بناسـێتەوە هـەوڵ بەیەکگەیـشتنی بـدات لەگـەڵ عاشـقەکەیدا. لەکاتێکـدا (خـاتوو زبیـدە) لـە (موزدەلیفـە) بـوو گـوێی لـە هـەمان شـیعر بـوەوە کەکەسـێك دەیخوێنـد.کـاتێ بانگیـان کـرد بـۆی.بـینی لاوێکـە وتـی مـن ئـەم شـیعرەم وتـووە وعەشـقی کـچێکی ئـامۆزای خـۆم بوومـە بـەلآم کـەس و کـاری بـەڵێنیان داوە کەنـەم دەنـێ... (خاتووزبیـدە) لاوەکـەی بـردو ڕۆیـشتن بـۆ مـاڵی کـچەکە بـەردەوام (خـاتو زبیـدە) پـارەی بـۆ زیـاد کـردن هـەتا ناچـاری کـردن و ئـەو دوو خۆشەویـستەی بەیـەك گەیانـدن. (خـاتو زبیـدە) دەڵێـت: کـچەکە زۆر زیـاتر شـەیدا تربـوو بـۆ کوڕەکـە پاشـان هەمیشە (خـاتو زبیـدە) دەیـوت: مـن بـەهیچ شـتێك دڵـم خـۆش نـی یـە بـۆ قیامـەتم بەئەنـدازەی ئـەو کـارەی ئـەو دوو عاشـقەم بەیـەك گەیاندوە.

(خراطـــي) دەڵێـــت: (ســـلیمان بـــن عبـــدالملك) خزمـــەتکارێك و کەنیزەیـــەکی هـــەبوو. یـــەکتریان خـــۆش دەویـــست. جارێکیـــان خزمەتکارەکـە پارچـە شـعرێك دەنوسـێت بـۆ خۆشەویـستەکەی.تێیـدا باسـی ئـەوە دەکـات کـە ئـەم شـەو لـە خەونیـدا پێکـەوە بوونـە لەیـەك ماڵـدا...وەکەنیزەکـەش: بـە پارچـە شـعرێك وەلآمـی دەداتـەوە کەتێیـدا بـاس لـەوە دەکـات هیـوا خـوازە بەیـەك بگـەن. کاتێـك ئـەم بەسـەرهات و شـیعرانە دەگاتـــەوە دەســـتی (ســـلیمان) هەرچـــەندە لـــەم ڕووەوە

بەتوند ڕەو ناسرابوو. یەکسەر بانگیان دەکات و لەیەکتریان مارە دەکات و ئازادیان دەکات وە هەرچی پێداویستی هەیە بۆیان دابین دەکات و گوزەرانیان خۆش دەکات.

(جامع بن برخیە) دەڵێت: لە (سعید بن المسیب) م پرسی کەموفتی شاری (مدینە) بوو: ئایە ئێمە تاوانبار دەبین لە خۆشەویستی یەك کەتوشمان بێت و بەدەستی خۆمان نەبێت؟ سعید ووتی.تۆ لەکارێکدا تاوانباریت کە بەدەستی خۆت بێت.و زاڵبیت بە سەریدا. دواتر (سعید) ووتی: هێشتا کەس لەم جۆرە پرسیارەی لێم نەکردووە وەهەر کەسێکیش بپرسێت هەر بەم شێوەیە وەلامی دەدەمەوە.

**عەشقی ئافرەت سیّ جۆرە:**

**١- مایەی چاکەو خوا پەرستی یە:**

ئەم عیشقەیان مایەی چاکەو خوا پەرستی یە کەعەشقی هاوسەرەکەتە کەئەنجامی حەلاڵی و دروستی نەوەی چاك و ژیانی خۆش دەبەیتە سەر دەبنە قەڵغان بۆ پاراستنی داوێنی و چاوی یەکتری-هەربۆیە ئەم جۆرەعیشقە مایەی خێرو خۆشی یە و لەلای خواو پاشان خەڵکی مایەی ڕێزو سەر بەرزییە.

**٢- مایەی ڕیسوایی و دورکەوتنەوەیەلەڕەحمی خودا:**

ئەم جۆرە عیشقە بریتی یە لەعیشقی هاوڕەگەزی (نێربازی) هەرکەسێك توشی ئەم جۆرە عیشقە بێت ئەو ج لەلای خوای گەورە

وه چ لای کۆمـەڵگاش ڕیسواو سەرشـۆڕو بـێ ڕێـز دەبێـت.جـوامێری و مەردایـەتی لەدەسـت دەدات. وه هـەر ئـەم جـۆره عیـشقه بـوو کەچـی بەسـەر گـەلی پێغەمبـەر (لـوط) دا هێنـا. کـه خـوای گـەوره دەفـەرمێت: (لَعَمْـرُكَ إِنَّهُـمْ لَفِـي سَـكْرَتِهِمْ يَعْمَهُـونَ: الحجر-٧٢)، واتـه: (سوێند بێت بـه تەمـەنی تـۆ پێغەمبـەر، ئـەوان لـه گێـژاوی سـەر لێشێواوی دا کوێرو مەست و ڕۆچوون)

**چارەسەری ئەم دەردە:**

بریتـی یـه لـه گەڕانـەوه بـۆلای خـوای گـەورەو بیرکردنـەوه لەسـزای خـوای گـەوره لەدۆزەخـدا. دواتـر بـیر کردنـەوه لـه ڕیـسوایەتی لـەم ڕووەوه کەتوشـی مـرۆڤ دەبێـت لـەنێو کۆمـەڵگادا.دواتـر دڵنیـابین کەئەم حاڵەتە-دابەزینه بۆ ئاستی خواتر له ئاژەڵ.

**٣- عیشقی دروست، کەلەدەسەڵاتدا نەبێت:**

ئـەم جـۆره عیـشقەیه کەهـەر بـەبنینی ئـافرەتێکی شـۆخ و شـەنگ بـەبێ مەبەسـت ڕاسـتەوخۆ بکەوێتـه عیـشقەوه. بـەلاّم بەمـەرجێ ئـەو عیـشقه توشـی سـەر پێـچی و تاوانکاریـت نـەکات. ئەمـه لەسـەروی دەسـەلاّتی مرۆڤەوەیـه کـاتێ زانـرا ئـەو کەسـەی کـه عیـشقی بوویته،هاوسـەر داره یـاخود ناکرێـت بیخوازیـت. باشـترین کـار ئەویـه کـه پـشتی تێبکـەیت و لێـی دورکەویتـەوه ڕوولـه باشـتر بکـەیت کـه بگونجێـت و دروسـت بێـت. گـەر نـا توشـی خـەم و پـەژارەت دەکـات. باشـتر وایـه کـه ئـارام گـر یاخۆڕاگربیـت و چـاو و داوێنـی خـۆت بپارێزیـت. بەمـەش پـاداش دەدرێیتـەوه لـەلای خـوای گـەوره. کـەدژی

حەزو ئارەزووەکانی خۆت وەستایتەوە و ئارام گربوویت. ڕزامەندی خوات هەڵبژارد لەتاوانکاری.

**خەڵکی لەعیشقدا سێ جۆرن:-**

هەیە:عیشق و شەیدای هەموو جوانیەك دەبێت.وە دڵی لە هەموشوێنێکدا دێوانەو سەرگەردانە.

وەهەیە:تەنها شەیداو عەشقی کەسێك و جوانیەك دەبێت جا ئیتر نیازی بەیەکگەیشتنی هەبێت یان نا...

وەهەیە:تەنها شەیداو عەشقی کەسێك و جوانیك دەبێت کەدڵنیا بێت بە ئاسانی پێی دەگات.جا لەنێو ئەم سێ چینەدا عیشقی بەهێزو لاواز هەیە.

جۆری یەکەم:کەسێکی ناسەقام گیرەهەرۆژەی لەسەر بەزمێکە.وەهەر ساتەی بەکەسێکەوە گیرۆدە دەبێت. سەرەتاو کۆتای دیار نی یە.

جۆری دووەم: شەیدایەکی جێگیرەو چەسپاوە،زۆر بەهێزترە لەجۆری یەکەم-تەمەنی خۆشەویستەکەی دوورو درێژە. بەلأم تەنها ئەوەلاوازی دەکات.کەنیازی گەیشتنی بەعەشیقەکەی نی یە.

جۆری سێیەم: لە هەر هەموویان خۆشەویستی بەهێزترو تەمەن درێژترو شەیداترە. کەنیازی گەیشتنی بەخۆشەویستەکەی هەیە لە چوار چێوەیەکی دروستدا.چونکە نیازو تەماحی گەیشتنی بەخۆشەویستەکەی مایەی بەهێزبوونی عیشقەکەیەتی.

**پوچەڵ کردنەوەی فەرموودەی عیشق**

پاشان دێینە سەر فەرموودەی: (من عشق وكتم،وعف وصبر غفر الله لة،وادخلة الجنة) [1] واتە: (هەرکەسێك توشی عیشق بێت و شاردێیەوە داوێن پاك و ئارام گربێت،ئەوە خودا لە تاوانەکانی خۆش دەبێت وە بە بەهەشتی شاد دەکات) .

ئەم فەرموو دەیە (سوید بن سعید) دەیگێڕێتەوە وەسەرجەم پێشەواياني فەرموودە ئەمەیان ڕەت کردۆتەوە.وە (إبن عدی) لە (الکامل) دا دەڵێت: ئەم فەرموودەیە لە سویدەوە دەگێڕێتەوە. وەکەسیش نی یە بڵێت ئەو نەیگێڕاوەتەوە. ئەمە بۆچونی هەریەك لە (بیهقی) و (ابن طاهر) لە (الذخیرة) و (التذکرة) دا هاتووە. وەهەرووەها (ابو فرج ابن الجوزی) یش تەنانەت لە فەرموودە هەڵبەستراوەکاندا (الموضوعات) هێناویێتی.

وە (ابو عبد عبدالله الحاكم) دەڵێت:من ئەم فەرمودەیە ڕەت دەکەمەوە سەرم سوڕماوە لێی کەچەند ئاسانکاری تێدایە. منیش دەڵێم: ڕاستی ئەم فەرموودەیە. بریتی یە لە وتەی (ابن عباس ) نەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) وە (محمد بن خلف بن المرزبان) دەڵێت: (ابو بکر الازرق) لە (سویدە) وە ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە بۆمان.گلەیی لە (سویدە) کرد کە ئەم فەرمودەیە نەداتە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ) هەر بۆیە لەدوای ئەمە هەر کاتێ باسی ئەم فەرموودەیەی بکردایە نەیداتەوە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ) وە

---

[1] - ئەمە فەرموودە نی یە و (باطل) ە پێشتر باسمان کردووە، بۆ زیاتر ئاشنا بوون بڕوانە لێکۆڵینەوەمان لە سەر کتێبی (روضة المحبين) و (الطب النبوى)

سەرجەم پێشەوایان و زانایانی بواری فەرموودە-ئەم فەرموودەیەیان نەبە (صحیح) یان (حسن) یان...هتد وەر نەگرتووە. پوختەی ئەم بابەتە ئەوەیە کە ئەمە ووتەی (ابن عباس) ە.منیش دەڵێم مەبەستم (ابن القیم) ە. هەروەها (ابو محمد بن حزم) دەڵێت: پرسیان لە (ابن عباس) کەسێ بەهۆیی عیشق و شەیداییەوە بمرێت؟ (ابن عباس) یش ووتی: (قتیل الهوی لاعقل لە ولا قود) واتە: (کوشتەی خۆشەویستی یە. نە عەقڵی هەیەونەخوێنی هەیە) .

وەپێشتریش باسمان کرد. کەلە (عرفان) گەنجێکیان بۆی هێنا بە هۆی عیشقەوە تەواو لاوازو نەخۆش بوو، پرسی ئەمە چی یەتی ؟ ووتیان تووشی عیشق بووە. ئەویش بەدرێژای شەو و رۆژێك دەیووت بەنا بەخودا دەگرم لەعیشق. وەهەروەها پێغەمبەر (د.خ) لە (صحیح) دا سەر جەم شەهیدەکانی ژماردو پۆلێنی کردون. لەوانە (کوژراو لەبەرەکانی جەنگ و جیهاد،سك ئێشە سوتاوی،ئافرەتی سك پڕ،خنکان لە ئاودا، رووخانی دیوارو شاخ بەسەریدا) [1] کەچی باسی کەسێك ناکات بەهۆیی عیشەوە بمرێت. جا مەبەستی (ابن عباس) لەم ووتەیەدا ئەوەیە کەکەسێك عاشق بێت پێویستە بۆ ئەوەی بچێتە بەهەشتەوە ئارام گرو داوێن پاك و نهێنی پۆشەر بێت، جا ئەگەر کەسێك لەپێناوی خوای گەورە دا ئەم کارانە ئەنجام بدات و لە خوا ترس بێت ئەوا لەپێری ئەو کەسانەیە کە خوای گەورە لە حەقیان دەفەرمێت: (وَأَمَّا مَنْ خَافَ

---

[1] - ئەم فەرموودەیە ( صحیح) ە ( صحیح المسلم -١٣/٦٧٩) بە شەرحی نەوەوی.

مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى: النازعات ٤٠-٤١) واته: (هەرکەسێك لە خوای گەورە بترسێت، ڕێگە لە خراپە کاری بگرێت و ملکەچی ئارەزووەکانی نەبێت ئەوە جێگەی بەهەشتی بەرینە) . وەهەروەها دەفەرمووێت: (ولمن خاف مقام ربه جنتان...الرحمن:٤١) واته: (هەرکەسێك لەخوای گەورە بترسێت و ملکەچی بکات ئەوا خەلاتی دوو باخی هەیە لە بەهەشتدا) .

جا داوا دەکەین لە خوای مەزن و پەروەردگاری عەرشی مەزن کەبمان کاتە ئەو کەسانەی کە پشت لە حەزو ئارەزووەکانیان دەکەن و ڕوودەکەنە خۆشەویستی و ڕەزامەندی و ملکەچی خوای گەورە.

......ئامین-ئامین یا أرحم الراحمین...